لەبڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

# زەردەشت ئاوای گوت

دانانی فەیلەسوفی ئەڵمانی
**فریدریك نیتشە**

وەرگێڕانی بۆ كوردی
ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی



## پێشەکی

هیچ خاوەنبیرێك هێندەی نیتشە دڵ سۆز نەبووە؛ چونکە ئەوەی ئەوپێی گەیشتووە بەرلەم کەسێکی دی نەی گەیشتووەتێ.. بەبێ ئەوەی دەربایستی هیچ سەختی‌یەك بێ، لەپێناو ڕاستی خوازی‌دا بەهەموو ناخێك دا ڕۆچووە سڵیشی لەوەنەکردووتەوە بەرەنگاری جەرگەی مەرگەسات بێ یان لەو سەرەوە لەهیچەوە سەردەربکا.

**ئەمیل فاکیە**
**ئەندامی کۆڕی زانیاریی فەرەنسی**

نێتشە ئەو فەیلەسووفەیە کە ((فاکێە))[١] ئاوا دیاردی بۆ کردووە، ئەمەش لەدوا ئەوەی کە لە زۆربەی بەرهەمەکانی نۆڕیوەو ڕای نواندووە. لەهەموو ئەورووپادا دۆست‌و ناحەزی نێتشە بەهەمان بۆچوونی ((فاکێە)) ئەو فەیلەسووفەیان نمایش کردووە.

[١] ئەم کورتە پێشەکی‌یەی من لەگەڵ سەرە بڕشتێکی ئەو پێشەکی‌یە بەرفراوانەیە کەخوا لێخۆشبوو ((فلیکس فارس)) بۆ هەمان کتێبی نووسیوە.

بەسەرنج دانی بەرهەمی ئەو پسپۆڕو لێ هاتووانەی لەمەڕ ئەمیان نووسیوە بەئەوانەشیانەوە کە گووتیانە:

لەسەر لێشێواوی دا کەوتووەتە پەلەقاژێ.. بەئەوانەشیانەوە کەڕایان وایە لەودیو هەموو رستەو گوتەیەکی یەوە واتای نیشانەو سوورەتێك دەورنگێتەوە–مەگەر هۆشمەندێکی بەبڕشتی ناسك بیر پێی بزانێ–تێکڕای ئەوانە لەم پەسندکردنەیدا یەکانگیرن:

نێتشە ئەو فەیلەسووفە بەدەسەڵاتە چاو نەترسەیە ئاودیوی هەموو شتێك دەبێ و ئەودالی ڕاستی یە، تەنانەت لەنەدیوی ئەو ڕێ بیرو بنەمایانەشەوە کەقەراردادەی خۆنیهەر لەڕاستی دەگەڕێ..ئەوەتا بۆخۆی دەڵێ:

((نەکەی لەنێوان بیرۆکەی خۆت داو ئەوشتەی دژ بیری تۆیە ببیتە لەمپەرێك و بەبێ چرکە لێی بوەستی.

هەر خاوەنبیرێك لەسەر ئەم بنەمایە کارنەکا ئەوا لەسەرەتاوە یەکەم پلەی دانایی نائەنگێوێ.

پێویستە هەمو ڕۆژێك نەفسی خۆت بهاوێژیەیە گەرمەی جەنگێکەوە. بۆت نیە لەوزەحمەت کێشانەدا تێڕامێنی ئایە– سەردەکەوێ یان تێدادەچێ، چونکە ئەمەیان بڕیاری خودی ڕاستییەو کاری بەتۆوە نیە)).

ئەوا لەگەڵ خەون و خەیاڵی نێتشەدا هاتووین کەبۆ ((هۆشەونە= عقل باگن) ی خۆی یان بۆ بیر بەرزیی خۆی ناوی ئەو (زەردەشت)[٢]ەی کەبنەمای بیروباوەڕەکەی لەسەر ناکۆکی هێزی چاکەو خراپە لەژیانی مرۆڤ دایە کردووەتە نازناو. ئەمەش لەبەر ئەوە نیە کەمریدیەتی یان لەسەر ڕچەی دانا ڕۆژهەڵاتییەکانە– بەڵکو بۆ ئەوەیەتی بەرپەرچی بیرۆکەی چاکەو خراپە بداتەوە کەدەڵێ:

((ئەو بیرۆکەیە بەچاو مرۆڤایەتییەوە دیاردەیەکی لاوەکییە.. ئەو مرۆڤایەتییەی کەناتوانێ بەسەر زاتی خۆیدا زاڵ بێ و بالابێ تا نکووڵی لەوچاکەو خراپە قەراردادانە نەکرێ و لەوحەکانی ئەو یاساو دەستوورانەی بۆ نرخاندنی کاروبارەکان

---

[٢] مامۆستای خوالێخۆشبوو، دوواتر بە ((زارا)) کورتی کردووەتەوە منیش هەمان ڕچە دەگرم.

ڕۆنراون سەرجەمیان تێك نەشكێنرێن، چونكە هەر گەلەو بۆخۆی وەستای چاكەو خراپەی خۆیەتی كەلەگەڵ یاساو دەستووردانانی گەلێكی دیكەدا ڕێك نایە))

لەبەر چاومە زۆر لەڕۆشنبیرانی كورد دەپرسنەوە:

لەپای چی ((ئالانی)) ئەم كتێبە سەختە دژوارەی وەرگێڕایە سەر كوردی، خۆی نوقمی گێژاوێكی بێ سەروبن كرد؟

وەڵامەكەی من بەچاو خۆمانەوە وەك وەڵامەكەی زانای خوالێخۆشبوو ((فلیكس فارس))ە، كەلەلاپەڕە (٢٢)ی پێشەكیی ئەم كتێبەی‌داو لەساڵی -١٩٣٥-دا بەچاو خۆیەوە بۆ هاونەژادی خۆی نووسیوە:

((بەهیوام كەخاوەنبیرانی عەرەب لەگەڵمابن كەكتێبە فەلسەفەیەكی ئاوها نایاب خرابێتە سەر زمانگە لە زیندووەكانی جیهان و كرابێتە نموونەیەكی ڕاشكاوی و دڵ سۆزی لەڕاستی پەروەریدا،بێت و كتێبخانەی عەرەبی لێی بێ بەش بێ دەبێتە مایەی كەمایەسی و كەمتەرخەمی. لەوەش گەڕێ كەكەشكۆڵ و زانیارستانەكان پیشان دەدەن كەئەم بەرهەمە باشترین كتێبێكە كەبەئەڵمانی نووسرا بێ))

لەپەراوێزێكی دیكەش دا نووسیویەتی:

((زمانی عەرەبی ئافەرینی دەوێ و مایای شانازیمە كەدەسەڵاتی ئەوەی هەیە ئەو بەیانە دژوارە داهێنراوە تازە بەتازە ئەڵمانی‌یەی پێ ڕاگوێزبكرێ و دەرەقەتی بێ!))

دیسان ئەوەش دەخەمە ڕوو كەشاعیرە بەناوبانگەكانی نیشتمانی عەرەب لەو سەروەختەدا چۆن بەهەڵ بەستی گەرموگوڕەوە پیرۆزبایی‌یان لەخوالێخۆشبوو كردووە. ئەمەمان تا ئێرە .بەكورتی دەڵێم :

ئەی منی لەخۆ زویر بوو، بەم زمانە پیرۆكەوەو بەم كەمدەرەتانی‌یەوە چۆن بەكوردی خۆم فڕێ دایە ئەم كارە سەختەوە؟!

دوواتر هەر ئەوەندەم لەدەست دێ لەو سەری مەیدانەوە ئەم پرسیارە داچەقێنم:

((دەبێ چۆن چۆنی ئەم دیاری‌یەم لێ وەربگیرێ؟!.)).

ئالانی

٩٨٩/١٠/١

## پەسندکردن

دەقی ئەو نامە بەنرخەی کە مامۆستای مەزن و خاوەنبیری عەرەب ((تۆفیق الحکیم)) بەبۆنەی دەرچوونی ئەم کتێبەوە بۆ خوالێخۆشبوو مامۆستا (فلیکس فارس))ی ناردووە:

((دۆستی ئازیزم مامۆستا فلیکس فارس! هێشتا بەتەواوەتی پۆستەی ئەم بەیانی‌یەم لەمەڕ ئەم کتێبە بەنرخەوە ((زارا ئاوای گوت)) هەڵ نەپچڕی بوو دەرکم بەم خزمەتە گەورەیەی تۆ کرد لەپێناو بیری نوێی ڕۆژهەلات دا، کارەکەت لەبابەت وەرگێڕانی ئەو جۆرە بەرهەمانەوە بەزمانی عەرەبی، ئەمڕۆ وەك پێویست شوێنی دەرناکەوێ..بەلام ڕۆژگاری داهاتوو بەئەمەکترو قەدرزانتر دەبێ و جێ دەستت دەبێتە مایەی بەختەوەری. لەم ساتەدا بەرەو نەوەکانی داهاتوو خەیالم دەکەوێتە گوڕ: کە لەمەو لا سەرو دەماغە ڕۆژهەلاتی‌یەکان بە بەرو میوەی بیرو بۆچوونی ((مۆسێ و نێتشەو بێجگەی ئەمانە تەسەل دەبێ. قەڵەمەکەت ئەو جۆرە شاکارانەی کردنە میوانی سەر دێرینە خوانی ڕۆژهەلات. ئالێرەوە–لەشێوازی سەرنج دان بۆ شتەکان– گۆڕانێکی گەورە بەدی دەکەم. ئەم کارە هەڵگەڕانەوەیەکی هۆشمەندانەیەودوواتر لەچێوەی بەرگوشادی عەرەب دا بەرپا دەبێ. ئەوسا مێژوو نووسەکانیش هەلومەرج،و هۆیەکانی پاساو دەدەنەوە..لەوەش دڵنیام ئەوە فەرامۆش ناکەن کەئەم کارەی تۆ یەکێکە لەهۆ ئاشکراکانی ئەودیاردەیە. ڕۆژهەلات هێجگار پێویستی بەو کارەیە..ئێمەش بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی ژیریی تەواو زۆر پێویستمان بەڕاگوێزی ئەوشاکارە ئەوروپایی‌یانەیە..ئەو شۆڕشەی کەبەرهەمی داهێنراوی شەخسیی ڕۆژهەلاتی بەدووادا دێ. ئیدی لەمن و ئەدەبی عەرەبی‌یەوە درودو پیرۆزبایی ڕاستت پێشکەش بێ.

**تۆفیق الحکیم**

# زارا ئاوای گوت
# بەشی یەکەم
# ئەمە کتێبی کۆمەڵەو کتێبی تاکە کەس نیە.
# فریدریك نیێتشە

1

**بەرایی زارا**
**-نیێتشەی ئەڵمانی-**

لەتەمەنی سی ساڵی دا نیشتمانو دەریاچەکەی بەجێ هێشتو بەرەو چیا هەڵ کشا، دەساڵی ڕەبەقی بەگۆشەگیریو بیرکردنەوەوە گوزەراند، تابـاری دەروونو میزاجی بەتەواوەتی گۆڕا. ڕۆژێکیان لەڕۆژەوە بوون دا لەخەوگاکەی ڕاپەڕیو ڕوو لەخۆر ڕاوەستاو لەگەڵیا کەوتە ڕاز:

–ئەرێ ئەستێرە گەورەکە! خۆش هیوایی تۆ لەوەدایە کەس بەتیشکت نوورانی نەبێ؟ .. دەساڵەو بەسەر ئەشکەوتەکەمەوە هەڵ دێی.. ئەگەر خۆمو هەڵۆکەمو ئاشقە مارەکەم نەبانایە، گورزە ڕووناکی یەکانت شلو کول دەبوونو لەدەست ئەم – ڕێ پێوانە بێ زار دەبووی. بەڵام ئێمە هەموو سبەینانێك– چاوەڕوانی هەڵ هاتنت بووین تابەچاکەت بنازینو پیرۆزباییت لێ بکەین. دەگویێم لێ بگرە!چۆن هەنگ بەگردوکۆی خۆی ئێق دەداتەوە نەفسیشم ئاوا چارەی داناییمی نەگەرەکە ..

ئەدی کوا ئـەو دەسـتانەی لەبـەردەمم دا پـان دەبنـەوە تابـارانی بەخشـندەیی‌یان بەسەردا برێـژم؟! ئەوسا دانایـانی ئـەو مرۆگەلـە بەشـێتێتی خۆیانـەوە بەکـەیف بێـن‌و هەژارەکانیش بەسامانەوە کامەران بن.

ئەی ئەستێرەی خەزنەوەر! ئەمە ئەو ئاواتەیە کەبەرەو ناخەکانم دەکاتەوە، وەك تۆ هـەموو ئێوارانێـك بـەودیوی دەریاکـان دا شـۆڕدەبیتەوەو ڕووناکی‌یەکـەت دەگـری بەکوڵتـەوە بـۆ ئـەو دیـوی خـوارەوە لەجیـهان– دەبـێ منیـش چـاو لـەتۆ بکـەم‌و ئاودیوبم..بەگوتەنی ئەو خەڵك‌و خوایەی لەتەکیان دا تێ دەکەمەوە، دەبێ بۆخۆم لێی هەڵاژێم.

پیرۆزبایی لەکاسەی کەیل بکە.. کـەزێڕاوی ڕەوانـی لێ دەڕژێ‌و بڵێسـەیەك لـەدڵ خۆشـیت بەسـەر ئاسـۆی بـەریندا دەپڕژێنـێ.. بڕوانـە ئـەو کاسـەیە! گەرەکی‌یـەتی دیسانەوە هەڵقوڵێتـەوە.. زاراش گەرەکی‌یەتی بەمرۆڤی سەر هـەڵ داتـەوە. بەورەنگـە زاراش بۆ نەدیو ئاوابوو.

## ٢

زارا لـەچیاوە داتـرازا، تاگەیشـتە دارسـتانەکە تووشـی کـەس نـەبوو. لـەوێ پـیرێك پەیدا بـوو کەبۆ هـەندێ بنـەگیاو پـەلاش هـاتبووە دەرێ، خـێرا هاتـە بـەردەمی‌و پێـی گوت:

–لەبیرەوەریی من دا ڕێبوارێکی نامۆ نی.

ئەوجا وەك لەگەڵ خۆی بدوێ تێ هەڵ چووەوە:

–دەساڵێك دەبێ هەر ئەم کابرایە لەم شوێنەوە ڕابوورد بەلام لـەمڕۆی دا بێجگـەی خۆیەتی وەك لەدوێنێی‌دا!

ئەوسا خۆڵەمێشـەکەتت هـەڵگرت بۆ چیا.. ئـەی ئێسـتا بەئاگرەکەتـەوە بـۆ شـیو دەگەڕێیەوە؟..

ئەرێ تۆ سڵ ناکەیتەوە تووشی سزای ئاگر هەڵگیرسێنی بی؟

ئەوە زارایەو ناسیمەوە! ئەوە چاوە بێگەردە کانی‌یەتی ئەوە لچولێوەکانی کەباری قێزو بێزیان لێ نەنیشتووە...ئەوەتانێ بەهەنگاوی سەما کەرانەوە دێتە بەرەوە؟!

بيچمى زارا گۆڕاوە؛ نەفسى خۆى ساواكردووەتەوە، زارا بەڕاستى بێداربوويتەوە! كەواتە لەنزيك خەوتووە كانەوە كارت چيە؟

وەك يەكێك خۆى نوقمى دەريا بكاو دەرياش بارى قورسى لەكۆڵ بكاتەوە، بۆخۆت لەتەريكيى دا دەژياى كەچى ئەوا دەت بينم ڕوو لە وشكانى دەكەى. ديارە گەرەكتە ملى خۆت بەسەر زەوىدا كێش بكەىو دەست بەردەرى هەر كەسێك بێ بتگرێ بەكۆڵىيەوە.

لێى بەوەڵام هات: بەڕاستى مەردومگەلەكەم خۆش دەوێ.

پيرى دانا گوتى: لەبەر ئەوەى نوقمى خۆشەويستيى ئەو خەڵكە بووبووم بەگۆشەگيرى ڕووم لەم جەنگەڵە كرد، ئائێستاش خۆشەويستى يەكەم بەلاى خوادا باداوەتەوە، بەباوەڕى من مرۆڤ بوونەوەرێكى ناتەواوە، هەر كاتێ خۆشم بوێ خۆشەويستىيەكەى دەم كوژێ.

زارا وەڵامى دايەوە: ئێستا كێ باسى خۆشەويستيت بۆ دەكا! من تەنيا بۆ ئەوە دەربەستى خەڵكم، بە دياريىيەوە سروەيان پێ ببەخشم.

داناى قديس گوتى: نەكەى هيچيان پێ ببەخشى! بۆتۆ واخاسە لێيان وەربگرىو بارسووكيان بكەى، ئەمە بۆ ئەوان باشترە .. سەرەڕاى خەنى كردنى بەشى خۆت، لەو خێرو بێرە. ئەگەر ناچارى بەخشينيش بووى بالەپێشەوە داوات لێ بكەن ئەوجا خێريان پێ بكە.

زارا:-كەخۆم هێندە هەژار بوومو هەژارى يەكەم ڕێى دام ببمەخێرەومەند ئەوسا بەرات دەبەخشم.

قديس دايە قاقاو بەگاڵتەوە گوتى :

-كەواتە هەوڵ بدەو ڕازىيان بكە گەنجينەكانت لێ وەربگرن! ئەوان سڵ لەو كەسانە دەكەنەوە كەلەم جيهانىيانە دابڕاون.. ئيدى باوەڕناكەن ئێمەمانان بەراتيان پێ ببەخشين. كەبەسەر شەقام دا دەروێشێك شەقاو هەڵ بهێنێتەوە لەگوێى مەردومگەلەكەدا ترپەيەكى سير دەزرنگێتەوە! لەسەر خەوگاكانيان گرمۆڵە دەبنو بەپرسيارەوە دەچپێنن:-

دەبێ ئەو دزە بۆ كوێ خۆى كێش بكا؟!

نەكەى لەو خەڵكە نزيك ببيتەوە، لەم جەنگەڵەدا شوێنى خۆت بەجێ مەهێڵە، بۆ تۆ واباشە بگەڕێيتەوە بۆ مڵوموش لە- لەوەرگاى ئاژەڵەكان دا..گوايە ڕازى نابى تۆش وەك من ورچێك بى لەو ورچانەو پەلەوەرێك بى لەو باڵندانە؟!

زارا پرسی: ئەری کاری قدیس لەم جەنگەڵەدا چیە؟

قدیس:–من، سرروودان دەهۆنمەوەو دەیان لاوژێنم..لەحاڵێك دا ڕازی خۆم لەنێوان پێکەنین و گریان دا دەپێچمەوە خۆم بەشوکرانە بژێری خوا دەزانم، چونکە بە رازان و گریان و سرروود چڕین و خەنین ستایشی خوای پەروەردگارم دەکەم.. لەگەڵ ئەوەشڕا ئەدی ئەو دیاری یەی تۆ بۆمان دەهێنی چیە؟.

زارا بۆ قدیس دانەوی‌یەوەو گوتی:

–ئەرێ چیت بدەمی؟! وازم لێ بێرە، باخێرا لێت بتەکمەوە نەوەك شتێکت لێ وەربگرم. ئا بەم ڕەنگە وەك دوو ساوا بەپێکەنینەوە لێك ترازان.

کەزارا بەتەنێ مایەوە لەدڵی خۆی‌دا گوتی:

بەڕاستی شتێکی سەیرو سەمەرەیە! ئایە ئەم پیری جەنگەڵ نشینە بەخێری گیانی هێشتا نەی بیستووە کەئەو خوایە مردووە؟! [٣]

–٣–

لەکاتێکدا زارا گەیشتە نزیك شارێك لەجەنگەڵەکەوە دیتی ئەوا مەیدانی شار جمەی دێ لەخەڵك، تومەز لەوەوبەر جاڕیان ڕاهێشتووە کە پاڵەوانێك دادەبەزێ و گەمەو یاری دادەمەزرێنی زاراش لەنێو حەشامەتەکەدا ڕاوەستاو خوتبەی دا:

–من هاتووم هەواڵی ((مرۆڤی باڵا))تان پێ ڕابگەیەنم، مرۆی ئاسایی تەنیا بوونەوەرێکەو دەبێ بکەوینە سەررووییەوە..ئەی ئێوە چیتان ئامادە کردووە کەلێی وەپشت کەون؟

هەموو بوونەوەرێك شتێکی لەخۆی بەدی هێناوە کەلێی بالاترەو گەرەکتانە ببنە نزماوێك و تەگەرەبخەنە شالاوی گەورە شەپۆل لەخۆڕادان و کشاندا. لەباتی ئەوەی تەکان بدەن سەرووی مرۆڤ بکەون، مەیلتانە بۆ دۆخی ئاژەڵ بەرودووا ببنەوە. ئەرێ کە مەیموون هاوزای مرۆڤ بێ بۆی نابێتە مایەی شەرمەزاری؟

---

[٣] ئەمە هەنگاوی یەکەمە. لەمەولا دەزانین کەنێتشە بەگوتەی خۆی چ خوایەك دەمرێنی..یان دەبێ ئەم فەیلەسووفە بەرەو ڕووی چ خوایەك ببێتەوە کەلەنیهادی مرۆڤ دا بی دۆزێتەوە؟!

ف.ف=فلیکس

ڕێگەیەکتان گرتووە ئەمپەڕی کرمەڵانەو ئەوپەڕی مرۆگەلە، هەرچۆنێ بێ خۆتان بەزوربەی ئەو سیفەتانە ڕاگرتووە کە پڕاوپڕی کرمە زەمینەکانن.. لەڕابردووش دا لەتوخمی مەیموون بوون.. تائێستاش مرۆڤ لەمەیموونایەتی دا لەسەگسارو مەیموونەکان ڕەسەنترە!!

زۆرینەتان لەدانایی‌دا بریتی‌یە لەبوونەوەرێکی تێ چڕژاو کەناچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی ڕێك‌و ڕەوان..گیراوەیەکە لەڕووەك‌و تارمایی. داواناکەم مرۆڤ ببێتەوە تارمایی‌و ڕووەك. هاتووم بانگی مرۆڤی بالا-تان بەگوێ‌دا هەڵ دەدەم. چۆن واتا لەقەبارەو گوتەیە، مرۆڤی بالاش لەزەوی‌یە، کەواتە بەویستی خۆتان مرۆڤی بالا بکەنە واتاو گیانی ئەم زەمینە.

براینە! هانام هاوردووە: دڵ سۆزی یەکەی لەمەڕخۆتان بۆ زەوی بهێڵنەوە..بڕوا بەئەوانە مەکەن کەبەئومێد کردن‌و بەرتەمای هەڵ کشاو بۆ ژوور زەوی منەتبارتان دەکەن..ئەوانە مەحاڵ‌و نەشیاوتان بۆ پاساو دەدەن‌وبەژەهر دەتان سوونەوە.. ئەوجا لێی بزانن‌و لێی نەزانن ئەمە کردەوەیانەو ژیان لەبەرچاو دەخەن. ئەوانە ژەهریان لەهەناو گەڕاوەو لەگیانەلا دان.. زەوی یان پێوە شەکەت‌و ماندووە.. ئیدی بالەزەوی هەڵ کەنێن‌و سووکە بار بێ.

جاران گیان سوکانە سەیری لەشی دەکرد.

ئەوسا خۆ نازی‌یە نەبوو مەودا بەمەزنایەتیی ئەو سووکایەتی‌یە بدا. گیان بەئاواتی لەشێکەوە بوو لاژك‌و دزێوو برسی بێ، وای دەزانی بەو ئاواتمەندی یەوە لەو لاژکە لەشەو ئەو زەوی‌یەی بەسەر یشی‌دا دەجوڵێتەوە ئازاد دەبێ. ئەو گیانەش- بەچەشنی ئەوەی بۆ لاشەکەی دەخواست- ریوەڵەیەکی دزێوە. لاژگە گیان وادەزانێ کە ئەوپەڕی خۆشایەتی‌یەکەی لەستەم‌و سەخت گیریی خۆی‌دا پەنا داوە!

براینە! گوایە گیانتان هەروەك ئەو گیانە نیە؟ ئەی لەشەکانتان پێتان ڕاناگەیەنن کەبریتین لەپەڵۆخی‌و سەرشۆڕی..دیسان ئەو لەخۆ بایی بوونەشە کە سەرنج بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوە ڕادەکێشی؟

ئەم مرۆڤە بریتی‌یە لەخەوشە گۆلاوێك مەگەر کەسێك بووبێتە زەریایەکی بەرزە شەپۆل ئەوجا دەتوانی ڕێ بەتێڕژانی ئەو گۆلاوە بدات‌و پیسیش نەبێ.

فێربن کەمرۆڤی بالا کێ‌یە؟

هەر ئەو زەریایەیەو لەناخی دا سووکایەتی‌یەکانی تێدا دەخنکێنن.

ئایا بەتەمان بگەنە سەراسایەك لەو سەراسایە مەزنتر بێ؟![٤]

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە سووك بینی لەنێوتان دا گوڕبستێنی.. دوای ئەوەی کە نامووستان وەك هۆش‌و پەسندایەتی تان بەرەو چارە قورسی‌و نەفرەت هەڵ گەڕانەوە.

وەختی خۆتانە بڵێن: دەربەستی ئەو شەرەفەنین، تەنیا بریتی‌یە لەسەر شۆڕی‌و پەڵۆخی‌و قرمنی، لەکاتێك دا دەبێ ناموس پاکانەی خودی ژیان بکا.

وەختی خۆتانە هەریەکەو بڵێ: دەربایستی هێزە ژیری‌یەکانم نیم ئەگەر ورکی دانایی نەگرن شێرەکە برسی بێ..ئێستا ئەوانیش بریتین لە سەرشۆڕی‌و پەڵۆخی‌و قرمنی.

وەختی خۆتانە هەریەکەو بڵێ: دەربایستی داد وەریم نیم؛ دادوەر هەرپڕینچك دەهاوێژێ‌و هەڵ ناگیرسێ.

وەختی خۆتانە هەریەکەو بڵێ: دەربایستی میهرەبانی نیم؛ ئەدی بەزەیی هەر ئەو ((خاچ))ە نیە کەمرۆڤ دۆستی لەسەر چوارمێخە دەدرێ؟ لەگەڵ ئەوەش ڕا هێشتا میهرەبانی‌یەکەم بۆسەر ئەو خاچە هەڵی نەبڕیوم.

ئایە وێنەی ئەمەتان گوتووەو بانگەوازتان بۆ هەڵداوە؟.. خۆزی گوێم لێ دەبوون کەبەم نموونانەوە دەتان قوولاند!

ئەوەی بەسەر ئاسماندا دەقیڕێنێ بریتی‌یە لەلووت بەرزیتان نەك هەڵەکاریتان..بریتی‌یە لە هەتەربوونتان بەتایبەت لەسەر کارخراپیتان.

کوا ئەو کڵپەیەی زمانەتان بۆ دەهاوێژێ‌و پاکژتان دەکاتەوە..کوا ئەو شێتی‌یەی داتان دەگرێتەوە؟!

—ئا ئەوەتام هەواڵی مرۆڤی باڵاتان پێ ڕادەگەیەنم.

—هەر ئەو بڵێسەیەیەو هەر ئەو شێتایەتی‌یەیە.

---

[٤] سەراسا : المعجزە. هەندێ نووسەر ((پەرجوو))ی بۆبەکاردەهێنن. بەلامەوە ((سەراسا)) لێ یەوە نزیك بێ. ئالانی

هێشـتا زارا لـەدواندان نەوەسـتابوو، لـەنێو جەماوەرەکـەدا دەنگـێ بـەرزەوە بـوو گوتی:

((ئەوەی لـەبارەی پاڵەوانەکەوە بیستمان بەسمانە. کەواتە باخۆی دەرخـاو بێتـە بەرچاومان))

کەپۆڕەکە دایە هاڕەی پێکەنین و گاڵتەبە -زارا- ئەوجا پاڵەوان بـۆ یاریيـەکانی هاتە بەرەوە، لەو باوەڕەشدابوو کەبابەتی قسەو باسەکە هەر ئەو بووە!.

زارا بەحەپەساوە چاوێکی بەگرۆهەکەدا گێڕاو گوتی:

ئەم مرۆیە هەر ئەو شریتەیە کەلەنێوان گیانەوەرو مرۆڤی باڵادا ڕایەڵ کراوە..هەر تەنافەیە بەسەر زەندۆڵ و دۆزەخەدا شەتەك دراوە.

تـێ پـەڕبوون بـۆ ئاسـتی بەرانبـەر فەلاکەتـە..مانـەوە لەچـەقی ڕێگـادا مەترسی‌یە..لەئاوڕدانەوەدا بۆ دوواوە، لەپاش گەزبوونـەوەدا، لەهەموو وێستەیەك دا مەترسی‌یەو لەترسناکی‌دایە.

گەورایەتی مرۆڤ لەسەر ئەوە بەندە کەمرۆڤ بەردەبازەو ئامانج نیە، ئەوەی لەودا بەردڵ دەکەوێ هەر ئەوەیە کەڕێگەو ئاسۆیەکی ئاودیوە.

من ئەوانەم خۆش دەوێن کەلەژیان دا بێجگە لە نەمان ئامانجی دیکەیان نیەو بۆ ئەودیوی ژیـان تـێ دەپـەڕن. ئەوانـەم خۆش دەوێـن کەسووکایەتی‌یان مەزنـە چونکـە خۆیـان مـەزنن. ئـەو پەرسـتایانەم° خـۆش دەوێـت کـەوازو شـەوق وەك تـیری کـەوان فرتەیان پێدەکا بۆ بەری ئەوبەر ئەوانەم خۆش دەوێن لەودیو ئەستێرەکەوە دوای زانیاریی شتێك ناکەون کەبۆ نەمان بانگیان بکا یان بۆ خۆ بەخت کردن گاڵیـان بدا، چونکە خودی خۆیان بۆ زەوی دەکەنە قوربانی تاڕۆژێ لەڕۆژان ئەم زەوی‌یە دەبێتە میراتی مرۆڤی باڵا.

کەسێکم خۆش دەوێ بۆ فێربوون بژی‌و بەپەرۆشی زانیاری‌یەوە بێ تا لە دووای خۆی پیاوی باڵا بژی. ئەمە مەبەستی زانیارە لەئاوابوونی دا.

---

° پەرستا= عابد، متعبد: ئاوەڵناوی کارایە بەزرە ریژی زانین-زانا، توانین-توانا، خستمەکار. ئالانی

کەسی کاراو داهێنم خۆش دەوێ کەمەنزڵ بۆ مرۆڤی باڵا بنیاد بنێ و هەموو گیانەوەرو ڕووەکی سەر زەوی هەر بۆ ئەو ئامادەبکاو لەپێشوازی دا بێ..ئەمە مەبەستی زانیارە لەئاوابوونی‌دا.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کەپەسندایەتی لەلا ئازیزە پەسندایەتیشی بەرتەما بوون (گموح)ە، بۆ ئاوابوون کە تیرئاژنی ئارەزووەکانی‌یەتی.

ئەو کەسەم خۆش دەوێ کەلەگیانی خۆی پزیسکێك گل نەداتەوە بۆ نەفسی خۆی بەرەو ئەوە باداتەوە تاسەرپاکی خۆی دەکاتە گیانێك بۆ پەسندایەتی (فچیلە) خۆی. بەم ڕەنگە گیانی بەشارێ‌دا تێ دەپەڕێنێ.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کەپەسندایەتی خۆی ئارەزووەکانی پێك دەهێنێ بەم پەسندایەتی‌یە حەزی لەدرێژبوونەوەو کورت بوونەوەی ژیانی‌یەتی.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ نایەوێ گوژمەیەك پەسندایەتی هەبێ؛ چونکە لەو گوژمەیەدا ئەوەی لەیەك پەسندی‌دا هەیە پترە لەوەی کە لەدوو پەسندی دایە، تاکە پەسندی یەکیش) ئاڵقەیەکەو ژیانی تێدا پەیوەست دەبێ.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کەبەخشندەی گیانی‌یەتی و بەتەمای پاداش و سوپاس نی‌یەو داوای ناکاتەوە. هەمیشە بەخشەو بیر لەخۆمانەوە ناکا لەسەر زاتی خۆی.

ئەو کەسەم خۆش دەوێ کەلەکاتی مۆرە کەوتنی تاوڵەدا بۆ ماوە نیگایەك سەرمەزار دەبێ بەهۆی گزی دەستەوە دەکەوێتە گومانەوە. نموونەی ئەو کابرایەی وازی لە ئاوابوونە.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کەبەڵێنی ئاگرین دەداو پاشان کارەکەی لەبەڵێنەکەی تێ دەپەڕێ. نموونەی ئەم کابرایەش وازی لە ئاوابوونە.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کاری پاشینە پاساو دەداو بەرگری لەپێشینە دەکا چونکە بەو کارە خۆی بەتۆڵەی هاوتافی خۆی دەسپێرێ. ئەویش لەوانەیە کەوازیان لەئاوابوونە.

ئەوکەسەم خۆش دەوێ کەبەگلەیی‌یەوە جاڕی خۆشەویستی بۆ پەروەردگاری خۆی دەدا؛ کەواتە گەرەکە بەخەشمی ئەوپەروەردگارەی بەهیلاك چێ.

ئەو كەسەم خۆش دەوێ كەسوێ دەگا بەبرينى ناخى گيانى؛ ئەوسا بەسووكە ڕووداوێك لەنێو دەچێ.. نموونەكانى ئەميش بەبێ دڕدۆنگى بەسەر سيڕاتا گوزەر دەكەن.

ئەوكەسەم خۆش دەوێ كەنەفسى سەردەكاو لەخۆى بێ ئاگادەبێ. ئەوجا بەهەموو شتێك هەمە گێر دەبێ و لەنێوىدا دادەوەشێ و تێدادەچێ.

ئەوكەسەم خۆش دەوێ هۆشى ئازادەو دڵى ئازادە.. بەو ڕادەيەى مێشكى دەبێتە هەناوى دڵى.. دڵيشى بەرەو نەمان پاڵى پێوە دەنێ.

ئەوانەم خۆش دەوێن كەلەو دڵۆپە قورسانە دەچن پەيتا پەيتا لەو هەورە ڕەشانەوە دادەبارن كەبەسەر خەڵكەوە بەخش بوونەتەوەو پێش هەواڵى چەخماخە ئەدەن و نەديو دەبن. منم بەهەورە تريشقە باخەبەرتان دەكەم..منم ئەو دڵۆپەى لەگشت پۆشەوە دابەزيوە. ئەو هەورە تريشقەيەى بەموژدەوە پێتان ڕادەگەيەنم بريتىيە لەمرۆڤى باڵا.

## ٥

پاش ئەوەى زارا ئەو قسانەى بۆ مەردووم گەلەكە كردن چاوى پێداگێڕانەوەو كڕومات بوو. لەدڵى خۆىدا گوتى:

پێكەنين گرتوونى ..ئەوەى دەيبێژم تێى ناگەن! خۆ ئەو دەنگەش نيم شايەنى ئەو گوێ يانەبێ.

ئايە دەكرێ گوێچكەيان بئاخنم تاخۆيان بەچاو بيستن ڕادەهێنن؟ يان پێويستە وەك ئامۆژگارەكان چۆن سەرنج بۆ ڕۆژووەوان لێ دەدەن منيش بەوتەرزە بىكەمە شيخەو هوريا؟!

دەبێ ئەوخەڵكە شتێكيان هەبێ شانازى پێوەبكەن.. دەبێ ئەو مايە شانازىيەيان چى بێ؟!.

ديارە ئەو شتە بە(شارستانێت) ناودێر دەكەن؛ تاوەكو خۆيانى پێ لەشوانە وێڵەكان هەڵاوێرن.. هەر لەبەر ئەوەيە كاتێ لەميانى قسەم لەگەڵيان دا بێژەى

سووکایەتیم بەگوێدا دان لێی دەسڵەمنەوەو نەبان دەبن؛ کەواتە لەمەودووا باسی ئاغری و لەخۆبایی بوونیان بۆ دەکەم!

ئیدی لەبارەی سوکترین بوونەوەرەوە..لەبارەی دووا مرۆڤەوە قسەیان بۆ دەکەم، ڕووی لەجەماوەر کردوو گوتی: مرۆڤ سەرەی ئەوەی هاتووە–ئامانجێك بگرێتە بەرچاوی خۆی. کەزەوی پاشماوە زەخیرەیەکی هەبێ وەختی ئەوەیەتی شتێ دابچێنێ کەبەرزترینی حەزەکانی لێ سەوزببێ..ڕۆژێك دێتە پێشەوە ئەو زەخیرەیەش نەمێنێ و زەوی تووشی نەهاتی و قاتی یەك ببێ هیچ گەورە درەختێك نەتوانێ بەسەریەوە خۆی ڕابدا.

وای بۆ خۆمان! ئەو کاتانە نزیك بوونەتەوە کە– کەوان تەڕن بەتیر بکاو ژێیەکانی خاو ببنەوە، مرۆڤیش نەتوانێ تیری حەزو وازی خۆی بەرەو ژوور بکاتەوەو بەسەر ئادەمی یەتەوە سووڕبخواتەوە.

ڕاستی دەبێژم: ئەستێرەی درەخشان لەمرۆڤەوە دەرناچێ بۆ جیهان لەکاتێك دا ئەو سەدیمەی تێیدا ماوەتەوە بەرەو نەمانە.. لەگەڵ ئەوەش ڕا ئەو سەدیمەتان هەر تێدا ماوە.

وای بۆ خۆمان!

ئەو کات و ساتە هاتە بەرەوە کەمرۆڤ هەرگیز نەتوانێ بەرەو جیهان پاڵ بەئەستێرەکانەوە بنێ.

وای بۆ خۆمان!

زەمانی مرۆڤی سووك نزیك بۆتەوە، کەخۆداری دەکا لەخۆ ڕیسوا کردن دا.

گوێ بگرن! ئەوەمنم کەلەبارەی دووا مەردومەوە باخەبەرتان دەکەم. بێت و کەسێ بوەستێ و لەبەرخۆیەوە بپرسێ نازانێ:

ئەوە خۆشەویستی یە یان داهێنانە.. ئەوە حەزو ئارەزوویە یان پرتەوی ئەستێرەیە؟!

لەو زەمانەدا دێت و زەوی گچکە دەبێتەوە، ئەو دووا مەردومەی دەبێتە ژیوارێك بۆ دەورو بەرەکەی لەبان زەویەکەوە بازدەدا وەجاخی ئەو مەردوومە بنەبڕ نابی.. وەجاخێکەو لەکێچ دەچێ، دوا مرۆڤیش تەمەن درێژتری ئادەمیزادە

خەڵکی دووا زەمان بەچاولێك داگرتنەوە دەڵێن: بەڕاستی ئێمە بەختیاریمان داهێنا.. بەڵا بەختیاری!

ئەو گرۆهە لەو شوێنانەی ژیانیان تێدا سەختە ڕەویان کرد چونکە هەستیان بەپێویستی گەرمایی کرد..وایان پێ هات هەریەکەو خۆی لەهاوسێکەی بخشێنێ.. هەمووشیان پێویستیان بەگەرمەوەبوونە.

ئەوان بە وریایی خۆیان لەژیانەوە دەگلێنن.. چونکە لەچاوی ئەوان ڕا ترس و نەخۆشی هەڵەیە، کامیان لە بەردو مەردوم هەڵەنگوێ لەدەست شێت بوون قوتاری نابێ.

ئەوان لەپێناو پەناگەی خەونەکان دا لەهەرکوێیەك بێ کەمە ژەهرێك پەیدا دەکەن و لەپێناو خۆشایەتی مەرگیش دا یەك ژەم بەشی خۆیانی لێ هەڵ دەمژن.

ئەگەر ئەو کارەشیان بەجێ هێنا تەنیا بۆ دڵ دانەوەو گوزەراندنە خۆشیان لەوە دەپارێزن نەوەك ئەو دڵ دانەوەیە بیان گەیەنێتە سنووری خۆشەکەت کردن.

کەسێکیان تێدا نیە ببێتە دەوڵەمەند[٦] یان ببێتە هەژار، چ دەوڵەندیو چ هەژاری مایەی داهێزان و بێ هێزین، نیشانەی بەرتەمای فەرمانداری بێ یان بەنۆکەری ڕازی بێ..هەردووکیشیان شلوق و سەغڵەتکارن.

لەوێ تاقە شوانێك لەگۆڕێ نیە، هەرچی هەیە تاقەمێگەلێکە هەرکامێك لەوانە بەرەوڕووی یەك ئارەزوویە. کەواتە یەکسانی لەنێو هەمووان دا بەرکەماڵە. کەسێکیش هەستی لەگەڵ هەستی کۆمەڵ داجودابێ ئەوا بەکەیفی خۆی بەرەو شێتخانە مل دەنێ.

مەکر بازەکانی ئەو خەڵکە بەچاو لێ داگرتنەوە دەڵێن کاتی خۆی گشتیان شێت بوون، ئەم گرۆیە لەبەر ئەوەی کەپەندی خۆیان وەرگرتووە بەتەواوی زرنگن.. بەگاڵتەو لاقرتێوە بەرەو ڕووی قەوماوەکان دەبنەوە، ئەگەر ناکۆکی یان لێ پەیدا بوو بەناوی ئاشت بوونەوە کۆتایی پێ دەهێنن..ئەم خۆپارێزییەشیان لەبەرخاتری گەدەیانە نەبەشکم نەخۆش کەوێ و بەلای لێدا.

ئەو خەڵکەی ئەوێ گوژمەیەکی کەشیان هەڵ گرتووە بۆ شەوانە.. بەڵام لەپێشەوە بەتەنگ تەندروستی خۆیانەوەن.

((بەختیاریمان داهێناوە..بەختیاری!)) ئەمەیە کەبە چاوداگرتنەوە گەلەمەردومی دوا ڕۆژ دەی بێژێ.

---

[٦] یان کەسێکیان تێدانیە بەیانیان بەدەوڵەمەندی یان ئێواران بەهەژاری بباتە سەر.

ئالێرەدا زارا دووایی بەگوتارەکەی هاورد، یان بڵێین ئەمە سەرەتای خوتبەکەی بوو. ئەوجا قوولەو قریوەی حەشامەت ئەوناوەی کەڕ کرد کەدەیان گوت:

((هۆ کابرا! ئەو پیاوەی لەمەڕ دووابیمان پیشان بدەو بەچەشنی ئەو بمانکە بە خەڵکی دوا زەمانە..ئیدی با مرۆڤی باڵاش هەر بۆ تۆبێ و ئێمە نەمان گەرەکە))

بەڵام زارا بەمۆنی لەبەردەم حەشامەتێك دایە کەئەو جۆرە گیانە باڵی بەسەردا کێشاوە ماتەمینی دای گرت و لەدڵی خۆیدا گوتی:

بەڕاستی ئەوانە لەقسەی من ناگەن.. ئەو دەنگەش نیم کەئەو گوێ یانە پیێان خۆش بێ!))

لەمێژە لەو کەژانەدا ژیانم بەسەر بردووە، لەو مەودایەدا گوێم ڕاهاتووی ووشەی دەرەختەکان و هاژەی کانیاوەکان بووە.. ئێستاش کە قسە بۆ ئەم خەڵکە دەکەم وەك ئەوە وایە شوانە بزنان بدوێنم!

هەر وەك پۆپەی چیاکان سەرپۆشیان سپێدەی بەیانە گیانە بێ گەردەکەی منیش نوور پۆشە .. بەڵام وام هەست پێ دەکەن تویێی دڵم سەهۆڵبەندانە.. وادەزانن لێبووکێکم و گەپی دڵ تەزێنم بۆ هاوردوون.

ئەوانە چاوم تێدەبڕن و دەتریقێنەوە..لێگەڕێ! لەدڵیان دا شۆڕشی قینەو بەسەرلێویانەوە بزەی بەفرینە!!

## ٦

ڕووداوێك گشتی دەم بەست کردن و چاوەکانیانی پێ زیت بوونەوە، ئەوەبوو کە پاڵەوانەکە دەستی بەیاری کرد: لەدەلاقەوە دەرپەڕی و بەسەر ئەو تەنافەدا دەستی بەڕۆیشتن کرد کەلەنێوان دوو بوارو=بورج دا ڕایەڵ کرابوو بەسەر ئەو مەیدانەو سەیران کەران دا دەی ڕوانی. هێمان نەگەیشتبووە نێو قەدی تەنافەکە بۆ جاری دووەم دەلاقەکە کرایەوەو لاوێکی لێ دەرچوو، وەك لێبووکان خۆی لێ ڕەنگاندبوو، پێ بەپێ دوای پاڵەوانە کەوت و دەی قێڕاند:

-ها-شەلە! بۆ پێشەوە..هۆ-تەمەڵ! بۆ پێشەوە.. دەی- ریابازی دەمووچاو مۆن! تێ تەقێنە تالینگە کەوشەکانم لەتەکت دا نەکەوتوونەتە گەمە. ئەی ئەگەر وانیە

لەنێوان ئەو دوو بورجەدا کارت چییە؟.. ئەی نازانی لەنێو ئەو بورجەدا[٧] بەشت زیندانە؟.. هۆ–کابرا! ئەوە ڕێگا لەو کەسە دەبەستێت کە لەتۆ باڵاترە؟!

کوڕە لاوەکەو تاقسەیەکی بکردایە هەنگاوێکی دی دەهاتە بەرەوە، تاهێندەی باڵێکی مابوو بگاتە پاڵەوانەکە. ئەوجا کارەسات بەرپابوو، دەمی هەمووانی دادروو، چاویان زەق بوونەوە. هێندەی پێ نەچوو کوڕەکە وەك جنۆکە قیژاندیو بەسەر تەگەری ڕێگاکەدا بازێکی دا. کەپاڵەوانەکە زانی مێملەکەیسەرکەوتووە، لەگێژەوەهاتو قاچی لەتەناف ترازاو ئەو چڵە ڕانگەیەی لەنگەری پێ ڕادەگرت لەدەستی کەوتە خواریو کابراش لەحەواوە بەربووەو چوارپەلی لەبڵندانییەوە چەخەیان دەکرد.

وەك دەریایەك زریانی لێ هەڵ بکا ئەوحەشامەتە شەپۆلی دایەوە..خێرا بەدووادا تێکیان کردەوە..لەو شوێنەدا کەلاشەکەی بۆ دەهاتە خواری ڕەوینەوە.

..بەڵام زارا جووڵەی بۆ نەکردو لاشە لەبەردەمیدا کەوت بە زەویداو تێك شکا. بریندارەکە جاریێ گیانی تێدا مابوو ..ئەوەندەی نەخایاند هۆشێکی پێدا هاتو دیتی: ئەوا زارا لەپەنایەوە هەڵ کورماوە، سەرێکی هەڵ بڕیو گوتی:

ئەوە چ دەکەی لێرە؟.. دەم زانی کەڕۆژێ لەرۆژان شەیتان شەقاوم تێك با هەڵ ئەداو هەڵم ئەدێرێ، ئەوەتا ئێستاش بۆ دۆزەخەکەی خۆی کێشم دەکا؛ گوایە تۆش گەرەکتە ڕێگای لێ بگری؟!

زارا گوتی:

هاوڕێم! بەناموسم ئەوەی تۆ دەی ڵێی نە بووەو نە هەیە. نەشیتان هەیەو نەدۆزەخ هەیە؛ ئیدی گیانەکەت خێراتر لە لەشەکەت دەمرێو دەبرێتەوە؛ کەواتە لەئێستا بەولاوە لەهیچ مەسێ.

کابراکە بەگومانەوە چاوێکی هەڵ بڕیو گوتی:

بێتو ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بێ ئەوا لەگەڵ گیان دەرچوونم دا هیچ شتێکم لەکیس ناچێ. کەواتە بریتی بووم لەئاژەڵێكو بەتێهەڵدان هەڵ پەڕیومو لەوەڕی چاکیشم خواردووە.

---

[٧] وشەی ((برج)) لەبنچ دا ((بورگ))ەو لەباڵەخانەکانی گوندییانی دێرینمانەوە سەری هەڵداوەو بەرەو ئەوروپاش ڕەوی کردووە. لەبەعەرەبی کردنیدا فۆنێمی (گ) کراوەتە (ج). ئالانی

زارا پێی گوت:

نەخێر کارەکە وەهانیە کەتۆ دەی ڵێی بەڵکو– خۆفرێدانە مەترسی–ت کردووەتە پیشە، ئەمەش نابێتە مایەی نەنگی، پیشەی ئێستاشت هەر ئەوەیە کەنەمێنی. ئەوجا لەبەر خاتری ئەوە بەدەستەکانی خۆم دەت نێژم. چونکە لەگیانەڵادابوو متەقی بۆ نەکرا، ئەوە نەبێ کەدەستی بزاوت بیخاتە لەپی زاراوە تا بەسوپاس گوزارییەوە ماڵاوایی بکا.

## ٧

ئێوارە پەردەی تاریکی بەسەر مەیدانەکەدا بەردایەوە ئەو سەیرانچیانەی بەهۆی خۆ تێ هەڵ قوتانو ترسەوە هەراسان بوو بوون بڵاوەیان لێ کردو زاراش بەتەنێ بەدیار مردووەکەوە لەسەر زەوی لێی دانیشت لەبیرکردنەوەی خۆیدا ڕۆچوو.. نەی زانی کات چەندی لێ تێ پەڕیوە تا کزەبای شەو لێی هەڵ کردو لەگەڵ خۆیدا کەوتە رازان:

ئەی زارا! لەڕاوی ئەمڕۆکەت دا سەرکەوتوو بووی، ئەوا خەڵکو خوات لەدەست چوو.. بەڵام لاشەیەکی ساردەوە بووت کردە نێچیری خۆت.

ژیانی مرۆڤ گیرخواردەی مەترسیو ئەنگیزە..لەژوور ئەوەش ڕا هەر بێ مانایەو هەڵخەرەوەیەك دەتوانێ ئەو ژیانە لەنێوببا.

دەمەوێ خەڵکی فێرە واتای هەبوونیان بکەم؛ تاتێ بگەن مرۆڤی باڵا چەخماخەی پرتەوە لەهەورە ڕەشەکانەوە: لەمرۆڤەوە. بەڵام هەر لەو خەڵکەوە بەدوورمو بیریشم لەزەینی ئەوانەوە هەردوورە.. ئێستاش من چەقی مەودایەکم لەنێوان شێتێكو لاشەیەکی بێ گیان دا.

شەو ئەنگوستە چاوە..دیسان ڕێگای زاراش تاریکە. ئەی هاوڕێی وشك هەڵاتو لەشەختەی خۆت دا! ئەوا بۆ شوێنێکت دەبەم کەبەدەستی خۆم وەت شێرم.

## ٨

زارا تەرمەکەی گرت بەشانەوەو ڕۆیشت.. هێشتا سەد هەنگاوێکی نەبڕی بوو کابرایەك تەنگی پێ هەڵ چنی، تومەز یارۆی هەڵخەرەوەی بورجەکەبوو، بەگوێیدا چپاند:

-زارا! ئەم شارە بەجێ بهێڵە؛ خەڵکەکەی بەزۆری لێت بەداخن: دادوەران پیاو خاسانی لەمەڕ ئێرە رقیان لێتەو بەچاوی دوژمن و قێزەون دەت نۆڕنێ. ئیماندارەکانیش لێت بەقینن دەڵێن تۆ مایەی مەترسی بۆ دڵو دەروونی ئەم جەماوەرە ڕەشۆکی یە. بەختت هەبوو کە مرۆگەلەکە گاڵتەیان پێ دەکردی چونکە وەك لێبووکان قسەت بۆدەکردن، لەوەش دا کەبوویتە هاوبەشی ئەم سەگە تۆپیوە هەر بەختەوەری. ئەوا ئەم جارەیان کەخۆت لەقەرەی ئەم دۆزەخەدا- ڕزگارت بوو.. بەڵام هەرگیز بۆ جاری دووەم قوتار نابی، کەواتە ئەم شارە بەجێ بهێڵە دەنا سبەینێش بەسەر لاشەیەکی دیکەدا بازدەدەمەوە.

کابرا ئەوەی گوت و لەبەرچاو گوم بوو، زاراش بە شەقامی تاریك دا هەنگاوی هەڵدەهێنایەوە. کەگەیشتە دەروازەی شار لووتی بوو بەگۆڕ هەڵکەنەکانەوەو تیشکی چراکانیان تێ گرت، هەر کەزانی یان ئەوە زارایە پڕ گاڵتەو بەزمیان کردو گوتیان:

ئای-ماندوو نەبی زارا! ئێستا بوویتە گۆڕهەڵکەن. کارێ چاکت کردووە کەئەو سەگە تۆپیوەت گرتووە بەکۆڵتەوە.. نەوەك دەستە پاکیزەکانی ئێمە بەر ئەو مندارەوە بووە بکەون و گلاوبن.

ئەرێ زارا! ئەوە گەرەکتە خواردن لەبەردەمی شەیتان هەڵ گری؟ بی‌خۆ، نۆشی گیانت بێ..بەڵام شەیتان لەتۆ کارامەترە..لەوانەیە هەردووکتان بدزێ و داتان پاچێ و لرفتان بدا.

گۆڕ هەڵکەنەکان بەتێ هەڵڕوانینەوە دەوری زارایان دا ئەویش کڕومات بەرێی خۆیدا ڕۆیشت، دووای ئەوەی بۆ ماوەی دوو سەعات بەنێو بێشەڵاندا تێپەڕی و گەلە گورگی برسی دایانە چەقولوور، ئەوەندەی کە هەستی برسێتیەکەی جووڵا! لەبەردەمی تاقەماڵەیەك دا کەلەدەلاقەکانیەوە تروسکایی بەدی دەکرا-ڕاوەستاو گوتی: ((برسێتی گەزتوومی، وەك دزی نێو دڕك و داڵ لەشەوەزەنگ دا ئامبازم بووە.

برسێتی من هەوەس ئارایەکی سەمەرەیە؛ جار هەیە دوای نان خواردن یەخەم دەگرێ.. بەڵام ئەمڕۆ هەر لەبەیانییەوە تائێوارە لێم تەکیوەتەوە نازانم تائێستا ئەو برسێتییەم لەکوێ بووە؟!)) کەزارا لەدەرگای ماڵەکەی دا، پیرێکی چراوگ بەدەستی لێهاتە دەرێو گوتی : کێیە واهاتووە بۆلای منو ئارامگای بێ ئۆقرەم؟!.

زارا وەڵامی دایەوە:- ئێمە دوانین؛ زیندوێکو مردوویەك هاتووین خواردنو خواردنەوەمان بدەیتێ. بەدرێژایی ئەمڕۆ خۆراکم فەرامۆش کردووە. ئەوکەسەی برسیانیش تێربکائەوا هێزێکیش بەبەرخۆی دا دەهێنێتەوە، نەك من گوتەنی پەندیش هەر ئاوای گوتووە. پیرە دیار نەماو دواتر بەنانو شەرابەوە گەڕایەوەو گوتی:

بۆ برسیەکان ئێرە فرە چۆڵەوانییە، بۆیە لێرە سەقام گیر بووم بەتەنێم تا ئادەمیو گیانەوەر ڕابکەنەلام. ئەدی فەرمووی هاوڕێکەت ناکەی لەتەکتا شێو بکا؟ وادیارە ئەو لەتۆ ماندوو ترە!

زارا گوتی:- هاوڕێکەم تەرمێکەو بۆمن کارێکی ئاسان نیە بی هێنمەوە سەر ڕەدای خواردن.

پیرە دای بەیەك دا:

ئەوە بەلای منەوە گرنگ نیە. ئەوەی لەدەرگای ماڵم دەدا چی بدەمێ دەشێ وەری بگری. دەی بەنۆشتان بێ بی خۆن !

زارا ملی ڕێگای گرتەوەو دووسەعاتێکی کەش ڕۆیشت. چونکە ڕاهاتووی شەو ڕەوی بوو لەبەر تروسکەی ئەستێرەکان دا جەمسەری ڕێگای بەرنەدا.. ڕاهاتووی ئەوەیە چی بەلاوە باش بێ تەواو زەینی بداتێ.

لەبەرەبەیان دا زارا گەیشتە دارستانێکی چڕی زەبەنگو جەمسەرە ڕێگاکانی بەردەمی لێ بزربوون، ڕاوەستا. ئەوجا بۆ ئەوەی لاشەکە لەپەلاماری گورگان بپارێزێ ترنجاندییە کلۆرە دارێکی هێندەی بالاّی خۆی.

دوواتر لێی هەڵاژیاو برێ پەلاّشی کردە سەرینو ئەوەندەی نەخایاند بەلەش ماندوێتیو دڵ ئارامییەوە لەپرخەی خەودا نوقم بوو.

# ٩

خەوەکـەی زارا درێـژەی کێشـا دووای ئـەوەی کەسـپێدەی بـەیان ختووکـەی داو ڕووناکی چەشـتەنگاو بەسـەر دەمو چـاوی‌دا بـاڵی کێشـا بەگەشـکەیەکەوە چـاوی کردەوەو بەدارستانەکەیدا ڕوانی. پاشان بەهێمنی و سەر سـوڕمانەوە بـۆ پـەیدۆزی زاتی خۆی چاوەکانی بەخۆی‌دا گێڕان.

چۆن کەشتیوانێ زەوی لێ دوردەکەوێ‌ورادەپەڕێ زاراش خێرا ڕاپەڕی لەخۆشـی یانا هاتـە هـەژان قریواندی؛ ئەمـەش لەبەرئـەوەبوو ڕاسـتیەکی تـازەی بـۆ دەرکـەوت، ئەوجا لەگەڵ دڵەکەیدا کەوتە دوان:-

-ئەوا چاوم کرانەوە؛ ئیدی پێویستم بەزیندە هەڤاڵەو چ کارم بەمردە هەڤاڵ نیـەو نەهاتوم ئەوان بگرم بەکۆڵمەوە جا بۆهەرلایەك بێ. دەمەوێ ئەو زیندە هەڤاڵانە شوێنم بکەون کەڕوو بکەمە هەرلایەك یاوەری زاتی خۆیان بن. ئەوا چاوم کرانەوە. شایستی زارا نیە لەتەك کۆمەڵاندا بدوێ.. بەڵکو لەسەریەتی قسە لەگەڵ هەڤاڵان دا بکاو بەس. پێ ویستە زارا نەشوانی گەلە بێ‌و نەسەگی گەلەش بێ.

من هەر بۆ ئەوە هاتووم کە بەرخـەلێك لەمێگـەلێك هـەڵاوێرم، دوواتریـش گـەل‌و مێگەل لێم یاخی دەبن! زارا دەیەوێ چۆن شوانەکان مامەڵەت لەتەك دزان دا دەکەن لەگەڵ ئەمیش دا ئاوا ڕەفتار بکەن.

گوتم: شوانە وێڵەکان .. بەڵام ئـەوان بەخاسـەپیاوان‌و داد پـەروەران نـاودەبرێن، گوتم: شوانە وێڵەکان.. بەڵام ئەوان بەئیمانداری دینی ڕاستینە ناودەبرێن.

سـەرنجی چاکـە خـوازان‌و داد پەرسـتان بـدەن تـابزان کـەبێ ڕەزاتریـن دوژمنیـان کێیە.. کەسێکە ئەو لەوحانە دەشکێنێ کەئەوان یاسایان لەسەر هـەڵ کۆڵیوون. ئەو لەوح شکێنە کاول کەرە .. تاوانکارە.. بەڵام هەر ئەویش داهێنە.

سـەرنجی خـاوەنی هـەموو بیروباوەڕەکـان بـدەن تـابزانن بـێ ڕەزاتریـن دوژمنیـان کێیە؟.. کەسێك ئـەو لەوحانـە دەشکێنێ کەیاسـاکانیان لەسـەر هەڵکـەندوون.. هـەر ئەوە ڕووخێنەر..هەر ئەوە تاوانکار.. هەر ئەویش داهێنە.

هەڤاڵەكان! بگەنە لام. دەمەوێ داهێن بن.. ئەم گەرەكە چەند لاشەیەكو چەند گەلەیەكو چەند ئیمانداریێك بن داهێن ئەوانە دەكاتە هەڤاڵ كە خۆی ئاسا داهێن بن ئەوانەیان وەردەگرێ كە یاسای نوێ لەسەر لەوحی نوێ هەڵ دەكۆڵن

ئەوەی ئەبداڵو داخوازی داهێنو خوڵقێنەرە، ئەو درویێنەوانانەن كە لەدرەوەدا یارمەتی ئەدەن. لەچاوی ئەودا هەموو شتێكی گەیو بۆ دەرەوە.. بەلاّم یارۆ سەد– داسەكەی لەبەردەست دا نیە بۆیە بەخشەمەوە گوڵە گەنمەكان ریشەكەن دەكا. داهێن ئەو هەڤاڵانەی دەوێت كە بۆ بەرەی درویێنە داسەكانیان باش تیژ دەكەنەوە، دوواتریش خەڵكو خوا پێیان دەڵێن: ڕووخێنەرەكان..گاڵتەچیەكانی چاكەو خراپە– بەلاّم هەر ئەوانیشن كەدەبنە پاڵەو ئاهەنگسازی جەژن.

زارا ئەوانەی دەوێن كەوەك خۆی خوڵقێنەرنو لە درویێنەو حەسانەوەدا هاوبەشی دەكەن. ئیدی حەوێجەی بەگەلەو شوانە وێڵەو پاشماوەی لاشە مردووان نیە.

تۆش ئەی هاوڕێی یەكەم جارم بەئاسوودە لێی ڕاكشێ بەڕاستی لەخۆم دێ كەبەكلۆرە دارم سپاردیو بەگورگان خواردووم نەدای. لەبەر ئەوەی كات بەتیژی تێپەڕی ئەوا لێت جیادەبمەوە راستیەكی تازە شالەنەفسی منەوەو لە نێوان دووشەفەقەوە دەركەوت.

هەرگیز نابمە شوانو نابمە گۆڕ هەڵكەن، لەمەولاش لەنێوان كۆمەلاّندا ڕاناوەستمو نابمە خوتبە خوێن. دووایین گوتاریشم ئاراستەی مردوویەك كرد.

دەمەوێ پاڵ دەمەوە لای داهێنانەكان.. لای ئەوانەی درەودەكەنو دەحەسێنەوە. ئەوسا پەلكەزێڕینەیان پیشان دەدەم..دەمەوێ ئەو پلەو پایەیان بخەمە بەرچاو، كە ڕێبواری مرۆڤایەتی بالاّیان پێدا هەڵدەكشێ، بۆ ئەوانەی بەركەنارنو بۆ ئەوانەی لەتاكایەتی یان دا واهەست بەدوانەتی ((المثنویە)) دەكەن سروودی خۆمیان بۆ دەچڕم ئیدی لەمەو لا بەهیوا خۆشی خۆم دڵی كەسێ پڕ دەكەم كە جووتە گوێی بداتە شتێ هێمان هیچ گوێچكەیەك نەی ژنەفتبێ، من ڕێگەی خۆم دەگرمو بۆ ئامانجی خۆم دەڕۆم، ئەوسا بەسەر دوواكەووتووەكانو دوودڵەكان دا بازدەدەم. هەر ئاوا ڕەوتی من بەرەو ئاوابوون دەبێتەوە.

١٠

هەروەها زارا بەدەم ئەو گوتەیەوە کەوتبووە ڕازو خۆریش لە ئاوابوون دا بوو، خێرا دەنگێکی تیژ لە بۆشایی ئاسمانەوە گوێی سمی، تومەز هەڵۆیەکەو بەحەواوە چەرخان دەکاو ئاشقەمارێکی پێوە هەڵۆسکاوە، وەنەبێ وەك نێچیر بەچنگ دای هاتبێتێ بەڵکو مارەکە وەك دڵدار لەگەردنی دولبەرەکەی ئالأبوو:

زارا فرە بەدڵ خۆشی‌یەوە قریواندی:

ئەمانە هەڵۆی خۆمو ئاشقە ماری خۆمن، هەڵۆ لەهەموو گیاندارێك شکۆدار ترەو کەڵەماریش لەژێر گەرمای خۆردا مەکرۆی جانەوەرانە.. هەردووکیان بەئاسمان دا دێنو دەچن تابزانن زارا لەژیان دا ماوە، منیش لەخۆم دەپرسم:

دەبێ ئێستاش هەر زیندوویم؟!

لەنێو گیانەوەران دا ئەو مەترسی یانەم بەخۆوە نەدیون کەلەنێو ئادەمیزاد دا تووشی هاتوون. ئیدی من ڕێگای مەترسی دەگرم.. کەواتە باپەیڕەوی هەڵۆکەمو ئاشقەمارەکەم بکەم.

زارا قدیسە ڕەبەنەکەی نێو نزارەکەی هاتەوە بەبیردا پشوویەکی داو گوتی:

ئەوجا زۆر دانا دەبم.. ئەوجا وەك ئاشقە مارەکەم مەکراوی دەبم. لەسەرێکی کەشەوە داوای سەراساو مەحاڵ دەکەم. لەبەر ئەوە تکا لەشانازیی خۆم دەکەم کەببێتە یاوەری دانایيمو هەرگیز لێی جیا نەبێتەوە. هەر ڕۆژێ دانایيم لێ تۆرا کەداخەکەم وازی لەهەڵ فڕینە– تکا لەو شانازی‌یەم دەکەم لەگەڵ شێتیم دا بفڕی.

زارا ئاوا بەرەو ئاوابوونە

## خوتبەکانی زارا
## وەرچەرخان لەسێ قۆناخ دا

ئیدی باسی وەرچەرخان و گۆڕانی هۆشتان بۆ دەکەم لەسێ قۆناخەکەی دا.. خەبەرتان دەدەمێ کەچۆن هۆش بووەتە حوشترو حوشتریش بووەتە شێرو شێریش هەڵگەڕاوەتەوەو بووەتە ڕۆڵەیەك.

ئەو هۆشە سەختەی کە جلوەگای سەنگینی‌یە چەند بارگرانە! سەختایەتی هۆش وازی لەکۆڵی قورسە.. بەڵکو وازی لەقورسترین بارە.

هۆشی ساخ ئەودالی قورسترین بارە، وەك حوشتر پیخ دەخوا بۆ بەرزەوە کردنەوەی چاکترین بار کە بخرێتە بان پشتی هۆشی ساخ بانگی پاڵەوان دەکاو دەڵێ:

چ بارێك قورسە تا هەڵی برم و هێزو توانمی پێ بەکەیف بێ؟! ئەدی بۆ سزادانی (بایی بوون) بێ نموودی قورسترین بارینە؟.. ئەی قورسەباری ئەوەنیە کە مرۆڤ خۆی شلووق بکا تا شێتایەتی یەکەی بەدانایەتی‌یەکەی دەربکەوێ؟!

ئەی قورسترین بار ئەوە نیە کەمرۆڤ لەئاستی سەرکەوتنی مەبەستەکەی‌دا وازی لێ بهێنێ.. یان لەپێدا بەرز بوونەوەی لووتکەی شاخاندا بۆ لووت دانی کەسێ کە ڕووبەڕووت بوەستێ؟!

یان قورسترین کۆڵ ئەوەیە کەمرۆ لەبەری پیرەدارو گژوگیا خۆراك وەربگرێ و لەپێناو ڕاستی‌دا بەرگەی برسێتی بگرێ؟ یان قورسترین بار ئەوەیە نەخۆش خۆی ڕابگرێ و ئەوانەی بۆ دڵ دانەوەی هاتوونەتە لای دەریان بکا؟

یان قسە بۆ ئەو کەڕانە بکا هیچی لێ‌نەبیەن و ئەوەی تۆش مەبەستتە ئەوان تێی نەگەن ؟

یان قورسترین کۆڵ ئەوەیە کە ((ڕاستی)) لە بنی پیساوێکدا بێ و مرۆ خۆی بۆ تێ فڕێ بداو ڕازی بێ خۆی هەڵ بسوێ لەو بۆقە لینجانەو ئەو دووپشکانەی ژارو زووخیان لێ دەتکێ ؟!

یان بارگرانی ئەوەیە ، ئەو کەسەی خۆشمان بوێ سووکمان بکا .. یان ئەو تارمایی‌یە بێ لە کاتێك دا دەستی تەوقەی بۆ درێژ بکەین ترس و لەرزمان بخاتە دڵەوە ؟

هۆشی ساخ بردەباری ئەو هەموو کۆڵە قورسانەیە . چۆن حوشتر کە  بارە سەنگی لە پشت دەکەنەوە خێرا ڕێگای بیابان دەگرێ هۆشی ساخیش ئاوا بەرەو بیابانی خۆی مل دەنێ . لەتێ کردنەوەی ئەم  بیابانەدا وەرگەڕانەوەی دووەم تەواو دەبێ کە هۆش وەردەچەرخێ و دەبێتە شێرێك ، چونکە دەیەوێ ئازادیی خۆی دەست بکەوێو دەسەڵاتداری بیابانەکەی خۆی بێ .

لەو بیابانەش دا لە ئاغاکەی دەگەڕێ تا بەقەد خۆی دوژمنایەتی لەگەڵ دا بگونجێنێ هەر وەك لەتەك ئاغای پێشوودا گونجاندی . ئیدی ئامادەیە  دەست بکا بە قوڕگی ئەژدیهادا و لە نێوی ببا !

دەبێ ئەو ئەژدەرەی هۆش لێی هەڵ دەگەڕێتەوە کێبێ و لەمەولاش نایەوێ  ئاغاو پەروەردگارەکەی تێدا بەدی بکا ؟

ئەژدەر بریتی‌یە لەوتەی ((ئەرکە لەسەرت)) هۆشی شێریش سوورە  لەسەر ئەوەی بڵێ ((دەمەوێ)) بێژەی ((ئەرك)) ئەژدەرێکە و لە چەقی ڕێگای شێردا خۆی بۆ سەدەدا و بەهەزاران سەدەف خۆی زرێ پۆش دەکاو لەسەر هەر  پارچەیەکیان وشەی ((ئەرکە لەسەرت)) بە پیتە زێڕینەکانەوە دەورنگێتەوە ..

بەسەر ئەو سەدەفانەشەوە دەستوورەکانی هەزار ساڵە تیشك دەدەنەوە ، ئەژدەری مەزنیش دەلرفێنێ و دەڵێ :– سەر پاکی شەرع و دەستوور گەل بەسەر منەوە دەدرەوشێتەوە .

ئەوەی دەستووراتە زادەی لەمەوبەرەو لە من دا ئاشکراو نمایانە . بە ڕاستی لەمەولا نابێ کەس وشەی ((دەمەوێ)) بدرکێنێ ! ئەژدەر ئاوای گوت .

براینە ! چ پێویستی‌یەکتان بە –ئەقڵەشێر–ە ؟ هەر ئەوەندە بەسە کە  گیاندارێکی بەهێزی ئاغری وایە بە خۆداریی خۆیەوە دەنازێ و خۆی نادا بەدەستەوە .

ئەگەر بەتەمای ئەوەبن یاسای نوێ دروست بکەن کارەکەتان  بێهوودەیە ، چونکە شێرەکە خۆی لەم دروست کردنەدا کۆڵەوارە . هەرئەوەندەی دەسەڵاتەکە بۆ داهێنانی تازە ، لەپێشەوە بۆ ئازاد بوون خۆی کۆبکاتەوە ، چونکە هێزو تینی لەو  سنوورە تێ ناپەڕێ .

براینە ! بۆ ئەو کارەتان کە پێویستتان بەشێرە ، هەرئەوەیە خۆتان سەرفراز بکەن و بە پاڵەوانەتیی(خۆداری) لە رووی هەموو شتێك دا ، تەنانەت (ئەرك) یش یاخی بن

برا گەل ! ئەمە ئەو کارەیە کە پێویستمان بە شێرەکەیە لە گەڵمان دا ڕای پەڕێنی.

دەست بەسەراگرتنی ماف بنیاد نانی تازە دەستووران پێویستی بە کۆششی بەتەوژمە بۆ لەناوبردنی هۆشێك مل کەچ و بەقنیات و رەزامەند بێ .

بێگومان ئەو بێ بەزەیی و زەبری لەو جۆرە (کۆششە)دا هەیە لە هیچ جانەوەرێکی دڕندەدا نیە .

جاران هۆش –وەك پیرۆزترین ماف– ئاشقی وشەی ((ئەرك)) بوو . ئێستاش وای لێ بەسەرهاتووە ئاشقەکەی لەوەدا ماندوو بکا : ئەو مافەی جاران بەسەدەقەی دەبوو شتێکی ئەوتۆی تێدایە بەرەو ستەم و وێڵی پێی بابداتەوە .. ئەم رەتانەش بۆ ئەوەیە دەست بەسەر ئازادیی خۆی دا بگرێ ، هەڵ دانی ئاواش هەر لەشێر دەوەشێتەوە . بەڵام دووای ئەوەی شێرەکە لە کارەکەدا کۆڵەوار بوو دەبێ ئەو منداڵە دەسەلاتی بەسەر چ کارێك دا بشکێ ؟ ..

– ئەو شێرە ڕاماڵەش لەپای چی وەرچەرخێت و ببێتە منداڵێك ؟

چونکە منداڵەکە پاکیزەی نیسانە .. تازەبوونەوە و یاری چەرخەیەکە بەدەوری زاتی خۆی دا دەسووڕێتەوە ، کەواتە بزووتنەوەی سەرەتاو باوەڕی پیرۆزە .

بەڵێ ، برا گەل ! کاری خوانیشان بۆ داهێنان

پێویستی بە باوەڕی پیرۆزە . ئێستاش هۆش (دەیەوێ) دنیای خۆی دەست بکەوێ .

لە کاتێك دا نیشتەنیی ئەو باژێرە بوو کە پێیان دەگووت ((شاری مانگا بەڵەك))

زارا ئاوای گوت ...

## دوانگەکانی ئاکار پەسندی [٨]

[٨] – منابر الفضیلة.

خەبەری دانایەك گەیشتە زارا کە ڕێسەی داوە بە زانایی و تەوانایی خۆی لەبارەی ((خەوخۆشی)) و ((پەسندی)) یەوە ، بەو درێژ دادڕییەوە خەڵکەکەی بەلای خۆی داکێش کردووە و بەقەدر زانینەوە لەبەردەمی دا دەستەو نەزەرن ، کۆمەڵە لاوێکیشی لێ گلێر بوونەوەو بوونەتە کۆڵەکەی سەکۆ بڵندەکەی . زاراش ڕۆیشتە نێویان و لەبەردەم دوانگەکەیەوە لەگەڵیان ڕۆنیشت و گوێی بۆ فەرمایشتەکانی یارۆ دانا گرت کە دەی بێژا :

– ئاگاداری ڕێزو گەورەیی خەوخۆشی بن کە پایانی یەکەمی هەیە . دوورە پەرێز بن لەو کەسانەی کە تووشی بەد هەلاڕیان و خەوزڕان بوون !

دز لە ئاقار خەوخۆشی دا لینگە لەرزەیەتی ، کە لە توێی شەوگار هەڵ دەخزێ نایەوێ ترپەی لە پێیان بێ .. بەلاّم شەو نخوونی جەزرەبە هیچ سڵ ناکاتەوە کەڕەنایەك بگرێ بە کۆڵییەوە .

خۆسپاردنی مرۆڤ بە ڕژێمی خەوخۆشی زانیارییەکی هێندە ئاسان نیە. تەنیا بۆ ئەوانە ئاسانە کەبەدرێژایی ڕۆژ دەزانن چۆن پڕ بە پێڵوەکانیان ئاگاداری خەوتن بن. ئەرکەو لەسەرتە: دەبێ ڕۆژی دەجار بەرهەڵستی نەفسی خۆت بکەی..ئەوجا لەباشترین ماندوێتی فرسەت بهێنی و سرکەرێك بۆ گیانی خۆت ئامادەبکەی.

ئەرکەو لەسەرتە: ڕۆژی دەجار لەگەڵ نەفسی خۆتا ئاشتەوەبی، چونکە ئەگەر نەفس شکاندن مایەی تاڵی و ناخۆشی بێ–ئەوا مانەوەی ناکۆکی لەنێوان خۆت و نەفستدا مایەی هەراسان بوونتە لەنێو خەوگاکەتدا.

ئەرکەو لەسەرتە: لەڕۆژێك دا دەڕاستینە بەدەست بهێنی تا لەخەوتا بەناچاری بەدوای ئەو ڕاستیانەدا وێڵ نەبێ و نەفست لەبرسانا زاکەی بێ.

ئەرکەو لەسەرتە: لەڕۆژێك دا دە جار بخەنی تا ئاسوودەبی و لەشەودا گەدەت هەراسانت نەکا..گەدەش خانەی دەردانە.

ئەوانەی ئەمە دەزانن بەشێکی کەمن لەم مەردومگەلە کەسێك هەڵگری هەموو ئاکارە پەسندەکان نەبێ ناتوانێ لەخەو ئارامیدا رابوورێ. ئەگەر مرۆ گەواهی درۆیداو لەزیناوەگلاو حەزی لەکارەکەرە نزیکەکەی کرد، مانای وایە هۆیەکانی ئاسوودەیی لەخەوەکەی خۆی قەدەغە کردوون.

هەرچۆنێك بێ وێڕای ئاكار پەسندی مرۆڤ پێ ویستی بەوە هەیە لەكاتی خۆیدا بەخۆیو سفەتە پەسندەكانییەوە هەڵاژێو بچێتە خەو.

بەڕاستی هەندێ لەكارە پەسندەكان دەڵێی ئافرەتگەلی نەشمیلەو سركن كەواتە تۆ لەنێوانیاندا ببەرە لەمپەر دەنا لەو سەرەوە بەشەڕ دێنو تۆش لەگۆڕیدا دەبیتە قوربانی.

با لەنێوان خۆتو پەروەردگارتداو لەنێوان خۆتو خزمانتدا باوی ئاشتی بێ.. بەبێ ئەو خەوخۆشی پەیدا نابێ.دیسان بۆ ئەوەی شەیتانەی بن دەستو هاوسێت فریوت نەداو تووشی غایلەت نەكا لەتەكیدا بەسەلامەتی بگونجێ، ئەوسا ئەدەیە پرخەی خەو.

ڕێزی دەسەڵاتدار-میری- بگرەو ملی بۆ شۆڕبكە، قەی ناكا با دەسەڵاتدارێكی چەوتیش بێ. خەوی ئاسوودە وای دەوێ. ئەگەر ڕەوتی خاوەن دەسەڵات پێچاو پێچیش بێ ئەوە تاوانی من نیە.

شوانی باش ئەوكەسەیە مێگەلەكەی بۆ مێرگە سەوزەكان ڕابدات. خەوی ئاسوودە ئەمەی گەرەكە.

مـن ڕەدوی فـرە مـاڵیو فـرە شـانازی ناكـەوم، چونكـە هـەردووكیان مایـەی شەپرزەیین..بەڵام مرۆڤیش بێتو چكە ناوبانگێكو كەمە ماڵێكی نەبێ-بەئاسوودەیی لێی نانوێ.

لەباتی ئەوەی كەبەد رابوێرەكان ئامەشۆی خانەم بكەن حەزدەكەم كەمە خەڵكێك سەرم لێ بدەنو ئەوەندەش نەمێننەوە خەوە خۆشەكەم لێ تێك بدەن.

حەز لەكۆڕی گەوجان دەكەم؛ چونكە خەواڵوومان دەكەن..ئەوكاتەی گەوجایەتیان لێ قبوڵ دەكەینو شایەتییان بۆ ئەدەین ڕاستیان پێكاوە. هێندەی دیكە وەكەیف دێن!

ئابەم تەرزە ڕەوشت پەسندان ڕۆژگاری خۆیان وەسەردەبەن..بەچاومنیشەوە هەركە ئێوارە داهات لەتەك (خەوبردنەوە)دا خۆداری دەكەمو سەغڵەتی ناكەم، چونكە -خەواڵوویی- سەرتۆپی ڕەوشتە پەسندەكانەو نەی گەرەكە شەوبێداران گەمارۆی بدەن.

ئـەوەی بـەڕۆژ کردووەمـەو بـیرم لێ کردووەتـەوە لـەژێر بـاڵی تاریکـاییدا ڕای دەنوێنم..ئەوجا وەك ئاژەڵێکی بەسەزمان لەگەڵ نەفسی خۆم دا خڕ هـەڵدێم و لێـی دەپرسمەوە: کە دەجار بەچی ئارەزووەکانی بـەزاندوون..دەجار بەچی لەگەڵ خۆیدا ڕێك کەوتووە..لێی دەپرسمەوە کەچۆن بەدە ڕاستـەقینەو بـە دە ڕابـواردن خـۆی لێ مڕکردووە؟!

کاتێ بەخۆمـەوە دەگلێـم و چـل ئەندێشـەو غایلـە دەم هـەژێنێ خـێرا وەنـەوز دام دەگـرێ، ئابـەو ڕەنگـەو بـەبێ هیـچ داوالێ کردنێـك-سـەرتۆپی ڕەوشـتە پەسـندەکان ((خەوخۆشی)) دەم باتەوە.

وەنەوز پێڵوەکانم قورس دەکاو دەنیشن..

وەنـەوز خـۆی لـەزارم دەداو بەداچـەقاوی دەمێنێتـەوە! وەنـەوز وەك دزێکـی ڕۆح سوکەڵە بۆ لای من خۆی کێش دەکاو پێ دزیلکە دەکا.ئیدی بیری و ژیریم لێ دەدزێ، منیش وەك دیرەگ بۆی دەوەستم، ئەوەندە ناخایەنێ لەسەر خەوگاکەم ڕادەکێشم.

کەزارا گوێی لەو قسانەگرت ودیتی ئەودانایە گوێچکەی مەردومگەلە کە یان پێ دەڕەقێنێتـەوە توانـی خـۆی لەخـەنین ڕاگـرێ و لـەچوارلای نەفسـی یەوە ڕوونـاکی دەرچوو، ئەوجا کەوتە ڕاز:

-بۆم دەردەکەوێ ئەو دانایە بەخۆیو چل ئەندێشەکەیەوە شێت بووە!

بـەڵام تابڵێی دەربارەی-خەوخۆشی-شـارەزایە. خۆزی لەوکەسـەی شـان لەشـانی ئەو دانایە ئەدا!

چونکە ئەوجۆرە-وێژنگ دان-ە درمێکەو بەتیژی دەتەقێتەوە نەخوازەلا بۆ ئـەو دیوی دیوارەکانیش!

کەمـە جادوویـەك لەدوانگـە باڵاکەیـەوە بـۆن دەداتـەوە، کوڕگـەلیش بـەخۆڕایی لەدەوری گوتار بێژی ڕەوشتە پەسندەکان گلێرنابنەوە.

یاسای ئەم دانایە بریتییە لـە ((شـەوبێداری لـەپێناوی خـەوتندا)). لەڕاسـتیدا ئەگـەر ژیان بێ مانا بووایەو ئەم حیکمەتە بێمانایەشم لەقەبەل بکرایە- ئەوا لـەم دەستوورەم چاکتر دەست نەدەکەوت.

لەکاتێکدا خەڵکی جەمسەری ڕەوشتە پەسندەکانیان هەڵ دەپشکنین بۆم دەرکەوت بەر لەهەموو شتێك لەخەو خۆشی و ئەو ڕەوشتە پەسندانە دەگەڕان کەتاجی سرکەرو تریاکەمەنی بەتەوقی سەریانەوە دەبریسکێتەوە.

پەندیاری لەباوی دانایانی سەر مینبەردا-کە بە پایەی شانازیو ستایش گەیشتوون-ئەم یاسایەیە، ((نووستنێك بەخەونەکان تووشی نیگەرانی نەبێ)) ئەوانە مانایەکی لەمە باشتریان بۆ ژیان پێ نەدۆزراوەتەوە.

لەڕۆژگاری ئێستاماندا زۆر هەن وەك ئەو ئامۆژگارە جاڕ بۆ ڕەوشت پەسندی رابهێڵن بەڵام لەو دڵ سۆزیەدا ناگەن بەتۆزی ئەم دانایە.

ئەم زەمانەش هەر زەمانەکەی خۆیانە، زۆر چاوەڕوان نابن-خەوخۆشی بیرو ئەندێشەیان فریودەدا، ئەوجا بەم زوانە لێی رادەکشێن خۆشی و مژدێنی بۆ ئەوانەی وەنەوەز یان لەچاو رادەگەڕێ!

-ئابەم زوانە بۆ خۆیان دەچنەوە خەو

زارا ئاوای گوت...

## گیرۆدەکانی جیهانی دووەم

ڕۆژێکیان زارا ئەندێشەی بۆ ئەودیو مرۆڤایەتی بەڕێ کرد. بەچەشنی تێ ڕوانینی گیرۆدەکانی جیهانی دووەم ئەویش ئەم جیهانەی بۆ دەرکەوت کە ئافەریدەی پەروەردگارێکی بەئازاری شەپرزەیە، گوتی:

-دنیام واهاتە بەرچاو-وەك خەونەکانی نووستوویەك-تەمومژی پێچ و لوولی رەنگاوەر دەخولڤێنن و بەناچاری خواوەندێتی نەفسی لێ وەردەگەڕێ.

چۆن تەمومژی ڕەنگاوەر دەکەوێتە بەرچاوی داهێن ئاوایش من چاکەو خراپەو خۆشی و ناخۆشی خودی خۆم و خودی ئەوانی دیکەم لێ وەدەردەکەون. لەوانەیشە کەداهێن ویستبێتی لەزاتی خۆی نەڕوانێ و جیهانی بنیاد نابێ.

ئازار چەشتوو کاتێ پڕمەستی کەیف سازیی خۆیەتی کەواز لەئێش و ژانەکانی دەهێنێ و نەفسی خۆی لەبیردەچێتەوە. ئاوا رۆژێ لە ڕۆژان جیهانم بۆ دەرکەوت و دیتم:

خۆشی و کەیف و سازی‌یەکەی بریتی‌یە لە پڕ مەستی و لەبیرچوونەوە.. هەمیشە لەناتەواوی‌یەکانی خۆیدا دەگەوزێ و پێچەوانە گەرێکە و سێبەردەرەوەیە کە بۆ ناکۆکی‌یە ئەبەدی‌یەکە.

ڕۆژێکیان سەرنجی جیهانمدا، کەیف و مەزاقێکی سەرخۆش کەرم بۆ دەرکەوت..نەکاملێك خۆشایەتی لیٚ وەردەگریٚ کەمن دام هێناوە.. ئەویش وەك گشت کارەئادەمی‌یەکان بەهەشتێکی ئادەمی‌یە.

ئەو خواوەندەش هەر مرۆڤە بەڵکو بەشێکە لە کەسایەتی مرۆڤ؛ چونکە لەگڵەکەی من و گڕەکەی من پەیدابووە..تاپۆیەکەو زادەی ئەم جیهانەیە و لەنەدیوی ئەم جیهانەوە نیە.

براینە! ئەوەم بەچاوی خۆم دی و بەئازارەوە پشت خۆم کەوتم و گڵی خۆم بۆسەر چیا هەڵ گرت، لەویٚ ئاگرێکی نوور پژێنم کردەوە، ئەوجا تارمایی‌یەکە دوور کەوتەوەولەبەر چاونەما.

ئێستا ئەگەر باوەڕم بەو تارمایی‌یە هەبیٚ، ئەوباوەڕەم نابێتە ئازار چەشتن و گچکایەتی..ئەمەیە کەبۆ گیرۆدەکانی جیهانی دووەمی دەبێژم:

لەم گەردوونەدا زادەی هەرجیهانگەلێکی دی تەنیا ئازارو هەست کردن بەکۆڵەواری‌یە، ئەم زادەیەش لەگەڵ شێت بوونێکە خێرا ئەو بەختە وەری‌یە ناهێڵیٚ کەبێجگەی ئازارمەندەکان کەسی دیکە نەی چەشتووە.

ئەو ماندووەی بەتەمایە دوورترین مەودا بەیەك باز.. بەڵیٚ بە یەك بازی کوشندە بڕیٚ و داماوی و نەفامی‌یەکەشی بەرادەیەکی گەیاندبیٚ-نەتوانیٚ لە ئاستی‌دا خاوەنی ویست و ئیرادە بیٚ، ئەوە هەر بۆ خۆی داهێنیٚ سەرجەمی خواوەندەکان و جیهانگەلی دیکەیە.

براینە بڕوام پیٚبکەن لەش بەتەمای لەش نەماوەو لێی نائومێدە سبەینیٚ لەودیو ئەو لەمپەرانەوە کە لە دووری دوورەوەن سەپەنجەکانی لە جێگای گیانە گومڕاکە دەکوتیٚ.

براینە! بڕوام پیٚبکەن لەش لەزەوی نائومێد بووە، ئیدی ئەو دەنگەی بیست کەلەدڵی هەبوونەوە بانگی دەکرد..ئەوجا ویستی بەسەر تیٚ سرەواندن جەمسەری بەربەستەکان بسمی و لێیانەوە بۆ جیهانی دووەم تیٚبتەقێنیٚ.. بەڵام لای ئادەمیزاد

ئەو جیهانە دووەمە هێجگار شاراوەیە چونکە بەنامەردێتیو خۆدوورگرتنی لەهەموو سیفەتە مرۆڤایەتییەکانی بووەتە ئاسمانێك لە ((نەبوون))و بەس. دڵی هەبوونیش ئەگەر وەك مرۆڤ نەئاخێوێ ناتوانی لەگەڵ خەڵكدا بدوێ.

راستیەکەی سەلماندنی–هەبوون–و هێنانەزمانی هەبوون بۆ ئێمە کارێکی فرەسەختە. دەئەوجا–براینە! وەڵام بدەنەوە: گوایە بۆتان دەرنەکەوتووە کەنامۆترو سەیر تری هەرشتێ ئەوەیە کەباشتر بە بەڵگە سەلمێنراوە؟

بەڵام ئەو زاتە ((خود)) وێڕای تێدابوونی ناکۆکیو تێك چوون، بەئاشکرا هەبوونی خۆی دەسەلمێنێو دەکەوێتە داهێنانو جاڕدانی ویستی خۆی..تاپێوەر دابنێو نرخی شتەکان دیاردی بکا. خود–لەدڵ سۆزی خۆیەوە هەر ئەودالّی لەشە، ئەمە وایە با لەشەکەش نوقمی خەونەکانی بێو بەباڵەتێك شکاوەکانییەوە تکانی فڕین بدا.

ئەوزاتەی لەپێناوی یەکالای ئارەزووەکانیدا بەدڵ سۆزییەوە خۆی ڕام دەکا، چەند بۆ پایە بەرزی لەشو زەوی پتر مەشق بکا گوزارشی خۆی بەهرەمەند تر دەکا.

زاتی خۆم فێری ئەو تازە سەنگینی یەی کردووم کەلەئێستاوە خەڵکی پێ فێردەکەم: فێری کردووم لەئێستا بەدواوە سەری خۆم نەژەنمە لمی شتە ئاسمانییەکانەوە..بەڵکو سەرێکی گڵین بەرزەوەدەکەمو مانای زەوی پێ دەخولقێنم.

من خەڵکی فێری ئەو تازە ویستە دەکەم ڕەوتی ئەو ڕێگایە هەڵ ببژێرن کەلەوەوبەر مەردومگەلەکە گەوجانە پێیدا رەت بوون..فێریان دەکەم لەو ڕێگایە دڵنیابنو قاچیان لێ هەڵ نەتریزا، هەروەك قاچی بڵندە سووك بینەکانی لێ هەڵ تریزا..

ئەوانەش کەسانێکن شتە ئاسمانییەکانیان کردوونەتە باوو لەپێناوی سەدەقەسەری بەشەردا دڵۆپە خوێنە ڕژاوەکانیان داهێناون. وێڕای ئەوەش ئەو ژەهرانەی بەسامو لەزەتیانەوە گیرۆدەبوون هەر لەزەویو لەشەوە دەریان هاوردوون ویستویانە لەدەست نەگبەتی رەهەندە بن..ئەستێرەکانیان لەدوورەوە بۆ دەرکەوتوون. خۆ پێدا گەیشتنیان کارێکی ئەوپەڕی سەختو سەراسایە؛ بۆیە پیشیان خواردەوەو پرماندیان:

((بەداخەوە! بۆچی ڕێگا ئاسمانییەکان لەپێشمانەوە ناکرێنەوەو بەسەریاندا خۆمان کێش بکەینو بەرەو ((هەبوونێك))ی کەو بەرەو بەختەوەرییەکی دیکە تێ بتەقێنین؟!..

لەوكاتەوە ئەندێشەو فنجانە پڕ لەخوێنەكانیان بۆ خۆیان داهێناون..ئەو خەڵكە وەك ڕۆڵەی یاخی بوو بێ ئەمەگن..ئەوەتان دوور لەزەوی و لەش بەخێرو بێر دەنازن. لەبیر خۆیان بردۆتەوە كەخۆش گوزەرانی و مچوڕكە خۆشایەتی یەكانیان لەزەوی یەوە پەیدابوون[٩]

[٩] خوێنەری ئازیز ئاگادار دەكەینەوە هەروەك لە سەرەتاوە باسكراوە: ئائەمە ئەو نێتشەیەیە كەبەڵگەی بێباوەڕی خۆی ئاشكرا دەكا، بەلایەوە ئەو زاتەی ئادەمیزاد دەی پەرستێ زادەی خەیاڵاتی خۆیانە، یان وەكی دی بڵێین: مرۆڤ خوای داهێناوەو لەگڵی خۆی وێنە تاشی كردووەو لەگڕی خۆی سروەگیانی بەبەردا هەڵ كێشاوە. بۆ ئەو بیرە ترازاوانەی ناكرێ سەرجەم بێینە دەست و ڕەتیان بكەینەوە دەنا ئیشەكە دەبێتە بابەتی ڕەخنەو لێكۆڵینەوە، ئیدی لەوەرگێڕان دەردەچێ. ناچاریشین خوێنەران بانگ بكەین بۆ لێ ورد بوونەوە لەو سیفەتانە كە نێتشە بەچاوی خوایەتی یەوە سەیریان دەكا..ئەوسا خوێنەر دڵنیا دەبێ ئەو خوایەی ئەم فەیلەسوفەی هێرشی دەباتێ خوایەكەی ئێمە نیە، جیهانە دووەمەكەشی بێجگەی ئەو جیهانە گیانی یەمانە كەئەو لەنێوماندایە بەرلەوەی كەئێمە لەنێو ئەودابین.
نێتشە لەو دینە دەرچووە كە ئاڕێتی لەسامێتی یەوە-وەری-گرتووەو شێواندوویەتی-ئەوجا بووەتە نێژیری بیرە بەزەبرو دەسەڵاتەكەی و ڕەخنە لەشوێنكاری دین لەكۆمەڵگادا دەگری لەو هەڵ وێستەیدا بارە نالەبارەی گرتووە= نەئەوەیە هاواری دەروونە یاخی یەكەی پێ ڕابگیری.. نەئەوەیشە بكەوێتە سەر ڕاستەڕێی. ئەو دینەی كەگیان تێیدا ئارام دەگرێ و كارو باری كۆمەڵی پێ ڕێكوپێك دەخرێ. ئێستاش قسەیەكی نێتشە دەهێنینەوە كەلەكاتی نووسینەوەی ئەم كتێبەدا -زارا-گوتوویەتی، ئەو گوتەیەش پەندێكە چ بۆ خواناس و چ بۆ خوانەناس. لەباخچەیەكی (لۆزۆن)دا نێتشە لەلای (خاتو لۆسالۆمە)وە كەكچەجوانێكی ڕووس بوو دانیشت و لەناخەوە دڵی ڕاگرت. لەكاتێكدا قسەی لەگەڵدا دەكرد كرومات دەبوو. (لۆ) دیتی: ئەوا نێتشە بەچاوی پڕ فرمێسكەوە مێژووی گەشەو گۆڕانی ژیری و بیریی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، باسی ساڵانی لاوێتی بۆ دەكا كەچۆن خواپەرستێك بووە، پاشان دەگاتە قۆناغەكانی گومان و ڕاڕایی لەجیهانێك دا كەدەبێ ژیانی پێدا تێ پەڕێ و جیهانێكی بێ خواش بێ. ئەو گوتی و خاتوونیش بۆ باری مێژوو قسەكەی نووسی:
((ئاوا سەرەنگێژیی بیرم دەستی پێكردو بەمەبەستیشی نەگەیشتم. ئەوجا ڕووبكەمە كوێ..ئەی واباش نیە بەرەو ئیمان بابدەمەوە. یان بگەمە ئیمانێكی تازە..هەرچۆنێ بێ كەمن نەتوانم بگەمە ئامانج، پاشگەز بوونەوەم باشترە، نەك بەسەر گەردانی بمێنمەوە)).

زارا بەزەیی بەپایە بەرزاندا دێتەوە..سەبارەت بەوەی کەهۆیەکانی دڵ نەوازی یان هێناونەتەدی رقی لێیان نابێتەوە، کەلەفەرمانی لەش و زەوی دەربازبوون، دیارە رۆڵەی بێ وەفا بوون.. دیسان لەم لایەنەشەوە لێیان خەشم گیرنابێ.. بەڵکو چاك بوونەوەو زاڵ بوونیان بەسەر نەفسی خۆیاندا بۆ دەخوازێ لەپێناوی خوڵقاندنی لەشی بالاتر لەو لەشەی کەهەیانە.

دیسان زارا لەو نەخۆشە چاکەوە بووە رقی هەڵ ناستێ کەسۆزی بۆ خەیاڵ و ئەندێشەی خۆی دەبزێوێ و لە نیوەشەودا دەچێ بەگەردی –گۆڕی خواکەیدا دەسوڕێتەوە

..بەلام لەفرمێسکی ئەو چاکە بووەدا بێجگە لەشوێنکاری نەخۆشی و لەش بەباری بەولاوە چی دیکە نابینێ.

لەهەموو زەمانێکدا نەخۆشی بەخۆوە گلاوو خۆشێوێن زۆر بوون، تا دەگاتە ڕادەی بێ ئەقلی و هەوەس چارەی ئەوکەسانەیان ناوێ کە ئەودالی زانیارین.

ئەوانە رقیان لەسادەترین ئاکار پەسندی دەبێتەوە کەبریتی یە لە دڵ سۆزی!

ئەوانە هەمیشە بۆ دوواوەو بۆ سەر دەمە تاریکەکان ئاوڕ دەدەنەوە. ئەگەر باوەڕو شێتایەتی بارو گوژمی تایبەتی‌یان هەبوایە ئەوسا خوا لەهەوەسی هۆش دا وەدەردەکەوت و هەموو گومانێکیش تاوانێك دەبوو.

بەباشی ئەوانم ناسیون کەلەوێنەو شێوەی خوادا خۆیان وەدەر دەخەن.. دڵنیاش بووم کەسەرجەمی ئارەزووەکانیان بەرەو ئەوە دەبنەوە خەڵکی باوەڕیان پێ بهێنن و هەموو گومان و دودڵی‌یەکیشیان تێدا ببێتە تاوانێك. ئەو ئیمانەی گەرەکیانە لەو خەڵکەدا بیچەسپێنن باش درکم پێ کردووە. ئەوانە–نەباوەڕیان بەجیهانگەلی دیکەو نەباوەڕیان بەو دڵۆپە خوێنانەیە کەدەبنە سەدەقە سەری جیهان.. ئەویش وەك ئەو خەڵکەیە کەباوەڕیان بەلەشەو خودی لەشیان بەلاوە بوونەوەرێکەو هەبوونی ناچاری‌یە.[١٠]

---

١–ه لەکتێبی (دانیال هالامی) وەرگیراوە / ف . ف.

[١٠] کائن: بوونەوەر. الواجب الوجود: هەبوونی ناچاری یان هەبوونی ناچارەکی.

ئەوەندە هەیە ئەو خەڵکە وەك بوونەوەرێکی دەردەدار سەیری لەش دەکەن و حەز دەکەن لەکەوڵی خۆیان بێنە دەرەوە، ئەوەیە کەپاڵیان پێوە دەنێ-گوێ لەمژدە بەخشی مەرگ بگرن هەر ئەو مزگێنیەشە کەچاویان پێ دەبڕێتە ئەو جیهانگەڵیدیکە

بەڵام برایان! ئێوە گوێ لەدەنگی ئەو لەشە بگرن کەلەدەردەکەی جیابووەتەوە.. چونکە ئەو لەشە دەرباز بووە بەدەنگێکی پاکی زوڵاڵ-بەچاو دەنگەکانی دیکەوە- دەتان دوێنێ.

لەشی ساخ بەهەموو دڵ سۆزیو بێ گەردییەکەوە دەدوێ..ئەو لەش ساخە لەبنی پێیەوە تاتەوقی سەری وەك ستونێکی ڕەختەی چوارپاڵوویە..بەیانو جوانبێژی یەکەشی بریتییە لە یەکالای واتای زەوی.

زارا ئاوای گوت..

## گاڵتە پێکەرانی لەش

قسەی توندم بەرەو رووی ئەوانەیە کە گاڵتە بەلەش دەکەن: پێ ویستە ڕێبازە ئامۆژگارییەکانیان نەگۆڕن.. بەڵام لەسەریشیانە لەشەکانیان بەجێ بهێڵنو زمانیان لاڵ بیٚو فزەی لیٚ نەیە.

ئەوا منداڵەو دەڵێ:-من لەشو گیانم-ئەدی بۆچی ئەو مەردومگەلە وەك منداڵەکان قسە ناکەن؟..هەرچۆنێ بی ئەو مرۆڤەی وریا بۆتەوەو خۆی دەناسێ، دەڵێ: ((من بەهەمموو شتێکمەوە تەنیا لەشێکم، گیانیش تەنیا وشەیەکی ڕەها کراوە بۆ دیاری کردنی بەشێکی ئەم لەشە)).

لەش بریتییە لەکۆ ئامێرێکی پێك هاتوو بۆ هۆش..و چەند هەندامێك بۆ تاکە واتایەك. هەر ئەوە مەیدانی جەنگو ئاشتی، هەر ئەوە گەلەو هەر ئەوە شوان.

براله! ئامێرە لەشت لەئامرازی ئەو هۆشەت بەدەرنیە کەتۆ پێی دەڵێی گیان، ئەمیش گچکە ئامرازێكو یارییە بچکۆلەیەکە بۆ هۆشە مەزنەکەت.

تۆ دەبێژی ((منو بەم بێژەیە فیزەبات تێ دەگەڕێ، بەڵام – بڕوابکەیتو نەکەیت– لەولاوە شتی گەورەتر هەیە، ئەویش لەشتەو گەورە ئامێری بیرکردنەوەیەتی. ئەو لەشە بەبێژەی (من)ەوە خۆی هەڵ ناکێشێ؛ چونکە ئەو خۆی منەو ئەزەو حەشارگەی کەسێتی‌یەکی ئاشکرایە.

ئەو شتەی کار لەهەستەکان دەکاو هۆش دەرکی پێ دەکا لەزاتی خۆیدا کۆتایی نایە، هەرچەندە هەستو هۆش هەوڵ دەدەن پێت بسەلمێنن کەلەوان دا هەموو شتێك کۆتایی دێ.. ئای چەند لەخۆباین؟!

هەستو هۆش لەچەند یاریو ئامرازێك بەدەر نین، خودی ڕاستەقینەش لەو دیویانەوەخۆی متداوەو بەچاوەکانی هەست کەوتووەتە پشکنینو بەگوێیەکانی هۆش کەوتووەتە گوێ گرتن.

بەردەوام ((خود)) هەروا پشکنەرو گوێ گرە، دەستەو یەخەو ئەنجام گرە، پاشان دەڕووخێنێو بەسەر کەسایەتی دەخوڕێو زاڵ دەبێ. برالە! لەو دیوی بیرو هەستەکانتەوە دەسەڵاتدارێکی گەورەتر خۆی لەبۆسە ناوە چونکە دانای نادیارە، ئەو دانایەش هەر خودی ئەوزاتەیە کەلە– لەشی تۆدا سەقام گیرە، دیسان ئەوزاتە دەقی لەشی تۆیە[11] لەشی تۆدا ئەو هۆشە هەیە بەسەر چاکترین دانایت دا بشکێتەوەو زاڵ

[11] ئایا خوێنەری بەڕێز لەهەوڵ دانی نکولانەو گومراترین قسەو بێ پەرواترین لافی بێ خوایەتی ئەو کابرایە ئیسپاتی هەبوونی خواو سەلماندنی باوەڕو بیری هەرە بەرز وەدەست ناهێنێ؟.. ئەوەش کاردانەوەیە کەلەپێشەکی‌یەکەمان دا لامان لێ کردۆتەوە: باوەڕی ڕۆژ ئاوایی لەشی بەئامێرە هەوەسو حەزێکی سووکانی داناوەو گەرەکە زەلیل بکرێ؛ بۆیە ئەو باوەڕە نکووڵی لەژیان کردووە ((ژیانیش بەلای ڕۆژهەڵاتی ئیماندارەوە سەرەتای نەمرایەتی‌یە)) نێتشە کەهێرشی هێناوە بۆ سەر ئەو بۆچوونەیە لەقەوارەی مرۆڤ دا– دەرەوەی ئاوەژوودەکاتەوە بۆ ناوەوەی ناوەوەشی بۆ دەرەوە.. ئەوجا لێکی دەترازێنێ بۆ خودو کەسێتی، بەلایەوە کەسێتی هۆشو گۆشێکە لەنێو دەچی، پێی لەوەش ناوە کە لەش لەگەڵ ئەو هێزە پاڵ دەرو رووتو شاراوانەی تێیدا هەن خۆی لەخۆی دا ئەو زاتەیە هەبوونی ناچاری‌یەو بەرەو کەماڵ دەخزێ تامرۆڤ دەگەیەنێتە پلەی خواوەندی.

بـێ، كێـش هۆيـەكی ئـەوتۆ دەزانـێ لەشـت ناچـاری ئـەو دانايەتی‌يـە بكـا كەلـەتۆدا باشترين شتە؟!

زاتـی خـۆت گەمـەی بەكەسـێتی‌يەكەت‌و دەورەكـانی دێ كـەدەڵێ: دەبـێ پايـەو بـەرزيی بـير چی‌بـێ كەبـەرەو مەبەسـتم نـەبێ؟.. ئـەدی هـەر مـن رێبـەری كسـێتی نەبووم..هەرمن سرووش بەخشی بيركردنەوەكانی نەبووم؟[12] زات بەكەسێتی دەڵـێ: هەست بەئازار بكە. ئەوجا ئازار دەچێژی‌و بيريش دەكاتەوە لەو ئازارە ڕزگاری ببـێ، ناچاريشە كە ڕوو لەو مەبەستە بكات

زات بەكەسێتی دەڵێ: هەست بەشادی بكە. ئەوجا شاد دەبێ‌و بيريش لـەدرێژە پێدانی ئەو شادی‌يە دەكاتەوە، ناچاريشە كەڕووبكاتە ئەو مەبەستە.

قسـەيەكم هەيـە بەگاڵتـە پێكـەرانی لەشـی دەڵێـم: لەڕاستيداسـووكايەتی‌يەكەيان پايەو ڕێزە. ئەی دەبێ كێ ڕێز لێ نان‌و سووكايەتی‌و قەدرزانی ويستی پەيداكردبن؟

زاتی داهێن ڕێزلێ نان‌و سووكايەتی بۆ نەفسی خۆی بنيات ناون،بەو چەشنەی كە ئێش‌و لەزەتی بۆخۆی پەيداكردوون.

لەشی داهێن چۆن باسكێك بەويستی ئەو دەجوڵێنـەوە ئاواش بۆ خزمـەتی خۆی هۆشی خوڵقاندووە.

ئێوە بەتايبەت لەباری سووكايەتی‌و شێتيتان دا خزمەتی زاتی شاراوەتان دەكەن. ئەی گاڵتـە پێكـەرانی لـەش لەگـەڵ ئێوەمـەزاتی ئێـوە بۆخـۆی دەيـەوێ بمـرێ؛ وازی

---

هەرچەندە ئەم قسەيە زۆر كورت برە بەڵام ناچاريش بووم هـەر بيهێنمـەوە. لـەوەدواش كاتـێ لەتەرجەمەی ئەو فەيلەسوفە گەورەی ڕۆژئاوا دەبينەوە دەبێتـە جێگـای لێكۆڵينەوەيـەك حـەز دەكـەی خـەريكی بی... تالەخوايـەتی ئـەودا بەڵگـەيەك وەربگرين پايـەدار بـێ لەسـەر ڕاسـتی باوەڕی ڕۆژهەڵات بەتاكايەتی خواو بەو سروەگيانە نەمرەی كردوويەتی‌يە بەر گشت لەشێك. ف.ف

[12] لە لاپەڕە (٥٦)ی دوو نوسخەداو لەم بەندەدا نووسراوە:

((ماهی خطرات الفكر وتساميه)) من بۆ ئەوە دەچم (خطوات) بە واوبێ. ديسان بۆ هـەمان بەند كەنووسراوە: انا وائده الشخصيه) دەبێ ئەميشيان (رائده) بە (را) نەك لە (وا) بێ.

لەژیان هێنا؛ چونکە ناتوانێ ئەوەی بەتەمایەتی بەجێی بهێنی، ئەوپەڕی ئارەزووشی بریتی‌یە لەداهێنانی کەسیٚ لەبلندایەتی خۆیەوە بێ.. کاتی هاتنە دی ئەو ئارەزوەش بەسەر چووە؛ لەبەر ئەوە ئەی گاڵتە پێکەرانی لەش! زاتی ئێوە بەتەمای نەمانە.

زاتی ئێوە ئارزوومەندی نەمانە؛ هەر ئەمەیە پاڵتان پێوە دەنێ گاڵتە بەلەش بکەن چونکە بۆتان نەکرا لەخۆتان باشتر بخولقێنن..زادەی کۆڵەواریتان لەسەر ژیان و زەوی خەشم و تۆڵەیە ..ئائەوەتانێ بەبێ ئەوەی بزانن لە حەزو هەوەسی چەند سات و چاوتروکانێکی لاداوتان دا خۆی وەدەردەخا.. ئەی گاڵتەپێکەرانی لەش و کە لەش! بەرێبازی ئێوەدا ڕەت نابم؛ چونکە گوزەرێکتان تێدا بەدی ناکەم بگاتە ئەو شوێنەی مرۆڤی بالای لێ وەدەردەکەوێ.

زارا ئاوای گوت...

## حەزو خۆشایەتی‌یەکان

برام! ئەگەر تۆ پەسندی‌یەکت هەبوو، ئەو پەسندیەش تایبەتی خۆت بوو ئەوا بێجگەی خۆت کەسی دیکەی تێدا بەشدار نابێ. بێ گومان دەشتەوێ بەناوی خۆیەوە ناودێری بکەی لە پای کەیف و سازیتا وازی لەتەك دا بکەی.. بەلام بەهۆی ئەو ناسیاری‌یەوە کەبەسەرت دا بڕیوە مەردومگەلەکەت تێدا بەشدار کردووە؛ بەو سەبارەتەوە بەخۆت و پەسندیتەوە ئاو گەلە بووی.

برام! بۆ تۆ واباشە کەبڵێی: ئەوەی گیانم لەزەتی پێوەردەگرێت و ئەوەی گیانم ئێشی پێ وەردەگرێ–بالاترە لەدەربڕین و مەزنترە لە ناوهێنان..لەدەرك پێکردنی‌دا کۆڵەوارم ئەو کۆڵەواری‌یەش لەهەناوم دا قاتی و برسێتی پەیدا دەکا.

با ئەو ئاکار پەسندیەت لەوە بالاتر بێ کەلەکاتی دەست نیشان کردن‌دا شت بەکەم بزانی.. کاتیکیش خۆت لەقەرەی ئەو دیاری کردنە دا هیچ شەرم مەکەو بەلالە پەتانێوە بی درکێنە؛ کەواتە بەتورە تورەوە بڵێ:–

–ئەمە، ئەو خێرەیە کەحەزی لێ دەکەم..

–ئەمە، ئەویە کەسەرسامیم دەورووژێنی..

–کەواتە، بێتو خێرێك بەو ڕەنگە نەبێ نامەوێ..

–هیچ کام، لەوشتانەم ناوێ کە بەخواستی پەروەردگارێك بێ لە خواوەندەکان..

–کارێکیشم ، ناوێ بەخواستو ڕاسپێری ئادەمی بێ..

–هیچ بەڵەدێکم، نەگەرەکە بەرەو جیهانی باڵاو بەهەشتە نەمرەکان ڕێبینیم بکا..

بڵێ: حەزم تەنیا لەپاکێتی زەوی‌یە، چونکە کەمێك دانایی تێدایە.. لەوەش کەمتر ڕاستی‌یەکی تێدا هەیە کە لەسەری پێك هاتوون، ئەو باڵندەیە لە نزیکمەوە هێلانەی هەڵ بەستووە بۆیە خۆشم دەوێو بەزەیم پێدا دێتەوە.. ئا ئێستاش لەکن منەوە کڕکەوتووی هێلکە زێڕینەی خۆیەتی. ئا بەو تەرزە قسە بکەو لاڵە پەتانە (پەسندایەتی)ی خۆت پەرداخ بکەو پێی‌دا هەڵ دا بڵێ.

لەوە پێش ئەو حەزو هەوەسەی هەت بوو بەخراپەت دادەنان، بەڵام ئێستا خاوەنی ئاکارە پەسندەکانی کەلەنەفسی حەزو هەوەسەکانتەوە پەیدا بوون؛ چونکە سەر تۆپێ مەبەستەکانت خستووەتە ئەو حەزانەوە، ئەو جا بوونە ڕەوشت پەسندیو خۆشایەتی کەلەخۆتەوە بۆ خۆتن، لەمەولاش دەبینی هەموو حەزوو هەوەسەکانت دەبنە پەسندایەتی..

لەمەولاش دەبینی ئەو شەیتانەی لەکلێشەت دایە–دەبێتە فریشتە، ئەمە وایە. با تۆ لەو کەسانەش بی کەبەرکاری ڕقو هەوەسن..ئەمەوایە –با لەکۆمەڵەی دەمارگیرو کینەلەدڵان بی.

لەوە پێش سەگە دڕەکان لەدالانەکان خزابوون، ئەوەتان ئێستاش پەلەوەری خۆش ئاوازن، ئاسمان لەژەهرەکانتەوە مەڵحەمێکی داچکاندو حوشترە لاتێك بەزرینچکە دەردەوە شیری داچۆڕاند.. ئێستاش تۆ بەکاری خۆت شیری بەلەزەتی لێ فڕدەکەی ! لەمەودا خراپەت لێ پەیدا نابێ، بەڵام خراپەیەکی دی لەگۆڕێ دایەو لەدوژمنایەتی ڕەوشتە پەسندەکانتەوە پەیدا دەبێ. بڕام! گوێم لێ بگرە–هەرکاتێ هەستت بەکامەرانی کرد مانای وایە پەسندی یەکت تێدا جێ گیربووەو ڕاگوزاریشت بۆ ئاسان دەکا.

کەمرۆڤ فرە ڕەوشت پەسند بێ ئەمەشتێکی زۆر چاکە.. دەبێ لەوەش بەئاگابین کەئەم فرە پەسندیەی لێ دەبێتە بەدبەختی.

زۆر تێکۆشـــەر ســـەبارەت بەدابەزینـــە مـــەیدانگای ئاکـــارە پەســـندەکانەوە هێندەشەکەت بون ناچار سەری خۆیان هەڵ گرتووە تا لەبیابان دا خۆیان بکوژن!

کەتۆ هەموو شەڕو جەنگێکت بەلاوە خراپ بێ برام! ئەوە بزانە : ئەوانە چەند مەرجێکی ناچارین‌و دەبێ هەر بێن؛ چونکە لەنێو خودی ڕەوشتگەلە پەسندەکەی تۆدا زرگنی (حسد)و گومان‌و جنێو هەر یەکەیان پایە بەرزی خۆی هەیە.

چاو بکەرەوە! هەر یەکە لەو رەوشتگەلە پەسندەت بەتەمای پلەیەکی بالاّترەو هەریەکەیان بەتەمایە دەست بەسەر هەموو بیرگەلەکەت دا بگرێ‌و بیان کاتە بەندە فەرمانی خۆی‌و تووڕەیی‌و کینەو  خۆشەویستی تۆیان پێ لەقاقۆزە بنێ‌و فزەیان لێ ببڕی.

هەرکامیك لەڕەوشتە پەسندەکانت- زرنگی-بەئەوی دیکەیان دەبا.

دیسان زرنگیش تۆقێنەرێکەو ئەو رەوشتگەلە پەسندە پاکۆ دەداو نایانهێڵێ.

ئەوەی بکەوێتە گڕە پێچەی زرنگی‌یەوە بەو مەردە دەچێ کەچزووی ژەهرینی دووپشك بە شوێنی کوشندەیەوە بدا.

ئەرێ کاکی خۆم! ئەوە نازانی، کامیان جنێو بەخۆدەرەو خۆکوژە هەردەبێتەوە یەکێك لەڕەوشتە پاکەکان؟!

مرۆڤ هەر ئەو بوونەوەرەیە پێویستە سەرووی خۆی کەوێت.

کەواتە کاکی  خۆم! لەسەرتە پەسندگەلی خۆت یەك یەك خۆش بوێ؛ چونکە تۆ بەهۆی ئەو ئاکارە پەسندانەوە لەنێو دەچێ.

زارا ئاوای گوت...

## تاوانباری هەڵ بزرکاو

ئەی دادوەرو پێکەنین هێنەکان! هێشتا  ئاژەڵەکە سەری نەلەقاندووە دەشتانەوێ بڕیاری تۆڵەی لەسەر دەرکەن؟ ..فەرموون ئەوە سەری تاوانبارە هەڵ بزرکاوەکە، ئەوەتا هەڵ دەچۆقێ‌و بشنۆڕن: سووکانی‌یەکی سامناك لەنیگاکانیەوە دەتان دوێنێ.

دووچاوی تاوانبارەکە پێتان دەڵێن: کەسێتی لەو شتە دەرناچێ کەپێ ویستە بەسەریدا بەرزەوەبین. کەسێتی منیش بریتییە لە سووکایەتییەکی مەزن بۆ ئادەمزاد.

لەکاتێك دا ئەو تاوانبارە فەرمانی بەسەر خۆیدا دەرکرد مانای وایە کاتی مەرگییەتی . کەواتە رێگەمەدەن لەم دۆخی هەڵکشانەوەیە بۆ نزمانی داکشێتەوە .پەلەی مردنی لێبکەن؛ چونکە مەرگ تاکە رزگار کەری کەسێکە سزای خۆی بگەیەنێتە ئەم دوورە ئەندازەیە. ئەی داد وەرینە! با هەق سەندنەوەکەتان میهرەبانی بێ تۆڵە نەبێ. هەر کەفەرمانی مەرگتان دا با مەبەستەکەتان پاکانەی ژیان بێ. هەر ئەوەندەتان بەس نیە کەلەنێوان خۆتانو ئەوانەی دەیان کوژن لەمپەرێك هەڵ نێن بەڵکو پێویستە خەمباریتان پەرۆش دەربرین بێ بۆ دیمانەی مرۆڤی باڵا.. ئا بەم رەنگە لەبان خۆتانەوە پاکانەی مانەوەتان دەکەن.

بڵێن: ئەو کابرایە دوژمنەو مەڵێن: خوێڕیلەیە.. وای دابنێن کە نەخۆشەو ریسوا نیە.. تێك چووەو تاوانبار نیە. تۆش جەنابی دادوەر-کەئێستا خۆت لێ سوور پۆش کردووە-بێتو ئەو هەمووەی لەبیر کردنەوەت دا قەوماندوتن بۆ ئەم خەڵکەیان جاڕبدەی ئەوسا بەگوێی خۆت دەی بیستی کەبەهاوارەوە دەڵێن: ئا-ئەو کابرایەی لەسەر ئەو کورسییە ڕۆنیشتووە دای بگرنە خوارێ؛ چونکە هێندە بەژار و ژەنگەوە ئاخناوە ئێق دەداتەوە.

..بەڵام بیر شتێکەو کار شتێکی کەیە..هەر وەك تارماییکا دیسان لەخۆی دا شتێکی سەربەخۆیە. لەنێوان ئەو سێ شتەدا هیچ پەیوەندییەکی وەهانیە کەبتوانین پێی بڵێین: بەندیواری نێوان (هۆو بەر هۆ).

تارمایی تاوانەکە لەبەرچاو کابرادا وێنەیەك بوو. ئەوسا دەموچاوی زەردهەڵ گەڕا؛ چونکە لەکاتی تاوانکردنەکەی دا هێزەکەی لەئاستی خۆی دانەبەزی.. بەڵام هێشتا بەتەواوی کۆتایی تاوانەکەی نەهاتبوو هێزەکەی خاوبوەوەو نەی توانی بەوردی لەو تارماییە تاوانەی هەڵ بڕوانێ.

ئەم کابرایە بۆی دەرکەوتووە تەنیا کارێکی کردووە..لەبەر ئەوە شێتییەکەی وەئاگادێ؛ چونکە باری نائاسایی بووەتە بنکەی قەوارەکەی..ئەو جغزەی تاوانبارەکە دەی کێشێ دەبێتە پێوەندی بیرکردنەوەی. بەچەشنی (فەرخە) یەك کە خەوبازێك

بـەدەوری دا بازنەیـەك دەكێشـێ. ناتوانـێ لـەو هێڵـەوە دەربچـێ تابچێتــە جغــزە شێتی‌یەكەیەوە.

دادوەرینە، گوێم لێ بگرن! ئەو شێتی‌یەی بەدوای كارەكەدا دێ شێتی‌یەكی دیكەی لەپێشەوە هاتووە.. ئێوەیش تا ئەو پەڕ بەگیان تاوانبارەكەدا نەچوونەتە خوارێ.

دادوەری سـوورپۆش دەپرسـێتەوە: هـۆی چـی بـوو تاوانبارەكـە دەسـتی دایـە كوشتنی.. لەدڵی خۆی‌دا دەڵێ! بكوژەكە لەپێش دا ویستوویەتی دزی بكا.

بەڵام من دەڵێم نەفسی تاوانبارەكە مەبەستی دزی نەبووە.. بەڵكو مەبەستی‌خوێن رشتن بوو–چونكە تینووی ئەوەبوو نووكە تیغی خۆی داچەقێنێ، ژیرایـەتی تاوانبـار لـەم شـێتایەتی‌یە نەگەیشـتووەو بـۆ قـەوماندنی ئـەو تاوانـەی ڕاخزیـوە..ژیرایــەتی یەكەشی لەتەكی‌دا دەكەوێتە ڕاز:

–كە تاوانەكەت بت خاتە دزی‌و تۆڵەوە بۆچی دەربەستی خوێن رشتنی؟

تاوانبار گوێی بۆ دەنگی ژیرایەتی‌یە بەسـەزمانەكەی راهێشـت.. چێشی بەگوێ‌دا چپاند هێنـدەی قوڕوقوشم گران بوو؛ ئیدی هـەر بـەدوای كوشـتنەكەدا–دزی‌یەكـەی كرد؛ چونكە ویستی شەرمەزار نەبێ‌و پاكانەی شێتی‌یەكەی بكا.

دیسـان قوڕقوشـم ئاسا تاوانەكەی بەلاوە گـران بـوو هۆشە بەسەزمانەكەشی هــەر قورس بوو. شەپڵەو تەزین بەسەری‌دا زاڵ بوون. خۆ ئەگەر پیرە تاوانبار بی‌توانی بایە ملی هەڵ بڕێتەوە كۆڵە گرانەكەی لێ دادەخزێ..بەڵام لەئێستە بەدواوە دەبێ كێ بێ سەری راوەشێنێ؟

ئەگـەر بەباشـی لـەو مرۆیـە بنـۆڕی تـەنیا كۆمەڵـە دەردێكت بۆ دەردەكەوێ دەبێتـە بەڵەدكاری هۆش بۆ جیهانی دەرەوەو ئەودالی تالانی‌یەك دەبێ لێی بەمەرام بگا.

ئـەو مرۆیـە بریتـی‌یـە لەتۆپەڵـە مـاری تێـك ئـالاو یـەك بینـە ناسـرەون تـالێك هـەڵ دەوەشـێن‌و بەهــەموو كـون‌و قوژبنێكـی دنیـادا ڕادەخـزن‌و پـەلاماری تـالانی خۆیـان دەدەن.

سـەرنجی ئـەو لەشـە بەسـتەزمانە بـدەن! گیانــە لاوازەكـەی بـە تەمایــە بەڵــەدی راســتەقینەی نــاوەوەی بــێ بەهــەموو ئێـش‌و ئازارەكانی‌یــەوە .. بەخــەیاڵی خــۆی وادەزانێ سەرجەمیان وازیان لەكوشتنە.

لـەم رۆژانـەدا هــەر كەسـێك ئـەو نەخۆشـیەی بەسـەر دا زاڵ بـێ، خراپـەكانی ئـەو رۆژگـارە ناگـەهان سـتەم زەدەی دەكـەن. ئـەوجا دەیـەوێ هـەر بـەو سـزایەی خـۆی

چەشتوویەتی خەڵکی ئازاربدا. زەمانێکیش لەمەبەر تێ پەڕی، چاکەو خراپەیەکی هەبوو کە بێجگەی چاکەو خراپەی ئەم ڕۆژگارەن، ئەوەش کاتێك بوو چی گومانو بەرتەمای مرۆڤ بوو، بەتاوان لەسەری حەلێب بوو، ئەوەی بەو جۆرەش دووچار بوو بوو، بەگاڵتە جاڕو خۆجیای نێو کۆمەڵ دادەنرا. ئەوجا بەهەمان سزا خواردنی خۆی دەکەوێتە ئازردانو وێزەی ئەوانی دی.

شێوە نەتان گەرەکە گوێ بۆ قسەکانم شل بکەن! چونکە وا دەزانن زیان بەکارسازەکانتان دەگەیەنن.. بەلام من هیچ کێشو سەنگێکم بۆ ئەو پیاو چاکانەتان دانەناوە.

لەو پیاو گەلەدا تێیان دا هەیە دڵم لێی دەشێوێتەوە.. وەنەبێ هەرچیەکی لەوان دا چارم نەوێ بەخراپەو بەد دابنرێ. چونکە من شێتی یەکیان بۆ دەخوازم مەرگیان بێ وەربکا بەچەشنی شێتی لەمەڕ تاوانبارە هەڵ بزڕکاوەکە.

ڕاستی‌یەکەی من دەمەوێ بەو شێتی‌یە بگوترێ:

ڕاستی، یان دڵ سۆزی، یان دادپەرستی، چونکە پەسندایەتی ئەو خەڵکە لەسەر تەمەن درێژی یەك دامەزراوە کە لە خۆشایەتی خوێڕیلانە دا ببرێتە سەر.. خۆشایەتی‌یەکەشیان هەر ئەوەندەیە: لە خۆیان دڵنیانو لەخۆڕازی بن.

من بەربەستێکمو لەکەناری ڕووباری خۆم هەڵ ناوە کێ دەتوانێ چاو لە من بکاو دەستی داوێنم بێ- بابی‌کا، کێش ناتوانێ ئەوە بکا با وانەزانێ دەبمە بەردەستیو بەوێنەی ئەو کەنەفتەی دەست دەداتە دار عەساکەی پڕم بداتێ.

زارا ئاوای گوت...

## خوێندنەوەو نووسین

ئەوەی نوسراوە پیشانی دەدەمو نمایشی دەکەم، نەفسم تەنیا مەیلی شتێك دەکا-مرۆڤ بەتکە خوێنەکانی نووسیبێتی ئەوجا تۆش بەخوێنی خۆت بنووسە؛ ئەوسا دەزانی کەخوێن گیانە.. کارێکی ئاسانیش نیە مرۆڤ لەخوێنی نامۆو بێگانە بگا. رقم لەهەموو خوێنەرێکی تەمەڵە؛ چونکە ئەوکەسەی دەخوێنێتەوە هیچ

خزمەتێکی خوێندنەوەکەی ناکا ئەگەر سەدەیەك بەسەر تاقمی خوێنەراندا تێ پەڕی دەشێ لەیادو بیرکردنەوەوە بۆ چرووكو بۆ درن هەڵسێ.

ئەگەر مافی فێرە خوێندنەوە بدرێتە هەموو کەس وەنەبێ-لەگەڵ تێ پەڕبوونی زەمانەدا-هەر نووسین تێك بچێ بەڵکو خودی بیرو بیرکردنەوەش هەرتێك دەچێ.

لەڕابووردوودا (بیر) بۆ خۆی خواوەندێك بوو.. ئەوجا پێ گەیشتو بوو بەپیاوێك..ئا ئێستاش چرە هەراو هوریایەکە، کەسێك چەند سوورەتێك بەخوێنی خۆی بنووسێتەوە بەوە رازی نابێ هەر بەوێرە وێرەوە بخوێنرێتەوە بگرە دەیەوێ هەموو دڵێك ئەو سوورەتانەی لەبەربکا.

نزیکترین رێگای نێوان کێوەکان ئەو هێڵەیەکە لە ترۆپکێکەوە دەکشێ بۆ ترۆپکێکی دی. خۆ ئەگەر قاچی عفریتت نەبن ئەوا ناتوانی ئەو رێگەیە بگری. کەواتە پێویستە هەموو پەیڕەوەکان وەك ئەو لووتکانە بڵندبن.. ئەوانەی پێشیان ڕادەگەیەنرێن دەبێ هێزو فرەی جەزرەبەکاریان هەبن و چاونەترسانە بەخۆیان ڕاپەرموون.

لەپەسند ئارایی دا سروە ناسك و ئاودارە..ئەوەش مەترسی یەکان کەلەدوورەوە سەرەتاتکی دەکەن چاوم لێ زەق دەکەنەوە، بیریشم لەسەر سەختی خۆیدا فرکانی قۆناغێکە. رێگەی راستم لەبەردەمدا کشاوە؛ کەواتە با لەپەری و جنۆکان دەستو پێوەند پەیدابکەم. منم خواوەندی زەبر خوازو ئازایەتی. کەسێ بتوانێ لەتارمایی یەکان هەڵ داو بیان تارێنێ-بەلایشیەوە سەخت نیە کە لەجنۆکان مریدو گرۆی خۆی بسازێنێ.

ئازایەتی یەکەم سەوداسەری پێکەنینە..هەموو رشتە بەندێکی نێوانم و نێوانتان پساوە..ئەو هەورانەی ژان گرتووی گەردەلوولن قورسە هەورە رەشەکانی ئێوەن و منیش لەئاست خۆمەوە گەمەم پێیان دی.

کاتێ تاسەی بڵندایەتی دەکەن بۆ سەرووی خۆتان هەڵ دەڕوانن.. بەڵام کەمن بەرەو ژوور هەڵ کشام ئاگام لەوەش بوو کەلەژێر پێم دا بوو. ئایە کەسی وەهاتان تێدا هەیە لەسەر لووتکە بێ و بشتوانێ پێ بکەنێ؟!

کەسێك بەسەر لووتکەی چیاکان دا دەورانی بێ گەمەی بەهەموو مەرگەساتێکی ژیان دێ.. گەمەی بەهەموو بەرەڵاگەو شانۆی ژیان دێ.. بگرە گاڵتە بەخودی ژیان دەکا.

دانایی دەیەوێ نەبەردی بێ پەروابین.. توندو تۆڵی گاڵتە جاڕبین؛ چونکە (دانایی) مێیە، هەموو مێیەکیش هەر حەزی لەسەختە پیاوی تێکۆشەرە.

ئێوە دەڵێن ژیان باری قورس و گرانە. دە–پێشم بڵێن: بۆچی بەلووت بەرزیو بایی بوونەوە بەرەوڕووی بەیانی دەبنەوە.. کەئێوارەش داهات تەنیا بەستەزمانیو مل شۆڕیتان پێوە دیارە؟!

بەڕاستی ژیان گرانە..بەڵام ئەو داهێزانەی پێتانەوە دیارە چییە؟..ئەدی هەمووومان ولاخ نینو هەر ولاخێکیشمان قورسە باری خۆی نیە؟..ئەی لەنێوان ئێمەو خونچە گوڵان دا وێچونێك هەیە کەبەسەخڵەتییەوە لەبەر لێ هەڵ نیشتنی دڵۆپە شەونم دا دەلەرزێ؟!

بێ گومان ژیانمان خۆش دەوێ، لەبەر ئەوەش نیە: چونکە خوومان بەژیانەوە گرتووە.. بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەخوومان بەخۆشەویستی ژیانەوە گرتووە..

خۆشەویستی شێتییەکی تێدا هەیە.. ئەوجا شێتیش شتێکی دانایی تێدا هەیە. منیش کەخۆم حەزم لەژیانە ئەوەم بۆ دەردەکەوێ، ئەوەی باشتر هەست بەکامەرانی دەکا بریتییە لەخێڵە پەپولەو بڵقە کەفە سابوونی بەتاڵو ئەو مەردومانەی بەچەشنی ئەوانن..

کەزارا دەڕوانێتە ئەو گیانە بچووکە خنجیلانەی لەشێتی خۆیان دا هەمیشە خورپەن کاری گەردەبێو بە لاوژەوە بانگی گریانی لێ هەڵ دەدا.

ئەو خواوەندەی توانام دەداتێ کە باوەڕی پێ بهێنم هەر ئەو خواوەندەیە کە دەشتوانێ بکەوێتە سەما.

کاتێ شەیتانم لێ دەرکەوت، بینیم بێ چرکە بەخۆیەوە گلاوە لەگورجو گۆڵیدا خۆی لێ هەڵ ناوە. ئەوجا گوتم:

ئەمە ئەو قورسە گیانەیە کەبەلایەوە هەموو بارو دۆخێك یەکسانە.

هەرکاتێ ویستت بکوژی داوای یارمەتی لەڕق مەکەو پەنا بەرەبەر پێکەنین؛ کەواتە باراستەوەبین ئەو قورسە گیانە بکوژین.

من لەوەتی فێرە ڕۆیشتن بووم یەکبینە ڕادەکەم.. ئێستاش ئائەوە تام دەفرم، پێویستم بە کەسیش نیە پاڵم بداو بکەومە بزووتن.

ئێستا بەتەواوی سووکەڵەم.. من باڵ دەگرمەوەو هەست دەکەم لەژوور زاتی خۆم دا دەسووڕێمەوەو لەهەمان سات دا لەدەروونیشم دا خواوەندێك سەما دەکا.

زارا ئاوای گوت...

## دارە گەورەی کێوەکە

ئێوارەیەك زارا چووە سەر ئەو گردەی بەسەر شاری (مانگابەڵەك)دا دەیڕوانی، لەوێ تووشی لاوێك بوو، توومەز کاتی خۆی پشتی لێ هەڵ دەکردو رووی لێ وەردەگێڕا، لاوەکە لەپاڵ قەدی داریکی گەورەدا لێی دانیشتبوو بەچاوی حەسرەتناکەوە بەدۆڵەکەیدا-دەڕوانی، زارا هاتە بەرەوەو هەردوو قۆڵی لەقەدی دارەکە وەرهێناو گوتی : ئەگەر بمەوێ بەم دەستانە ئەم دارە رابوەشێنم ئەوا ناتوانم.. بەلأم ئەو بایەی بەچاو نایبینی چۆن حەز بکا دەی هەژێنێ و دەیپێچێتەوە.. ئاواش دەستە نادیارەکانی ئێمە رادەوەشێنن و دەمان پێچنەوە.

لاوەکە بەشڵەژانەوە ڕاستەوەبوو، گوتی: چۆن-ئەمە زارایەو قسە دەکا؟! خۆمن بیرو غایلەم لای ئەوبوو. زارا گوتی: کابرا ئەوەلەچی دەترسی؟.. ئەدی مرۆڤ و دارەگەورەکە هەر یەك حاڵەتیان نیە؟.. مرۆڤ چەندە بۆ سەرچاوەکانی نوور هەڵ بکشێ بنجەکانی بەناخی زەوی و تاریکستان و نزمانیدا رۆدەچن.

لاوە هاواری کرد: بەڵێ! ئێمە بەخراپیدا دەڕۆین، بەلأم تۆ چۆن بۆت دەکرێ نهێنیەکانی دەروونی من هەڵبپشکنی؟

زارا خەندەی هاتێ و گوتی: زۆرینەی ئەو نەفسانەی دەمانەوێ بیان بپشکنین دەبێ لەپێشەوە دایان بهێنین و بیان خوڵقێنین.

لاوەکە گەرایەوە سەر قسەکەی: زارا راستم گوت:بەڵێ ئێمە وابەخراپەدا رۆدەچین. لەوەتەی بەتەمای بڵندایەتیم ئەو باوەڕەی بەخۆمم بوو دادەوەشێ. لەوەش بێ بەشم کەخەڵکی باوەڕیان پێم بێ.. دەبێ هۆی ئەمە چی بێ؟ من خێرا پێدا دەگەڕێم کەچی

حاڵی حازرم ڕابووردووی ڕۆژگارم پەك دەخا..چەندە بەسەر پەیژەخانەکاندا خولاومەوەو شەقاوم هەڵ هێنایەوە کەچی ئێستا پلەبەپلە لە کەمتەر خەمیم خۆش نابن. کە دەگەمە لووتکە هەمیشە تەنیایی خۆمم لەبەر چاوەو گەزێو ئێسقانەکانم دەلەرزن.. نازانم کەهاتوومەتە سەر لووتکە چیم لێ دەوێو داوەرانی چیمە؟

سووك بینم شان بەشانی ئارەزووە گەشە سەندووەکانمەو.. چەندە بۆی هەڵکشێم ئەوانەی بەرزوە بوون بەلامەوە سووکترنو نازانم مەبەستیان لەبان لووتکەکان چییە؟

کەلەسەر بەرزایی هەڵ دەنگووم ڕەفتارێکەو تەریقم دەکاتەوە.. زۆ جار گاڵتەم بەهەناسەبڕکێی خۆم کردووە.. حەزیشم لەوانەنیە کەبۆ فڕین باڵیان فش دەکەنەوە.. ئای کە ڕاوەستانی سەر ترۆپك لەخۆیدا چۆن ماندو بوونێکە!

زارا سەیری پیرەداری کرد، ئەوا لاوەکە پشتی پێوەداوە، گوتی: ئەم دارە کە گەشەی کردووەو بەسەر ئەم خەڵكو گیانەوەرانەدا دەڕوانێ–بەتەنێ بۆ چڵە پۆپە هەڵ دەکشێ. دوای ئەوەی گەیشتە ئەو پایە بڵندییە بێتو بییەوێ قسەبکا ئەوا هەرگیز کەس لەگفتەکانی ناگا. لەچاوەڕوانیداو بەئارام خۆی پاساو دەدا.. هەرچەندە گەیشتووەتە شوێن ڕادانی هەوران چاوەڕوانی یەکەم گەردەلوولە لێی هەڵ بکا!

لاوەکە بەگەرماییەوە قریواندی: ئەی زارا!

ڕاستت گوت. کەداوای بەرزەوەبوون دەکەم ڕووم کردە قولاییەکان. تۆش ئەو هەورە برووسکەیەی چاوەڕوانی بووم. باش سەرنجم بدەرێ! لەوەتی تۆمان لێ وەدەرکەوتووە ببینەو چ حاڵەتێکم بەسەردا هاتووە.. لەوەش بەدەرنیم کەببمە قوربانی ئەو زرگنییەی داگیری کردووم.

لەکالانە چاوی لاوەکەدا بەخوڕ فرمێسك دادەباریو قسەشی دەکرد، زاراش قۆڵی خستە بن دەستیو بردی بەڕێگادا، ماوەیەکیان بڕیو پێی گوت: بەراستی دڵ پارەم! ئەو بەیانو دەربڕینەی لەچاوەکانت دا دەی خوێنمەوە لەوە بەولاترە کەخۆت بهاوێژیتە جەرگەی مەترسییەکانەوە.

براله! تۆ هێشتا ئازاد نەبووی..بگرە یەکبینە بۆ ئازادی دەڕەنجێی بەچەشنی ئەوانەی بەدەم خەوەوە دەڕەتێن، هەستت لەسەر پێیەو زەینت تیژە.

دەتەوێ لەپێوەند ڕەها بیو بەرەو لووتکە هەڵبکشێی .. گیانیشت سەوداگەری مۆڵگەی ئەستێرەکانە، بەڵام ڕەمەكو غەریزە بەدەکانت خۆیان تاسەی ئازادی دەکەن.

سەگە کلك و گوێ کراوەکانیشت داوای ئازادیی خۆیان دەکەن و بەکەیفەوە لە سەر دابەکانیادا دەوەڕن. لەکاتێك دا هۆشت بە تەمایە چی دەرگای بەندیخانەکانتە بیان شکێنێ. بەمرۆیەکی ڕەهاو سەرفرازت نازانم؛ تۆ هەر ئەو بەندەیەی کەحەزی لەئازادی خۆیەتی. گیانی ئەوجۆرە بەندییانەش بەتوندو تۆڵ ناودەبرێ.. ئەگەرچی– بەداخەوە!–دەبێتە خۆ بوێرو ئوینبازێکی بەدکار.

ئەو کەسەی هۆشی خۆی ئازاد کردبێ پێویستە لەپاشماوەی خووی مت کردنی سۆزەوار (عواگف)و تێوە گلانی پیسی، خۆی پاکیزە ڕابگرێ و دەروونی لێ مشتومالْ بکا.. تاوەکو نیگاو چاوەکانی بێگەردوو گەش بن.. لەوەش باخەبەرم کەبە چ مەترسییەکەوە گرفتاری، بەڵام سوێندت دەدەم بەخۆشەویستی یەکەم و بەو هیوایەی بەتۆمە زینهار! نەکەی ئاوات و خۆشەویستی لەخۆت بتارێنی.

سەرەڕای ئەوەی مەردوومگەلەکە ناحەزانە چاوت تێ ببڕن تۆ لەخۆت دا هەست بەسەنگینی و شکۆمەندی دەکەی و ئەوانیش بەسەنگینیت دەزانن. بشزانە ئەو خەڵکە ڕاگوزارانە بەلای بەڕێزاندا تێ دەتەقێنن و ئاوڕیان لێ نادەنەوە..بەڵام کارسازەکان گرنگی یان پێئەدەن؛ خۆ ئەگەر لەڕێگاو بانی خۆیان دا تووشی کابرایەکی مەزن پۆش و شکۆمەندبوون، خێرا بۆ ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە بەپیاوچاك ناوی دەهێنن.

پیاوی بەڕێز دەیەوێ پەسند داهێنی تازە خوڵقێن بێ، لەهەمان کات دا پیاوی کارساز (رجل اصلاح) بۆ کۆنەوارەکان بە پەرۆشەو زۆربەی ئارەزووەکانی بەو بارەوە دەقیان گرتووە.

مەترسی لەوەدا نیە مەزنە پیاو هەڵگەڕێتەوەو ببێتە کارساز..بەڵام زۆر مەترسی لەوەدەکرێ ببێتە کاول کەرێکی بێ وێڵ.

لەنێو ئەو مەردمگەلەدا زۆر مەزنە پیاوم ناسیون، سەرەتا وایان پیشان داوە کەئەوان بەهەرە ئاواتی بەڕێز دەگەن..کەچی ئەوەندەی نەخایاندووە کەوتوونەتە گەمە پێ کردنی هەموو بەزە ئاواتێك؛ ئیدی ژیاون و ئارەزووەکانیان بەر لەدەرکەوتن منداربوونەتەوە.. ژیاون و بێ وێڵیش بەبەردەمیان دا تێ پەڕیوە..ژیاون و هەر پلانێکی بەیانیانیان جاڕ دابێ لەئێوارانـدا سەرەنگرێ بووە، خەڵکی گوتیان: بیرۆکەش وەك هەموو حەزەکان تاکە شەهوەت و هەوەسێکە.

ئابەو چەشنە ((بیر)) لەنێویان دا دووباڵەی وێك هێنان و تێك شكان..

..ئێستاش ئەوا خۆی كێش دەكاو بشگاتە هەرشتێك پیسی دەكا.

لەوەبەر ئەو خەڵكە بیریان لەوەدەكردەوە كەببنە پاڵەوان. هەرئەوەندەشیان بۆ لوا بكەونە نازو نیعمەتەوە. ئەوا تارمایی پاڵەوانەتیش خەمناكیان دەكاو ترسیان لەدڵ دەگێڕێ.

سوێندت ئەدەم بەخۆشەویستی یەكەم.. سوێندت ئەدەم بەو ئومێدەی بەتۆمە كەئەو پاڵەوانەی لەنەفسی خۆت دا حەشارت داوە نەی كەیتە دەرەوە..چونكە پێویستە بڵندترین ئاواتەكانت بەدی بهێنیٚ.

زارا ئاوای گوت...

# جارچیانی مەرگ[١٣]

ئای کە دەم بەهاوارەکانی مەرگ چەندە زۆرن!

دنیاش پڕە لەو مەردومانەی کەبانگی پشت لەژیانیان کردووەتە ئەرکێکی تەوزیمی. زەویش بەم لاوەکیانەوە جمەیەتی و ژیانیان تێك داوە. جێی خۆیەتی کەژیان ئەبەدی بێت و ئەم جارچیانە لەئامێزگریّ و لەکۆڵ ئەم دنیایەیان بکاتەوەو لێی دەرچن.

دەم بەقریشکەی مەرگ بە زەردە پیاو، رەشە پیاو ناوبردەبوون؛ منیش بەشی خۆم ناودێریان دەکەم و بەچەند رەنگی کەوە ئاشکرا تردەبن.

ئەوانە لەگشت کەس سهندە ترن؛ چونکە جانەوری دڕندە لەئاوەژووی ئەواندا خۆی مت داوە، ناچارانە لەنێوان دوو حاڵەت دان: باری خۆپڕووکاندن بەتینی هەوەس و باری چەپاندنی حەزوهەوەس بەئەشکەنجەدان. ئەو حەزەشیان هەر لەخۆیدا ئازاردانە. ئەو زەلامانە رمووزنێکن هێشتا نەگەیشتوونەتە پلەی مرۆڤایە...

با- ئەوانە هەر مزگێنی ژیان بێزران جارپدەن و لە هەوارستان و بەهارستانی ژیان دەرفرتێن.

ئەم جار چیانە کەسانێکن تووشی سیل و دیقی گیان بوون، لەگەڵ هاتنە ژیانەوە مەرگیان پێوە دیارە. وێرای ئەوەش کەبنەماکانی زوهدو خۆخواردنەوە هەراسانی کردوون.

ئەو گرۆهە حەز دەکەن هاوڕیزی مردووەکان بن..ئێمەش لەسەرمانە ئەو ئیرادەیەی ئەوانمان پێ خۆش بێ و با لەژیاندنەوەی ئەو مرداونەو شێواندنی ئەو تابووتە بزۆکانە خۆداری بکەین و خۆپارێزبین.

---

[١٣] المنذرون بالموت: جارچیانی مەرگ..دەم بەهاوارانی مەرگ: بەمەرگ ترسێن. دیسان بەرامبەر بە ((مسخ))، رمووزن، رەشەوەبوو، بەد فەساڵ..دەست دەدەن.

هەر کەتووشی نەخۆشێك یان پیرێك یان تەرمێك ببوونایە دەیان گوت: (بەڕاستی ژیان بۆی دەرچووە). ئەوانە بێتو رەواگیر بوونایە دەیان گوت: ئەوان خۆیان لەژیان دەرباز بوونو چاویان لێ ترازاوە؛ چونکە تەنیا لەدیوێکەوە دەنۆڕنە هەبوون.

ئەوانە خۆیان بەبەرگە پەژارەیەکی فراوانەوە پێچاوەتەوە. تامەزرۆی ئەو رووداوانەن کەبەدوای خۆیان دا مەرگ کێش دەکەن. بەڵام کەچاوەڕوانی مەرگن لەهەراسانیدا ددانیان دەسوونەوە. لەهەمان کاتیش دا سووکانە دەستیان بۆ هەرشتێکی خۆشو بەلەزەت درێژ دەکەن؛ بەلایانەوە ژیان پەلاشێکەو گەمەی پێ دەکەن..کەچی لەسەریشی سوورن!

پەندی ئەو مەردومگەلە هاوار دەکا: ژیان شێتییە..لەوەش خراپتر دەستاوێژبوونی ژیانە. ئاوا شێتایەتی ئێمەی بەم مەردە بردووە؟!))

دەڵێن: ژیان ئێشو ئازارە.. باشە، ئەوان راست دەکەن. ئەی کە ژیان بریتی بێ لەوئازارچەشتنە بۆچی سنوورێك بۆ ژیان دانانێن؟.. ئەو ئامۆژگاریانە خۆکوشتن بەسەر مەردووم دا دەسەپێنن. هەندێ جارێ مەرگ دەدەن، دەڵێن: تێخزانی زایەندی تاوانە؛دەشێ خۆداری لێ بکرێو مان لە زانو زەوکردن بگرن. برێکی دی دەڵێن: منداڵ بوون بەژانە؛ کەواتە بۆچی ژنان دەزێنو رۆڵەی بەدکار فرێ دەدەنە بوونەوەر؟ ئەمانەش هەر ئەو تاقمەن کەجارێ نەمان رادەهێڵن.

کۆمەڵێکی دی پێت دەڵێن: میهرەبانی شتێکی نووسەكو ملۆزمە، لێ نابێتەوە. کەواتە چی لەدەست دایە بی گرە.. ئەوەی کەسایەتیس لێ پێك هاتووە تۆ بی گرە. ئەگەر ئەوەت کرد ئەوا ئەو ڕشتە سیمەی ئێمە بەژیانەوە دەبەستێتەوە دەی پسێنی.. ئەگەر ئەو کۆمەڵە خەڵکە میهرەبانی یەکەیان بەناخ دا رووچووبایە ئەوا رەنجیان دەکێشا کەبێجگەی خۆیان هان بدەن لەژیان بتۆرێن. بائەو کۆمەڵە چۆنیان دەق پێوەگرتووە لەسەری برۆن؛ چونکە میهرەبانییە راستینەکەیان خۆی لەئازار پێ گەیاندن دا حەشارداوە.

ئەو مەردوومانە هەر ئەوەندەیان مەبەستە کەخۆیان لەداخوازیەکانی مانەوە (بقاو) بدزنەوە. دەربەست نایەن کە زنجیرەکانیان بخەنە سەر ئەستۆی کەسانی دیکە.

دیسان ئێوەش ئەی خەمبارەکانی جیهانو بردەباری زەحمەت! ئایە لەدەست ئەم ژیانە هیلاك نەبوون؟..

ئایا- دەردەسەری-نەفسی ئێوەی نەگەیاندوەتە: تاوەکو ئەویش بەترسە جاڕی مەرگەوە راستەوەبێ؟!

ئەی ئەو کەسانەی کاری دڕندانەتان پێ خۆشە..

ئەی ئەو کەسانەی کەیفتان بەقەومانی سەمەرەی راگوزارانە سازدەبێ! هەر ئەوانەن کەخۆتان بەخۆتانەوە گوشیوە.. مەگەر بۆ ئەوەی لەدەست ژیان رابکەن ئەوجا خۆتان هیلاك بکەنو لەخۆتانەوە بگلێن تازاتی خۆتان بگەیەننە قۆناغی (خۆلەبیرچوونەوە). ئەگەر باوەڕی بەتینتان بەژیان هەبوایە، ئاوا بەجارێ بەیدەستی ئێستاتان نەدەبوون.

نیهادتان دوواچۆڕی ئەو هێزەی هاتووە کە لەچاوەڕوانیدا پێویستە.. ئەوخۆڕاگرتنەش کەبۆ باری تەوەزەلیتان گەرەکە ئەوەشی تێدانەماوە.. لەهەموو شوێنێك دا جاڕی دەم بەهاوارەکانی مەرگ دەنگ ئەداتەوە..جیهان جمەیەتی لەو خەڵکەی بانگ کردنیان بۆ مەرگ کارێکی واجبە.. یان باشتری بڵێین: بانگ کردنیان بۆ ژیانە ئەبەدیەکە، بەلای منەوە کەئەو خەڵکە بۆ زەوی چۆڵ کردن بەپەلەبن هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەم و ئەودا نیە.

زارا ئاوای گوت...

## جەنگ و جەنگاوەران

نامانەوێ باشەی دوژمنانمان چاودێریمان بکەن..ناشمانەوێ ئەوانەی لەکانگای دڵمانەوە خۆشمان دەوێن چاودێریمان بکەن.

-وازم لێ بێرن راستیتان پێ ڕادەگەیەنم-

ئەی هەڤاڵگەلی کۆڕی جەنگ! لەناخی دڵمەوەئێوەم خۆش دەوێ، منی ئێستاکە هەر ئەوەم کەدوێنێ وەك ئێوە سەربازبووم،کەواتە من هەڵبژاردەی دوژمنەکانتانم.

-وازم لێ بێرن راستیتان پێ ڕادەگەیەنم-

ئەو رق و حەسودیەی لەدڵتان دایە دەی زانم، گەورەییتان بەرادەیەکە ناتوانن لەئاست ئەو رق و حەسوودییە خۆتان نەزان بکەن.. کەواتە با گەورایەتیتان لەو شەرمنی‌یەی لە دڵتان دایە بتان سڵەمێنێتەوە. خۆ ئەگەر لەراستی زانی‌دا نەتان توانی ببنە پیاوچاك (اولیا و) بەلای کەمەوە ببنە سەربازو لەپێناو ئەو زانیاری‌یەدا بخەبتن. خەباتکارانیش بریتین لەپێشەنگی پیاوچاکان.ژمارەی سەرباز زۆر بووە، خۆزگە هێندەی ئەم ژمارەیە جەنگاوەریشم بدیتنایە، بەو چەشنەی کالآیان یەك شێوەیە لەوەناچێ سروشت و دەروونیان لەسەر یەك تەرز بێ.

با چاوەکانتان ڕەهابن و راوی دوژمنێکتان بۆ بکەن.. ئەو چاوانەی کە لەتریسکەیان دا بەرایی خەشم دەردەکەوێ.. بڕۆن تووشی دوژمنەکانتان بن لەپێناوی بیرەکانتان بکەونە خەباتی جەنگەوە..خۆ ئەگەر ئەوبیرانەتان لە شەڕگەدا کەوتن، ئەوا دڵ سۆزی هەردوو لاتان بەقریوەی سەرکەوتنەوە ڕاست دەبێتەوە.

وەك هۆیەك بۆ شەڕ هەڵ گیرسانەوە حەزلەئاشتی بکەن.. ئاشتی چاك ئەوەیە ماوەکەی کورت بێ. من ئاشتیتان پیشان نادەم بەڵکو سەرکەوتنتان بۆ دەست نیشان دەکەم. کەواتە باکارتان خەبات بێ و ئاشتیتان سەرکەوتن بێ..

تا تیر بەسەر کەوانەوە ئاراستە نەبێ من دڵم ناسرەوێ..

ئاسوودەیی مرۆی لاکەوتیش مایەی چەنابازی و مشتومڕە؛ کەواتە با ئاشتیتان بریتی بێ لەزاڵ بوون و پیرۆزی...

ئێوە دەڵێن مەبەستی چاك پاکانەی جەنگ دەکا..بەلآم من پێتان دەڵێم: جەنگی چاك پاکانەی گشت مەبەستەکان دەکا. زۆر جاران ئەو گەورە شکۆمەندانەی جەنگ و جەسارەت ڕەخساندوونی خۆشەویستی نێوان مەردومگەلەکە نەی توانیوە ئەو نموونانە بدا بەدەستەوە. تائێستاش قوربانی‌یەکان بەجەسووریتان ڕزگاربوون نەوەك بەسایەی بەزەیی پێداهاتنەوەتان.

ئێوە لەخێر دەپرسنەوە، خێریش خۆ پەسند کردنە بەئازایەتی، کەواتە واز لەچکۆلەکان بهێنن، بائەوان بڵێن: ((خێر لەناسکی و جوانی‌دایە)).

دەڵێن: ئێوە بێ دڵن؛ چونکە دڵەکانتان بەدڵسۆزیەوە لێ ئەدەن. منیش نەوازش و دڵ سۆزیتانم خۆش دەوێن. ئێوە شەرمنن؛ چونکە شەپۆلەکانتان لەبەرزبوونەوەیاندا تەکان دەدەن، بێجگەی ئێوەش شەرمەزارن..خەجاڵەتن؛ چونکە شەپۆلەکانیان لەنزم

بوونەوەیان دا دەکشێنەوە. بەڕاستی دزێویتان سامناکە! کەواتە خۆتانی تێوە گلێنن: ئەو قەشەنگی‌یەی لەپۆشەنی دزێودا هەیە لەپۆشاکی کەدا چنگ ناکەوێ.

کاتـــێ نـــەفس بڵنـــد دەبێتـــەوە دەوەســـتێ و دەی کاتـــە هـــەرا، دڵ رەقیـــش لەبڵندبوونـەوەتان دا خـۆی حەشـار داوە، حـاڵی ئێـوە لای مـن شـاراوە نیـە.. هـەر لەمـەیدانی دڵ رەقی‌دا ئـەوەی بـەزەبروو ئـەوەی زەبوونـە بەیـەك دەگەنـەوە، ناشـتوانن لێکدی بگەن–من باشتان دەناسم کە ئێوە کێن؟!

ئەگەر بەسەر دوژمنێك دا زاڵ بوون کاسەی غەزەبی بەسەردا قڵپ بکەنەوە، نەکەن بەســووکی بزانــن؛ چونکــە لەســایەی دوژمنانــەوە بــەخۆتان دەنــازن، ئەگــەر بــەم راسپێری‌یەم رەفتار بکەن ئـەوا سـەرکەوتنی دوژمنەکەشـتان هەردەبێتـە سـەرکەوتنی ئێوە.

بــۆ کۆیلــەو ژێــر دەســتە شــۆڕش مایــەی شــانازیە، بائــەو شانازی‌یەشــتان لەسەربناغەی گوێ ڕایەڵی بێ و فەرمانی فەرماندەشتان بەشێك بێ لەو گوێ رایەڵی‌یە. جەنگاوەری راست ئـەو کـارەی دەخرێتـە ئەسـتۆی پێـش ئـەوکارەی دەخـا کـەخۆی گەرەکیـەتی. کەواتـە ئـەوەی پێتـان سـپێردراوە ئاراسـتەی ئامـانجی ئارەزووەکانتـانی بکــەن باخۆشویســتنی ژیانتــان دەربڕینێکــی هــەرە بــاڵای ئاواتــەکانتان بــێ ئــەو ئاواتانەشتان بریتی بن لە باڵاترین بیرۆکە لەژیان دا.

هەرچەندە داوای لێ بووردنتان لێ دەکەم– کەوەك فەرماندە دەری دەبڕم–بەرزترین بیرۆکە بۆ ئێوە تەنیا ئەم بنکەیەیە: ((مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە کەپێویستە بەسەری دا باڵابین)).

بەو چەشنە ژیانتان بەرەچەی گوێ رایەڵی و تێکۆشاندا تێدەپەڕێ..ئەوجا بـە لاتانەوە گرنگ نیە مەودای ژیانەکەتان بەرتەسك بێ یان بەرین بێ.

ئەوەش بەجەنگاوەر دانانرێ کەمامەڵەتی چاودێرانەو خاترانە بێ..

ئەی برا چەکدارەکانم ! چونکە ئێوەم لەکانگای دڵمەوە خۆش دەوێ ئەوا بـەبێ خاترانە راستیم پی گوتن.

زارا ئاوای گوت...

# بتى تازه

تائێستاش لەبڕێ شوێنی ئەم زەمینەدا چەندان هۆزو گەل بۆخۆیان سەریان بەیەکەوە ناوە. بەڵام ئەوەی لەلای ئێمە هەیە بریتییە لە دەوڵەت، ناش زانن– دەوڵەتان چین؟

گوێم بدەنێ! تالەبارەی مەرگی گەلانەوە قسەتان بۆ بکەم: سەراوان و بناوان دەوڵەت بریتییە لەرموورنێکی ساردو سڕی بەد فەساڵ. لەسەر خۆ درۆ دەکاو دەڵێ: ((منم دەوڵەت منم گەل))

نەکەن بەقسەی دەوڵەت بکەن ! ئەو خوڵقێنەرانەی ئیمان و خۆشەویستییان بڵاوکردۆتەوە، هەرئەوان گەلانیان پێك هێناون. ئەوانەی بۆ کۆمەڵە زەبەندەکان داوایان ناوەتەوە هەر ئەوانەن قەوارەیان تێك و مەکان دەدەن و لەسەر پەردووەکانیان دەوڵەت و حوکمڕان بنیاد دەنێن..ئەوجا لەژوور سەری گەلەوە رمی تیژ هەڵداوەسن و سەدان هەوەس و حەز لەبەرچاوی گەل هەڵ دەنێن.

گەل لەهەر شوێنێکی ئەم سەرزەوییە بژێوگایەکی بۆ مابێتەوەو سەربەست بووبێ نازانێ دەوڵەت چییە، چۆن سڵ لە سیحرباز دەکرێتەوە ئەو گەلەش لە دەوڵەت دەسڵەمێتەوە بەشتێکی لاوەکی و نائاسای دەزانێ و داب و نەریتیتیان لێ دەشێوێنێ؛ فەرموون ئەوەش بەڵگە:

هەموو گەلێك بۆ خۆی دەربڕینیتایبەتی بۆ چاکەو خراپەی خۆی هەیە کە دراوسێ گەلەکەی دی لەو بەیانەی ئەم بۆ دەستوورو باوی خۆی دایناوە تێ ناگا. لەهەمان کات دا دەوڵەت لەهەموو چاکەو خراپە دەربڕینێکیدا درۆزنە. هەرچی مڵکی دەوڵەتیشە دەست کەوتی دزیو فزییە.شتەکانی دەوڵەت سەرجەم قەڵبن و بەددان و کەڵبەی خواستەنی قەپ دادەگرێ و هەناویشی ساختەکارە.. دروشمەکەشی هەرئەمەیە: ((بەیانی ئاڵۆزو شێواو لەبارەی چاکەو خراپەوە)) ئابەو بەیانەیەوە بەرەو نەمانی دەکاتەوە..بەڵێ بەخواستی مەرگ خوازەکان دەوڵەت دروشمەکەی لەمەڕ خۆی بڵاودەکاتەوە.

ئەوانەی پێدەنێنە دنیاوە لەژمارە بەدەرن، کە دەوڵەتیش دروست بووە تەنیا بۆ خزمەتی ملۆزمو لاورگەی ژیان درووست بووە. ئا سەیری ئەم دەوڵەتەو ئەو دەوڵەتە بکەن! چۆن چۆنی لەوارلاوەکییەکان خۆی بۆ کێش دەکەن! ئەویش -خواهەڵناگرێ- توند دەیان گوشێ بەسنگی خۆیەوەو بەدەستەملانێوە پڕ ماچیان دەکا. ئا-گوێ لەدەوڵەت بگرن! چۆن دەنەڕێنێ:

(بەسەر رووی زەمینەوە لەمن گەورە تر نیە.. منم دەسەڵاتی خواوەندانەی کارسان)

هەر کەدەوڵەت ئامای قیڕاند زۆرینەی خەڵکو خوا بەچۆك دا دێن، لەنێو کڕنووش بەرەکانیش دا زۆری وایان هەن نەگوێ درێژن و نەکورت بینن.

بەداخەوە ئەو درۆو دەلەسانە بەشی خۆیان هەیە تا خەڵکی باوەڕیان پێ بکەن.. نەخوازەڵا لەنێو ئێوەش دا کەنەفس بەرزیتان تێرا دەگەڕێ! دەوڵەت باش دەزانێ چۆن ختوکەی ئەو دڵانەدا بدا کەلە رەوشت جوانی و بەخشندەیی دا کەیلن. ئەی ئەو کەسانەی بەسەر کۆنەخواوەندی دا زاڵ بوون! دەوڵەت کانگای نهێنیەکانی دەروونتان دەسمێ. باش دەزانێ کەماندوی کاروانی تێکۆشانن ئەوجا فرسەت لەو شل و کول بوونەتان دەهینێ و بۆ بەندایەتی بتی تازە دەتان خاتە کار.

بتێکەو ئاواتی ئەوەیە پاڵەوان و مەزنە پیاوان بەدەوریدا بێن. لەراستیدا رەمووزنێکی ساردو سڕەو گەرەکیەتی رۆژی درەخشانی نێودڵان بکوژێنێتەوە.

هەر ئەوەندە کڕنووشی بۆ بەرن هەموو شتێکتان پێ دەبەخشێ. ئەم تازە بتە ورشەو گریشمەی رەوشتە پەسندەکانتان دەگرێ.. ئەو پیاوەتی و ناموسەی لەنیگای چاوەکانتان دا-دەورنگێتەوە دەیان کڕێ..پێویستی پێتانە تاژمارەیەکی تەواو لەلاوەکییەکانی ژیان بۆ لای خۆی جڵەو کێش بکا. لەلایەکەوە قەڵاتی جەهەنەمییەو لەو لایشەوە رەوە ئەسپی مەرگەو سمڕ سمڕ بەبارە ئافەرین و نیشانەی پلەو پایەوە تێ دەتەقێنن. بەڵێ! ئەوە دروێنەی مەردومگەلەو مەرگ دای هێناوە..خۆیشی پێ هەڵ دەکێشێ: گوایە ئەوەیە ژیان بەشینەوە..ئەمە کارێکەو لەگەڵ بیروباوەڕی جارچیانی مەرگ دا رێك دێ؛ چونکە ئەم مەرگەساتە بەخزمەتێکی باش دادەنێن.

لەکوێ هەموو کەس ژەهری لێهەڵ لووشی و هەموو مرۆیەکیش بەچاك و خراپیەوە نەفسی خۆی دا چاند ئالەوێ دەوڵەت قوت دەبێتەوە؛ چونکە سەرجەمی ئەو

شوێنانەی کەخۆ کوشتنی شێنەیی تێدا بە ژیان دابنرێ دەوڵەت دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا دەسەپێنی.

سەرنجی لاوەکی یەکانی ژیان بدەن کە بەری ڕەنجی داهێنەکانو گەنجینەی دانایان دەفڕێنن..ئەمە دزێتی یەو ناوی دەنێن شارستانەتی..بەڵام هەموو شتێکیش لەژێر چنگیان دا دەبێتە دەردو مەینەتی.. سەرنجی ئەو لاوەکی یانە بدەن: سفەتی ڕۆژنامەنووسییان بۆ خۆیان داناوەو بڵندانە دەنۆڕنە خۆیان هەر زەقنەموتێ لەمەڕ خۆیان تف دەکەنەوە.. قەپ لێکدی دەگرنو ئەو هێزەشیان نیە چییان لرف دابێ هەرسی بکەن.

سەرنجی ئەو ملۆزمانە بدەن کەچۆن دارایی کەڵەکە دەکەن، چەندەش زەخیرە کەڵەکە بکەن هەژار ترن؛ ئەمان دەیانەوێ لەپێشەوە پەلاماری یەکەم جوڵێنەری (هێز) بدەن کە ماڵو سامانە..ئا بەم ڕەنگە دەیانەوێ دەست بەسەر هێزدا بگرن.. لەو سەریشەوە لەجغزی لاوەکی یە کۆڵەوارەکان دەربازنابن.

سەیربکەن، سەیری ئەو مەیموونانە بکەن کەچۆن بەسەر یەك دا پێ هەڵ دەگەڕێنو تەکان بەخۆیان دەدەنو لەقەراغی بەرزایی یەوە لەقوڕ گەوزیون. هەریەکەیان دەیەوێ لە ((تەخت)) نزیك بێتەوە، ئاشقی گەیشتنە تەخت شێتی کردوون؛ وادەزانن لەنزیك ئەو تەختە وە نەبێ بەختەوەری چنگ ناکەوێ.. جار هەیە لەقوڕگەوزینەوە چڵپاو هەڵ دەپڕژێتەوە بۆ لای تەخت.. هەر وەك خودی ئەو تەختە دەترازێتە قوڕە قەستەکەوە.

لەم شێتگیری یەدا کۆمەڵە مەیموونێکم دێتە بەرچاو کەناحەجمنو بەبنکەی بتە ساردو سڕەکەدا هەڵ دەزنێنو لەهەموویانەوە هەڵاوی بۆدڕن دەردەچێ[١٤]

---

[١٤] با خوێنەری ئازیز ئاگا داربێ، لەم بەشەدا نێتشە دەیەوێ چارەسەری مەسەلەیەکی گەورە بکا لەشارستانەتی ڕۆژئاوادا، ئەمەش کەسەری هەڵداوە لەبەر ئەوەبووە داراو سەرمایەدارەکان هەرچی بەرهەمی بلیمەتانەی زاناکانو ڕەنجی خوڵقێنەرەکانە خستویانەتە ژێر رکێفی خۆیانەوە. بەهۆی ئەو سامانە زەبەندەوە دەستیان بەسەر دەوڵەتەکانیش دا گرت. لەم بارە نائاسایی یەدا شارستانەتی ڕۆژئاوا کەوتە بازنەیەکی بەتاڵەوە.. لەنێوان پاشایەتی دەوڵەتو پاشایەتی سامان دا ئاڵقەکە لەکوێوە دەستی پێ کرد لەوێشەوە دووایی دەهات. بەڵام– سوپاس بۆ یەزدان– لەڕۆژهەڵات دا وێنەی ئەو پاشایەتیو خونکارانە نین.

ئەرێ براینە! حەز دەکەن بەو بۆگەنەی لەهەوەسی ڕمووزنەکانەوە دەردەچێ بخنکێن‌و قڕ بکەن؟ خێرا پەنجەرەو دەلاقە لێك دەربەن‌و بازدەنە خوارەوەو خۆتان ڕزگار بکەن.

لەو قانگە خنکێنەرە خۆتان بپارێزن‌و لەبت پەرستی بەدوور بن ئەوە دێنێکەو بەبالآی ملۆزمەکانی ژیان بڕاوە.. لەو قانگ‌و بۆقە دوورە پەرێز بن‌و پشت لەقوربانی‌یە ئادەمی‌یەکانیش هەڵ بکەن.

ئێستاش بۆ نەفس بەرزان ماوە بەرینە، بەرەو سەر فرازی ژیان بکەونە خۆیان. زەویش جێگاو ڕێگایەکی هەیە سروەی دەریای لێ هەڵ بکا، ئەوجا گۆشەگیر بەتەنیای‌و جووتەینی خۆیەوە پەنای بۆ ببا. دەری ژیانی ئازادیش بۆ گەورە نەفسان لەسەر پشتە. ڕاستی‌یەکەی.. هەرکەسێ لەپەزمەندەی دنیا کەمە بەشێکی هەبێ، لەفەرمان سەپاندنی میریش‌دا کەمێکی کەمی بەردەکەوێ.. کەواتە خۆیشی لەوانەی گچکە هەژارن!

لەکوێ دا سنووری دەوڵەتان تەواو بوو هەر لەوێش مرۆڤی ڕەسەن لەژیان دا دەردەکەوێ.. لەوێ سروودی پێ ویستەکان ((الچرورە)) بەئاوازی سەرفراز لەکۆت‌و بەند بەرز دەبێتەوە.

براینە! لەوێ..لەکۆتایی سنووری دەوڵەتان دا ڕابوەستن‌و تەماشابکەن: ئایە لەژێر پەلکە زێڕینەدا ڕێبازێکی ئەوتۆ دەبینن کەمرۆڤی بالآی پێداتێ پەڕێ؟!

زارا ئاوای گوت...

## مەگەزەکانی کۆمەڵ

هاوڕێم! بۆ گۆشەگیریەکەی خۆت بکەوەڕێ.. زەنازەنای گەورە پیاوان توشی سەرێشەیان کردووی.. گچکە پیاوانیشیان ئازار زەدەیان کردووی. سەرلەبەری نزاو تاشە بەردەکانی بەردەمت بەسەنگینی‌یەوە کشوماتن. خۆت وەك ئەو دارە گەورە لێ

بکـەرەوە کەخۆشـت دەویسـت، ئـەویش بەسـێبەری چـڕەوە خۆشەویسـتانە بەسـەر دەریادا دەی ڕوانی و بەکشوماتییەوە گوێی بۆ هۆنەی دەریا دەگرت.

لـەگێڕاوگێڕی زەمینـەی گۆشـەگیریدا سـنووری مەیدانـەکان دەسـت پـێ دەکـەن، لـەوێ گـەورە نمایندەکـان دەی کەنـە هـەراو مێشـە ژەهرینـەکانیش دەوزێنـن. بێتـو لـەدنیادا شـتە باشـەکان نمـایندەی خۆیـان نـەبێ هیـچ نرخێکیـان نیـە. گـەلیش نمایندەکانی خۆی بەگەورە پیاوان ناودێر دەکاو لەمەزنایەتی داهێنەرانـەدا خـراپ تێدەگا. بۆ جوان کردنی نمایندەکانی و ئەوانەی لەسەر شانۆی ژیان دەوری گەورە گـەورە دەبینـن کۆمـەڵێ مانایـان بـۆ دادەتاشـێ. جیـهان بـەدەوری داهێنـەرانی تـازە یاساکاندا بەنائاشکرا سووڕ دەخواتەوە،

ئەوانەی لەسەر شانۆی ژیان دەوری گەورە دەبینن، گەل بەشانازییەکانی باوانەوە بەسەریان دا دەسوڕێتەوە. جیهانیش بەهەمان تەرز دێت و دەڕوا.

یاری کەری دەوران بەشی خۆی زیرەکە.. بەڵام ڕێبـەدیی ڕاسـتی ئەو زیرەکیـیەی ناکا؛ چونکە باوەڕەکەی هەموو جەمسـەرێك دەگرێ کەبیگەیەنێتە باشترین ئـەنجام و هەر کارێك پاڵ بەو خەڵکەوە بنێ متمانەی پێبکەن.

ئەو کابرایە سبەینێ دەچێتە سەرباوەڕێکی تازە، دوو سبەیش ئەو تازەیە بەتازە تـر ئاڵۆگۆڕ دەکا.. بیری کابرا لـەم ڕاڕایی و هـەڵ گیرسان و هـەڵ گەڕانەوەیـەدا لەگـەڵ دەچێ.

نماینـدەی گـەل بەڵگـەی لـەتێك دانـداو داو بیـانووی لـەئاگر هـەڵ گیرسـان دنـداو باشترین دەلیل لە خوێن ڕژان دا دەبینێ. هـەر ڕاستییەك بـەو چەشنە بێ کەبێجگـەی گوێ سوکەڵەکان کەسـی دی تێی نـەگا، ئەوا نمایندەیـەکی گـەل بەهیچـەی دادەنـێ.. چونکە نمایندەی ئاوا بەندەی خواوەندی هەراو هوریایە لەژیان دا.

مـەیدانی جـەماوەر بەسـازندەو لێبوکـان جمـەی دێ! گـەلیش شـانازی بەگـەورە پیاوانی خۆیەوە دەکا؛ چونکە بەلای گەلەوە هەر ئەو پیاوانە سەرداری کات و ساتن.. بەڵام کاتیش داوای پەلـە و خێرایی لـەو گەورانە دەکا. کاکی خۆم! لەبەر دەمی ئـەو گەورانـەدا ناتوانی بـەبێ لایـەن خۆت ڕابگری، ئەوان هروژمـت بـۆ دەهێنـن، داوات لێ دەکەن بەقبوڵ کردن و قبوڵ نەکردن جاڕی خۆت بدەی.. دەك خاکت بەسـەر! ئەگـەر بەسەرگەردانی لەنێوان ((بەڵێ)) و ((نا)) دا خۆت بهێڵیتەوە.

ئەگـەر تۆ عاشقی ڕاستیت با گەوجە هۆش و سەرسەختەکان لەخشـتەت نەبـەن. ڕۆژێ لەڕۆژان ((ڕاستی)) پاڵی نەداوەتە بازووی یەکێك لەو سەرسەختانە.

واز لە ئاژاوە چییەکان بێرەو بگەڕێرەوە بۆ ئارامگەی خۆت. مەیدانی جەماوەر شوێنی هەراو بەیەك دادانە؛ لەنێو مل کەچ بوونی ((بەڵێ))و یاخی بوونی ((نا))دا، زەحمەتە بەسەلامەتی دەرباز ببی. ئاوی کانییان وردە وردە کۆدەبێتەوە، زەمانێکیش تێ دەپەڕێ پێش ئەوەی ئاوەڕۆکان پێ بزانن کەچی لەبناوانەکانیان دا سەقام گیربووە.

گەورایەتی لەدوورەدەستی مەیدانی جەماوەرو شانازییەکانی باوانەوە خۆی هەڵ ناوە، لەهەمان کاتیش دا ئەو کەسانەی یاساتازەکان دادەهێنن لەو تێچڕانە دووراو دوورن.

هاوڕێکەم! لەنزیك ئەولاتو لەوارانەوە زۆر مایتەوە. کەواتە بەپەلە بگەڕێرەوە بۆ کەنار گیرییەکەی خۆت خۆتیان لێ لابدە باتووشی تۆڵەیان نەبی.. ئەوانە کاریان پەنامەکییانەیەو دەستیان لەسەر هەڵ مەبڕە چونکە هێندە زەبەندن لەئەژمار نایەن..تۆش ڕاوە مەگەزت لەچارەنووسراوە.. بەڵێ گچکەو نزمن بەڵام تابلێی زۆرن.. ئای کەدڵۆپە باران ومشەخۆری گژوگیا لەبالاخانەکانەوە داباریون!

خۆ تۆ لەژێر زەبری ئەو دڵۆپانەدا سەختە بەرد نیت.. ئەگەر وەهایش بێ لەمەولا یەکبینە دەماڵن بەسەرتاو تەفروتونات دەکەن.

بەڕاستی مەگەزە ژەهراویەکان بەمەردیان بردووی و پێستیان ڕووشاندوویتو خوێناڵیان کردووە، تۆش لەبەر خۆبە گەورە زانینت بەسەر خۆتی ناهێنیو پیش بەبەرخۆتادا دەبەیتەوە. مەگەزەکان گەرەکیانە دووا دڵۆپی خوێنت هەڵبمژن.. ئەوەش مافی خۆیانە چونکە خوێنە بێ هیزەکەیان داوای خوێنی دیکە دەکا تاوەکو پێی بەهێزبێ، کەواتە بەگوناهی نازانن کەچزووی خۆیانت پێ دابژەنن، ئەوبرینە وردانەش بۆ ماوەی دوور ژان دەبەنە هەستی ناسکتەوە. ئەوجا زوخاویان لێ دێو کرمە ڕێز دەبن. دەشت بینم خۆت بەزیاتر دەزانی کە لەدەستت بۆ کوشتنی ئەو مەگەزە برسیانە هەڵ بهێنێتەوە. وریای خۆت بە نەوەك ژەهری زۆرداریی ئەوان لەخوێنەکەت ڕابگەڕێ.

ئەو ئاژاوە گەرانە وەك مێش بەدەورت دا دەوزێنن تالێت نزیك دەبنەوە سروودت بۆ دەچڕن. ئەوجا دەسەڵاتیان بەسەر پێستو خوێنت دەسەپێنن. ئەوان چۆن مەرایی خواوەندەکانو شەیتانەکان دەکەن ئاوایش مەرایی بۆ تۆ دەکەنو بەقسەی خۆش پێداهەڵدان فێڵت لێ دەکەن.. فێڵو تەڵەکەش تەنیا پیشەی بوودەڵەکانە.

ئەوان لەنهێنی خۆیان دا زۆر بیر لەتۆ دەکەنەوەو لێت دردۆنگ دەبن.. هەرکەسێك خەڵك و خوا زۆر بیریان لێ کردەوە، ئەوا دوو دڵی و گومان گەماڕۆی دەدەن.

بەرانبەر هەر ئاکارێکی پەسندت سزات دەدەن و لەدڵەوە لێت خۆش نابن مەگەر ببێتە تاوانکارێك لەوەلائیەوە داد پەروەرو نەفس جوانیت لەبەر ئەوەی لەدڵی خۆت دا دەڵێی: ((ئەو خەڵکە بێ تاوانن و ژیانیان لێ تەنگ بووە)) بەڵام نەفسە تەنگەبەرەکانیان لەژێرەوە دەڵێن: ((بەڕاستی هەموو ژیانێکی نەمر بریتی یە لە ژیانی تاوانکار))

بەڵێ مەردومگەلەکە هەستی پێ دەکەن: لەکاتێك دا بەزەیت پێدا دێنەوە سووکیان دەکەی.. ئەوجا ئەوانیش بەرانبەر ئەو بەزەیی پێدا هاتنەوەیەت خراپەت لەتەکدا دەکەن. تۆ بەو ئاکارە پەسندە ماتەت زەبریان پێ دەگەیەنی. کەواتە هەتا ئەو نەوازشەت هەڵ نەگرێتەوەو نەبێتە قرسنی ئەوان کەیف پەیدا ناکەن و ناسرەون. ئەو خەڵکە لەخۆیان دا حەز لەوەدەکەن هەر سۆزێکیان بۆ دەرکەوت خێرا گڕی بدەن و تێژەی دەن؛ کەواتە خۆت لە گەداکان بپارێزە چونکە لەبەردەمی تۆدا هەست بەگچکەیی و کەمی خۆیان دەکەن؛ ئەوجا دەمارگیردەبن و هەستیان بەباری نەیاری تۆڵەدا هەڵ دەگەڕێتەوە. ئەی هەست بەوەناکەی، هەرئەوەندە لێیان دەرکەوتی لاڵ دەبن؟ دیسان چۆن دووکەڵ لەئاگری کوژاوە جیا دەبێتەوە، ئاوایش هێز لەکەوڵی ئەمانە دەردەچی؟!

بەڵێ-هاوڕێکەم! چونکە ئەوان نەبوونەتە ئەهلی تۆ، تۆش بوویتە تێ سرەواندێك لەدڵی هاوسۆزەکانت دا.. ئەوانیش بەو سەبارەتەوە چارەی تۆیان نەگەرەکەو حەز دەکەن خوێنەکەت بمژن.

رۆڵە هاوڕەگەزەکانت وەك مەگەزە ژەهراویەکان بەجێت ناهێڵن، چونکە تۆ چەندە بەمەزن دەربکەوی ئەوان هەمیشە لەئاقارتدا ناحەزدەبن

هاوڕێم!

بەرەو گۆشەگیری بەرەو هەڵ کشان تا ئەو شوێنەی بای قایم هەڵ دەکا.. تۆ بۆ ئەوە ئافەریدە نەبووی کەببیتە راوکەری مەگەزو گەزندەکان.. یان بڵێین:

(نێچیری تۆ- جڕو جانەوەر نیە!! ))

زارا ئاوی گوت...

# داوێن پاکی

حەزم لەجەنگەڵ نشینی‌یەو ژیانی شاران بۆ من گرانەو پڕە لەهەوەس پەرستی و ئارەزوو وورووژان. پیاو بکەوێتە بەر کەڵبەی خوێن ڕێژەێکەوە نەك بکەوێتە بەر تەوژمی حەزو ئارەزووی ئافرەتی گەرمۆڵی سەرکەشەوە. کەلەپیاوە شاری‌یەکان ورد ئەبیتەوە، تیلە نیگایان گەواهیت بۆ ئەدەن کەلەسەر زەوی شتێك نابینی تێخزانی ئافرەتێك پەسند بکا..

لەبنەوەی گیانیان دا نیشتەی پیسی‌یە؛ ئەو کەسەیان هۆشی لەچەپەڵی‌یەوە بگلێ مەردومێکی بەدبارە!

خۆزگە ئاژەڵێك دەبووی کەبەلای کەمەوە لەئاژەڵی‌دا رەخساوە.. بەڵام تۆ لەکوێ و پاکێتی ئاژەڵ لەکوێ؟! من هەست کوشتنت پیشان نادەم.. بەڵکو پێویستە ئەو هەستانە پاك بن.

من داوێن پاکیت پیشان نادەم! چونکە ئەگەر بەلای هەندێکەوە ڕەوشت پەسندی بێ لەوانەیە بەلای هەندێکی دیکەوە ڕەوشت نزمی بێ.. لەوانەیە ئەو کەسانە خۆیان لەخۆش رابواردن دابڕن بەڵام هەوەس ئاڵۆشی لەهەموو جموجوولێکیان دا ئاشکرایە.

سەگەلی شەهوەت بەدوای خۆگرەکانەوەن تا دەگەنە پۆپەی پەسندایەتیان.. ئەوجا بەناخی بیرتیژییان دا ڕۆدەچن و بێ ئارامیان دەکەن. ئەو سەگە هەوەسانە ئەگەر نەیان توانی پڕ بدەنە گوڵمە گۆشت ئەوا بەکلکە سووتێوە خۆیان دەگەیەننە پارچە مێشکێکی خاوەن بیر.

ئێوە حەزتان لەداماوی و دڵ پارەبوونە.. بەڵام بەش بەخۆم بڕوام بەسەگە هەوەسەکانتان نی‌یە؛ چونکە ڕوانینە قورسەکانتان بەسەر ئازارمەندەکان دا کەیلن لەشەهوەت و ئاڵۆشتان خۆی لێ گۆڕیوەو پێی دەڵێن- میهرەبانی و بەزەیی پێداهاتنەوە، ئەوا من بۆ ئەم لایەنە مەسەلەیەکتان بۆ دەهێنمەوە بە حاڵەتی ژمارەیەکی زۆر لەوکەسانەی ویستویانە شەیتانەکان دەربکەن کەچی لەباتی شەیتانەکان خۆیان چوونەتە بەرازەکانەوە!

بێت و هەرکامێکتان داوێن پاکی بەلاوە گران بێ با وازی لێ بهێنێ. نەوەك لەبەردەمیا ڕێگا و ئاگری دۆزەخی پیسە دەروونی‌یەکان خۆش بکا!

لەوانەیە لەقسەکانم دا نالوێژی بەدی بکەن.. بەلام لەکوێ ئەو قسە بێ لەزەتی‌یە بەدی بکەم ئێوە نای بینن، تالوێژی لەپیسی ڕاستی دانیە بەڵکو لەنزیك بوونەوەی دایە، مرۆیەك داوای زانیاری بکا بێزی نایە بۆ چاڵی بێ‌لەزەتی شۆڕ ببێتەوە.

هەندێ کەس داوێن پاکی چووە بەدڵیاندا دڵیان بۆی نەرم بووە. بەڕاستی هەر ئەوانە پێ دەکەنن، ئەو دڵ سۆزی‌یەی لەخەندەی ئەوان دایە لەبزەی ئێوەدا نیە.. ئەوان گاڵتەیان بە داوێن پاکی دێ و دەپرسن: دەبێ شتێك هەبێ پێی بڵێن داوێن پاکی؟

ئایە داوێن پاکی لەخۆ بایی بوون نیە؟.. ئەوەنیە هەر ئەو هاتووە بۆ لامان ئێمە نەچووین بۆلای ئەو! بەراستی دڵمان بۆ داوێن پاکی کردەوە، ئەویش وەك میوانێکی قورس خۆی تێدا حەواندەوە.. کەواتە چەندە نیوەڕۆخەوی پێ خۆش بێ با میوانی بمێنێتەوە.

زارا ئاوای گوت...

## دۆست

تەنیا خواز لەدەروونی خۆیدا دەڵێ: ((تاقەتی کەسم نیە لەپەنامەوە بێ)) لەبەر ئەوەی یەکبینە چاو دەبڕێتە زاتی خۆی دوولایی ((تثنیە)) تێدا پەیدا دەبێ و کێشە لەنێوان زات و کەسایەتی‌یەکەیدا دروست دەبێ؛ ئەوجا دەزانێ کەبەبێ دۆست هەڵ ناکا. دۆستی تەنیا خوازیش بریتی‌یە لەکەسی سێیەم، چۆن پشتێنەو کۆڵە پشتی بۆش ناهێڵن سەراوەکان بناوبن ئاوایش ئەوکەسە سێیەمە ناهێڵێ جووتە کێشەدارەکە بکەونە بنی قوڵایی‌یەکانەوە.

قووڵایی‌یەکانی تەنیا خواز بنیان دیار نیە، هەر لەبەر ئەوەیە کەپێویستی بەدۆستێکی لێ هاتوویە. کەمرۆڤ بڕوای بەبێجگەی خۆی هەبوو ئەمە دەبێتە هۆی

ئەوە کەبڕواشی بەخودی خۆی هەبێ، ئەلهای دۆستێك دەبێ بیرەکانی لەحاڵەتی گلاندا هەڵستێنێتەوە.

زۆر جار خۆشویستن دەبێتە هۆی زاڵ بوون بەسەر زرنگی و حەسوودیدا، زۆر جاریش مەردووم منەی دوژمن دەکا تاوەکو بێ دەسەلاتیی خۆی پێ حەشاربداو لەتوانای خۆیشی تابینا بێ کەهێرش بەرێتە سەر کەسانی دیکە.

کەسێ بەتەمای دۆست پەیدا کردن بێ پێویستە ئامادەی خەباتیش بێ لەپێناوی دا، کەسیش نەتوانێ ببێتە دوژمن بەکەڵکی خەبات نایە، پێویستە مرۆ لەدۆستەکەیدا رێزی دوژمنایەتی بگرێ؛ چونکە ناتوانی لەدڵی دۆستەکەت نزیک ببیتەوە تاهێرشی نەبەیتە سەرو لەگەڵ کەسایەتییەکەیدا نەجەنگێی.

تۆ دەتەوێ هەموو پەردەنەهێنی یەکانی دەروونت هەڵماڵی و لەبەردەمی دۆستەکەتداخۆت دەربخەی؛ ئەوسا بەسەیری مەزانە کەئەو دۆستە وازت لێ بهێنێ و دوورە پەرێزت کات. کەسێ لێی نەزانێ خۆی بسازێنێ ئەوا خەڵکی گاڵ ئەدا هێرشی بەرنە سەر. کابرا وریابە : بێ پەروا خۆتی لێ دامەماڵە؛ چونکە تۆ خواوەندی، تەنیا خواوەندەکان پێیان شەرمە کەخۆیان داپۆشن.

((پێویستە لەبەردەم دۆستەکەت دا پۆشتەو پەرداخ بی تا پاڵی بدەی داخوازو ئەلهای نموونەی بالاَ (مرۆڤی بالاَ) بێ.

ئایە ڕۆژێك لەچڕوچاوی دۆستە نووستووەکەت ورد بوویتەوە تاوەکو راستی ئەوت بۆ دەربکەوێ؟ ئەی لەو کاتەدا چارەی ئەوت بەچەشنی چارەی خۆت نەدیووە کەلەئاوێنەی ڕووبەندی عەیبداردا ڕەنگی ئەدایەوە؟.. ئەدی بەدیمەنی دۆستەکەت —کەلەپڕخەی خەودا بوو—نەشڵەژاوی؟!

هاورێم! مرۆڤ هەر ئەوبوونەوەرەیە پێویستە سەرووی زاتی خۆی بکەوێ.. دۆستیش دەبێ لەبێ دەنگیدا دۆزەرەوەبێ. کەتۆ بتوانی لەنائاگایی خۆت دا هەرچی دۆستەکەت لەئاگاداریدا دەی کا دەری بخەی و ئاشکرای بکەی، خۆت رابگرەو بەئاشکرا لەهەموو شتێ مەڕوانە. پێش ئەوەی جارێ بەزەیی پێداهاتنەوەت بدەی پێویستە هێماکان شی بکەیتەوە. جار هەیە دۆستەکەت—بەزەیی پێدا هاتنەوە—ی پێ ناخۆشە، بەڵکو حەزدەکا بەڕوو بەندی ئاسنەوە بت بینێ و نەمرایەتیش لە چاوەکانتەوە ببریسکێتەوە.

با ئەو سۆزەی بەرانبەر دۆستەکەت هەتە بەتوندو تیژی‌یەوە رازابێتەوەو کەمە رقێکیشی تێکەڵ بێ، ئەوجا سۆزەکەی لەمەڕ ئێرە بەناسکی و زەریفی تەسەل دەبێ.

تۆ بەرانبەر دۆستەکەت وەك هەوای پاك و لاتەریك بە.. خۆراك و دەرمان بە. هەندێ کەس بۆ خۆڕزگارکردن لەکۆت و بەند کۆڵەوارن کەچی بۆ رزگار کردنی دۆستەکانیان بەتوانان.

کەتۆ خۆت کۆیلە بی واز لەدۆستایەتی بهێنە، کەزۆر دڵ ڕەقیش بووی بەتەمای دۆست پەیدا کردن مەبە.

زەمانێکی دوور بەسەر ئافەرەتدا تێپەڕی کەتێیدا ژێر چەپۆك و زۆر لێکراو بوو، تا ئێستاش ئافرەت بەکەڵکی دۆستایەتی کردن نایە؛ چونکە بێجگەی خۆشەویستی چی دیکە نازانێ

خۆشەویستی ئافرەت بەرانبەر کەسێك خۆشی نەوێ لەهەڵ دا شتێ و سەرکوێری بێ بەش نیە.

خۆ ئەگەر دڵی ئافرەت بەخۆشەویستی‌یەوە خەریك بوو، تیشکە رووناکیەکانی هەمیشە لەبارن کە لەشەوە زەنگ دا بروسکە چەخماخە رایان فڕێنی.

تا ئێستاش ئافرەت وەك دۆست نەگەیشتووتە رادەیەك ئەمەگی لێ بوەشێتەوە.. هەر ئەوەندەیە پێی بڵێین: پشیلەیەکە بۆ خۆی.. دەشبێتە چۆلەکەیەك، خۆ ئەگەر بەرزیش بووەوە ئەوا مانگایەکە بۆ خۆی...!

گوترا ئافرەت بەکەڵکی دۆستایەتی نایە. بەڵام با پیاوان پێم بڵێن: ئەی کێ لەوان شایستەی دۆستایەتی‌یە؟!

هەی پیاوی ینە! گیانی هەژارو گیانی بێ ویژدان شایەنی نەفرەتن. ئەو ئەندازەیەی بەدۆستانی دەبەخشن منیش دەتوانم هێندەی ئەوە بەدوژمنانم ببەخشم و هەژاریشم پێوە دیار نەبێ.

((ئێوە یارو یاوەر پێکەوە دەنێن.. کەواتە کەی دۆستایەتیتان دەکەوێتە نێوانەوە!!))

# هەزارو یەك نیشانەو ئامانجێك

زارا بەنێو گەلانو ولاتانی زۆردا گەڕاوەو شارەزابووەو بەڕاستی (چاکە)و (خراپە)دا ڕۆچووەو بۆی دەرکەوتووە کەلەجیهان دا هیچ هێزێك لەژوور هێزی ئەو دووانەوە نیە.

ساغ بووەتەوە کە لەسەر ئەم زەوی‌یە هیچ گەلێك ژیانی لەلاخۆش نی‌یە تارژێم‌و دەستوورەکان نەخاتە ژێر رکێفی ئیرادەی خۆیەوە. هەر گەلێك بیەوێ بژی دەبێ بڕیەو چارەنووسێك بۆخۆی دابنێ لەقەرارادەی گەلە دراوسێکانی جودا وازبێ. ئەوەش دیارە: ئەو شتەی بەلای گەلێکەو چاکەیە بەلای گەلێکی دیکەوە ریسوایی‌یە.

بۆم دەرکەتووە کەزۆر کار هەیە لەولاتێك دا لەبەرگی نەنگی‌دایە کەچی هەر ئەو کارە لەولاتێکی کەدا لەبەرگی شەرەف‌و شانازی‌دایەو خۆی دەنوێنێ.

دراوسێ‌یەکم نەدیوە ڕاستی دراوسێکەی بۆ دەربکەوێ، بەڵکو دیومن هەر یەکەیان دەرهەق بەشێتی‌و دڵ ڕەقیی یەکدی سەریان سوڕدەمێنێ.

هەموو گەلێك لەپشت سەری خۆیەوە لەوحەی داب‌و نەریتی خۆی هەڵواسیوە، بەسەر چ کۆسپێك دا تێپەڕبێ‌و چ توانا‌و بڕشتێکی لەویستی خۆی‌دا قایم کردبێ لە– سەرلەوحە–ی خۆی‌دا دێری بۆ کێشاوە، ئەو شتەی کە بەلایەوە سەخت گیرە ئەوە جێگای شکۆپێدانێتی.. خێری ئەو بریتی‌یە لەپێداویستێکی هێندە پێداگر بەزەحمەت بێتەدی، بۆ فرسەت بینین لەوپێداویستەش دەست بۆ هەموو هۆیەك دەبا.

هەرشتێ دەسەلاتی گەل بچەسپێنی‌و هەرشتێ بۆی ببێتە مایەی سەرکەتن‌و شانازی‌و لەرزە بخاتە دڵی دراوسێکەیەوەو زرنگی‌و حەسوودی بورووژێنی، ئەو شتە بەلای ئەو گەلەوە پایەی یەکەمی هەیە. هەر شتێکیش لەچاوی ئەوڕا پایانی یەکەم وەربگرێ، ئەوا بۆ هەموو کارو بارێکی دەبێتە واتایەکی تاکانە. ئەگەر توانیت ئاگاداری پێویستی‌یەکانی هەرگەلێك بی.. شارەزای زەوی‌و ئاوو هەواو تەنانەت ئاگاداری دراوسێ کەشی بی–ئەوا دەرك بەهەموو ئەو هێزە نهێنییانە دەکەی کەفەرماندەیی لەوگەلەدا دەسەپێنن‌و پاڵی پێوە دەنێن خۆگربێ؛ تازاڵ بێ بەسەر

ئارەزووەکانی‌دا. دیسـان ئـەو هۆیەشـت بـۆ دەردەکـەوێ کەئـەم گەلـە چ پەیژەیـەکی تایبەتی بۆ خۆی هەڵناوە تاپێی‌دا دەگاتە ئاوات‌و ئامانجەکانی.

((پێویسـتە لەهـەموو مـەیدان داری‌یـەك دا پێـش بڕبـی، بانەفسـت بـەغیرەتی خۆیەوەبنازێ‌و تین بستێنێ‌و تەنیا مەیلەکەشت هەر بۆ لای دۆست بێ‌و بۆلای نەیار مل مەنێ))

ئەوانە چەند وشەیەك بوون ئەگەر بەرگوێی یۆنانی‌یەك بکەون مچوڕکەی بەلەش دا دێ‌و رادەپەڕێتـە نێـو مەترسـی‌و سـەختی‌یەوەو لـەوێ‌دا بـۆ شـانازی بـاوانی خـۆی دەگەڕێ.

((راست بڵێ‌و لێزان بە کەچۆن تیری خۆت لەبان کەوانەوە بەرەو ژوور دەکەیتەوە))

ئەو ڕاسپێری‌یە– لەسەر ئەو گەلەی کەناوی خۆم لێ وەرگرتووە– بەگران دەکەوێ. هەر لەم دیارناوەم دا چەندە باوان شانازی تێدایە، ئەوەندەش تووش هەڵەتی تێدا بەدی دەکرێ.

((رێزی دایك‌و باوکت بگرەو لەناخی دڵتەوە لەگەڵیان دا رۆڵەی چاك بە))

ئەم راسپێری‌یەش لەسـەر نـەفس ڕەتـاندن خـۆی هـەڵ نـاوە، گـەلێکی دی پـێی راپەڕیوە، خۆی پێ بەهێزکردووەو بووەتە گەلێکی نەمر.

((دەسـت پـاك‌و ئـەمین بـەو لـەناخی دڵتـەوە لـەپێناو دەسـت پـاکی‌دا خوێـن‌و ناموست دابنێ؛ بائەو تێ کۆشانەت مایەی زیان‌و فەلاکەت بێ بۆ خودی خۆت))

دیسانەوە، ئەمەش راسپێری‌یەکی کەیەو یەکێ لەگەلانی دیکـە کـاری پێبـەجێ هێنـاوەو بەسـەر زاتـی خـۆی‌دا زاڵ بـووەو بووەتـە گـەلێکی مـەزنی بـار قورس بەئاواتـە گەورەکانی‌یەوە.

مەردومگەل بۆ خودی خۆی چاکەو خراپەی داهێنان‌و خۆی دای ناون. بەسایەی هیچ دەنگ‌و زایەڵەیەکی ئاسمانی‌یەوە نەی دۆزیونەتـەوەو لەحـەواش دا نەهاتوونەتـە خوارێ.

بۆ ئەوەی کەمرۆڤ خۆ پارێزبێ، هاتووە بۆ هـەموو شـتێك نرخـی خـۆی بـۆ بڕیـوە، واتا مرۆڤایەتی‌یەکانیش هـەر دەسـتکردی مرۆڤـن. ((نـرخ دانـان‌و مـەزندە لـەخۆی‌دا بنیادە.. کەواتە ئەی بنیادنەرەکان گوێم لێ بگرن!

ئەو گەنجینە گەوهەرانەی لەگۆڕیّدان چەندشتێکن و بەخواستی نرخاندنی ئێوە بوونەتە گەنج و گەوهەر. کەواتە نرخاندنی بوونەتە گەنج و گەوهەر. کەواتە نرخیش بریتی‌یە لەو دانان و مەزندە، خۆ ئەگەر نرخ بۆ دانان نەبووایە هەچی ((هەبوون))ە بریتی دەبوو لە توێکلێکی بێ ناوك

بنیاد نەرینە گوێ بگرن! بەپێی مەزندە گۆڕینی بنیادنەر نرخی شتەکانیش دەگۆڕێ: دەبێ ئەو بنیادنەرە لەهەموو کاتێك دا تێکدەریش بێ.

هەر لەسەرەتاوە گەلان دووابەدووا بەشوێن بنیادەوەبوون تائەوحەلەی تاکە خولقێنەرەکان سەریان هەڵدا.. کەواتە لەم هەڵ کەوتەدا، تاك دەبێتە تازەترین شێوەکانی -هەبوون-. هەر لەسەرەتاوە گەلان یاسای چاکەیان بۆ خۆیان داناوە.. ئەو یاسایەش زادەی خۆشویستنێکی رێك هاتووە بۆ (سەرداری) و بۆ رازی بوون بەفەرمان بەجێ هێنان.

حەزی کۆمەڵ لەحەزەکانی تاك کۆنینە ترە.. ئەگەر چاکەی نیهاد ئەوەبێ لەکۆمەڵدا خۆی حەشارداوە، خراپەکەشی ئەوەیە کەلەوتاکەدا ئاشکرا دەبێ کەسایەتی‌یەکەی خۆی وەدەردەخات.

بەڕاستی ئەو کەسایەتی‌یە ئۆینبازی بێ و سۆزی تێدا نەبێ.. ئەوکەسایەتی‌یەی مەبەستی سوود وەرگرتن بێ لەچاکەی زۆربەی کۆمەڵ ئەوە تەنیا ناونیشانی نزمایەتی هەموانە و بنەمای قەوارەی کۆمەڵ نیە.

لەهەموو سەردەمێك دا بێجگە لەهۆسەچیە داهێنەکان بەولاوە کەسی دی چاکەو خراپەی دروست نەکردووە.. ئەوەی ئاگری چاکەو خراپەی هەڵ گیرساندووە بریتی‌یە لە سۆزی خۆشەویستی و سۆزی رق بەناوی هەموو ئاکارە پەسندەکانەوە.

زارا-گەل و شاری فرەی دیتوون. لەسەر ئەم زەوی‌یە هێزێکی لەسەر رووی هێزی هۆسەچیەکانەوە بەدی نەکردووە.. (هێز)یش واتایەکە بۆ جووتە وشەی چاکەو خراپە.

ئەوەی شایەنی ستایشەو شایەنی سزایە لەرمووزێکی بەد فەسەڵ دەچی..ئەرێ براینە! کێتان دەتوانێ ئەو رمووزنە تۆقێنەرە تێك بهاڕێ؟.. ئەوجانەوەرەی کە بەهەزاران ملی دەرپەڕاندووە، دەبێ کێ زنجیر بخاتە ئەو ملە بەد فەسالأنەوە؟!

کەژمارەی گەلان گەیشتە هەزار.. نیشانەو ئامانجیش هەزارو یەکی تەواوە.. ئەوجا ئێمە بۆ هەزار ئەستۆ پێویستمان بەیەك زنجیرە.. چونکە ئێمە پێویستمان بەیەك ئامانجە. تائەمڕۆ بەشەرایەتی تاکە ئامانجێکی نەناسیوە.. بەلام بێتو مرۆڤایەتی هەر وەها بەبێ مەبەست بەڕێ کەوێ-ئایە مانای وانیە کەگومڕاو کەمتەرخەمە؟!

زارا ئاوای گوت..

## خۆشویستنی کەس و کار - یان کەسی نزیك

ئێوە بەرامبەر کەسی نزیکتان پڕسۆزن و بەقسەی جوان و خۆشەوە سۆزیان بۆ دەردەبڕن. بەلام بەش بەخۆم دەڵێم: خۆشویستنی کەس و کارو خزمی نزیك لەوەدەرناچێ کە خۆویستنێکی سەر لێ تێکدەرە.

ئێوە چونکە لەنەفسی خۆتان ڕادەکەن پەنا دەبەنە بەر کەسی نزیك، دەشتانەوێ ئەو کردەوەیەتان بەکارپەسندی بدەنە قەڵەم.. بەلام ئایا باری ڕاستی ئەم خۆدا ڕنینەی ئێوە بەلای منەوە شتێکی پەنهانە؟

کەسی دوێنراو لەکەسی دوێنەر لەپێشترە؛ ئەویان پیرۆزەو هێشتا ئەمیان نەگەیشتۆتە رادەی پیرۆزی.. ئائەمەیە هۆی پەرۆشی مرۆڤ بەرامبەر بەکەسی نزیکی!

ئەوەتان بۆ دیاری دەکەم وازلەنزیکە کەس بهێنن و خۆشەویستی‌یەکەی ڕابگرن و لەباتی ئەو وەرن مرۆڤی دەوورتان خۆش بوێ.. خۆشویستنی مرۆڤی دووری چاوەڕوانکراو لەسەرووی کەس خۆشویستنەوەیە. بەش بەخۆم خۆشەویستنی تارمایی و شتەکان دەخەمە بان مرۆڤ دۆستیمەوە.

دۆستەکەم! ئەو تارماییانەی لەبەر دەمتەوە رادەکا گەلێ لەتۆ جوانترە.. کەواتە بۆچی ئێسك و گۆشتەکەتی پێنادەی؟

بەڕاستی ئێوە ترستان لێ نیشتووەو بەهەراسانی‌یەوە پەنا دەبەنە بەر کەسانی نزیك و نەفسی خۆتان پێ راناگیرێ و خۆشەویستی‌یەکەشتان نەکاملە، ئێوەم بەم

شێوە دێتە بەرچاو: هەر بۆ ئەوەی کەیف لەسەرگەردانی کەسی نزیکتان وەربگرن بەتەمان فریوی بدەن‌و هەڵی بدێرن.

ئاواتە خوازم: لەسەرجەمی کەسە نزیکەکان‌و بگرە دراوسێکانیشتان بەدووربن؛ ئەوجا ناچاردەبن دۆستی ئەوتۆ پەیدا بکەن لەدڵ سۆزیدا تەسەل بێ، ئێوە کاتێ بتانەوێ ستایش بەسەر نەفسی خۆتان دا قڵپ بکەنەوە داوای گەواهەکان دەکەن..هەر کە گەیشستنە ئەوەی ڕێیان لێ بگۆڕن‌و بەچاکە گومانتان بەرنێ، ئەوجا ئێوەش لەگەڵ خودی خۆتان دا چاك گومان دەبن‌و بەخاس دەنۆڕنە خۆتان.

درۆزن ئەو کەسەیە دژی ویژدانی خۆی قسە بکا. ڕاسترین مەردووم کەسێکە ویژدانی ئەوتۆی نەبی کەلێی ببێتە بەرزەخ‌و نەهێڵێ ڕاستی بڵێ. لەسەر ئەم بنکەیە لەنێو خەڵك دا لەنەفسی خۆتان دەدوێن تالەبارەی ڕاستەقینەی خۆتانەوە ڕێیان لێ تێك بدەن.

شێت لەدڵی خۆیدا دەڵێ: ((تێکەڵی ئەم خەڵکە ڕەوشت تێك دەدا، بەڵکو بەتایبەتی ئەوانە تێك دە دا کەهەر بەشیان پێوەنیە))[15]

هەتانە بۆ خۆ دزینەوە رادەکاتە کن دراوسێکەی‌و هەشتانە بۆ خۆلەبیر کردن رادەکاتە لای. ئێوە بەم تەرزە خۆڤیانیی خۆتان خراپ دەکەن؛ لەبەر ئەوە کەنارگیری‌و تەنیایی تان بۆ دەبێتە زیندانێك.

دەبێ ئەوانەی بزرن نرخی (خرم خۆشەویستی) تان بۆ بدەن؛ چونکە کەنگێ پێنجتان کۆببنەوە بەشەشەمی بزرتانەوە خەریك دەبن.

---

[15] بۆ ص ٨٦: ((بل تفسد بخاصه من لاخلاق لهم))

بەشێوەیەکی فراوانتر:

شێتە وای لێدەداتەوە کەتێکەڵی مەردومگەلەکە تەنانەت ئەوانەش تێك دەدا کەلەروشت ئارایی‌دا بێبەشن. هەر لەم بیرە فەلسەفیەوە حەزرەتی ((مەحوی)) لەمەڕ خۆمان (بۆ ل٣٠٧) دەفەرموێ:

((قەی کردنی سوراحی ئەگەر تێبگەی، دەڵێ

دڵ تێکەڵ هاتنە لەگەڵ ئەم خەڵکەدا تێکەڵی)).

ئالانی

من حەز لەجەژنـەکانتان ناکـەم، ئـەوەندێکی دیمـن جمـەیان هـاتووە لـەنمایندەو ئەکتـەر، ئەوگرۆهـەی لەدووریشـەوە سـەیریان دەکردن لەهـەمان لاسـایی‌دا ئەنتیکـەتر بوون!

بۆ خزم خۆشەویستی بانگتان ناکەم.. بەڵکو بۆ دۆست خۆشەویسـتی بانگتـان دەکەم.. بادۆستەکەشتان دیمەنی زەمزەمەو شادی زەوی بێ، جا، خێرا هەست دەکەن هەواڵی شتێکتان پێ ڕادەگەیەنێ هەواڵی -مرۆڤی باڵا-.

راسپێریتان دەکەم: با دۆستەکەتان لەدڵسۆزی‌دا ویژدان ئاوەدان بێ. کەسێکیش مەبەستی بێ دەستی بەسەر دڵێکی ئاودا ڕابگا، پێویستە وەك ئەو ئسفنجە بێ کە شلەی هەڵ قوڵیو هەڵ دەمژی. راسپێریتان دەکەم دۆستەکەتان ئەوتۆبێ جیـهانێك بگرێتـە نەفسـی خۆیـەوە. ئەوەیـە دۆسـتی داهێـن کەلەهـەموو کـاتێك دا بتوانـێ جیهانێکتان پێش کەش بکاو چ پەندو دەرسێکی ژیانیشی بەسەردا تێپەڕی‌بێ، خێرا بی‌خاتە بەرچاوتان.. ئەوجا دەبینن کـە چـۆن (خراپـە) بـە (چاکـە) دەگـەڕێ‌و چـۆن ڕێکەوتە گەلیش دەتان گەیەننە مەبەستەکانتان.

بائایندەو مەبەستە دوورەکانت ئەوەبن کەلەئەمرۆی خۆت دا بەتەمایانی.. لەچاوی دۆستەکەشـترا مرۆڤـی بـاڵات خـۆش دەوێ، وەك مەبەسـتێك بـۆ -هـەبوون-ی خـۆت بەرامبەر بەچاوی خۆت ڕای دەگری.

براینە! خۆشویستنی کەسی نزیکتان بۆ نیشانە دەکەم.. بەڵکو ڤیانی ئایندەیەکی دوورتان بۆ ئامازە دەکەم.

زارا ئاوای گوت...

## ڕێگاکانی داهێن

برام! ئایـا بـۆ دۆزینـەوەی ئـەو ڕێگایـەی دەتگەیەنێتـە حەشـارگەی زاتـی خـۆت دەتەوێ گۆشەگیرو کەناربی؟..

کەواتە لەبێنەو بەرەدا کەمێك بوەستەو گوێم لێ بگرە:

گەلە (القگیع) گوتوویەتی:

((کەسێك کەوتبێتە پشکنین ئەوا سەری خۆی هەڵ گرتووە.. کەسێکیش کەنار بووبی ئەوا گلاوەو بەنووچ دا هاتووە))

لەنێو ئەو گەلەیەدا ماوەیەکی دوور ژیاوی. لەمەولاش بەتەواوی دەنگی ئەو لەئەندەروونی تۆدا دەنگ ئەداتەوە. کەپێت گوت: ویژدانم گۆڕاوەو لەویژدانی تۆ لای داوە ئەوسا دەبێتە سکالأبێژێکی ئازارمەند.

ئەوەی ئەم ئازارەی بەمیرات خستی هاوهەستیتە لەتەك ئەو گەلەیەدا. دوایین بلێسەی ئەو ویژدانە هاوبەشە یەکبینە کارەساتەکەت گرەداو تازەی دەکاتەوە.. بەلأم تۆش حەزدەکەی شوێن دەنگی ئازارەکانت بکەوی.. چونکە بۆ چوونەناخی زاتی خۆتت دەبا. کەواتە بەڵگەت چیە کەهەقتە بچیتە لای زاتی خۆتو تواناشت هەیە بۆی بکەویتە ڕێ؟ بۆچی تۆ بریتی لە هێزێکی تازەو هەقێکی تازە؟ ئایا تۆ بزووتنەوەیەکی سەرەتای؟

یان چەرخەیەکیو بەدەوری خۆت دا دەسووڕێیتەوە؟ ئەی گوایە دەتوانی ئەستێرەکان بەدەوری خۆت دا بخەیتە گەڕ؟! ئای کە چەندان تەماو ئاوات بۆ بڵندانی تەکان دەدەن! چاوچنۆکیش بەهەموو بەشێکیەوە لەحەزەکانی خۆیدا هەڵ دەچۆقێ؟! کەواتە بۆم ئیسپات بکە: تۆ نەلەبەرەی بەرتەمایو نەلەبەرەی چاوچنۆکی!

کارو فرمانی زۆربەی بیرە بەرزەکان– هەر کاری تۆپە فوودراوەکانە کە هێشتا تەواو هەڵ نەئاوساون یان لەمەیدان نەهاتوون کەچی دەکەونە ژێر فەرمانی پووکانەوەوە.

تۆ خۆت بەئازاد دەزانی؛ کەواتە پێم بڵێ ئەو بیرۆکەی دەیکەیتە بنەماو ڕێبیری خۆت چیە؟

بەئەوەندە قسە وازمەهێنە: گوایە نیری سەر ئەستۆی خۆت داماڵیوە. ئایە تۆ مافی ئەوەت هەبووە نیرەکەت دابماڵی؟.. هەندێ کەس کە لەبەندایەتی ئازاد بوون دوامەزییەتی خۆیان دەدۆڕێنن.

زارا بەلایەوە گرنگ نیە پێی بڵێی: لە چ بەندایەتییەك رزگارت بووە، بانیگای بێ گەردت ئەومەبەستە جاربدا کە لەپێناوی دا ئازاد بووم.

ئایە دەتوانی بۆ نەفسی خۆت چاکەو خراپە یەك هەڵ بنێی ئەوجا بەویستی خۆت دەستوراتێك بەرزەوەکەیتو بەسەر کردەوەکانت دا زاڵ بی؟.. ئایە دەتوانی ببیتە

دادوەری نەفسی خۆت و تۆڵەستێن لەنەفسی خۆت؟.. بەڕاستی مرۆ بەتەنیا بمێنێتەوە لەگەڵ کەسێك دا کەکردوویەتی بە دادوەرو تۆڵەستێن لەنەفسی خۆی لەسایەی ئەو یاسایەی خۆی بنیادی ناوە– ئەوە تێکڕای کارێکی سەیرو ترسناکە؟! هەر بەو چەشنەی ستارەکان بەنێو بۆشایی ئاسمان دا تێ دەتەقێنن، نموونەی ئەو مرۆڤەش دەهاوێژرێتە بۆشایی تەنیایی و زوقمستانی تاکایەتی یەوە

تۆ کەبەتەنیا ماویتەوە ئازار چێژی کۆمەڵیت؛ چونکە هێشتا نەدەست بەرداری ئازایەتی و نەهیوابڕاویشی.. بەڵام دەبێ رۆژێك لەو تەنیایی یەت دا شەکەت ببی.. ئەوجا نەرم دەبی و لەخۆبایی بوونەکەشت دادەڕمێ و هیچ خۆت پێ ناگیرێ و دەهوولێنی (ئێستا من تاك و تەنیام)! ئەو رۆژە دێتە بەرەوە کە.. مەزنایەتی یەکەی خۆت چاوشارکێت لەتەك دا بکا و گچکایەتی یەکەشت ببێتەوە هەڵەرۆسکێ، تاوات لێ بێ لەترسی هەڵ کشانی خۆت هەڵ بلەرزی، چونکە هەڵ کشانەکەت لەبەر دەمت دا لێ دەبێتە تارمایی تۆقێنەر.. ئەوسا دەقیژێنی و دەڵێی: ((هەمووشتێك بەتاڵە)).

لەکەسی تەنیادا سۆزو پەرۆشێك هەیە بەتەمای لەناو بردنێتی، خۆ ئەگەر ئەو سۆزگەلە دەرەقەتی تەنیاکە نەهات ئەوا دەرەقەتی خۆی دێ و دەبێتە خۆکوژ. ئایە تۆ ئامادەی کەدەست بدەیتە تاوانی کوشتن؟

کاکی خۆم! ئایە مانای وشەی (سوك بینی) دەزانی.. هەرکاتێ ناچار بوویت و گەرەکت بوو دادپەروەرانە هەقی خۆت لەو کەسانە بکەیتەوە کەبە سووکت دادەنێن، ئایە ئازارەکانت تا چ ئەندازەیەك و چۆن دەبن؟!

تۆ چارەی زۆر کەست ناوێ، چونکە دەرهەقت بیروڕایان گۆڕیوەو تۆش رقیان دەورووژێنی.. بەڕاستی لێیان چوویتە پێشەوە پاشان لێیان دوورکەوتیتەوەو بەجێت هێشتوون، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەرگیز لێت خۆش نابن.

تۆ ژوور ئەوان کەوتووی، چەندەش بەسەریانەوە هەڵ بکشێی لەچاو زرگنەکان دا پتر بچووك دەبیتەوە. بەلای ئەو خەڵکەوە کەس هێندەی ئەو کابرایەی بەسەر پەڵە هەورانەوە دەخولێتە ڕەزای تاڵ نیە.

پێویستە بەو خەڵکە بڵێی کە: ستەمی ئێوەم بەباڵای خۆم بڕیوە، ڕەوای منەو لەکن ئێوەیە، لەبەرئەوە کە وەڵام دانەوەم ستەمناك بێ کارێکی زەحمەتەو ناکرێ. خەڵکەکە توانج و ستەم دەگرنە گۆشەگیر.. بەڵام کە تۆ بتەوێ ببیتە ئەستێرەیەك،

پێویستە تیشکە ڕووناکیەکانت ڕەوانە بکەی.. تەنانەت بۆ سەر ئەوانەش کە خەریکی ستەمبەرانتن. دەبێ خۆشت لەکارسازو دادخوازەکان بپارێزی، چونکە ئەوان حەزیان لەهەڵ واسینی هەرکەسێکە ئاکارێکی پەسند بۆ خۆی بنیاد بنێ. سەرەنجام ئەوان تاکە خوازیان خۆش ناوێ.

دیسان لەسافیلکایەتی خۆپارێز وریابە! چونکە ئەو کەسەی پێشی‌یەوە نەلکابێ تێی‌ڕادیارە. سافیلکەکان لەهەموو شوێنێك دا وازیان لەئاگر هەڵ گیرساندن‌و یاری پێکردنیەتی.

دیسان نەکەی لەخۆشەویستی‌دا پێ‌دابگری، چونکە تەنیا خواز (المنفرد) هەر کەسێکی لەرێگادا پێ بگا خێرا دەستی تەوقەی بۆ درێژ دەکا. هەندێ کەس لەباتی ئەوەی دەستی خۆشەویستیمان بۆ درێژ بکەن پێویستە چڕنووکیان لێ گیربکەی.

ئەوەش بزانە! سەهندە ترین دوژمن کەتووشی دەبی بریتی‌یە لە (خۆت).. ئەوەی لەمغارەو جەنگەڵ دا خۆی لێ‌داگرتووی هەر (نەفس)ی خۆتە.

ئەی تاکو تەنیا! ڕێگەیەکم بۆ هەڵپەرداوتی بت گەیەنێتە زاتی خۆت. ئێستا ئەو ڕێگایەی لەبەردەمت‌و لەبەردەمی حەوت شەیتانەکەت دایە رێك‌و لەبارە. ئەوجا هەر لە ئێستاوە بەش بەخۆت دەبیتە خۆنەناس‌و جادوکارو شێت‌و دوودڵ‌و کافرو ئاوارە. پێویستە ڕازی بی بەگڕی خۆتەوە بسووتێی؛ چونکە تاهەڵ نەگیرسێی‌و نەبێتە خۆڵەمێش بۆت نالوێ تازە ببیتەوە.

ئەی کەسە تەنیاکە! تۆ ڕێگەی پەروەردگارت گرتووەتەبەر تۆ لەحەوت شەیتانەکەت دا دەگەڕێی خواوەندێك بۆ خۆت هەڵ نێی. ئەی (تەنیا)! تۆ، ڕێبوارێکی بەسەر ئاشقە ڕێ‌دا، کەچی ئاشقی نەفسی خۆتی؟! کەواتە بەچەشنی سووك بینی ئاشقان نەفسی خۆت سووك دەکەی.

ئاشق گەرەکیەتی بخوڵقێنێ؛ چونکە سووك بینە..بۆشی نیە لافی خۆشەویستی لێ بدا تالە سووك کردنی خۆشەویستەکەیەوە دەستی پێ نەکردبێ.

کاکی خۆم! بەگۆشەگیری خۆتا بڕۆرە خوارێ ڕێگای خۆت بەرمەدە؛ با هاوڕێت بریتی بێ لەخۆشەویستی‌و داهێنان. تۆ هەر دەڕۆی‌و دەڕۆی، بەر لەوەی کە (دادپەروەری) بەقورسی‌و لۆژەلۆژەوە شوێنت هەڵ بگرێ.

بەلای گۆشەگیریەکەت دا بابدەرەوە. ئەوجا کاکی خۆم! بەفرمێسکی خۆمەوە بەرێت دەکەم؛ چونکە من وەها حەز دەکەم یەکێك تێدا بچێ و لەتێداچوونەکەی ئەودا یەکێکی بەسەر ئەودا بالاّو هەڵکشاو دروست ببێ.

زارا ئاوای گوت...

# پیرێژن و کچ

((ئەرێ زارا! بۆچی لەتاریکە شەودا خۆت دەشاریتەوە؟ ئەوە چیت لەژێر جلەکانتەوە پەنا داوە؟..

گوایە گەنجینەت وەدەست کەوتووە.. یان ساوایەکت پەیداکردووە؟ ئەرێ دۆستی پیاو خراپان! بەدزەرێدا روودەکەیتە چ لایەك؟)).

زارا وەڵامی دایەوە: بەڕاستی کاکی خۆم! ئەوەی پێمە گەنجینەیەو کەوتووە، ئەوە (راستی)یەکی بچکۆلەی لاسارە.. بێت و دەماخنم نەکردایە هەر وەك منداڵی ساوا پڕبەدەم هاواری دەکرد.

ئەوا ئەمڕۆ دەمەو ئێوارە بەتەنیا دەڕۆیشتم، لووتم بوو بەلووتی پیرەژنێکەوە؛ لەتەکما کەوتە رازو گوتی:

زۆر جار ئێمەی ئافرەت لەگەڵ زارادا بەقسە هاتووین، بەلاّم تائێستا تایبەت بەئافرەت قسەیەکی بۆ نەکردوین!

پێم گوت: پێویستە پیاو–لەبارەی ئافرەتەوە تەنیا قسە بۆ پیاوان بکا.

گوتی:–دەتوانی لەبارەی ئافرەتانەوە رێك و ڕەوان قسەم بۆ بکەی چونکە لەتەمەنی پەك کەوتن دام و قسەکانت لەزەینم دا نامێننەوە.

تکای پیرەژنەم قبووڵ کردو پێم گوت:–

هەچی لەژندا هەیە مەتەڵێکە، ئەو مەتەڵەش تاکەکلیلێکی هەیە، ئەویش تاکە وشەی ((ئاوس بوون))ە.

پیاو بۆ ژن تاکە هۆیەکەو مەبەستی ژنیش رۆڵەیە.. بەلاّم ئەی ئافرەت دەبێتە چی بۆ پیاو؟.. پیاوی راستەقینە دووشتی گەرەکە: خۆخستنە مەترسی و یاری–ئەمە ئەوشتەیە کەپیاو دەخاتە سەر کەڵکەڵەی ئافرەت و ئەویش خەتەرناکترین یاریە.

پیاو بۆ جەنگ ئافەریدبووەو ژنیش بۆ ئەوە دروست بووە کەپیاوی لەلابێ.. ئیدی بێجگەی ئەوە شێتایەتی‌یە، جەنگاوەریش مەیلی میوەیەك ناکات شیرینی‌یەکەی لەکۆتایی‌دا بێ.. لەبەر ئەوەیە کەحەزی لەئافرەتە، چونکە لەشیرین ترین ئافرەتا تالاو دەچێژی!

هێندەی ئافرەت لەمندالْ تێدەگا، پیاو بەو ئەندازەیە تێی ناگا.. بەلام پیاو لەخووی مندالەوە نزیکترە تاوەکو ئافرەت.. لەهەموو پیاوێکی راستەقینەدا مندالێك خۆی حەشار داوەو حەزی لەیاری‌یە. کەواتە بائافرەتان بکەونە پشکنینی مندالْ لەپیاودا.

با ئافرەت یاری‌یەکی گچکەی پاکیزە بێ، وەك ئەلْماس پاکزایی جیهانی چاوەڕوان کراوی تێدا تیشك بداتەوە.. ئەی ئافرەت! با لەخۆشەویستی تۆدا ئەستێرە بەرزە گڕبستێنێ.. با حەزو ئارەزووی تۆ هاوار بکا:-

مرۆڤی بالا بۆ ئەم جیهانە دەخەمەوە، بالە خۆشەویستنەکەتدا بەئازایەتی‌یەوە چەك دار بی و هەلْ کوتیتە سەر ئەوکەسەی لەدلْتا ترس دەوروورژێنێ.. ڤیانی خۆت بکەرە پەناگای ڕووسووریت.. هەرچەندە ئافرەتیش تاڕادەیەکی کەم شەرەفناسە.. هەر چۆنێ‌بێ شەرەف لەخۆشەویستی تۆدا ئەو خووەیە وات لێ بەسەر دەهێنێ مامەلەی خۆشەویستایەتی‌یەکەت پتر بێ لەزاتی خۆشەویستایەتی‌کەت.. ئەوجا بۆ پایانی دووەم شۆڕ نابیتەوە.

کاتێ خۆشەویستی ئافرەت زالْ دەبێ بەسەریاو تین دەستێنێ با، پیاو سلْ لە ئافرەتەکە بکاتەوە؛ چونکە ئافرەت لەپێناو خۆشویستنەکەی‌دا قوربانی بەهەموو شتێك دەداو لەچاوی ئەوڕا بەرانبەر خۆشەویستی نرخی هەموو شتێك دادەوەشێنێ.

بالەو کاتەدا ئافرەت غەزەبناك دەبێ پیاو خۆی لێ لابدا؛ چونکە ئەگەر دلی پیاو بۆسەی دلْ رەقی بێ ئەوا دلی ئافرەتیش بۆسەی شەڕە.

ئافرەت رق و کینەی خۆی بەرەو ڕووی کێ دەکاتەوە؟ وەلامەکە لە گوتەی ئاسن دایە کە بەهێزی ڕاکێش دەلێ: ((بەڕاستی حەزت لێ ناکەم و چارەتم ناوێ، چونکە تۆ ڕاکێشی و وزەیەکی ئەوتۆشت تێدانیە ئەوەی ڕای دەکێشی بی بەستیتەوە))

بەختیاریی پیاو بەستراوە بەویستی خۆیەوە.. بەلام بەختەوەری ئافرەت بەستراوە بەویستی پیاوەوە.

لەو حەلەدا کەئافرەت تەلیسمی سەرجەمی خۆشویستنەکەی بوو دەڵێ: ((ئیدی جیهان کامڵەو ڕەخساوە)).

دەبێ ئافرەت پێ‌مل بێ‌و قولایی‌یەکانی لەسەر ڕووکاری خۆی چاوبکا؛ چونکە گیانی ئافرەت لەسەر ڕووکارە.. تۆبڵێ: گۆناو سەر ڕووی ئاوێکەو با- شەپۆلەکانی ئەدا بە یەك داو وازییان پێ دەکا.. لەهەمان کات دا گیانی پیاو قولایی ئەو تۆیە لەبێ‌بنی خۆی‌دا شەپۆل ئەداو دەنرکێنێ.. ئافرەت هەست بەهێزی پیاو دەکا بەلام هەرگیز تێی ناگا.

ئەوجا پیرێژنە گوتی:

زارا شتی زۆر خۆشی باس کرد کە شایانی ئەوەن کچە نەورەسەکان گوێیان بۆ ڕابدێرن. شتێکی سەمەرەشە کەزارا لەبارەی ژنانەوە ڕاست دەڵێ‌و کەمێکیش نەبێ شارەزایان نیە! تۆ بڵێی ئەم نیشانە پێکانەی زارا لەوەوە نەهاتبێ کەلەدەرباری ئافرەت دا شتێك نیە خۆدارو قەدەغەبێ؟!

ئێستاش زارا گوێم بۆ بگرە!

لەپاداشتی ئەم قسانەت ڕا ڕاستیەکی گچکەت بۆ دەردەخەم، لەبەر ئەوەش کەبوومە داپیرە لێم ناگیرێ بۆت ئاشکرا بکەم؛ تۆش گوێم بۆ ڕاهێڵەو توند دەمت دابخە، نە بەشکم ئەو ڕاستی‌یە بچکۆلەیە قیژەی لەزار تەوەبێ.

گوتم: ئادەی ئافرەتەکە! ئەو ڕاستی‌یە گچکەڵەیە بڵێ؟!

ئەمەش گوتەی پیرێژنەکە بوو:

((هەر کاتێ چوویتە لای ئافرەت شووڵت لەبیر نەچێ)).

زارا ئاوای گوت...

## مارپێوەدان

لەڕۆژێکی زۆر گەرمادا زارا لەبن دار هەنجیرێك دا خەوی لێ کەوت‌و قۆڵی نابووە بان چاوانی. مارێك هات‌و پێیەوەدا، بەئازارەوە ڕاپەڕی‌و هاواری کردو چاوی لەمارەکە هەڵ چەقین. ئەویش پێچی دا کەبڕوا، زاراش پێی گوت:

((جاریٚ مەڕۆ تاسوپاست بەجیٚ دەهێنم؛ چونکە کاروانێکی دوورم لەبەرەو تۆش لەکاتی خۆیدا بێدارت کردمەوە)).

مارەکە بەدەنگێکی کزەوە وەڵامی دایەوە: ((بەڵکو گەشتەکەت نزیکەو ژەهرەکەی منیش کوشندەیە)).

زارا بزەیەکی هاتیٚو پێی گوت:- بۆچی ژەهری مار دەرەقەتی ئەژدەر دیٚ، بیکوژیٚ؟! ئەوە ژەهرەکەتو دەت دەمەوە، چونکە تۆ ناچارنی، هێندەشت نیە بیبەخشی بەمن.

مارەکە راخزی خۆی لەملی زارا بئالێنیٚو برینەکەی هەڵ ملیسێتەوە.

رۆژێك زارا ئەورووداوەی بۆ مریدەکانی گێڕایەوە. ئەوانیش گوتیان مانای ئەدەبی ئەم چیرۆکە چیە؟ وەڵامی دانەوە: ئەوانە کار سازو دادخوازن ناویان زڕاندووم کەڕووخێنەری بنەما ئەدەبیەکانم، چیرۆکەکەشم لەتەك ئەو بنەمایانەدا ناگونجیٚ.

کەتووشتان بوو بەتووشی دوژمنەوە، سەر بەسەرێی خراپەی بەچاکە لەتەك دا مەکەن؛ چونکە بەوکارە خۆی لەلا بچوك دەبێتەوە، بەڵکو بۆی تابینابکەنەوە: کەچۆن کارێکی لەگەڵ ئێوەدا کردووە.. بۆ ئێوە واجوانە کەس سووك نەکەنو رەق هەستاوانەش خۆتان پیشان بدەن. ئەگەر بەرەوڕووی نەفرەتو نەفرینی بوونەوە، کەیفم بەوەساز نابیٚ ئێوەش فەڕو بەرەکەت ببەخشنەوە؛ پێم خۆشە ئێوەش هاوتا واز لەنەفرینی خۆتان نەهێنن. ئەگەر ستەمێکی گەورەتان لیٚکرا هێندەی خۆی بەرەنگاری ستەمکار ببنەوەو[16] پێنج وردە ستەمیشی رەگەڵ بخەن. چونکە هیچ دیمەنێك هێندەی دیمەنی ئەو کەسە ناشرین نیە کە تەنیا بۆ ستەم مل کەچ دەکاو بۆ شتی کە مل کەچ نابیٚ. دابەش بوونی جەوروستەم بەیەکسانی لەخۆیدا یەکسانییە بەراستو ڕەوا، ئایا لەمەو بەر ئەوەتان زانیوە؟ کەسیٚ بتوانیٚ بەستەمباری خەڵکی ماندووبکا پیٚویستە ئەویش بارە بەری ستەم بیٚ.

---

[16] لێرەدا نیٚتشە خۆی ئازا دەکا، گوایە بەربەرچی ئایەتی بەزەییو ئاشتی دینی عیسا (د.خ) دەداتەوە.. بەڵام لەم لافی بیٚدینییەی دا هیچ بەخۆی نەزانیوە کە ئالێرەداو لەهەمان بەندا ریسەکەی کردۆتەوە بەخوریوسەری کردۆتەوە بەکۆشی ئیسلامەتی پیرۆزدا!

ئالانی

ئەگەر مرۆڤ کەمێك تۆڵەسـتێن بـێ ئـەوە لای هـەرە کـەمی چاکەیـەتی. ئـەوەش کارێکی مرۆڤانە نیە کە ستەمبار واز لەتۆڵەبهێنێ. ئەگەر هەق سەندنەوەتان بریتی نەبێ لەوکارەی بەڕەوا بەرامبەر بەدەست درێژکار دەی کەن- ئەوا من نەفرەت لەتۆڵەسەندنەوەتان دەکەم. کەسی هەڵە پاڵ بداتە نەفسی خۆی وەجاخزادە ترە لەو کەسانەی لەهەمووکاتێك دا جارِدەدەن کە ڕاستی لەلایەنی ئەوانە. لەو گرۆهەش دا مەبەستم ئەو کەسانەن کە بەڕاستی ئالودەی ڕاستین و چەوت نین. ئەو کەسانەش کە ((گیان داریی))ن، ئاواناکەن..

من چارەی ئەو دادپەروەرییە ساردو سڕەی ئێوەم نەگەرەکە؛ چونکە لەچاوی دادوەرەکانتان دا، بکوژ بە خۆیو بریسکەی شمشێرەکەیەوە سنگی دەرپەڕاندووە. لەچاوی کام داد پەروەریدا بێخەوشی دەردەکەوێ؟ یان کامەیەو لەکوێیە دادپەروەریی بێ گەرد؟..

ئێوە ئەو ڤیانەم دەست بخەن نەك تەنیا جۆرەکانی سزای دابێ بەکۆڵ دا.. بەڵکو هەموو تاوانەکانیشی لەگەڵ دا خستبنە سەر شان.

دادێکی ئەوتۆم دەست بخەن کەپاکانەی هەمووان دەکا، تاوەکو حوکم بەسەر ئەو مرۆڤەدا بدا مل کەچی باوەڕوسزا بەری دەبێ. ئایا دەتانەوێ دوورتر بڕۆم لەوەی کە گوتم، ئەوجا جارِتان بۆ بدەم کەخودی درۆ بۆ مرۆڤایەتی دەبێتە خۆشەویستی لەدەروونی ئەوکەسەدا حەزی لەداد نانەوەیە.

بەڵام ئایە لەوزەی من دا هەیە بەهەموو دڵ سۆزیمەوە داد بچەسپێنم؟.. چۆن دەتوانم بگەمە ئەورادەیەی ماف بدەمە دەست هەموو خاوەن مافێك؟.. کەواتە بەئەوەندە وازدەهێنم کەمافە تایبەتییەکەی لەمەڕ خۆمیان پی ببەخشم.

دواتر لەسستەمی (تەنیا) خۆتان بپارێزن؛ چونکە لەتواناىدا نیە لەبیری بچێتەوە لەگەڵ ستەمکارەکان ئاڵوگۆڕی ستەم بکا. (تەنیا): هەر ئەو بیرە قووڵەیە، کێ حەزبکا دەتوانێ بەردێکی تێ فڕێ بدا. بەڵام کەبەردەکە گەیشتە بنی بنەوەی بیرەکە کێ دەتوانێ دەری بهێنێتەوە؟

نەکەن تەنیا -منفرد- سووك بکەن کەهەر سووکیشتان کرد ئەوا خێرا پەلاماری بدەنێ و بی‌کوژن.

زارا ئاوای گووت...

# منداڵو ژن هێنان

کاکی خۆم ! پرسیارێکی تایبەتیت لێ دەکەم تابچمە قووڵایی گیانتەوە: تۆ سەرەتای تەمەنتەوە ئاواتە خوازیشی ژنو منداڵت هەبی؟.. بەلاّم پێم بلێ تۆ ئەو پیاوەی کەمافی ئەو ئاواتە خوازییەت هەبێ؟.. ئایە تۆ زاڵو سەرکەوتووی بەسەر نەفسی خۆت داو فەرماندەی هەستەکانی خۆتتیو وەدەست بەسەراگری ئاکارە پەسندەکانتی؟..

یان ئاواتە خوازییەکەت بریتییە لە هەوەسی ئاژەڵێك.. یان ترسوبیمی تەنیایەکە؟.. یان پەرێشانی کەسێکە ناکۆکی کەوتبێتە نێوان خۆیو نەفسییەوە.

بەش بەخۆم داوات لێ دەکەم کەبەسەرکەوتنو سەرفرازیتەوە تاسەی (تازەوەبوون بەمنداڵ) بکەی، چونکە ئەو پایەو پەیکەرانەی هەڵیان دەنێی دەبێ لەژوور ئاستی خۆتەوەبن.. ئەوجا بەرەوڕووت دەبمەوە: ئەرێ لەکەڵە پەنجەی پێتەوە تا تەوقە سەرت توندو تۆڵی تا ئەو کارە بەجێ بهێنی؟!

کاری تۆ تەنیا هەر ئەوەنیە کەبنەچەی خۆت بۆ پێشەوە ببەی.. بەڵکو لەسەرتە بۆ هەرە بالاّسەری بخەی، کەواتە بائیشەکەت لەزەمینەی ژن هێنان دا بۆ ئەم مەبەستە بێتەدی.

پێویستە لەسەرت لەشولارێك دەست خۆت بخەی کە گەوهەری ئەو لەگەوهەری لەشی تۆ پاکژتر بێ. با ئەو گەوهەر داڕشتنە یەکەم بزووتنەوەو چەرخەیەك بێ بەدەوری تەوەری خۆی دا بسوڕێتەوە.. کەواتە لەسەرتە کەسی داهێنەر بخولقێنی.

لەباوی من دا ژن هێنان یەك گرتنی دوو خواستە لەپێناوی بنیادی کەسێك دا کەلەهۆیەکانی هەبوونی خۆی بالاّ تربێ، کەواتە ژن هێنان ئاڵوگۆڕی ڕێزێکەو بەندە بە ڕێزگرتنی ئەو خواستو ئیرادەیەوە.

با ئەمە واتای ڕاستینەی ژن هێنانت بێ.. بەلاّم ئەو شتەی کەنەفامە لەوارەکان ((دخلاو)) پێی دەڵێن ژن هێنان، کارێکەو من لەباس کردنیدا سەراسیمەم! هەر ئەمەندەی لێ دەڵێم:

-ئەو کارە بریتی‌یە لە (گیان زەلیلی)و دوان بەسەر خۆیانا بەشی دەکەن.. پەلۆخی یەکەو دووان تێیدا دەگەوزن.. لەزەتێکی چارە رەشانەیەو دووانی داگرتۆتەوە.. بەڵام لەوارەکان ئەو جۆرە ژن هێنانە بەتێك بەستەیەك دادەنێن کە ئاسمان گرێی داوە.

من بەو جۆرە ئاسمانە ڕازی نابم کە ئاسمانی لاوەکی و لەوارەکانەو دەرفەتی لێ بڕیون. دەك دووای بڕێو دووای ئەو خواوەندەش بڕێ کە بۆ پیرۆزبایی (دووان) بەپاشەکشێوە دێتەبەرەوە کەچی ئەویش بەیەکی نەگەیاندوون.

ژن هێنانێکی بەو تەرزە با نەتانخاتە پێکەنین؛ ئای کەزۆر منداڵ هەن و هەقیانە بەسەر دایك و باوکیان دا بگرین!

دیتم پیاوێکی سەنگینەو ژنی هێناوە، بەشی خۆی پێ گەیشتووە کە لەمانای زەوی بگا.. بەڵام کەدواتر ژنەکەیم دی دنیام لەبەرچاوو بوو بەشێتخانە؛ کاتێ پیاوێکی سەنگین دەبینم و ژنێکی گەوجی هێناوە حەز دەکەم بەجارێ زەوی لرفم بدا.

هەیەو بەچەشنی پاڵەوانەکان خۆی لەهەموو شتێك دادڕنێ و بەدوای شتە ڕاستەکان دا وێڵ دەبێ. ئەوەندەی پێ ناچێ ئامانجی ڕاوکردنەکەی دەبێتە دەست بەندێکی قەڵب..یان: بەندیواری‌یەکی ڕووکەش و ناوی دەنێ ژن هێنان.

هەشیانە لەخۆڕاگری و سڵ کردنەوەی ژن هێنان دا دەنگی‌داوەتەوە، کەچی لەشەوو ڕۆژێك دا ژیانی خۆی خراپ دەکاو ناویشی دەنێ ژن هێنان. هەشیانە ئەوداڵی کارەکەرێکە وەك حۆری پاکیزەبی کەچی کارەکەی لێ وەردەسووڕێ و ئەوەندەبەخۆی دەزانێ کابرا بۆتە نۆکەری ژنێك! ئەوجا لەجێی خۆی‌دایە پیاوەکە بەفریشتە سفەت ناودێربێ‌س.

هەموو شوێنێکم پشکنی، هەرچیم دی کڕیاربوو، کوتاڵی ئەم دیوو ئەو دیوو دەکردو مەکری لەچاوان دەباری.. بەڵام کاری ئەوجۆرە زەلامانە سەرەنجام ناگاتە ئەوەی هەریەکەوپشیلەی خۆی بکڕێ و لەچمکی جلەکانی‌دا بی‌شارێتەوە.

ئەوەی پێی دەڵێن ئەڤین نۆرەی شێتی‌یەو پەیتا پەیتا سەر هەڵ دەداتەوەو دەگاتە ژن هێنان و گەوجایەتی گەورەو دامرکاوتان کە دەبێتە دواینەی گەوجایەتی‌یەکانتان. کاشکێ خۆشەویستی پیاو بۆ ژن و هی ژن بۆ پیاو ئەو بەزەیی پێدا هاتنەوەیە بووایە کەلە جووتە خواوەندی بەئازار دەوشێتەوە.

بەڵام ئەو خۆشەویستی‌یە بەلایەنی زیادەوە لێکدی حاڵی بوونێکە لەنێوان هەستو نەستی دوو ئاژەڵدا. ئەگەر بزانن: باشترین خۆشەویستی بریتی‌یە لە گۆڕانکاری‌و گڕ تێ بەربوونی ئازارو ڕاچەنین، ئەمەش مەشخەڵێکەو ڕێگاکانی بالابوون لەبەردەمتان دا رووناك دەکاتەوە. رۆژێکیش دێتە بەرەوە کە خۆشەویستیتان رووبکاتە ئارامگەیەکی دوورترو بڵند تر لەقرارگای زاتی خۆتان.

دیارە خەریکن فێری خۆشەویستی ببن‌و دەستتان داوەتێ، ئێستا لەبەرهەمان هۆ تالاوێك فڕدەکەن‌و دەی چێژن هەر دەڵێی کەفە بڵقی سەرکاسەیە.

لەکاسەی هەموو خۆشەویستی‌یەك دا.. تەنانەت لەهی بالاترین ڤیان دا تالاوێك هەیەو ناچارن بی‌کەن بەگەرووتان دا.

داهێنەکان! ئەمە ئەو تالاوەیە کەتاسەی مرۆڤی بالاتان تێدا ڕادەپەڕێنی‌و لەپێناو ئەودا تینوێتیتان گڕدەدا. ئەوجا براله! ئەگەر تینوێتی ئاوەها، پاڵت پێوە بنێ بۆ ژن هێنان.. یان ئارەزوومەندی یەکەت وەك تیر بەرەو مرۆڤی بالا هەڵکات، ئەوامنیش لەلایەن خۆمەوە پیرۆزبایی ئەو خواستو ئیرادەیەت لێ دەکەم‌و دواتر پیرۆزبایی ئەو ژن هێنانەت لێ دەکەم.

زارا ئاوای گوت...

## مەرگ هەڵ بژاردن

ئەوانەی لەمەرگی خۆیان دووا دەکەون زۆرن..ئەوانەشیان کەجوانە مەرگ دەبن هەر زۆرن. ئەگەر هاتو یەکێك-کاتێکی لەبار بۆ مەرگ-بەخەڵکە رابگەیەنێ، ئەوا بەسەرسامی‌یەوە دەی کەنە هاتو هاوار. زارا خەڵکی فێردەکا لەوادەی خۆی‌دا بمرن.. بەڵام دەبێ ئەو کەسە کێ بێ ژیانناس بێ لەوادەی خۆشی‌دا مەرگ بخوازی؟!

ئایە باشتر نەبوو کەلەوارەکانی ژیان هەر لەدایك نەبوونایە؟!

بەڵام ئەوانە گەرەکیانە کارێ بکەن خەڵکو خوا بەگرنگی‌یەوە پەنجە بۆ مردنەکەیان رابدێرن. زۆر (ناوکە)ش بەشکان خۆی هەڵ دەکێشی کەچی پووچەڵە!

ئەوانە چونکە نازانن شادی مەرگ چیە، فرەگرنگی یان پێداوە. خەڵکی تائێستاش فێرنەبوون چۆن ببنە ستایش خوانی نازدارترین جەژن. لەمەوودا هەواڵی مەرگی پیرۆزتان پێ رادەگەیەنم.. ئەو مەرگەی کەبەهەموو ئاوات و هاندەرێکی‌یەوە سەرجەمی زیندووەکان کەمەندکێش دەکا.خەنی لەو کەسەی کاری خۆی تەواو کردووەو بەسەرکەوتنەوە دەمرێ. ئەوانەی لەدەوری ئەو زەفەرمەندەشن، ئاواتەکانیان لەگینگڵەدان بەرەو شادمەرگ بوون، پاڵیان دەدەن. من دەڵێم: خۆتان فێربکەن کەئاوا بمرن.. بەلاٌم دەبێ ئەوەش بزانن کەسێك پیرۆزبایی ئەو شتەنەکا کەزیندووەکان بەڵێنی تەواو کردنیان داوە ئەوا مردنەکەی هیچ سەرکەوتنێکی تێدانیە.

ئا ئەمەیە مەرگی پەسند! ئەوجا مەرگی ئەوانە دێتە بەرەوە کەلەشەڕگەدا دەکەون و گیانە مەزنەکەشیان بەسەرمەیدانەکەدا پەخشانە.. بەلاٌم ئەوەی زەفەرمەندان بە سووکی بزانن– ئەو مەرگەساتە شێواوەتانە کە وەك دز خۆی کێش دەکاو بەچەشنی فەرماندەیەکی ئیتاعەکراو دێتە پێشەوە.

((مەرگێك کەخۆم هەڵی بژێرم و فەرمووی بکەم و بێتەلام، فرە قەشەنگە.. فرە جوانە!

بەلاٌم بۆم دیاری کە.. وادەی مەرگ بۆ مرۆڤ...

چ کاتێ لەبارە، چ کاتێ لەبارە؟!

کەسێك لەژیان دا ڕووبکاتە مەبەستێك و میراتی هەبێ پێویستە لەتافێك دا مەرگ خواز بێ کەبۆ میراتی و مەبەستەکەی لەبار بێ.

چونکە لەبەر ڕێزلێ نانیان پێی ناخۆشە تاجە گوڵینەی سیس بخاتە سەر پەیکەری ژیان و زیندەگانی.

((من نەم گەرەکە– وەك گوریس هۆنەوەکان– بەدەم هەودا هۆنینەوەوە پاشەو پاش ببمەوە))

کەسانی واهەن ناهێڵن تەمەنیان لەو ئەندازەیەی کەپایانی ڕاستی و سەرکەوتنە تێ بپەڕێ. دەمێك کە ددانی تێدا نەمابێ واباشە بەدەربڕینی بێ ددانی نەکەوێتە قۆستنەوەی سەرجەمی ڕاستی‌یەکان. ئەوانەی بەتەمای سەرکەوتنن پێ ویستە لەکاتی‌خۆی‌دا ماڵاوایی لەشانازیی باوان بکەن.. تاکو لەکاتی لەباردا، دیسان لەسەر هونەری دنیا بەجێ هێشتن خۆیان رام بکەن. مرۆڤ کەزانی بخۆرەکان واز لە چەشە

نەفسی ئەو دەهێنن، بائەویش نەفسی خۆی پیشان نەدا. کەسێکیش ئەم ڕاستی‌یە دەزانێ کەبەلایەوە خۆش بێ ڤیانی دەورو بەرەکەی بپارێزێو بی هێڵێتەوە.

هەیە وەك سێو بەسرووشتی ترشیاتی‌یەکەی خۆی دەهێڵێتەوە.. تا دەگاتە دوا رۆژگاری پایزو دەگا، ئەوجا زەردایەتی پیری لێ هەڵ دەنیشێو گرژیو مۆنی دەموچاوی دادەگرێ.

هەندێ کەس هەر لەبەرایی‌یەوە پیرێتییان لەدڵ دەگەڕێ، هەیانەو پیرێتیشیان لەهۆش دەگەڕێ.. واتە (هۆشیان پیر دەبێ). بڕێکی دی هەر لەبەهاری ژیاندا پیر دەبن.. بەڵام کەسێك دوواتر بگاتە گوڕی لاوێتی ئەوا تا ئەمەدێکی دوور ئەولاوێتی‌یەی دەپارێزێ.

هەندێ مەردووم لەژیانیان دا گومڕابوونو تەمەنیان بەفیڕۆ داوە، پێویستە بەلای کەمەوە ئەو گرۆهە کارێ بکەن بگەنە خۆ گونجان لەگەڵ مەرگ دا.

هەندێ میوە هەیەو پی ناگا، هەر لە هاوین دا کرمۆڵ دەبیو بەلقەکانیشەوە شۆڕدەبێتەوە.. ئەو جۆرە میوە داوەشاوانە لەبەر ترسنۆکی خۆیان ناوێرن بکەونە خوارەوە.. ئابەو چەشنە لەم جیهانەدا خەڵکی دەبینم توند خۆیان بەچێوەبەژنی خۆیانەوە هەڵەرۆسکاندووە.. تۆ بڵێی فەرتەنەیەکیان لێ هەڵ نەکا؟! ئەوجا چی دەردلێی‌داوە دای تەپێتە خوارێ؟. با گازندەکانی مەرگی خێرا بێنە پێشەوەو، وەك گێژەڵووکە پیرەداری ژیان تێك هەڵ دەنو لوولی بکەن.. بەڵام بەش بەخۆم تەنیا گازندەی سستەمەرگ دەبینم، ئەوانیش هەر دەگلێنە ئامۆژگاری ئارامو خۆ ڕاگرتن لەژێر باری هەموو فەلاکەتێکی ئەم سەرزەوییەدا.

ئێوە دەتانەوێ بەنیخە نیخو باڵە تەپێوە لەگەڵ زەوی‌دا ململانێی مەزنایەتیو خۆگری بکەن! ئەوا زەویش ڕێك لەتەکتان دا خۆگرو بەئارامە.

ڕاستی‌یەکەی ئەو عیبرانی‌یەی کە مزگێنی دەرانی بە سستەمەرگ شکۆمەندی دەکەن بەر لەوادەی خۆی مرد. ئێستاش گەلەیەکی زەبەند باوەڕیان وایە کە جوانەمەرگ بوونەکەی عیسا روداوێکی چارەنووسانەبووە.

بەڵام ئەو عیبرانی‌یەی بێجگە لە فرمێسکی گەلەکەیو خەفەتبارییان.. لەتەك فێڵی کارسازانو دادگەران بەولاوە چی‌دیکەی نەزانیوە؛ ئەوجا لەبەر ئەوە کوتوپڕ ئارەزووی نەمانی تێڕاگەڕاوە.

خۆ ئەگەر لەبیابان داو لەدووراو دووری کارزان‌و دادگەران دا بمایەوە ئەوا فێرە خۆشەویستی ژیان‌و فێرە خۆشەویستی زەمین بوو.. بەڵکو فێری پێکەنینیش دەبوو.

براینە! باوەڕم پێ بکەن کەمەسیح لەپێش وادەی خۆیدا مرد. خۆ ئەگەر بگەیشتایەتە ئەم تەمەنەی من‌و لەئێستادا– ئەوا نکووڵی لەپەیڕەوەکانی خۆی دەکرد هێندەش بوێرو پاکیزە دەبوو بەرگەی ئەوەی دەگرت بکەوێتە بەربەرەکانی داب‌و نەریتەکانی‌و لێیان ڕەهابێ، بەڵام هێندەش پێش وادەبوو نەگەیی‌و ئەو ڤیانەی لەلاوێتی دایە نەی گەیشتێ، بۆیە نەحەزی لەخەڵك بوو نەحەزیشی لەزەوی بوو، ئاوا گیانەکەی بەقورسی مایەوەو باڵی شکاوی لێك نەدا![17]

ئەو ساوایەتی‌یەی لەپیاودا هەیە لەلاودا نیە؛ پیاوی کامڵ کەمتر خەفەتبار دەبێ ولەژیان‌و مەرگ تێ گەیشتن دا بەتواناترە؛ چونکە پێ‌دەزانێ کەشیانی مەرگەو لەمەرگ دا ئازادە، خۆ ئەگەر توانای سەلماندنی شتێکی نەبێ ئەوا نکووڵی لێ‌دەکاو لێی دەرباز دەبێ.

---

[17] لێرەدا زارا پێ‌لەوەدەنێ کەعیسا خەمخۆری ئەوانە بووە کەستەم دیدە بون‌و فرمێسکی گەلی ناسیوە.. ئاگای لەمل هوڕیی ئەوانە بووە کەخۆیان ناوناوە کارسازو دادگەر. ئیدی لەمەزیاتر چی لەعیسا دەوێ کەبێ‌زانێ؟.. ئەوەتانێ هەستی بەم سەراوسەری مەسەلەکە کردووە؛ هیچ مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی لەژیان دا لەبەینی فرمێسکی داماوان‌و فڕوفێڵی بەهێزان دەرناچێ.

زارا دەی‌ویست عیسا بگەیشتایەتە ساڵ تەمەنی ئەم‌و نکووڵی لەداب‌و نەریتەکەی خۆی بکردایەو باڵی نەفسی بڕەواندایەوەو مرۆڤ‌و زەوی خۆش بویستنایە.

ئایە (سەبارەت بەوەی کەمەسەلەی کۆمەڵایەتی لەڕووی کێشەوە لەگەڵ مەسەلەی ژیان دا سەربەخۆیە) ئەوانەی چاکە خوازی مرۆڤانەن– گەیشتونەتە ئەو ڕادەیەی کە پیاوە عیبرانی‌یەکەو پیاوە عەرەبی‌یەکە گەیشتوونەتێ، دەربارەی خۆشەویستی مرۆڤانەو خۆبەختکردن لەپێناو ڕاست کردنەوەی ژیان دا؟!

لەکاتێك دا نیتشە بنەماکانی ژیان وێنەداردەکاو ڕایان دەنوێنێ ئایا بۆی هەیە لافی ئەوە لێ بدا کەشتێکی تازەی لەفەلسەفەکەی خۆی هێناوەتە کایەوە؟.. ئەی ئەوە نیە هەرچی پێکاوێتی لەو سروشەی وەرگرتووە کەخوا بۆ پێغەمبەری ناردووە؟.. پشت هەڵ کردنی ڕاوەڕوونی ئەو سرووشتە بووەتە هۆی گومڕا بوونی!. ف-ف

هاوڕێیان! کاریٚ مەکەن مردنەکەتان لەسەر مرۆڤ و زەوی مایەسووکی بیٚ.. ئەمەش نیعمەتێکەو لەگیان ئارامیتانی سواڵ دەکەم.

بابیر پەسندیتان لەکاتی سەرەمەرگتان دا دواتیشکی خۆی بهاوێژیٚ، هەر بەو رەنگەی خۆر لەئابوونیدا دوا رووناکی دەنێرێتە سەر زەوی.. دەنا مەرگتان بەهیچ دەچیٚ. هاوڕێیان! من دەمەویٚ ئاوا بمرم و ئەوسا لەبەر خاتری من زەویتان خۆش بویٚ.. دواتر دەمەویٚ بگەڕێمەوە سەر ئەو زەوییەی کەلێی دروست بووم، تالەباوەشی ئەودا بۆخۆم ئاسوودەبم.

زارا دەی تەقاندە ئەو نیشانەیەی مەبەستی بوو.. ئێستاش ئەوا تیرەکەی خۆی هاویشتیٚ و گوڕی خۆی بەستەوە.. ئێوەش دوای من تیرتان بگرنە هەمان نیشانە. هەر لەبەر خاتری ئێوە بوو کەتیرە زێرینەی خۆم هاویشت. ئەوەندەی حەز دەکەم چاوم لیٚی بیٚ: ئێوەش تیرە زێرینەکانتان دەهاوێژن، ئەوەندە بەعەزرەتی شتێکی کەوەنیم. کەمێکیش لەسەر زەمین دەمێنمەوە تاخۆشی لەودیمەنە وەربگرم. تاکاتی خۆی لەم دواکەوتنەم دا داوای لیٚ بووردنتان لیٚدەکەم.

زارا ئاوای گوت...

## ئاکار پەسندیی بەخشندە

### ١

دوای ئەوەی زارا ماڵاوایی لەشاری (مانگا بەڵەك)) کرد.. ئەوشارەی هەمیشە دڵی لەلای بوو، کۆمەڵێکی زۆر لەو کەسانەی خۆیان بەپێڕەوی ئەو دەزانی بەرێیان کرد تا گەیشتنە نیوەی رێگا، ئەوجا زارا پێی گوتن: ئێستا کاتی لێك هەڵبڕانەو لەمەولا بەتەنیٚ دەڕۆم. ئەوانیش ماڵاویان لیٚ کردو دار وەکازێکیان پیٚ بەخشی کەدەسکەکەی لەزێڕ بوو بەوێنەی مارێك لەخۆر ئاڵابیٚ. زارا بەم دیارییە دڵ خۆش بوو، خۆیدا بەسەر وەکازەکەداو بەمریدەکانی گوت:

پێم بڵێن: بۆچی زێڕ بەنرخە؟.. ئەی هەر لەبەر ئەوەنیە کەدەگمەنەو بیٚکەڵکیشە.. لەبریسکانەوەدا سەنگین و لەسەر خۆیە، لەهەموو کاتێکیش دا خۆی دەبەخشیٚ؟ کەزێڕ گەیشتووەتە ئەوپەڕی پلەی شتە بەنرخەکان لەبەر ئەوەیە هێمای بالاترین

پاك‌و پەسندی‌یە.. چاوی بەخشندەش وەك زێڕ بریقەی دێ.. شەوق سەندنی زێڕ لەنێو پرشنگدارەکان دا پەیامبەری ئاشتی‌و سلاّوە.

بالاّترین پەسندی کەشتێکی دەگمەن‌و بێسوودە بەڕووناکی‌یە هێواشەکەی لەمەڕخۆیەوە شەوق دەستێنێ.. لەنێو ئاکارە پەسندەکانیش دا نیانە بگاتە پەسندایەتی بەخشندە.

یاران! بەڕاستی هەستم بەلای حەزو ئارەزووەکانتانەوەیە ئێوەش وەك من بەتەمای پەسندایەتی بەخشندەن، دەتانەوێ نەفسی خۆتان بکەنە بەخشین‌و بەشینەوە، ئەگەر وەهانەبن لەگەلە گورگ‌و پشیلە دەچن؛ بۆیە تینوی گەنجینە کۆکردنەوەن. گەنجینەکانیش هەمیشە تینووی بەخشینن، ئێوە هەرچی لەدەورتانە بەلای خۆتان دا کێشی دەکەن، تا بەتەواوی بنرێتە دەروونتانەوە. سەرچەشمەی گەنجینەتان وەك ڤیان بەشینەوەتان– دەتەقێ‌و هاژەدەکا!

ئەڤینی سەخاوەتی بەخشندە دەبێتە دزێك‌و دەست بۆ هەموو شتێکی بەنرخ دەبا؛ ئەم خۆویستنەش بەکارێکی چاك‌و پاك دەزانم.

جۆرێکی دی لەخۆ پەرستی بەتاوی نەوسنی‌و چاوچنۆکی‌یە، کە دادەڕووخێتە چاڵی سەرشۆڕیەوە.. خۆ ویستنێکە هەمیشە چاوی لەدزی‌یەو بەچاوەوە دەنۆڕێتە هەموو شتێك، ئەوەش خۆ ویستنێکی نەخۆشە؛ وەك برسیی هار دەکەوێتە پەلامارو دواتر پاروی نێو دەمی خاوەن نازەکانیش دەژمێری‌وهەڵی دەسەنگێنێ.. هەمیشە بۆ سەرخوانی بەخشندەکان خۆی کێش دەکا. ئەو جۆرە هەوەسە دەرخستنی دەردێکی شاراوەیەو بەڵگەی نزمایەتی پەنهانە.

چاو لەدزێتی‌و بەو جۆرە خۆ ویستنە ئارەزووبازی‌و خووی لەشە دەردە دارەکانە.

براینە! چ شتێك بەدزێو تری هەموو شتێك دابنێین؟ ئەدی نزم بووەنەوە دزێوتریان نیە! هەر کۆمەڵێك ئاسەواری گیانی سەخاوەتی بەخشندەی تێدا نەبوو ئایە دەتوانن حوکمی بێجگەی نزمایەتی بەسەردا بدەن؟

بەریانی رێگەمان بەرەو ترۆپکە.. ئەوەی مەبەستیشمانە هەر بالاّبوونە لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دی.. لەبەر ئەوەیە لەو کاتەدا شەپرزەدەبین کەوا دەبیستین نزمایەتی هاوار دەکا:– ((هەموو شتێکم هەیە)) یان – هەموو شتێك هی خۆمە–!

ئەگەر گیانمان هێمای لەشمان نەبێ و بەتەمای بالأبوون نەبێ دەبێ چی بێ؟.. ئەگەر ئەو ئاکارانەی ناومان ناون پەسندایەتی رەوشت بریتی نەبن لەخودی ئەو هێمایانە دەبێ چی بن؟!

لەش بەتێکۆشان مەودای مێژوو دەبڕێ.. بەلأم ئەگەر گیان هەواڵدەری ڕەنج و سەرکەوتنی لەش نەبێ دەبێ چی بێ بەچاولەشەوە؟.. لەش تەنیا دەنگەو گیانیش دەنگدانەوەیەتی بەشوێنییەوەیە، ئەو بێژەو وشانەی بۆ (چاکە)و (خراپە) دانراون تەنیا هێمایەکی رووتن، ئاماژەی شتەکان دەکەن و دەریان نابڕن بێجگەی شێتەکان کەسیدی لەو وشانەدا یان لەو بێژانەوە داوای زانیاری ناکا.

براینە! بۆ ئەوزەمانە بێدار ببنەوە کە بیروفکری ئێوە بەتەمای بەیان و دەربڕینە ئەویش بەهۆی (هێماکان)ەوە چونکە لەو حەلەدا نەبێ پەسندایەتیتان تێدا ڕەنێو نایە.

ئەوجا لەشتان دەژێتەوەو ڕوو لە لووتکە دەکا و هۆشتان لەخەفەبوون دەرباز دەکاو بۆ قۆناخەکانی داهێنان پاڵی پێوەدەنێ تابەو هۆیەوە نرخی شتەکان دەناسێ و دەکەوێتە خۆشەویستی و کارەکانیشی ڕێك و گورجوگۆلأنە دەبن.

لەهەر زەمانێك دا دڵتان بەپەروشەوە خەریك بوو. ئەوا لایەنە پەسندایەتییەکەتان تێدا پێك دێ، ئەو جۆرە دلأنەی بەخۆیانەوە گلاون و خەریکن وەك ڕووبار هەڵ دەچن، ئەوانەی لەقەراغیشینی فەرپۆشیان دەکا.. هەر وەك بەمەترسیشەوە هەرەشەیان پێ دەگەیەنی، واتە لەهەمان کات دا مەترسیشیان پێ ڕادەگەیەنێ. کاتێ پەسندیتان پەیدا دەبێ کەمەدح و زەم کۆڵەوارێن و نەگەنە هەستگەلتان؛ ئەوجا ویستی پیاوەتی لەئێوەدا بەتەمای سەروەری دەبێ لەهەموو شتێك دا. کاتێ پەسندایەتیتان پێك دێ کەخۆش گوزرەرانی و نازو جێگای نەرم و نۆڵتان لەلابێ بایەخ بێ، کوێ لە شوێنی ئاسوودە دووربێ لەوێ بحەوێنەوە.

کاتێ پەسندیتان وەدەر دەکەوێ کە ویستی ئێوە لەسەر تاکەمەبەستێك دامەزرابێ، هەرکاتێ ئەو گۆڕانکارییە لە ئارەزووەکانتان دا بوو بەپێ ویست و ناچاری تازە ناتوانن لێی هەڵ بگەڕێنەوە.

ئەدی ئەمە تازە شێوەیەك نیە بۆ (چاکەو خراپە)؟..ئەی بۆچی ئەم گوتەیە بەخوڕەی ئەو سەرچاوە قووڵەی لەپێش دا لێتان لاڕێ بووە ڕاناگەیەنن؟!

پەسـندایەتی تـازەگی ئەوەیـە کـە هـێز بەخشـی مـرۆڤ بـێ و خۆگریـی تێـدا ببوژێنێتـەوە.. ئەمـە بـیری دەسـەڵاتدارە لـەگیان دا بەمـەرجێ بگاتـە دانـایی؛ ئـەوجا دەڵێن:

((ئەوە خۆری زێڕینەو ماری دانایی خۆی تێ ئاڵاندووە)).

## ٢

بـەبێ دەنگ زارا چاوی بەمریدەکانیدا گـێڕاو بەشـێوە دەنگێکـی تـازەوە گوتـی: براکانم! بەهەموو هێزی ئاکار پەسندیتانەوە دڵ سۆزی زەوی بن.. با خۆشەویستی بەخشندەو زانیاریتان خزمەتکاری گیانی زەوی بن، دەستم دامێنتانو هەر ئەمـەتان لێ داوادەکەم .

ماوەمـەدەن ئاکارە پەسندەکانتان لەڕاستییەکانی زەوی داماڵێنو بدەنـە شـەقەی باڵ و خۆتـان لـەدیوارەکانی ئەبەدی بسرەوێنن.. ئـای کـە لەمەوبـەر چـەندان ئاکـاری پەسند لەم ڕێگەیەوە گومڕابوون!

چـۆن پەسـندایەتیم گێڕایـەوەبۆ بڕوێـن (مرتـع)ی خـۆی لـەزەویدا، ئێـوەش پەسندایەتی گومڕاتـان بهێننـەوە.. دەی بیگێڕنـەوە بۆ لـەش و بۆ گیـان.. تـا گیـانی ئادەمییانە بکاتەوە بەرزەوی.

هۆش سەرگەردانەو پەسندیش سەرگەردان بووەو بەهەزاران شت فێڵی لێ کردووە تائێستاش ئەو شێتایەتییە بەسـەر لـەشمان دا زاڵـەو بووەتە بەشێکی.. ئیدی دوای ئەوەی گیانەکە لەلـەش ڕا گـەڕا بـوو بـە ویستو خواست. بەهـەزاران ڕێگـەدا هـۆشو پەسندایەتی کەوتوونەتە تاقی کردنەوەو ئەزموونەوە. ئا بەو چەشنـە مرۆڤ بریتـییـە لـەو گوژمـە هـەوڵو ئەزموونـەی کـە لەنـەزانینو نەفامییانـەوە گلاندوویـنو هـەڵیان داشـتووین. وەنـەبێ ئـەو تـاقی کردنەوەیـەی لەئێمـەدا چەسـپیوە، تـەنیا دانـاییو پەندیاریی نەوە ئادەمییەکان بێ.. بەڵکو لەهەمان کات دا شێتایەتی ئەوانە. هـەر لـەم بارەوە زۆر میراتگریش لەمەترسییەوە دەگلێ.

تا ئێستاش ئێمە لەزۆرانبازیی ڕێکەوتە بێڕەزاکان داین تا ئەمرۆکەش شێتۆکەیی بەمرۆڤەوە دیارەو کاری خۆی تێدا دەکا.

با هۆشو پەسندیتان بۆ زەوی وەك گیانو هۆش بن. براینە! نرخی هـەموو شتێك بەهۆی شێوەوە نوێ دەبێتەوە؛ کەواتە پێویستە ئێوەش داهێنو خوڵقێنەربن.

هەرچی لەشە بەزانیاری پاك دەبێتەوە، ئەوسا بەخاياندن دەكەوێتە پشت زانستەوە.. ئەو كەسەی دەیەوێ دانابێ دەشێ هەموو غەریزەكانی پاك بكاتەوە، كەسێكیش هەڵ كشاوبێ‌ئەوا سروودی شادی ئەدا بەدڵی خۆی!.ئەی پزیشك جاریّ لەنەفسی خۆت بنۆڕەو چارەسەری خۆت بكە تابتوانی سەرنجی نەخۆشەكەت بدەی‌و چارەی بۆ بدۆزیتەوە. باشترین یارمەتیت بۆ ئەو نەخۆشە ئەوەیە كە باوەڕت پێ بكاو وای لێ بكەی بت بینێ كەتۆ لە پێش دا– دەتوانی نەفسی خۆت چاك بكەیتەوە.

((لەسەر ئەم زەوی‌یە رێگای زۆرهەن‌و هێشتا پێیان نەخراوەتەبان.. ئای كەچەندە بەرینەو چەندە بەپێچ‌و پەنایە؟!.

ئەی كەناری‌یەكان! شەونخون‌و وریا بن، چونكە سروەی موژدە لەئاییندەوە هەڵدەكاو تەنیا گوێی سووكەڵە دەرەقێنێتەوە.

تەنیا خوازەكان! ئێوە لەم جیهانە دابڕاون.. بەڵام لەرۆژگاری ئاییندەدا ئێوە دەبنە گەلێك‌و ئنجا گەلی هەڵ بژاردەتان لێ پەیدادەبێ، چونكە ئێوە ئەمڕۆ كەخۆتان هەڵ بژاردووە، لەو گەلەش مرۆڤی بالا لەدایك دەبێ.

بەڕاستی رۆژێك دێتە بەرەوە كەئەم گۆی زەوی‌یە ببێتە دروستیخانە (مستشفى)ی بالاكردن، ئەوجا بۆنو بەرامەیەك ئەو زەوی‌یە بڵاوی بكاتەوە بریتی دەبێ لە بەرامەی دڵ سۆزی‌و ئاواتی تازە.

## ٣

وەك كەسێك قسەیەك بگلمێنی بێ دەنگ بوو، دوای ئەوەی ماوەیەك بوو داروەكازەكەی ئەم دیواودیو دەكرد، ئەوجا دەنگێكی تەواو گۆڕاوەوە هاتە كركە: هاوڕێیان! ((ئەوا بۆخۆم دەڕۆم‌و هەر بەتەنێ دەڕۆم، ئێوەش لەدوامن هەر بەتەنیا دەڕۆن.. منیش ئاوام دەوێ.))

ئەمە ئامۆژگاریمە بۆتان: وەك كەسێك لەبەرامبەرم دا داكۆكی لەخۆی بكا ئاوا ئێوەش لێم دووربكەونەوە.. بەڵكو تەواو دووربكەونەوە. لەوەش داكە خۆتان بەیارانی من دەزانن لە ئاقار خۆتان شەرم بتان گرێ؛ چونكە بەدووری مەزانن كەفێڵتان لێ بكەم‌و فریو بخۆن!

كەسێك ئەوداڵی دانایی بێ پێ ویستە تەنیا فێری دوژمن خۆشەویستی نەبێ.. بەڵكو لەپاڵ ئەوەش ڕا دەبێ فێری دۆست نەویستی بێ.. ئەگەر قوتابی هەتاسەر هەر

قوتابيي مامۆستاكەی بێ.. ئەوا بەتەواوی دان بەچاكەی ئەو مامۆستایەی‌دا نانێ. جا كەوایە، ئەی بۆ تۆ ناتانەوێ تاجەكەم تێك بشكێنن؟!

ئێوە بەمەزنی‌لەنێو خۆتان گرتووم، بەلاّم كەپشتم لێ هەلّ بكەن دەبێ كارەساتی چاوەڕوان كراو چی بێ؟ لەهەلّ نانی پەیكەرەكان دا مەترسی هەیە. وریابن! نەبەشكم ئەو پایەو پەیكەرانەی هەلّتان ناون بەسەرتان دا برمێن‌و لەنێوتان بەرن!؟

ئێوە دەلّێن: باوەڕمان بەزارایە. بەلاّم ئەمەش ئەوەندە گرنگ نیە.. ئێوە دەلّێن ئێمە ئیمانداریں، بەلاّم دەبێ گرنگی ئیماندارەكان چی بێ؟

ئێوە بەرلەوەی كەمن بدۆزنەوە، لەنەفسی خۆتان نەگەڕاون؛ ئیماندارەكانی دیكەش هەر بەو شێوەیەن؛ كەواتە ئیمان‌و باوەڕ هێندە گەورە نیە.. لەبەر ئەوە هەر لەئێستاوە پێتان دەلّێم: بۆ ئەوەی نەفسی خۆتان دەست بكەوێ لەمن بەرگەشتەبن‌و وێلّم بكەن. ئەوا دەڕۆم‌و تاخۆتان نەدۆزنەوەو نكوولّیم لێ نەكەن ناگەڕێمەوە لاتان.

بەڕاستی براینە! من لەو سەردەمەدا بەچاوێكی دی لە بەرخە گومبووەكانم دەگرێم، ئەوجا ڤیانێكتان پێ دەبەخشم كە بێجگەی ئەم ڤیانەبێ.

رۆژێك دێتە بەرەوە كەئێوە ببنە یارانی من‌و خاوەنی یەك ئاوات بن، ئەوجا بۆ نۆرەی سێ‌یەم حەزدەكەم لەنێوتان دا بمێنمەوە بۆ رێزلێنانی خۆربارانی دوانیوەڕۆی مەزن.

كاتێ مەردومگەلەكە دەگەنە جەرگەی رێگا لەنێوان ئاژەلّ‌و مرۆڤی بالاّدا.. كاتێ ئاواتی بەرزیان لەوسەری ئەو شەقامەوە بەدی دەكەن كەبەرەو شەفەقی تازەیان دەبا– ئا لەو سەردەمانەدا خۆریش خۆی لەنێو قەدی ئاسمان توند دەكا، ئەوجا نۆرەی خۆشحالّی و رێز لێنانە؟

لەوسەردەمەدا هەرچی بەو تەنیشتی دیكەدا تێ پەڕێ، ئاوا دەبێ پیرۆز بایی لەنەفسی خۆی دەكا، چونكە خۆری زانیاری‌و ماریفەتەكەی بۆ تاقی ئاسمان بەرز دەبێتەوە.

خواوەندەكان دوا بەدوای یەك سەریان نایەوە، ئیدی بێجگەی دەركەوتنی مرۆڤی بالاّ هیچ ئومێدێكی كەمان نیە،

كاتێ دەبێتە نیوەڕۆی رووناك‌و خۆریش لە نێو قەدی ئاسمانەوە شۆڕدەبێتەوە ڕووداوێكەو دەبێتە دوا خواستی ئێمەو چاوی لێ ناتروكێنین.

زارا ئاوای گوت...

# زەردەشت ئاوای گوت
## بەشی دووەم

((تا هەمووتان دەست بەردارم نەبن و نکوولّیم لیّ نەکەن
هەرگیز ناگەڕیّمەوە بۆ لاتان)).
بەڕاستی، براینە! من لەم سەردەمەدا بە چاویّکی دی لە بەر خەلە گومبووەکەم
دەگەڕیّم..))
ئەوجا ڤیانیّکتان پیّ دەبەخشم کەبیّجگەی ئەم ڤیانەبیّ))

زەردەشت
ئاکار پەسندەیی بەخشندە / بەشی یەکەم.

# منداڵی ئاوێنه هەڵگر

زارا گەڕایەوە بۆ کێوان و گۆشەگیری یەکەی لەمەڕخۆی لە ئەشکەوتەکەی‌دا تا لەبەرچاوی خەڵکەکە پەنهان بێ.. وەك جووتیار تۆوی خۆی بەکەلەبەری زەوی‌دا وەشاندو لێی گەڕاو چاوەڕوانی سەوز بوونی بوو، بەلام تاسەر خۆی پێ نەگیراو پەرۆشی دیداری دۆستانی بوو؛ چونکە هێشتا مابووی کەزۆرتریان پێ ببەخشێ.. کاری سەخت بەلای خۆشەویستەوە ئەوەیە بەرامبەر ئەو دۆستانەی داوای خۆشەویستی لێ‌دەکەن رژدو چنگ چووزبێ.. هەروەها لەکاری بەخشین دا نەهێڵێ منەت باری پێوە دیار بێ.

ساڵ و مانگ هاتن و بەسەر-تەنیا-دا تێ پەڕین و باری دانایی لە گەشەو نەشەدا بوو، چەندە ئاسۆی دانایی فراوانتر ببوایە ئێش و ژانی پتر دەبوو.

ڕۆژێکیان پێش کازێوە لەخەو بەئاگاهات، لەسەر خەوگاکەی- خۆی لەگەزداو لەدەریای بیرکردنەوەدا نقووم بوو. لەبەرخۆیەوە دەی پرسی:

بۆچی ئەو خەونە تا ئەو رادەیە ترساندمی کەبەحەپەسانەوە بەخەبەربێم؟ دیتم: وەك منداڵێك ئاوێنەیەکی هەڵ گرتبێ) لێم نزیك بوەوە، گوتی:

-زارا لەم ئاوێنەیەدا تەماشا بکە!-

هەر ئەوەندە سەیری ئاوێنەکەم کرد قیژاندم دڵم ڕاچڵەکی، چونکە ئەوەی لەئاوێنەکەدا رەنگی بۆ دامەوە دەموچاوەکەی من نەبوو بەڵکو دەموچاوێکبوو بەتاوی پێکەنینی جەفەنگای شەیتان مۆن و دزێوبوو!

بەڕاستی‌لێکدانەوەی ئەو خەونەم بەسەردا تێ ناپەڕێ و ئەوەی منی بەئاگاهێناوە دەرکی پێدەکەم: خەریکە ئامۆژگاری‌یەکانم بکەونە مەترسی‌یەوە؛ شیلەو مرۆر دەیانەوێ ئاکاری گەنم وەربگرن، دوژمنەکانم گەرەکیانە خۆیان بکەنە شێرو ئامۆژگاریەکانم بشێوێنن.. ئەویش بەئەندازەیە دۆستانم لەو ئامۆژگارییانەدا کە پێم بەخشیون شەرمەزار ماون.

یارانم لەکیس چوون، ئێستاش وادەی ئەوەم هاتووە کەلەگومبوونی خۆم بگەڕێم.

زارا، ڕاپەڕی.. نەك وەك کابرایەکی شەپرزە، بەڵکو وەك گیرۆدەی خەون و خەیاڵێك. وەك شاعیرێك کە شەیتانەکەی ڕای وەشاندبێ. مار و هەڵۆ کەشی بێ‌نقە چاویان تێ بڕی بوون کە نۆبەرەی بەختەوەری و موژدەی بەیان لەدەموچاویا دیاربوون، ئەوجا پێیان گوت:

-چیم لێ قەوماوە؟.. هەر ئەوەنیە کە دەم بینن گۆڕاوم؟.. ئەی هەست ناکەن وەك باو بۆران شادیم لێ باریوە؟!

سەبارەت بەو بەختیاری یەم هەستم لە گرێژەنەچووە؛ بۆیە بەیان و دەربڕینیشم تێك دەچێ. کامەرانی من لەتافی هەڕاشی‌دایە، ئێوەش (هاوڕێیانی مغارەکەم، لەگەڵما ئارامی لەسەربگرن.

بەختیاریم ژان و ئازاری پێ چەشتووم.. با. ئەوانەی شەکەتی ئازارەکانن بێن و ببنە پزیشك و حەکیمی خۆم.

ئا ئەوەتام دەتوانم بۆ مەڵبەندی یارانم و بۆ مەڵبەندی دوژمنانم داپەڕمەخوارێ .. ئێستا زارا دەتوانێ لەسەر قسەی خۆی بڕواو چاکە لەگەڵ خۆشەویستی خۆی بکا.

سەروبەندی ئەوە هاتووە خۆشەویستیم وەك ڕووبار هاژە بکاو لە بڵندانی‌یەوە بۆ قوولایی داپەڕێتەخوارێ.. ئەوجا لەخۆرهەڵاتەوە سەرکاو ڕووبکاتە خۆرئاوا.

کە نەفسی من لە کێوی کشوماتەوە پێ دزیلکە دەکاو بەکەف چڕینەوە لە دۆڵەکان دا وزاق دەدا- فەرتەنەی ئازارەکان بە سەریەوە دەی کەنە هەراو هوریا..

ئەوا دەبینم شان بەشانی شێوازە بەیانی من هەرچی زمانە کۆڵ و بێ دەسەلاتە..

ئەی گەردەلوولەکە! ئەوا ئامبازی سەرپەرشتی تۆ دەبم و بەگەمە قەمچی خۆم تاوت ئەدەم.

دەمەوێ وەك قریوەی شادی، ئاسمانی دەریاکان ببڕم تا لەدوورگە بەختیارەکان دا دەوەستمەوە، لەوێ دۆستەکانم، بگرە دوژمنەکانیشم دامەزراون. ئێستا ئەوەی دەمی قسەم بی‌گاتێ زۆرم خۆش دەوێ.. لەبنیادی ئەم شادمانی‌یەم دا ناحەزەکانیشم بەشیان تێدایە.

کاتێ گوڕ دەبەستەمەوە کەخۆم فڕێ بدەمەوە سەرپەرشتی ئەسپێکی سەرکەش هیچ یاوەرێك وەك ئەو ڕمەی بۆ خۆ هەڵ دان تینی دەخەمە بان ڕاست نیە.

ئەوە ڕمەکەمەو دوژمنانی پێ‌چاوترسێن دەکەم، ئای چەندە شیانی سوپاس گوزاریمن بێت و بتوانم ڕمەکەی دەستم فڕێ بدەم!

لەنێو قاقای هەورە برووسکەدا تەمی ئارام و غیرە زۆری خایاند، ئێستاش کاتی ئەوەم هاتووە کەبەدانەی [18] تەرزەکانم قولایی بناوانەکان گوللە باران بکەم.

---

[18] نووسراوە: لقد طال! اصطبار غیوری بین قهقهة الرعود..) ئەگەر (غیوری) نەبێ و صفەی اصطبار نەبێ مانای نایە.؟

دەبێ غیوری نەبێ و ((غیوری جحیم) بێ‌ولەهەردوو نووسخەکەدا بە هەڵەنووسرابێ.

ئالانی

سنگم پەنگ دەخواتەوەو گەرەدەبێ تا فەرتەنەیەك بەرەو گەردن کەشەکان دەردەهاوێ.. ئا بەو چەشنە سەرفرازی دەکەم:

کامەرانیو ئازادیم وەك گەردەلوول تەکان دەدەن.. بەڵام ئاواتە خوازم کەدوژمنانم وابزانن: ئەو شتەی بەژوور سەریانەوە دەنرکێنێ گیانی شەڕوبەدەو گیانی کامەرانیو ئازادی نیە. ئێوەش دۆستەکانم! کاتێ دانایی جەربەزەم دابەزییە سەرتان ترستان لێ دەنیشێ. تکاتان لێ دەکەم ئێوەش وەك دوژمنەکان خۆتان دەرباز بکەن.

خۆزگە بم توانیایەبەسۆزی بلوێری شوان بانگتان بکەمە لای خۆم...خۆزگە شێرە دایکەی دانایی من فێر دەبوو بەسۆزەوە بنرکێنێ.. ئای کە بەدرێژایی زەمانە پێکەوە دەممان ژەنیوەتە سەرچاوە زانیارییەکانەوە.. بەڵام دانایییە کێویلەکەی من لەنێو سەختە بەردی شاخان داو لە دوور دوورەوە بەدواین بەچکەیەوە ژان گرتی. ئەوا ئێستاش شێتانە بەبیابانی چۆڵ دا دەخولێتەوەو لەمێرگی سەوزو ناسك دەگەڕێ!!

ئەو وشەیەی گەرەکیەتی ئازیز ترین شتی لای خۆی بخاتە مێرگزاری دڵە شەنگەکانەوە پیرێژنێکی کێوییە.

زارا ئاوای گوت...

## لەدوورگە بەختیارەکان دا

ئەوا هەنجیرە ریحانەی بۆن خۆشو شیرین تامو شڵ لەدار هەنجیردا دەوەرێو لەناسکیدا شەق دەبا، منیش بای باکوورمو لەومیوەگەیوانەم هەڵ کردووە.

هاوڕێیان! ئامۆژگارییەکانم وەك ئەو میوە گەیوانە بەسەر تان دا هەڵ دەوەرێن. نەچووەبچێ ئێستاش لە نیوەڕۆیەکی رۆژانی پاییزدا کە ئاسمان بەسەرتانەوە ساماڵە لەو میوە بەلەزەتانە بچێژن.

چاو بکەنەوەو بنۆڕنە دەوروبەرتان کە پڕنازو نیعمەتی ئەم زەوییەیە، پاشان بۆ ئاسۆ بەرینە دوورەکانی دەریا هەڵ ڕوانن.. ئەوە جوانترە بارۆزیشت لێ زیاد بێ کەچی بەهەموو لادا بۆ دوور چاوبکەیتەوە.

جاران کەخەڵکی ئەیان دایە دەریاو بۆ دیارو نادیار هەڵیان دەڕوانی ناوی خوایان دەبردو بەسەر زاریانەوە بوو.. بەڵام ئێستە ئێوە فێری ئەوە بوون کەبەناوی مرۆڤی

بالاوە بقریوێنن خواوەند گریمانەیەو ناشمەوێ گریمانە لەو شتەی کەویستی داهێنتتان دای دەنێ بۆ دوور ترتان بەرێ.

ئایە دەتوانن خوایەك دروست بکەن؟ کەواتە باسی خواوەندەکان مەکەنو وازیان لێ بهێنن؛ تەنیا ئەوەتان لەسەرە مرۆڤی بالا بنیاد بنێن.

لەوانەیە کە خودی ئێوە ببێتە ئەو مرۆڤە.. بەلام دەتوانن ببنە باوانی، با ئەو گۆڕانکاری‌یە باشترین شت بێ کە ئێوە فێری ببن.

خواوەند گریمانەیە، منیش نامەوێ گریمانە بتانخاتە ئەو دیو سنووری تێ ڕوانینتانەوە. ئایە ئێوە دەسەلاتی تێ ڕوانینی‌هیچ خواوەندێکتان هەیە؟ کەواتە لەمەوە تێ بگەن کەئەرکی ئێوە داواکردنی ڕاستی‌یە، بەتەمای شتێك مەبن کەبۆچوونی مرۆڤ تێیدا کۆڵەوار بێ و نەکەوێتە بەر رکێفی هەستو بیناتان.. تێ ڕوانینو بۆچوونی خۆتان رابگرن.. نەوەك لە سنووری هەستەکانتان دەربازبن.

ئەوەی کە لەمەوبەر ناوتان نابوو جیهان دەبێ دەست بەبنیادی بکەن. ئەوسا جیهانەکەتان پێك دێ لە بیرکردنەوەتانو لەبۆ چوونتانو لە ئیرادەو خۆشەویستیتان..

ئەی ئەو کەسانەی دوای زانیاری کەوتوون! ئا بەو ڕەنگە دەگەنەپلەی بەختیاری. خۆ ئەگەر ئەو ئومێدەواری‌یەتان تێدا نەبێ چۆن دەرەقەتی ژیان دێن؟

با زانیاریخوازان خۆیان تووشی ئەو مەتەلانە نەکەن کە بەخواستی هۆشو ژیرین.

من لەمە بەدوا دڵەکەی خۆمتان بۆ دەکەمەوەو هیچ شتێکتان لێ شاراوە نابێ.. ئەوسا پێتان دەڵێم: ئەگەر لەوێ پەروەردگارو سەروەر هەبوونایە ئایە من خۆم پێ زەوت دەکرا کەنەبمە سەروەر؟.. کەواتە لە گەردوون دا سەروەرو پەروەردگار نین.

ئەڵبەتە من ئەم ئەنجامەم بۆ زاتی خۆم هەڵێنجاوە، ئەوا ئێستاش هەمان ئەنجام من بەدەست دەهێنێ!

خواوەند بریتی‌یە لەگریمانەیەك، بەلام ئەو شەیرێوی‌یەی لەتوێی گریمانەدایە دەبێ لەکێشی کێ دابێ و تێدا نەچێ؟ ئەوە گەرکتانە ئیمان لەو کردگارە وەربگرنو لە گوزەرگای ئاسمان دا سووڕانەوە هەڵۆ بدزنەوە؟!

خـوا بريتیيـه لـەباوەڕێك كەهـەموو ڕاسـتەهێڵێكی تێـدا دەشـكێتەوەو هـەموو ڕاوەستاوێكی بەلادا دەسوڕێتەوەكەواتە زەمان بەلای ئیماندارەوە ئەندێشەو خەياڵە، لەچاوی ئەودا هەرچی مردە (فانی)بێ ئەوە پاڵەوانو فێلبازە.

ئايـا نموونـەی ئـەو بـيرو باوەڕانـە بريتـی نـين لـەو گەرداوانـەی كـە ئێسـكی ئادەميزاديـان تێدا تـەفرو تونا دەبێو بەهەوادا دەچنو ئەوەی سەيرشيان بكا گێـژ دەبـێ؟ ئەوانـە چـەند گريمانەيـەكن، هەركەسـێ گيرۆدەيـان بووبـێ تـا دەمـرێ وەك بەرداش بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

ئەو هەموو پێڕەوو ئامۆژگاريانەی تاكانەيەكی ڕەهای ئەو تۆيان هەڵ ناوە كە هيچ گۆڕانێكی بەسەردانەيە– ئايە ئەمە شەڕو سەپاندن نيە بەسەر مرۆڤايەتیيەوە؟! تەنيا هێماكان، ناگۆڕێن.. لەم بارەيەوە زۆر جار شاعيران بەدرۆ بوونەوە.. بەڵام باشترين شت كە بەنموونە بشێ ئەو شتەيە كە ئێستا ئايندەی ڕۆژگار وێنەدار بكا؛ ئەوجا دەبێتە بەڵگە (نەك هەڵ وەشێنی هەر شتێك كەنەمێنێ.)

لەبێجگەی داهێنان دا شتێك نيە كە ژيان لەئازار قوتار بكاو گرانی لەسەر شان سووك بكا.. لەولايشەوە كەسی داهێن بەگۆڕانكاری زۆرو ژانی فرەوە لەدايك دەبێ.

داهێنـەكان! ئيـدی ژيانتـان بـەتوانی مردووەكـان تەسـەل دەبـێ، تـا داكۆكـی لەسەرجەمی ئەو شتانە بكەن كە نامێنن.

كە داهێن بيەوێ خۆی ساوای نوێ زادە بێ، پێويستە لەخۆگریدا چاو لەو ئافرەتە بكا كەبەمنداڵ بوونەوە لەبەر ئێشی گەرمە ژان خۆی رادەگرێ.

بەنێو سەدان كەسو بەرزەكو كۆسپو ژان دا، ڕێگايـەكم بـۆ خـۆم دڕداوە.. زۆر جارانيش بەپاش داهاتووم چونكە باش دەزانم كە دواسات كام بەندی دڵ دەپسێنێ. بەڵام ئەوە شتێكەو خواستی خوڵقێنەرم هيوا خوازيەتی، بەدەربڕێنێكی زەقتر: ئەوە ئەو مەبەستەيە كەخواستی من گەرەكيەتی.

هەرچی هەستو نەستمە تێكڕا دەست بەستەو ئازار مەندەيە. تـەنيا ويستو ئيرادەكەمە دێتو شادی رادەگەيەنیو هەستو نەستەكانم ڕەها دەكا.

ويست بەتەنێ رزگار كەرە. بەبێ ئەم نيشان بەندە (أية) ياسايەكی ڕاست بۆ ويستو ئازادی لەگۆڕێدا نيە، پەيڕەوەكانی زاراش هەر لە سەر ئەمە بنيادن.

دەبا– داهێنران و رەنجووری کە ئیرادە کول و شل دەکەن و خەملاندن و داهێنان دەوەستێنن– دوایان برێ و نەمێنن!

زانیاری خواز هەست بەخۆشایەتی ویست و خولقاندن دەکا.. هەست بەخۆشایەتی (خۆتوانەوە بۆ شتێك) دەکەم لەناخ دا زات هەستی پێ دەکا. کەنیهادم بێگەردی گرتبێتە خۆی لەبەر ئەوەیە کە ویستی داهێنانی تێدا جێ گیرە.. ئائەم ویستەیشە وەهای لێ کردووم لە خواو خواوەندەکان بەدوور بم، چونکە بێت و لەو لاوە ئەو خواوەندانە هەبوونایە ئەواشتێك لەگۆڕیدا نەدەمایەوە بۆ دروست کردن بلوێ و بگونجێ.

ویستی من کەبەتەمای بنیادنانە، کێوی ئاسا کەدادێتە سەختە بەرد ئاوا بۆ لای مەردومگەلەکە تەکم ئەدا!

خەڵکینە! من لەسەختەبەرددا پەیکەرێکی پەنهانم بۆ دەردەکەوێ کەسەرتۆپی گشت نموونەکانە، ئەوجا دەشێ ئەو نموونەبالایە لەتوێی درێو ترین و سەختترین بەرددا خۆی بسەپێنی؟!

کیونی من بەزەبری گرانەوە لەو بەندیخانەیە دەسرەوێنێ و سەختە گاشە بەردەکەش بەبەرچاومەوە تەفرو تونا دەبێ.

دەمەوێ ئەم پەیکەرە تەواو بکەم...شەبەنگێك هاتە لام و ناسکتری هەموو بوونەوەرو لەهەموو بێ دەنگییەك قووڵتر لێمەوە نزیك دەبوو!

لەم خەیاڵە تیژەدا – وەك میوانی شەوگار– شکۆی مرۆڤی بالام لەبەرچاوان رۆشن بووەتەوە، ئیدی لەمەبەدوا کارم بەخواوەندەکان چیە؟![19]

زارا ئاوای گوت...

---

[19] ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە بەنێتشە دەڵێین و پێوانەکەشمان هەر لەپێوانەکەی ئەو وەردەگرین !

ئەگەر مرۆڤ توانیبای شتێك دروست بکا، ئەوا خوا لەگۆڕێ دا نەدەبوو. ئەوجا کە مرۆڤ نەتوانێ گەردیلەیەك و خورپە بیرۆکەیەك لەجیهانی مادەو جیهانی گیان دروست بکاو بێ دەسەڵات بێ، ئەوا هەبوویەکی هەمیشە لەسەر مرۆڤی هۆشمەند دەسەپێ و فەرز دەبێ.

هەر گوتەیەکیش پێچەوانەی ئەم ژێربێژییەبێ ئەوا شێتی و دەمەورییە.

(ف.ف و ئا)

## ميهرەبانان

هاوڕێیان گوتەی خەڵکیم بەرگوێ کەوتووە:

((ئایە دەتانەوێ زارا چۆن بەنێو ئاژەڵدا دەڕوات، ئاواش بەنێومان دا تێپەڕێ؟))

بەڵام باشتر وابوو کە بڵێن:

((کەسێك زانیاری خوازبێ وەك بەنێو ئاژەڵدا تێپەڕێ ئاواش بەنێو مەردومگەل دا دەڕوا...))

زانیاری خواز مرۆڤ بەو ئاژەڵە دەزانێ کەجووتە کوڵمی سوورهەڵگەڕاوی هەیە..

ئەی بۆچی ئاوای دەبینێ؟.. ئەی گوایە فرە جار سوور هەڵگەڕانی نیشانەی شەرمەزاری پێوە دیار نەبووە؟!

هاوڕێیان! ئائەمەیە کەزانیاری خوازان دەی ڵێن: مێژووی مرۆڤ نەنگو نەنگی‌یە. لەبەر ئەوە پیاوی پاکزا دەی کاتە ئەرکی سەرشانی کە ریسوایی نەداتەپاڵ کەس؛ چونکە هەرکەس ئازار زەدەبێ پاکزا شەرمی لێ دەکا.

بەڕاستی بەشی خۆم چارەی ئەو میهرەبانانەم ناوێ کەلەتوێی بەزەیی خۆیان دا داوای شادی دەکەن.

کەهاتو من ناچاری میهرەبانی بووم ئاواتە خوازی ئەوەم کەمیهرەبانی یەکەم پێ نەزانێ.. دووراو دوور نەبێ من بەزەیی نابەشمەوە، لەکاتی بەزەیی پێدا هاتنەوەشمدا، حەزئەکەم دەمو چاوم داپۆشمو بەبێ خۆ پێ زانی پەلەی راکردن بکەم. کەواتە یارانی خۆم! دەوەرن ئێوەش چاو لەمن بکەن خۆزگە بەختەکەم هەمیشە بۆ لای نموونە پیاوی.. وەك ئێوەم بهێنی کەبەئازارنایەنو دەشتوانن هاوبەشی ئاواتو خۆشیو زیافەتم بکەن زۆر کارم لەبەر خاتری ئازار چەشتووەکان بەئەنجام گەیاندووە.. بەڵام هەمیشە سەرنجم داوە لەهەمووی باشتر ئەوەیە کەلە بەسەر بردنی شادیم دا فرە شارەزابم. مرۆڤیش لەوەتی هەیە کەمە خۆشی‌یەك نەبێ بەخۆیەوە نەدیوە.. ئەگەر گوناهێکی ڕاستەقینە لەگۆڕێدا هەبێ هەر ئەم گوناهەیە.

کەئێمــە فــێربووین چــۆن پــەرە بەخۆشــیمان بدەیــن، لــەو لاوە نــەفێری خراپــە پیَگەیاندنی مەردووم دەبین و نە فێری داهێنانی شتێك دەبین کە مایەی ئێش و ئازار بێ.

ئـەوەی کـە خرایـە روو داوام لیَ دەکـا: هــەرکاتێك دەســتم بــۆ لای ئازارمــەندێك درێژکــرد دەســتم بشــۆم.. بــەڵکو دیســان گیانیشــم پــاك بکەمــەوە؛ چونکــە ئــەو شەرمەزاربێ منیش شەرمەزار دەبم. لەبەر ئەوەش کە دەستم بۆلای درێـژ کـرد بـێ بەزەییانە نەفسە بەرزەکەی ئەوم بریندار کردووە.

چاکەی گەورە گـەورە منـەتباری پـەیداناکاو داوای ڕق هەڵگیرسـان دەکـا. ئەگـەر چاکەی بێتام و کرچ خۆی سەپاندو فەرامۆش نەبوو ئەوا دەبێتە خۆرە.

بە بێ پارێز هیچ شتێك قبووڵ مەکەن، کە شت وەردەگرن لە هەڵاویشتنیا زیت و قایم بن: ئەمە رەفتارێکەو بۆ ئەوانەی ئاماژە دەکەم کـە هیچیـان نیـە بـە مـەردومی ببەخشن.

بەڵام من بەخشندەم و حەز دەکەم وەك دۆستێك شت بە دۆسـتەکانم ببەخشـم.. ئەوانەی دووریشن با لەخۆیانەوە نزیك ببنەوە بۆ ئەوەی میوەچنی پیرە دارەکەی من بن. لەوەدا کـە پـڕ بدەنـێ شـت بگرنـە دەسـت هێنـدەی ئـەوە شـکۆیان ناشـکێ کـە بەخشش قبووڵ بکەن.

دەبێ ریشەکەندی سـواڵ کـەران کـارێکی چەسپیو بێ، چونکە ئەو دڵ ئێشـانەی کەلەکاتی پێ بەخشینی دا تووشیان دەبێ بەرامبەری ئەو دڵ ئێشانەیە کە لـە کـاتی پێداهەڵ شاخان و بێبەش کردنیان دا تووشیان دەبێ.

لەهەمان بارودۆخ دا بڕوانە بۆ تاوانبـارو خـاوەن نیـهادە گومڕاکـان و ئاشووبەکان؛ چونکە دڵ شکستی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بکەوێتە جەزرەبە گەیاندن و گازگرتن..

لە هەمووی خراپتر بیرو بۆچوونی سووکانی‌یە.

پیاوخراپەکار بێ ئەوەك بهێڵێ ریسوایی ئالوودەی بیرکردنەوەی بێ.

ئێوە دەڵێن: "دەست پێوەگرتنی بەدکاری لەبیرکردنـەوەی دوولـۆدا زۆرە".. بەڵام دەست پێوە گرتنی ئابوورانە لەم بابەتەدا پەسند ناکرێ.

بـەدکاری، دادە خـورێو هـەودەکا.. وەك بریـن سـەردەکا؛ چونکـە خودبەسـەرەو لـە ڕوزانە، وەك زەخم بۆ خۆی هاواردەکا: دەردێکەو ئاشکرایە.. لە کـاتێك دا بیری سـەر

شـۆڕانه وەك دومـەڵان لـە پەنهانیـیەوە خـۆی رادەدا تـا بـەجارێ سـەرتاپای لـەش دەتەنێتـەوە.. بـەڵام مـن بـەگوێی ئـەو کەسـەدا دەچپێنـم کەوەسوەسـەی پەنـهانکار گرتوویەتی: ((واچاکە واز لەشەیتانی وەسوەسە بهێنیو لە دەروونتا بۆ خۆی گەورە ببێ، چونکە تۆش ڕێگەی پایەبڵندیت لەبەردەم دایە)).

جێگەی داخە کەنەزانینی هەندێ شت باشتر بێ لەزانینی هەمووی! هەندێ کەس دیوەدەرنو هەموو شتێکیان تێڕادیارە، تەنانەت دەروونیشیان وادەردەکەوێ.. بەڵام ئەوە پاکانەمان بۆ ناکاو هەر بەتەماین بچینە ڕاستی مەبەستەکانیەوە، تائێمە بێ دەنگیمان بەلاوە گران بێ ئەوا لەگەڵ ئەم خەڵکەش دا ژیانمان سەختو گران دەبێ.

ستەمی ئێمە دانابەزێتـە بـان مـەردومێك کـە زەوقمـان نـەفرەتی لێ دەکـا.. بـەڵکو دەکەوێتە سەر کەسێك کە چ ئیشێکی بەئێمە نەبێ.

وێڕای ئەوەش ئەگـەر دۆسـتێکی ئـازار مـەندت هەیـە– تـۆ وەرە ببـەرە پـەناگای ئازارەکـانی.. بـەڵام نوێنـی نـەرمو نۆڵـی بـۆ رامەخـە. بـەڵکو لـەو نوێنـە زبـرەدا بیخەوێنـەرەوە کـە جـەنگاوەرەکان دەی کەنـە سـەرین.. دەنـا تـۆ هیـچ سـودێك بەدۆستەکەت ناگەیەنی.

ئەگەر هاتو دۆستێکت خراپەیەکی لەگەڵ دا کردی پێی بڵێ: ئەوا بەرامبەر ئەو تاوانـەی دەرهـەقی منـت کـرد لێـت خـۆش بـووم.. بـەڵام ئایـا دەتـوانم بـەهۆی ئەوکردەوەتەوە لەو تاوانەت خۆش بم کەدەرهەقی خۆت کردت؟

ئەمە قسەی گەورە خۆشەویستە، ئاوا دەدوێ..

تەنانەت خۆی لەژوور لێ بووردنو بەزەیی پێداهاتنەوە رۆدەنێت.

پێویستە دڵە سەرکێشەکانمان جڵەو گیر بکەین؛ نەبەشکم هۆشمەندیمان لەگەڵ خۆیـان دا سـەرگەردان بکـەن. ((*لـەکوێی ئـەم زەویـەدا شـێتی بـەو ئەندازەیـە دەردەکەوێ کەبەتوندی لەنێو میهرەبانەکان دا دەورنگێتەوە؟!.. بەڵکو دەبێ چ زیانێك (کەتووشـی مـەردوم بـووە) تونـد تربـێ لـەو زەرەروزیانـەی کەلـە شـێتایەتی میهرەبانەکانەوە پەیدا بووە؟!

وای بۆ ئەو خۆشەویستەی کە لەخۆشەویسـتنەکەیدا تەپۆڵکەیـەك نیـە بـەزەیی پێدا هاتنەوەی میهرەبانەکانی بگاتێ؟!

ڕۆژێکیان شەیتان پێی گوتم:- پەروەردگار دۆزەخێکی هەیە ئەویش دۆزەخی میهرەبانی‌یەتی و بۆ خەڵکی سازکردووە.

هەر لەو شەیتانەم بیست کەلە دوایی‌دا گوتی:-خواوەند مرد، ئەوەی مراندیشی میهرەبانەتی‌یەکەی لەمەڕ خۆی بوو))*

لەمیهرەبانی بسڵەمنەوە؛ زوو بەزوو بەسەر مرۆڤەوە دەی کاتە هەورێکی چڕ. لەگەڕو گەڤی ڕۆژگار بێ‌ئاگانیم!

ئەم وشەیە ویردی سەر زمانتان بێ: ڤیانی مەزن لەئاقار میهرەبانی‌یەکەی خۆی نابینا دەکا، چونکە ئامانجی خۆشویستن گەلێ لەوە هەڵکشاوترە: کەخوڵقاندنی ئەوکەسەیە خۆشت دەوێ).

من نەفسی خۆم لەسەر خۆشەویستی ڕادەگرم، ئەوانەی وەك منیشن، هەروەها دەکەن: هەموو داهێنێك ئاوای لێ‌دەڵێ، داهێنەکانیش هەموو دڵ ڕەقن.

زارا ئاوای گوت...

## کاهینەکان

زارا تێپەڕبوونی دەستەکاهینێکی هێنایە بەرچاو و بەمریدەکانی گوت: ئا ئەوانە کاهینن. هەرچەندە دوژمنمن بەڵام پێویستە کشو مات بەبەردەمیان دا بڕۆن‌و شمشێرتان لەکێلان دەرنەکەن؛ ئەوانیش پاڵەوانیان تێدایەو هەشیانە لەبەر ئەشکەنجەدا خۆی ڕاگرتووە. جا لەبەر ئەوە دەیانەوێ تۆڵەی ئەو سزایە لەمەردومی کە بکەنەوەو کەسانی دیکە ئازار بدەن.

ئەو کاهینانە دوژمنی سەهەندەن‌و هێندە ناچیزەن لەدەغەزاری‌دا وێنەیان نیە.. ئەوەی پەلاماریان بدا خۆیشی خڵتان دەبێ. وەلێ لەنێوان خوێنی من‌و خوێنی ئەواندا پەویەندی‌یەك هەرهەیە، دەشمەوێ خوێنەکەم- بالەخوێنی ئەوانیش دابێ- بەشەرەفەمەندی بمێنێتەوە.

زارا پیشانی دا کەئەوان تێیان تەقاندو ڕۆیشتن. دوابەدوا هەستی بەئازارێکی بەتین کردو خۆی لەبەر ڕاگرت‌و هاتە سەرخۆی‌و گوتی: لەلایەکەوە بەزەیم بەو کاهینانەدا دێ‌و یەکبینەش نەفرەتیان لێ دەکەم، سەرەڕای ئەوەش لەوەتی بومە

هاودەمی ئادەمزاد خووم بە دلۆڤانییەوە گرتووە، هەرچەندە لەگەڵ کاهینەکان دا ئازار چەشتەم چونکە لەباوەڕی من دا کاهینەکان ئەو بەندییانەن کەلەجیهان دا نیشانە داخی پەرکردنیان پێوە نراوەو هەی دێ کراون. هەر ئەو کەسەش کۆتو زنجیری کردوون کەبەرزگار کەری خۆیان ناسیوە.. کۆتو زنجیرەکانیشیان بریتین لە ئامۆژگاری درۆزنانەو قسەی دڕدۆنگ. خۆزگە یەکێك دەهاتو لەدەست ئەو رزگار کەرەیان قوتاری دەکردن..!

ئەو بیچمە مەردومانە لەکاتێك دا فەرتەنەی دەریایان بەگژدا هاتووە لەجەرگەی دەریاکان دا دوورگەیەکیان لێ وەدەر کەوتووە.. ئەوجا خێرا پەڕیونەتە سەری، تومەز بەسەر پشتی ئەو نەهەنگەوەن کەبەسەر شەپۆلەکانەوە خەوتووە؟!

دەبێ هیچ نەهەنگێك ئەوەندەی نەهەنگی ئامۆژگاریو کۆتە بێ سەرو پاو خەیاڵیەکان بۆ ژیان پەروەران مەترسی هەبێ کە لەنێویاندا چارەنووس خۆی مت داوە تا ئەوکاتەی نەهەنگەکە بەئاگادێ؟!.. ئەوەتا ئەویش ڕادەخزێو هەر لانەو مەنزڵێکی لەسەر پشتی ئەو بنیادیان ناوە تێکومەکانی دەدا.

سەرنجی ئەو جێگایانە بدەن کە کاهینەکان درووستیان کردوونو ناوی کەنەیسەیان لێ ناون. تەنیا بریتین لەچەند ئەشکەوتێكو بۆ پرشیان لێ دەردەچێ. ئایا بەجێیە کەگیان لەژێر تروسکایی ئەو رووناکییە درۆزنانەداو لەکەشێکی چڕوەبوودا بۆ ئەو ئاستە هەڵبکشێ.. لەو لایشەوە تەنیا ئەو باوەڕەی تێدا زاڵە: مرۆڤ بەتاوانەوە لەکەدار بکاو داغان بێ، ئیدی بخورێتە مەردوم لەسەر ئەژنۆ بە پلەپەیژەی (پەیکەر)دا خۆی کێش بکا..؟!

من ئەوەم لەلاباشترە کە سەرنج بدەمە چاوترووکانی بێوێڵانەو نەڕوانمە ئەو چاوە نیشتووانەی کە سەرکزیو پێوە گلان ڕادەگەیەنن.

دەبێ کێ ئەو ئەشکەوتانەی داهێنابنو ئەو لە پەیژانەی بۆ پێهەڵ زنانی تۆبەکارەکان ساز کردبن؟.. ئەی دەشێ دەستکردی ئەوانەبن کەلەجیلوەگای سامالەوە دزەیان کردبێ بۆ نەدیوی پەردەو خۆشاردنەوە؟!

ئیدی بەدڵ ناگەرێمەوە بۆ مەنزڵگای ئەو خواوەندە.. مەگەر ئەوکاتەی کە گومەزەکانیان شەقوپەق دەبنو تیشکی ئاسمانیان تێ دەچەقێو لەدرزو کەلەبەری دیوارە رووخاوەکانیانەوە پۆل پۆل گوڵاڵە سورەکان سەر وەدەردەنێن!

ئەو کاهینانەی دەیانەوێ وەك پاشماوەی مردووان بژینو خۆیان رەش پۆش کردووە، کەدەکەونە کاوێژی ئامۆژگاریو تەڵقین بۆ هەڕنەهووتی ئەلحەدیان لێ بڵاودەبێتەوە!

کەسێ لەنزیك ئەو مەردومانەوەبێ، وەك ئەوە وەهایە لەقەراغ ڕەشە ڕووبارەکانەوە دانیشتبێ ولەقرەی غەمگینی بۆقان هیچی گوێ لێ نەبێ.

من ئەم گەرەکە گوێم بەو سروودەی ئەوان بڕەقێتەوە، دەبا گوێ بیستی سروودێکی دیکەم بکەن ئەوسا حوکم لەنەفسی خۆم دەکەم باوەڕ بەڕزگاکەرە خۆ بەخت کەرەکان بهێنێ؛ چونکە ئەوەم بۆ دەرناکەوێ شوێن کەوتوانی ئەو رزگارکەرە تائێستا زەفەرمەندو قوتار بن.

بەئاواتەوەم بەڕووتو ڕەجاڵی بیان بینم، دەبێ هەر جوانی بتوانێ مەردومگەلەکە بەلای پەشیمانیدا هۆبداتەوە؟ بەڵام ئەوان خودی مەرگەساتێکی شاراوەنو ناتوانن کەسێك بەلای باوەڕدا کەمەندکێش بکەن.

بەڕاستی دڵ سۆزو رزگار کەرانی ئەو کاهینانە خۆیان لە ئاسمانی ئازادییەوە دانەبەزیونو هەرگیز قاچیان نەخستۆتە بان ڕێگای زانیاری ماریفەت. دانایەتی ئەو دەستەیە دەڵێی چنراوێکی هەلا هەلایە؛ بەتاوی شێتایەتیان چیان لەخواوەندەوە چنگ کەوتنبێ ئەو چنراوەیان بێ پینەو پەڕۆ کردووە.. بەهۆی دانایی لەمەڕ خۆیان لەگۆمی بەزەیی پێداهاتنەوەدا نقوم بوون، چەندە لەو گۆمەدا بیرمێنن لاشەیەکی گەورە حەواڵە دەکەنو دەوری دەهاوژێنە سەر گۆمەکەو بەسەریەوە دێتو دەچێ.

ئەو شوانە وێڵانە بەقیڕەوە گەلەو ڕانی خۆیان داوەتەبەر، ئەوانیش لەیەك کەلێنەوە تێ دەکەونەوەو هەراو قیژەیان لێ بەرزەوە دەبێ.. گوایە گەیشتنە دەرفەتەکانی دواڕۆژ لە بێجگەی ئەم تەنگەبەرەوە قەدەغەیە. ڕاستییەکەی، ئەو شوانە وێڵانەش کەرتەیەکی ئاژەڵەکەنو هۆشیان تەسك بووەتەوە دەروونیان فراوان بووە، هەرکاتێکیش دەروون فراوان بوو هۆشیش کرژ دەبێتەوە.

بەهەر گوزەرێك دا قاچیان هەڵ بێتەوە شوێن پێی خوێناویان دیارە، ئەمانە لەچاو هەڵ تەکاندنەوە خورپەو سرووش وەردەگرن.. تامەردومگەلەکە فێری ئەوە بکەن کە خوێن شایەدە لەسەر ڕاستی. نەیان فاماندووە کەخراپترین گەواهی لەسەر ڕاستی گەواهی دانی خوێنە؛ چونکە خوێن بەسەر پاکترین ئامۆژگاریو پەیڕەودا ژەهر دەتکێنیو دەیان گۆڕێتە سەر کینەواریو شێتی

ئايا دەتانەوێ لەڕوداوی ئەو کەسەی لەپێناو ئامۆژگاری‌یەکانی‌دا خۆی فڕێداوەتە ئاگرەوە بەڵگە لەسەر ڕاستی هەڵ بنێن؟.. ئايا کارەنجامی ئەم ئامۆژگاری‌یە دەگاتە کارەنجامی ئەو باوەڕەی کەبەهەڵ گیرسانەوە لەکڵپەی نەفسی خۆی دەکەوێتەوە؟.. ئەگەر سەرێکی ساردو دڵێکی ئاگرتێ‌بەربوو بەيەک کەوتن ئەو گەردەلوولە پەيدا دەبێ کەخەڵکی پێی دەڵێن– دڵسۆزی ڕزگارکەر؟ دەبێ لەسەر ئەم زەوی‌يە چەند مەردی وەجاخزادەترو پايەبڵند تر لەوانەی گەل بەدڵ سۆزيان ناودەبا پەيدا بووبن..!.. ئەو ڕزگار کەرە دڵ سۆزانەش چەند فەرتەنەيەکی ڕاماڵ بوون‌و يەک لەدوای يەک هەڵيان کردووەتە سەر زەوی.

براينە! ئەگەر شەيدای ڕێگەی ئازادين پێ‌ويستە خۆتان قوتار بکەن تەنانەت لەو کەسانەش کەلەو دڵ سۆزە ڕزگارکەرانە مەزنترن. جارێ مرۆڤی بالا لەسەر زەوی دەرنەکەوتووە. خۆم داگرتووەو دەڕوانمە مەزنە پياوو گچکە پياوو سووکە پياو، کەچی لەبەر چاوم ڕووت‌و يەکسانن.. بگرە مەزنەکەيان پتر لە نەنگە عاری ئادەمييانەوە گلاوە؟!.

زارا ئاوای گوت...

## پەسندەکان

سستە هەست بەهەورە بروسکە نەبێ وريا نابێتەوە.. وردە چپەی (جوانی)يش تەنيا گيانە زيت‌و ڕاچەنيوەکان دەسمێ!

ئەمڕۆ لەسايەی پاک ڕەفتاريمەوە گوێم ئاشنای پێکەنينێکە قاقای پاکزای (جوانی) لێ بڵند دەبێتەوە.

ئەی پەسندينە! جوانی‌و ئاغری من گاڵتەی پێتان دێ؛ چونکە ئەم قسەيەم لەجوانی‌يەکەی لەمەڕ خۆم بيست: (( وەک مامەڵی‌چی داوای نرخ پەسندی خۆتان دەکەن)).

ئەی پەسندينە! ئێوە بەهاونرخە پەسنديتان وەردەگرن. کەچی داوای پاداش دەکەن؟!.. هەروەها لەباتی جێگاورێگای زەوی شوێنەکانی ئاسمان بکەنە مڵکی خۆتان.. لەباتی زەمانەی ناهەميشە بەتەمان لەنەمرايەتی‌و هەميشەيەيی‌دا پيرۆز مەندبن؟!

ئێوە رقتان لەمنە؛ چونکە خەڵکی فێری ئەوە دەکەم: نە لێ پرسەرەوو نە پاداش دەرەوە هیچیان لەگۆڕێ نین ڕاستی‌یەکەی لەبارەی پاداش دانەوەوە خۆداری دەکەم‌و بۆ ئەولاتر دەڕۆم‌و دەڵێم: خودی پەسندایەتی ئەو شتەی بەدەستەوەنیە کەبەباشی پاداشتی نەفسی خۆی بداتەوە.

پەسند ئاراکان! لەبەر ئەوەی سزاو پاداش، لەمەبەستی هەمووشتێك دا خۆیان ناوەتەوە.. بەڵکو خزاونەتە ناخی دەروونتانەوە—زۆر دڵ بەئازارم. بەڵام دەبێ وتەکەم وەك شاخی کەڵەکێوی بچەقێتە ئەو نەفسانەوە.. هەروەها چۆن گاسن زەوی دەکێڵێ دەبێ وشەکەم دەروونتان سفراسا بکا! با، نیهادو دەرونتان چییان پێچاوەتە خۆیان لەبەرنووردا وەدەری بخەن. تابەڕووتی نەخرێنە بەرتیشکی خۆر، ڕاستی‌و گومڕاییتان تێدا جیانابێتەوە. زاتی ڕاستەقینەتان گەلێ لەوە خاوێنترە کەماوە بە وشەکانی (تۆڵە، سزا، پاداش، سەربەسەرێ، بەرامبەرکێ...) بداو خۆتانیان پێ ناپوختە بکەن. ئێوە بەوچەشنەی دایك ساواکەی خۆی خۆش دەوێ پەسندایەتی لەمەڕخۆتان خۆش دەوێ. ئایە بیستووتانە دایکێك لەبەر ئەوەی سۆزی دایکایەتی تێدایە داوای پاداش بکا؟!

ئایە پەسندایەتی‌یەکەتان هەر زاتی خۆتان نیەو لەهەمووشتێکتان ئازیز تر نیە؟.. ئارەزوو خوازیشتان هەر ئەو ئەڵقە ئاواتەیە کەگێڕو وێڕ نابێ‌و یەکبینە دەسووڕێتەوە تاکۆتاو سەرەتای دەبنەوە بەیەك.

هەر کارێك لەپەسندایەتیتانەوە پەیدا ببێ وەك ڕووناکیی ئەستێرەیەکە پەردی کوژانەوەی بەسەردا کشابێ‌و هێشتا ڕووناکی‌یەکەی لەگەردوون دا سوورگەی خۆی بسمێ‌و سنوورێك نەبێ تێیدا بسرەوێتەوە. هەر بەو چەشنە تیشکە پەسندیتان بەڕێگەی خۆی‌دا ڕەت دەبێ.. تەنانەت دوای کۆتایی کارەکەشی‌و ئاوابوونی لەجیهانی بیرچوونەوەدا؛ چونکە تیشك دانەوەی پەسندایەتی خۆکارێکی یەکبینەیەو پەردەی نەمانی بەسەردانایە.

باپەسندایەتی‌یەکەتان لێکدانەوەی زاتی خۆتان بێ.. ئەمە شتێکی نامۆنیەو بەچەشنی کەوڵ‌و کراس مەی نۆڕنێ! هۆشمەندینە! ئائەمە باری ڕاستەقینەی گیانە شاراوەکەتانە .. بەڵام هەندێ کەس وا ئەندێشە دەکەن کە (پەسندایەتی) بریتی‌یە

لەكرژبوونـــەوەی ژێـــر قـــامچی وەشـــاندن.. زۆر جـــاریش هـــاواری ئـــەو خـــەیاڵ لێ نیشتووانەتان بیستووە.

بڕێك لەو خەڵك خوایە لە-تەمەڵی و ریسوایی-دا پەسندایەتی بەدی دەکەن. دادو عەدالەتی ئەوانە تازرگنی و رقیان باوێشك نەدا بەئاگانایە. ئەوسا لە وەنەوزەکوتیدا پێڵووە قورسەکانیان هەڵ دەگلۆفن

هەندێ مەردووم شەیتانەکانیان بۆ خوارەوە یان راپێچ دەکەن، چەندە داتریزێنە چاڵەکانەوە زەقەی چاوەکانیان بڵێسەی دێ و تاسەیان بۆلای پەروەردگاریان تاو دەستێنێ..

پەسندینە! خۆ دەنگی ئەو سەر بزێوانە دەبیستن کە هاواردەکەن، هەردەنگەو دەڵێ: ((ئەوەی لە قەوارەی من بەدەربێ هەر خوایەو هەر پەسندایەتییە)).

بڕێ لەو مەردومگەلە بەقورسی زرمەکوتێوە دێنە بەرەوە، هەر دەڵێی گاریەن و بەنێو شیودا بارەبەردیان هەڵ گرتووە، ئەم گرۆیە نەیان گەرەکە دەمیان بژەننە پەسندایەتییەوە؛ لەباوی ئەوان دا پەسندایەتی تەنیا بریتییە لەڕانگەو لاوانەی گاریەکانیان.

گرۆهێکی کەیان لەکاتژمێرێك دەچن کەقورمیش دەکرێ و دەست دەکا بەچکەچك. ئەوانەش دەیانەوێ جووڵە ئامێرەکانیان بە-پەسندایەتی-ئاودێربکەن. بەش بەخۆم بەدیمەنی ئەو کات ژمێرانە رادەبوێرم هەر کاتێ دەستم پێی ڕاگەیشتبێ بەزەبری گاڵتە پێکردن زەمبەرەکم لێ رەباداوەو زۆرم لێ کردووە بەندۆڵەکەی لێ بخاتە سەما!

هەندێکی دیکەیان سەبارەت بەمسقاڵە عەدالەتێکەوە لووتیان لێ هەڵ ناوە.. بەڵێ ئەوچکە عەدالەتەیان بەسەر کێودا وایەکەوە خۆی قنج دەکاتەوە لەناویان دا. کەسەرنجیان دەدەیتێ، ئەوا هەموو شتێکیان راداوەتە بەرخۆیان و جیهانێك بەستەمگەری نقووم دەکەن.. چەندە بێژەی ڕەوشت پەسندییان لەدەم دەربچێ وادەزانی قرقێنە دەدەنەوە، هەرکاتێ یەکێکیان گوتی دادخواییم بەجێ هێناوە- وەك ئەوە وایە کە بڵێ: ((من تۆڵەم کردۆتەوە!))

ئەوانە کۆمەڵێکن دەیانەوێ بەسایەی پەسندایەتییەوە چاوی ناحەزیان هەڵ بکۆڵن.. چەندە مەردومگەلەکە لەزەوی بدەن و پەکی بخەن ئەوەلافی خۆبەرزی پێ لێ دەدەن.

هەندێ کەس وەك بۆگەناو خراپەیان تێڕا دەگەڕێ. لەهەمان کاتیش دا جاڕدەدەن کەدەم لەکەسەوە نـاژەنن، بـەڵکو خۆشـیان لەقـەپگرەکان دەتەکێننـەوە.. خـۆ ئەگـەر رایەکیان بخرێتـە بەرچاو ئەوا بۆ شوێنە ونیو لەپێناو وەرگرتنو دانەوەدا رایەکـە وەردەگرن.. یان بەڕواڵەت کاری پێدەکەن.

هـەندێ بزێو توێتکە ناگرنو باوەڕیان وایـە کـە پەسـندایەتی جۆرێکـە لـەئیمان، کەتێشیان دەنۆڕی ئەوا لەپێناو پەسندایەتیدا بەچۆك دا هاتوونو لپە دەستیان داون بەسەر یەك دا، لەولایشـەوە هیـچ فڕێکییـان بـەو کـارەوە نیـەو پەسـندایەتیان لـەدڵ نەگەڕاوە!کۆمەڵێکی دیکەشمان هەن وادەزانن: پەسندایەتی قسـەیەو دەبـێ زاری لێ توند بکرێ.. لەولایشەوە باوەڕیان بەوە هەیە کە پێ ویستە-خراپە بە زەبرو هـێز لابرێ.

بڕێکی دی دەرك بەو سیفەتە باڵایانە ناکەن کەلەمرۆڤ دا هەن. تاچاونەبڕنە شتە نزمەکان پەسـندایەتیان نایەتـەوە یـاد. ئابـەو ڕەنگـە ڕەوشـت پەسـندی ئـەم گرۆهـە لەچاوشۆڕییانەوە ڕەنگ دەداتەوە.. یان لەعەیبی چاوەکانیانەوە دەردەچی.

مرۆڤـی واهەیـە خولیـای زانیـاریو چـەوتی ڕاسـت کردنەوەیـەتیو بەلایـەوە پەسـندایەتی ئـەو خواسـتەیە. هەمیشـە دەیـەوێ سـەرو بـن قـەوارەی خـۆی هەڵبگێڕێتەوە؛ ئەویش ئەم حەزەی ناو دەنێ پەسندایەتی. هەرەها بەو ڕەنگە دەبینین سـەرئەنجام هەریەکـەیان لەگۆشـەیەکی قـەوارەی خۆیـەوە بـاوەڕی بەهـەبوونی پەسندایەتی هەیە، دەشیان بینین بۆ ناسینی چاکەو خراپەیان ڕوودەکەنە خۆیان.. بـەڵام زارا بـۆلای سـەرجەمی ئـەو فێڵبـازو شـێتانە دابـەزیوە؛ تـاوەکو پێیـان بڵـێ: ((لـەبارەی پەسـندایەتییەوە تێکـڕا هیچـی لێ نـازاننو توانـای ئەوەشـتان نیـە کـەبی زانن)). زارا هەر بۆ ئەوە هاتووەتەلاتان تابێدارتان بکاتەوە؛ ئێوە ماندووی جوونەوەی ئەو کۆنـە گوتانـەن کەشـێتو فێلبازەکـان ئێوەیـان پـێ فـێرکردوون. زاراش لەلایـەن خۆیەوە لەوتەکانی (پاداش، سزا، بەرامبەرکێ، تۆڵە، داد...) گوێ ڕێزتـان بکا.. بۆ ئەوەی لـەم گوتەیـە وازبهێنینو ئیـدی نـەڵێن: ((چـاك کردنـی کارەکـان کـە ڕووت بـن لەمەبەستەکان))

بـا زاتـی ئێـوە لـەکردەوەکان دا ڕوون ببێتـەوە، هـەر بـەو ڕەنگـەی کـەدایك لەساواکەیدا دەورنگێتەوە؛ ئیدی بەم لێکدانەوەیە پێناسەی پەسندایەتی بکەن.

بەڕاستی زۆربەی قسەکانم لێ دارنیون.. ئازیز ترین شت کەلەبارەی پەسندایەتی‌وە کەیف‌و وازیتان بە جوونەوەی دەکرد من لێم زەوت کردن. ئەوا لەبەرچاومە وەك منداڵان ساختەدەکەن.. وەك ئەوان لەڕووخ‌و کەناراوەکان بە یاری‌یەکانتانەوە خەنیون.. کەچی شەپۆلێك بەرەنگارتان بوونەتەوەو یاری‌یەکانی لەدەست فڕاندوون‌و گرتوونی بەکوڵی‌یەوە.. تا ئێستاش وەك ئەو منداڵانە هاتوهاوارتانە. بەڵام شەپۆلەکان جارێکی دیکە بەیاریی تازەوە دەگەڕێنەوەو سەدەفی نەخشینیان لەبەردەم هەڵ دەڕێژن.

ئێوەش هاوڕێیان! وەك ئەو منداڵانە دڵ نەوادەبن، کام کات؟ ئەو سەردەمەی پرسەتان دەبێ‌و پرسەش (التعزیە) نەخشینە سەدەفتان دەخاتە بەر دەستان.

زارا ئاوی گوت...

## سێبەندی‌و ناجسن

تەنیا زیندەگانی بۆ خۆی سەرچاوەی خۆشی‌و شادمانی‌یە.. بەڵام سێبەندی لەکوێ‌یەوە خواردی‌یەوە دەبێتە جۆگەلەیەکی ژەهراوی. بەهەموو شتێکی پاکیزە کەیفم سازدەبێ.. بەڵام بەدیتنی ئەو لغاوانەی بەباوێشکەوە سیرۆشیی چەپەڵەکان جاڕ دەدەن تەواو بارگران دەبم. ئەو نا وەجاخانە هاتوون‌و چاو دەبڕنە ناخی بیرەوەو لەبنەوەی‌دا بزە ناشرینەکانیان ڕەنگ دەدەنەوەو تیتاڵیم پێ دەکەن.

بەچەپەڵی خۆیان ئاوە پیرۆزەکانیشیان پیس کردوون.. بێشەرمانە خەونە پۆخڵەکانیان بەشادی لێ دەدەنەوە، تەنانەت جوانبێژی‌و گفتیان خڵتانی ژەهری خۆیان کردووە.

کەسێبەندی‌یەکان دڵە لیقنەکانیان بۆ ئاگر ڕادەدێرن. ئەو گڕە بێزیان لێدەکاتەوەو بڵند هەڵ دەکشێ..

کەسێبەندی‌یەکان لەئاگر نزیك دەبنەوە چی گیانە بۆ خۆی دێتە جۆش‌و دەهەڵمێ‌و باڵا دەبێتەوە.. کەسێبەندی‌یەکان دەست لەمیوەکانەوە دەدەن تام‌و بەرامەیان تێك دەچی‌و لیقن دەبن‌و شەرایان تێ دەگەڕێ.. کەچاویان دەبڕنە درەختە بەردارەکان لە ڕەگ‌و ریشەوە وشك دەبن!

زۆر کەس کەوازی لەزیندەگانی هێناوە لەبەر ئەوەبووە سێبەندی‌یەکی بەد هەڵی داشتووە یان ژیانی لەبەر چاو خستووە؛ ئیدی وازی لێ هێناوەو[٢٠] نەی ویستووە لەگەڵ سێبەندی‌دا بەشداری (ئاوو ئاگرو میوەی ژیان) بێ.

زۆر پەڕیوە وێڵی بیابان بووەو خۆی لەبەر شالاوی گڕەدا گرتووەو لەنێو جانەوەرەکان دا ژیاوەو نەی ویستووە لەکن بیراوێکەوە دابنیشێ کەشوانە حوشترەکان بە چڕینەوە گەلەی لەدەوروبەر مۆڵ دەدەن‌و چڵکن‌و پڵکنییان پێوە دیارە.

بەچەشنی تەرزە کوتی هەوران لەسەر زەوی، کەسی بێ ڕەزاو ڕامالْلەسەر ئەم زەمینە کەوتووەتە کێومالْ، مەبەستیشی هەر ئەوەبوو پێلەقە بەدەموو لەوسی سێبەندی‌یەکان دا بماڵێ‌و ئیدی نقەیان لە گالۆکەوە نەیە.

بەلامەوە سەخت‌و ناخۆش نیە: لەوباوەڕەدابم کە ژیان پێویستی بە دوژمنایەتی‌و کوشتن‌و شەهید بوونە.. بەڵام ئەمەیانم بەلاوە کارێکی زەحمەتە کەبی سەلمێنم ژیان پێویستی بەسێبەندیشە!

ئایە زیندەگانی پێویستی بەو چاوگە ژەهراوییانەو ئەو ئاگرانەی بەبۆچڕوکەوە دەگرێن هەیە؟ یان پێویستی بەو شەیتانە خەونانەو ئەو کرمانەیە کەلە نانی ژین دا–دەلەوەڕێن؟!

بەلای منەوە (ژیان گەزتەیی) بۆمن، نابێتە دوژمنایەتی.. بەڵکو باری دژایەتی‌و دژواری لەقێزوبێزی ژیان دایە.

---

[٢٠] باهەموان بزانین: ئالەو سەردەمانەدا کە لەخانەی سەر پەڕەوە–وەك شاخەگای هار ژمارە شەش‌و حەوت نافۆکی مەردیان یەکالادەکردن‌و بەهەوای سێ ئاوازەش ڕەفیسکی کەسیرەکانیان دەسمی.. ئالەو سەردەمەدا سێبەندی‌یەکی کۆنە ناسیاو نامەردانە فرسەتی لێ بینیم‌و ناگەهانە تفیە دەممەوە. بۆ ماوەیەکی فرەکورت گلاراوم گرت.. قاچم پەیزەن بوو.. دەمم تێمیسکی لێ هات؟!

زوو بەزوو شەبەنگی دایکمم لەبەرچاوی خۆم ڕاگرت:

فریاد ڕەسانە بنەگۆزەی کانیاوی سازگاری لەژێر پێم دا ترپاند، قاچم هاتەوەجێ.. داوێنی سووتاندو بەری ڕەفیسکی گرتم.. پرچی پیرۆزی لەدەمم وەردا، ئیدی بۆ قڕەو ژاراوی سێبەندی‌یەکە هەرگیزاو هەرگیز تەشەنەی نەکرد.

**ئالانی**

زۆر جار كه چكەبيرێكم لەكەللەی سێبەنديی مارڕزدا بەدی كردبێ بيرو بيركردنەوەم لێ بووەتە كۆلێكی گران.

كاتێ لەم رۆژگارەدا لەواتای دەسەڵات گەيشتمو لێم تابيناو بوو كەبازرگانی كردنە بەهێزو سەودا پێكردنە لەلايەن سێبەندیيەكانەوە بەتەواوەتی پشتم لەفەرمانداراەكان هەڵ كرد. تووشی نائومێدی بووم ئەوجا بەقۆناغەكانی رابردوو داهاتوودا تێم تەقاندو توند لووتی خۆم گرت؛ چونكە لەهەردوو قۆناغەكەرا بەيانو ڕاگەياندنی گەلحۆيانە بۆنيان بەسەردا بڵاودەكردمەوە.

وەك كەنەفتێكی كوێری كەڕی لاڵ ژيانێكی فرەم بردەسەرو خۆم كەنار گرت تالەگەڵ سێبەندیيەكانی ميریو كلكو لەوارەكانی لەكاتی خۆشانی گوزەران نەگەم.

پلە پلە بيری من بەرزەوەبوو.. كەچی بەدەست خۆپاراستنەوە هەر دادوبێدادیيەتی.. تەنيا بەهيوا خوازی دڵ نەوايی لێ دەكا.. ژيانی كوێرێكی چەماوە بەسەر عەساكەیدا ئاوا تێپەڕی! ئەرێ ئەوە چيم لێ هاتووە!؟.. چ شتێك منی لە قێزو بێز قوتار كردو ڕووناكی خستەوە چاوەكانم؟.. ئەوە چۆن توانيم بۆ ئەو ترۆپكانە هەڵ بكشێمو سێبەندیيەكان گەمارۆی بەرزە كانیيەكانيان نەدابن؟!.

تۆ بڵێی خودی رق لێبوونەوە باڵی لێ ڕواندبمو هێزی پێدابمو گەياندبميە تەقينگای سەرچاوەكان؟.. بەڕاستی هەڵ كشاومە بان لووتكە، بێتو نەی گەيشتباميە، سەرچاوەی خۆشیو شاديم دەست نەدەكەوت.

براينە! ئەوەتانێ دۆزيمەوە.. ئەوا بەسەر لووتكەوە خۆشیو شاديم لێ هەڵ دەقوڵێ.. گەيشتمە ئەو شوێنەی كە مرۆڤ دەتوانێ تينوێتی خۆی پێ بشكێنێو سێبەندیيە خوێڕيلەكانيش دەمی پێدانەژەنن.

ئەی سەرچاوەی تەقيو! بەتوندی خۆشيان دەردەهاوێژێ، ئەو كاسەيەی سەررێژت كردبوو بەتاڵی دەكەيتەوە!

ئەی سەرچاوە! دەبی خۆم رابهێنم بەكاو خۆ لێت نزيك بمەوە، چونكە دڵەكەم بۆ هاژگەی تۆ تەكان دەدا.. نائومێدیو كەيفسازی دەستيان بەسەر ئەم دڵەدا گرتووە، كەگەرمای رۆژانی هاوينی بەسەردا تێ دەپەڕێ.. تاسەی شەتاوانت دەكا بەساردیو سەلامەتی هاژە بكەن بەسەريا!

لەبەهاردا ماتەمينی رەتانو دڵەراوكێم كۆتايی پێ هات.. هاوينيش بەفری تۆڵەی تواندمەوە.. ئێستاش بەهەموو گيانمەوە تاسەی هەواردەكەم.. باشترين حەوانەوەش

ئەوەیە کە لەپۆپەی شاخان داو پەنا کانیاوە ساردەکانەوە بەخێرو بێربێ.. دەی هاوڕێیان! بابکەوینە خۆمان و حەوانەوەکەمان بکەینە بەزم و شادی.. ئائەوە لووتکەی خۆمانە.. ئائێرە نیشتمانە کە تاشەبەردەکان دەمان پارێزن.. شوێنێکەو چەپەڵەکان بەخۆیان و تینوێتی یە پیسەکانیانەوە نایگەنێ.

برادەرینە! نیگای پاکتان بگرنە سەرچاوەی شادیم، چونکە لێڵی ناکەن و بەردی تێ فڕێ نادەن.. بەخاوێنی دەمێنێتەوەو بە دەمتانەوە دەشنێتەوە. ئا- لێرە دارە گەورەی دوا ڕۆژ بالادەبێ.. با- لەنێو پەلەکانی دا هێلانەی خۆمان هەڵ بەستین؛ ئەوسا هەڵۆکان بۆ ئێمەی کەنار گیر خۆراك دەهێنن.

ئەمە شوێنێکەو چەپەڵەکان ناتوانن لەگەڵمان دا بەشی بکەن.. ئەمە ئاگرەو لغاویان دەسووتێنێ.. ئێرە سێبەندی و پەڵۆخی لێ ناحەوێتەوە، چونکە بەختیاری یەکەی لەمەڕ ئێمە گیان و لاشەیان بەیەك دا هەڵ دەپرووکێنێ.. دەمانەوێ لەسەرروویانەوە بژین، لەتاقی هەڵۆکانەوەو لەهەلاتگەی خۆرەکانەوە لێیان ببینە فەرتەنەو زریان.. من وەك ڕەشەبای سەخت بەسەر چەپەڵەکانەوە، لەژوور سەری سێبەندی یەکانەوە دەی کەمە گەردەلول. بەهەناسەی خۆم هەناسەبڕیان دەکەم. ئەمەش چارەنووسە. زارا بۆرانێکەو قولایی یەکان ماندوو دەکا. ئامۆژگاریی دوژمن و خۆڕشێنەوەکان و تۆ پژێنەکان دەکا بەڕووی بایەکان دا تف نەکەنەوە.

زارا ئاوای گوت...

## خێڵە جاڵجاڵۆکە

ئائەوە جاڵجاڵۆکەیە. ئەگەر حەزدەکەی بی بینی ئەوا دەست بەتەونەکەی بهێنە تابجوڵێتەوەو خێرا خۆی وەدەر بخا. ئای دیمانەت بەخێر جاڵجاڵۆکە! کەسەرنجی پشتت ئەدەم بریتی یە لەدروشمێکی ڕەشی سێ گۆشە.. ئەو تۆڵەیەی لەدڵی خۆتت بەچنیوە دیسان لەلای من شتێکی پەنهان نیە.

بەهەر شوێنێکەوە بدەی یان بی گەزی دەبێتە ڕەشەپەڵەی سەرپێست لەگەڵ تۆمە جاڵجاڵۆکە! کەتنەکەت ژەهرێکی گومڕا کەرە لەدڵ و دەروون دا. ئەی جاڵجاڵۆکە

گومڕاكان! بەهيماوە لەگەڵتان ئەدوێم: ئێوە مزگێنی يەكسانەتی جاڕ دەدەن. بەلای منيشەوە بريتين لە عەمبارێكی سيخناخ لە سۆزو پەرۆشی تۆڵە سەندنەوە.

جێگەوڕێگەتان دياری دەكەمو لەولووتكانەوە كە بەسەريانەوە قنج بوومەتەوە وەك تاوێر قاقای پێكەنينتان تێدەگرم ئەوسا بۆخۆم دەزانم چۆن تەونەكەتان هەڵ دەوەشێنمەوە، ئەم كارەشم بۆ ئەوەيە، تا بەرق هەستانەوە لە كەورگی درۆكانتانەوە دەرپەڕنو لەسايەی وشەی ئەو عەداڵەتەوە كەلەوسی تێ وەردەدەن تۆڵەكاريتان لێ دەفرتێ.

ئەركەو لەسەرمە، دەبێ مرۆڤ لەپەرۆشی تۆڵە سەندنەوە قوتار بكەم ئەمەش ناوڕێيەكە بۆ گەيشتنە ئاواتی هەرە ئابڕومەند. دوای فەرتەنە نيشتنەوەی رامال پەلكە زێڕينە بەسەر ئەو ئاواتەوە تاق هەڵدەبەستێ. بەلام ويستی خێڵە جاڵجاڵۆكە بۆ ئەم مەبەستە ملی رێگا ناگرێ؛ ئەوان لەنێو خۆيان دا دەچپێنن: ((ئەگەر داد پەروەری هەبێ تەنيا لەو تۆڵە گەردەلوولەی ئێمەدا هەيەو بەسەر جيهان دا دەكشێو هەركەسێكيش لەخۆمان نەبێ ئابڕووی دەباو لەكەداری دەكا.

ديسان دەڵێن: ئەگەر ڕەوشت پەسەندی هەبێ، تەنيا لەيەكسانی خوازیدا هەيە؛ كەواتە بالەدژی هەموو دەسەلاتێك بقيڕێنين.

ئەی كاهينە يەكسانی خوازەكان! كۆڵەواريتان شێتايەتیيەو بەسەرتان دا زاڵە، سەبارەت بەو كۆڵەواریيەتان هوولەی يەكسانيتان بەرزكردەوە. لەوديو جاڕدانی پەسەندايەتيشتانەوە زەبرو زەنگ پەرستان خۆی لە مەكۆ داوە.

ئێوە لەبەرچاوی من لەخۆبايی شەپرزەو لانەی حەسوودين. ئەوزرگنیو حەسوودیيەی دڵ خۆركەی پێشينەكانتان بوون ئێستا لەتوێی ئێوەدا نێڵەيانەو ئاشقە تۆڵەتان تيژە دەدەن. رۆڵەكانيش رووكاری ئەو شتانەن كەباوك پەنهانی كردوون.. ئای كەرۆڵەكان چەندان نهێنی باوكی خۆيان ئاشكرا كردوون؟!

ئەو جۆرە مەردومگەلە– لەديمەن دا بەپەرۆشو تاوگێرن، ئەوەی ئاگری پەرۆيشيان تێدا دەخرۆشێنی خۆشەويستی نيە.. بەڵكو تۆڵەيە.. خۆ ئەگەر سەنگينیو هێمنيت تێدا بەدی كردن سەرچاوەكەيان ژيری نيە.. بەڵكو حەسوودی يەو گاڵيان دەدا بيربكەنەوە. بەڵگەی زرگنیو حەسووديشيان ئەوەيە كە بۆ دوورتر

لەمەرامی خۆیان تەکان دەدەن.. ئەوجا لەشەکەتی‌دا ڕەهێڵ دەبن‌و بەفر دەکەنە سەرین.

هەموو ناڵینێکی ئەو مەردوومگەلە خڵتانی تریەو ئاهەنگی تۆڵەیە. بەدەم سەنا خوان‌و لەبنەوە شڕا خۆیان بۆ ئازاردان ناوەتەوە. ئەوپەڕی کامەرانییان لەوەدا- دەدۆزنەوە کە خۆیان بەسەر ئەم جیهانەوە بکەنە فەرماندارو دادوەر. کەواتە - دۆستینە! گویٚ لەئامۆژگاریم بگرن: ئەوکەسانەی ڕەمەك‌و غەریزەی سزادانیان تێدا زاڵە ئێوە لێیان دوورە پەرێز بن؛ چونکە ئەوانە لەرەسەنی هەرە خراپەوە کەوتوونەتەوەو لەڕوویان دا روخساری جەلادەکان دەخوێنێتەوە.

خۆتان لەو کەسانە کەناربگرن کە یەکبینە باسی دادپەروەریی خۆیان دەکەن‌و هەرچی سیفەتی چاکەشە لەدەروونیان دا نیە. ئەگەر ئەوانە لافی کارسازی‌و ڕەواگیری لیٚ دەدەن لەبیرتان نەچیٚ بێت‌و هەستیان بەکۆڵەواریی خۆیان نەکردبایە خۆیان نەدەخزاندە نێو ریابازەکانەوە.

برادەرینە! من ئاگام لەنەفسی خۆمە، نەبەشکم ئێوە تێکەڵ بەوخێڵە مەردومەی بکەن‌و پاشان نەتوانن من‌و ئەوان لێکدی هەڵ بهاوێرن. هەندیٚ مەردوم پەیڕەوەکانی من- لەبارەی ژیانەوە ڕادەگەیەنن لەهەمان کاتیش دا بۆ یەکسانی بانگەواز دەردەکەن‌و دەچنە پاڵ خێڵە جاڵجاڵۆکەی ژەهراوی‌یەوە.ئەوانەی بەلای خۆیانەوەداکۆکی لە زیندەگانی دەکەن، کەچی پشتی لیٚ هەل دەکەن‌و دەخزێنە کونە مغارەکانیانەوە، ئەمەشیان بۆ ئەوەیە بەدکاری‌و ریسوایی بەدەست بهێنن‌و ئەوانەی لەم رۆژگارەدا جڵەوی دەسەڵاتیان لەدەست دایە لەکاریان بخەن. بۆیە بەهەڕەشەی وێران کردن خۆیان فرچك داوە.

ئەگەر دەسەڵاتداری لەدەست خێڵە جاڵجاڵۆکەدا بوایە- ئەوسا ئامۆژگاری‌یەکانیان شێوەیەکی کەی وەردەگرت، چونکە لەوەپێش لەهەموو کەس باشتر فێری ئەوەبوون کەچۆن سووتگەو کورەی ئاگر خۆش بکەن‌و ئەوانەی لەوان جوداوازن بەهیلاکیان بەرن‌و بیان چەوسێننەوەو ئەشکەنجەیان بدەن.

نەم گەرەکە لەڕیزی یەکسانی خوازان حەلێب بکرێم؛ چونکە داد پەروەری فێری کردووم کە: ((یەکسانی لەنێو مەردمدا نیە)) بەولاترەوە پیٚویستە هەریەکسان نەبن.

ئەمە بنەمایەکەو هەرگیز لێی لانادەم.. دەنا مرۆڤ دۆستییەکەم دەبێتەگەزافو تەشقەڵەی ڕووت.

پێویستە ئەم خەڵکە بەهەزاران ڕێگەو گوزەردا تێ بپەڕنو بەرەو زەمانی داهاتوو بکەونە هەڵە داوانو هاوچاوی.. ئەوساکە شەڕو شۆڕیان لەنێو بەرپادەبێ، بەتێپەڕبوونی ساڵەها ناکۆکییان لەنێودا پەرەدەستێنێ، ئەمە ئەو سرووشەیە کەسەرتاپا خۆشەویستیم پێی ڕاگەیاندووم.

پێویستە خەڵکی لەقوڵایی نیهادیاندا باڵانموونەو پەیکەرەتارمایی (مرۆڤی باڵا) ڕاست بکەنەوەو لەپێناویان دا زەحمەتکێش بن، ئەوسا بەچاکو خراپو دەوڵەمەندو هەژارو ڕەسەنو ناڕەسەنیانەوە بەرەنگاری سەرجەمی رژێمەکانی سەر زەوی دەبنو دەستەو یەخە دەوەستنو لەپێناوی چەکێك بۆ چەکێكو هێمایەك بۆ هێمایەك ئاگری جەنگ هەڵ دەگیرسێ، چونکە پێویستە ژیان هەمیشە بەسەر زاتی خۆیدا باڵابێ.

زیندەگانی بەهەموو پایەو پلەیەکیەوە هەڵدەکشێو بۆ ئاسۆ دوورەکان خۆی هەڵ دەبڕێ کە لەودیو ئەوجوانییەوەن لەسەر تەختی خۆشنوودی ڕۆنیشتووە تا دەگاتە ئارامگای خۆی لەترۆپکە گەردن کەشەکان دا.

دەبێ ژیان بە بەرزاییدا هەڵ زنێ، لەبەر ئەوەی کەنزمە مەردوم لەبەربەرەکانی بەرزە مەردوم دایە ژیان ناچارەو دەست بەرداری پێهەڵ گەرانو پێداگەڕان نابێ. کەڕوودەکاتە بڵندانیش پێویستە بەسەر زاتی خۆیدا باڵابێ.

یاران ! سەیربکەن: ئائەوە مغارەی خێڵە جاڵجاڵۆکەیەو کاولەی کۆنە پەیکەرێکی لێوە دیارە؛ ئێوەش نیگای سرووش خوازانی بۆ ڕەوانەبکەن.

ڕاستییەکەی ئەوکەسەی لەدێرینەوە بیرو بۆچوونی خۆی سەرجەم کردوون تا لەتاشەبەرد ساختمانێك بەرز بکاتەوەو هەور بەزێن بێ- وەك باش دانەیەك شارەزای نهێنییەکانی زیندەگانی بووە.

جوان ئارا ((الجمال)) لەخۆیدا لەسەر جیاوازیو خۆ ڕاگری لەهێزو بەرز بوونەوەدا- دامەزراوە. ئەمەیە ئەو دانایەی بەهێمای فرە ڕەونەقدارەوە تێمان دەگەیەنی.

ئالێرەوە گومەزو دەلاقەکان دەکەونە نەبەردی بێ ئەمانەوە.. تاریکی شالاو بۆ رووناکی دەباو رووناکیش هێرش بۆ تاریکی دەهێنێ.. هەر دەڵێی جووتە خواوەندن و زۆرانبازی دەکەن.

ئێوەش لەبواری جوان ئارایی و باوەڕ بەخۆبوون دا رێ و شوێنی ئەوهێمایەبگرن. کەواتە برادەرینە! بائێمەش لەنێو خۆمان دا دوژمن بین.

—با هەریەکەمان هێزی خۆی تێك نێ و لەتەك ئەوانی دیکەدا بجەنگێ..!!

وای بۆخۆم! ئەوا جاڵجاڵۆکەی کۆنە دوژمنم منیشی گەزت. چونکە باوەڕی بەخۆی بوو، جوانپۆشی خوایانە بوو بەمەرامی خۆی گەیشت و سەرەپەنجەکانمی گەزتم.. ئائەوەتا دەڵێ: دەبێ سزا دابەزێ.. دەبێ عەدالەت رەوتی خۆی بگرێ. کابرا! دیارە تۆش بەمەزنایەتی نیهادو ویژدانەوە گۆرانیت چڕیوە؛ کەواتە لاوژەکەی تۆ بەخۆڕایی ناڕوا!

(بەڵێ.. تۆڵەی خۆی سەند، وای بۆ خۆم! دەروونەکەی منیش بەرەو سۆزی تۆڵە بەرێ دەکات؟!)

برادەرینە، دەبگەنەلام! وەرن بەوستوونەوە قایم بم بەستنەوە، نەبەشکم لەبنەماو باوەڕی خۆم لابدەم، نا، باشتر وایە ببمە پەیکەرێکی بێ گیانی داچەقیو لەباتی ئەوەی کە ببمە فەرتەنەی تۆڵە.

هەرگیز زارا نابێتە فەرتەنەو بۆران[٢١] هەیەو نیە فەنەرێکی سەما کەرەیە.. بەلاّم سەماکەری جاڵجاڵۆکە نیە.

---

[٢١] زارا وەك لەم بەشەیدا کەوتووەتە خنەخن لەهیچ لایەکی دیکەوە هێندە بەگیرنەهاتووە، هەر ئەوە کە بانگەوازی دەرکردووە: (هەرچی لاوازو پەرپووتە رامالٚ درێ، ئیدی زەوی پاك بکرێتەوە.. ئەو واتەنی لە (لاتولەواری زیندەگانی پاك بکرێتەوە)، ئەوا ئێستاش نایەوێ ببێتە ئەو فەرتەنەو زریانە! هەربە ئەوەندە واز دەهێنێ کە : بەندۆڵێکی هەڵقونەی بێ ئەنجامە)) لەکاتێك دا جەربەزانە خۆی هەڵدایە بنەمای (یارمەتی هەژاران و مافی گەلان))ەوە. لەگەل ئەوەش ڕا ناگاتە کۆتایی بەندی قسەی تائەوەی گەرەکی بوو بیچەسپێنێ، دێت و بەدەستەواژەیەکی دی یارۆی خۆی هەڵ دەوشێنێتەوە؟!

ف-ف

## دانایانی بەناوبانگ

خێڵی داناکان! ئێوە بەناوو شۆرەتی خۆتانەوە دەنازن و خزمەتی ئەو گەلەتان کردووە کە باوەڕی بەپڕووپوچە، بێت و لەباتی ئەوە خزمەتی (ڕاستی)تان بکردایە ئەوا کەس ڕێزی لێ نەدەگرتن.. هەر لەبەر ئەوە گەل بووەتە بارکێشی گومان ئاراییتان؛ ئەویش زادەی دەمووددووی ڕازاوەتانەو بووەتە ئەو پێچە ڕێگایە کەبەرەو دەربڕینی قەشەنگ کێشتان دەکا. بەو ڕەنگە ئەوەی سەرداره بەندەو نۆکەر بۆخۆی پەیدا دەکاو لێی دەوەستێتەوە، ئەوجا بەدۆخی گومڕابوون و بەیەکادانیان دەکەوێتە خۆشی و ڕابواردن. ئەو مرۆڤەی چۆن سەگ ڕقی لەگورگە- ئاوا گەل چارەی ناوێ دەشێ کێ بێ؟ بێگومان گەل چارەی ئەوکەسەی نەگەرەکە: خاوەن بیرو ئازادە.. دوژمنی کۆتەو نابێتە مل کەچ و کۆیلە.. ئەو مرۆ ئازادەمان جەنگەڵ نشینی بەلاوە پەسەندە.

ئەو شتەی لەهەمو زەمانێك دا گەل بەگیانی- داد-ی زانیوە ئەوە دادێکەو بۆ گیانی ئازادی خۆی لەبۆسە ناوەو سەگە درەکانیشی دەلوورێنن بەسەریدا. ئەوەش لەبەر چاوە کە لەگشت زەمانێك دا گوتراوە: (ڕاستی لە بێجگەی گەل دا نیە.. ئەی وای بۆ ئەوکەسەی لەدەرەوەی گەلەوە ئەو داڵی ڕاستی‌یە!))

داناکان! ویستووتانە- لەبارەی سەرکزی و نەوازشەوە پشتیوانی گەل بن. ئەوجا ئەوچاوشۆڕی‌یەتان بە (ڕاست خوازی) ناوبردووە، پیاح، کەچۆن دانایەکن؟!.

لەدڵی خۆتان دا دەتانگوت: زادەی گەلین و پەروەردەی گەلین.. دەنگی گەلیش دەنگی خوایە، وەك کەری گێل کەزاب دەم ڕاستی و نێوەندیاریی خۆتان پیشان گەل داوە. زۆر دەسەڵاتداریش ویستوویانە گاریەی خۆیان لەگەڵ چێژو ئارەزووی گەل بسازێنن، ئەوجا بۆ ڕاکێشانی یارۆ گاری‌یە کەرێکی گولەکە.. تۆ بڵێ- دانایەکی بەناوبانگ- یان تێ بەستووە!؟.

دانا بەناوبانگەکان ! داواتان لێ دەکەم چیتان لەبەردایە لە کەوڵەشێرو کەوڵە جانەوەری بەڵەك و پەستەکی جیهان گەڕو داگیرکەرەکان لەبەرخۆتانیان دابڕنن.. ئێوە هاواری ڕاستی ڕادەهێڵن.. بەڵام تا لەمەزنایەتی و بەگەورەگرتن وازنەهێنن باوەڕم بەو ڕاستیانەتان نیە .. ڕاست پەروەر ئەو بێ خواوەندەیە ئەداتە هەردەو چۆڵ.. هەر لەبن

دەستی خۆیەوە گەورە پەرستی و ستایش خوانی تێك هاڕیون ئەوجا بووتە هەردەگێڵ. لمی بیابان قاچی چۆڵەوان دەسووتێنی و سەرنجیش ئەداتە ئەو مێرگانەی ئاوی زولاڵیان لێ هەل دەقوڵێ و سێبەر دای پۆشیون و زیندەگانیش بەئاسوودە بنەی لێ خستووە، کەچی تینوێتی کاری تێناکاو ڕای نادا بۆ خۆشیانی لەگەل خۆشنوودەکان داو ڕووبکاتە ئەو میرغوزارە؛ چونکە دەزانێ هەرمێرگەو بتێ خۆی لێ هەڵناوە. شێر دەیەوێ تەنیا بێ و لەبەندایەتی گەورەو سەروەرەکان و لەبەختەوەری مل هوڕەکان خۆی ڕزگار بکا.. دوور بێ لەخواوەندو پەرستاکان دوربێ لەترس و ئەوانەی ترس دەخەنە دڵانەوە.. پیاوی ڕاست پەروەر ئاوای دەوێ.. ڕاستی خوازەکان هەر لەچۆڵەوانی دا ژیاون و بەو بەرو ماوە بەرینەدا بیری خۆیان ڕەها کردووە.. بەڵام لەشاران دا تەنیا دانا بەناوبانگەکان خۆراکی باش دەماشنەوە ئەوە نیە لەپێناو دادۆشین دا ئاژەڵە گوندارەکان باش دەلەوەڕێنن؟!. ئەوان گاریەی گەل ڕادەکێشن و کەرە گەل ئاسا خۆیان پێ پالووبەند کردووە. وەنەبێ من لێیان خەشم گیربم.. بەڵام با بزانن کە ئەوان نۆکەرن و گاریەیان لەپالووخراوە، دەرەوشانەوەی زێڕیش بەسەر ئەو گاریەوە کەرای دەکێشن لە ڕووڕەشی قوتاریان ناکاو هیچ بەفریایان نایە .

زۆر جاریش ئەو مەردومانە لەخزمەتکاری دا دڵسۆزبوون و شیانی سوپاس بوون، دانایی ئەوەی دەوێ کەنۆکەر لەئاغایەك بگەڕێ و لەڕووی نۆکەرایەتیەوە سوودی پی بگەیەنێ

پێویستە هۆشی ئاغاکەت بالابێ و پەسەندایەتیشی هەروا بڵند بێ؛ چونکە بەسایەی ئەو دوو سیفەتەوە تۆش بەرز دەبیتەوە.

ئەی دانا نۆکەرەکانی گەل! بەسایەی بالا بوونی هۆش و پەسندایەتی گەلەوە ئێوەش قنج بوونەتەوە.. گەلیش بەسایەتانەوە بالابووە. ئەوەی جارم دا بۆ پێداهەڵدانتان نیە. ئێوە تەنانەت لە پەسندایەتی خۆتان دا لەگەلەوە گلاون و بەسیفەتی ئەو ماونەتەوە.. بەڵام گەلێکی سەر کێڵن و پەی بەهیچ واتایەکی هۆش نابەن.

هۆش لەخۆیدا زیندەگانیەو ژیان کوتولەت دەکا، ژیان چەندە بەرگەی ئازارەکان بگرێ لەزانیاریدا پەرە دەستێنێ و فراوان دەبێ. ئەرێ ئەو ڕاستیەتان زانیوە؟!

هۆش بەختيار نابێ تا فرمێسك نەسڕێو تاجی قوربانی نەنێیتە سەر. ئەرێ ئەو ڕاستی‌یەتان زانیوە ؟!

نابینایی کوێرو پەل کوتانی بۆ ڕێگا شایەدن لەسەر هێزی خۆر. ئەرێ ئەو ڕاستی‌یەتان زانیوە؟!

پێ ویستە زانیار خواز فێرببێ کەکێوەکان بکاتە بەردی دیوارو تەلاری خۆی پێ بنیاد بنێ.. لەلایەکی دیکەشەوە (هۆش) کێو گواستنەوەی بەلاوە سەخت نەبێ.

ئەرێ ئەو ڕاستی‌یەتان زانیوە؟!

لەبارەی هۆشەوە هەر ئەوەندەتان بۆ دەرکەوتووە کە خراپەیەکی پێ دەوەستێ.. ئیدی نازانن کە ئەو هۆشە چ دەزگایەکە.. دیسان نازانن کەچەکوش چەندە بەڕەقی‌و بەقورسی دادێتە دەزگا؟!

بەراستی ئێوە لەبارەی گەورەیی هۆشەوە نەزانن، ئەگەر نەوازشی هۆش‌و ویستی ڕاستی خۆی ڕابگەیەنێ ئەوا زۆر زەحمەتە ئێوە بەرگەی ئەو نەوازشەی بگرن.. یان ئەو نەوازشەی بگرن بەکۆڵتانەوە.

ئێوە لەهیچ زەمانێك دا نەتان توانیوە هۆشی خۆتان بۆ چاڵە بەفرەکان بەڕێ بکەن؛ چونکە بۆ ئەو تێسمڕانە گەرمایی تەواوتان تێدا نیە.. لەبەرهەمان هۆ بەلەزەتی ئەو کەسە نازانن کەشەراب گەرمی ئەو چاڵانە دەی بوژێنێتەوە.. وێرای ئەوەش کەبۆ وازی کردن لەتەك بیرکردنەوەدا دێنە بەرەوە. بەهەرحاڵ دانایی‌و پەندیاریتان کردووەتە پەناگاو بیمارستانی زڕەشارەکان.

ئەی دانا بەناوبانگەکان! ئێوە هەڵۆ نین؛ کەواتە نازانن هۆش لەبیم‌و لەرزی خۆی‌دا چ خۆشایەتی‌یەکی لێ دەزێتەوە.. بێجگەی باڵداریش بەسەر شیوو دۆڵەکانەوە مافی دڕ بەهەوادانی نیە.

داناکان! لەوە پتر نین کەپێتان بڵێن نەکامڵ‌و هێور. تەوژمی شەختە لەهەموو زانیاری‌یەکی قووڵەوە هەڵ دەکا؛ چونکە سەرچاوە پەنهانەکانی هۆش وەك بەفر ساردن.. تەنیا ئەو دەستانەی بەگەرمی زەحمەت کێشان گریان تێ‌بەربووە لەزەت‌و خۆشی لەو زوقم‌و سۆڵەیە وەردەگرن!!

دانایـانی بـەناوبانگ! لەبەرچاومـە: ئـەوا خۆتـان بـەدڵ ڕەقی‌یـەوە پێـچ داوەو بـە بەیایی بوونەوە داچەقیون؛ نەئەوەیە بەهێزی با یەك بجمێن.. ئەو ئیرادەیەشتان تێدا ڕاست نابێتەوە زاتتان بێنێتە بەرو بجوولێن.

ئـەدی چاوتـان بـەو کەشـتی‌یە نەکـەوتوە کەبەسـەر شـەپۆلە شـەپرزەکانەوە دەشەکێتەوەو لەهەموو– وزاق‌و پێچ لێدانێك دا باو بۆران لەقاقۆزەی ناوە؟!..

دانـایی منیـش وەك ئـەو کەشـتی‌یە بەسـەر تەمـەن دا تێدەپـەڕێ‌و پـڕو چـڕی گەردەلوولی بیرکردنەوەیە..

ئا ئەوە دانایی سرك‌و پەرەوازەی منەو تەکان دەدا.. ئەی خزمەت کارەکانی گەل.. ئەی دانا بەناوبانگەکان..! لـەو حەلـەدا کـەمن تـەکان بـەخۆم دەدەم‌و ڕادەسـێم– ئایـە ئێوە دەتوانن بێن‌و شان لەشانم بدەن؟!.

زارا ئاوای گوت...

## سروودی شەو

تاریکایی شەو داهات‌و خوڕەی شەتاوان بەرزەوەبوو.. دیسـان نەفسـەکەی منیـش سەرچاوەی هەڵقوڵیوی خۆی هەیەو دەکا هاژە لەسەردا.

تاریکایی شەوداهات‌و ئاوازی سروود لەزاری ئاشقەکانەوە دەنگی دایـەوە. گیـانی منیش سرووديێکە لەو ئاوازە سروودانە.

لـەناخی مـن دا شۆڕشـە هـێزێك هەیـەو دەیـەوێ دەنگـی خـۆی بـەردا.. تاسـەی خۆشەویستی‌یەو بەچەشنی گێرۆدەکان خاوەنی گفت‌و بەیانە. مـن نـوورم‌و کاشـکی تاریکایی بوومایە. چونکە نوورپۆشم‌و گـڕم تێبـەربووە، ئـەوەتانێ تـەنیایی بـووە تـە بەشم.

ئەی کۆی ئەستێرە! وەك گوڵـە ئەسـتێرە وردەکان بە ئاسمانـەوە دەتروسکێنەوە؛ بێت‌و تاریکی بامایە دەم توانی فەڕتان ئاوقەد بکەم بەتیشك پڕانتان بنازێم..

بـەڵام مـن بەڕووناکیـەکانی خۆمـەوە دەژیـم‌و بڵێسـەی زاتـی خـۆم دەخۆمـەوە.. لەخۆشایەتیی وەرگران نائومێدم، جارەها بەدڵیشم دا هاتووە کە ئەو خۆشـایەتی‌یەی لەدزی‌دا هەیە لە وەرگرتن دا نیە.

هــەژاریم لەوەدایــە كەدەســتم لەبەخشــین ناوەســتێ هەمیشــە تەماشــای ئەوچاوانەدەكــەم كەلــەچاوەڕوانیدا كــەیلن.. ســەرنجی ئــەو شــەوگارانە دەدەم كــە گڕگرتووی شەوقو تاسەن، ئەوەش حاڵێكی زرگنییەو خەوگاكەم لێ ناخۆش دەكا.

ئای لەبەد بەختی بەخشندەنەكان .. ئای لەتاریكی خۆری من.. ئای لە ئـەلهای حەزۆكێی من. ئای لە تاوی برسێتیم لەتێریم دا؟!

ئـەوان چیـان بدەمـێ وەری دەگـرن.. بـەڵام لـەگیانیان بـەدوورم، نێوانـی وەرگــرو بەخشـندە كـەندرێكی قوڵـە. دەشـێ نزیكـترین چـاڵ لـەقوڵاییدا سـەخترینیان بـێ لەدارِماندا .

هـەناوم تووشـی جـۆرە برسـێتییەك بـووە پـاڵم پێـوە دەنـێ ئەوانـە ئـازارم بـدەم كـەنووری خۆمیـان تـێ دەگرم، حەزدەكەم ئەوانـەی دیـاریم پێبەخشیون لێیـان ببمـە جـەردەو رووتیـان بكەمـەوە.. ئابەو چەشنە تینـوی جەزرەبە گـەیاندنم؛ ئـەو دەسـتەی درێژم دەكردەوە رای دەكێشمەوە دواوە.. من تاڤگەیەكمو دوور هاوێژانە تافە تافمە.

تۆڵە كردنەوەی ئاوا مەزنایەتییەكەم فریودەدا.. ئـەو جۆرە مـەكرو فێڵـەش زادەی بەركەناریمە.

هێنــدەم بەخشــی تــا بــەختیاریم لــەكیس چــوو، پەســەندایەتیم هــەڵ تــەكاو پووكایـەوە.. هەركەسێك یەكبینـە بەخشـندە بـێ مەترسـی ئـەوەی لێ دەكـرێ ژیـان لەدەست بدا؛[22]كەواتە پێویستە لپەدەستی داقونجێنیو دڵی رەق بێ.

كالانـەی چاوەكــانم ئەوكەســە فرمێســك بــاران دەكــەن كەشــەرمەزاری هانــاو پاڕانەوەیە، ئەوەتا دەستم رژد هەڵاتوون، نەیان گەرەكە هەست بەو دەستە لەرزۆكانە بكەن كە بەچنگ پڕبوونەوە لاسەنگ بوون!

كـوا فرمێســكی چاوەكــانم.. كــوا نــەرمو نیــانی دڵەكــەم؟.. ئــای لەتــەنیایی بەخشندەكان.. ئای بۆ كشوماتی نوور پۆشەكان؟!

---

[22] بەپێی دوو نوسخەی بەردەستمو لەلاپەڕەی (١٣٤)دا نووسراوە ((ان من یستمر علی بذل الهبات مهدد بفقد الحیاء)) بەپێی بۆچونی خۆم (الحیاء)م بەژین واتە ((الحیاة)) لێ داوەتەوە، لەوانەیشە هەر مەبەستی ((الحیاء= شەرم))بێ..؟!

خۆره بێ شمارەکان بەچۆڵگەی ئاسمانەوە دەخولێنەوەو بەتیشکەوە لەتەك چڕە تاریکستانی‌یەکان دا – دەدوێن، منیش بەتەنێ لەقسەو گفتی ئەو خۆرانە بێ‌بەشم.

ئەی هاوار لەتوانای چ پەیوەندی‌یەك دایە ڕووناکی‌یەکان بەو تەنانەوە ببەستێتەوە کەلەخۆیان دا ڕووناکن؟ ئەو ڕووناکی‌یانە بەسەریان دا تێ دەپەڕن‌و بەخێسەیەکەوە چاوزەدیان دەکەن‌و بەرێی خۆیان دا تێ دەتەقێنن.. ئا بەو جۆرە خۆر گەل بەئاسمانی خۆیان دا رادەبوورن‌و چارەی هیچ تەنێکی دیکەی درەخشانیان ناوێ، بەڵکو بەساردو سڕیەکەوە تێ دەپەڕن‌و ئاوەڵەکانیشیان هەست بەتینی گەرماییان ناکەن.

خۆرەکان وەك فەرتەنە لەکەلووەکانی خۆیانەوە دەردەچن.. شوێن ئەو شتە دەکەون کەویستە بەزەبرەکەیان هەنگاوی بۆ ناوە، ئا لەمەدا ساردو گەرمی‌یەکەیان پەنهانە!

ئەی ستارە گەلی خۆپۆش بەتاریکەشەو ! ئایە بێجگەی ئێوە شتێکی دیکە هەیە گەرمایی لەبریسکانەوە دروست بکا؟.. هەر ئێوەن کە بەرزە هێزەکان لەگوانی نوور هەڵ بخەن.

وای بۆخۆم! شەختەیەو گێژم پێ دەخواتەوە..

دەستیشم بەگڕەی شەختە هەڵ دەپڕووکێنی.. من بە گەرمە تینێکەوە هەڵ گیرساوم بەتینوێتی ئێوە نەبێ بڵێسەی دانامرکێتەوە. ئەوا تاریکایی پەرەی سەند.. کەواتە بۆچی لەچارەم نووسراوە نوورێکی تەنیابم‌و سیرۆشی تاریکستان بم؟!

تاریکستانی‌یەو بەرین.. حەزەکانی منن هاژەی شەتاوان..

دەیانەوێ لەپەنهانی‌یەوە بی‌کەنە هاوار. تاریکایی شەو داهات‌و خورەی قەڵبەزان بەرزەوەبوو..

دیسان نەفسەکەی منیش سەرچاوەی هەڵ قوڵیوی خۆی هەیە!

ئەوا تاریکانی شەو داهات‌و ئاوازی سروود لە زاری گیرۆدەکانەوە دەنگی دایەوە..

گیانی منیش سروودێکە لەو ئاوازو سروودانە.

زارا ئاوای گوت...

## سروودی سەما

رۆژێکیان زارا لەگەڵ یارانی بەنزارێك دا تێ پەڕین، لەو حەلەدا چاوی بۆ کانیاوێك دەگێڕا مێرگێکی تەختانی لەنێو درەختەکانو بێشەڵانەکانەوە بەدی کرد. لەهەمان کات دا دەستە کچۆڵەیەك– دوور لەچاوی ناحەزان – سەرفرازانە بۆ خۆیان سەمایان دەکرد.. کەچاویان لەم ڕێبوارە هەڵەنگوتو ناسیان وازیان لەسەما کردن هێنا.. بەڵام زارا لێیان هاتە پێشەوەو لەتەکیان دا کەوتە قسە:

کیژە جوانەکان! لەگەڵ ئێوەمە؛ مەوەستن بۆخۆتان هەڵپەڕن، من ڕێبوارێکمو هاتووم.. کەیف خۆشیتان بێزار ناکەمو دۆستی کیژانم ..کابرایەکمو لەبەردەمی شەیتان دا بەرگری لە یەزدان دەکەم،[٢٣] شەیتانیش بریتییە لە ((گیانی ڕەزا قورس)) کەواتە چۆن دەبمە ملۆزمی بەهاو ڕۆح سووکیتان؟!.. ئەمە سەمایەکی خوادادەو لەمن ناوەشێتەوە ببمە دوژمنی.. ئیدی چۆن دەبمە دوژمنی سەمایەك کەئەو قاچە خنجیلە ڕێکانە دای بمەزرێنن؟!.

بێ گومان من ئەو جەنگەڵەم کە بەدرەختە چڕەکان ڕەش داگیرساوەو تاریکایی دەوروبەری داپۆشیوە.. بەڵام هەر کەسێك نەترسانە خۆی فڕێ داتە ئەو تاریکستانەی منەوە، لەژێر پەڵە سنەوبەرە بەسامەکانم دا– ئەو ڕێگایانە دەدۆزێتەوە کەئەمبەراو بەر گوڵ خەملانن، دیسان تووشی ئەو خولایە دەبێ کەکیژان تاسەی دەکەنو ئەویش کشومات لەپەنا کانیاوێك دا هەلاژیاوەو چاوەکانی ناونە سەریەك. لەجەرگەی نیوەڕۆدا ئەو خولا داهێزاوە لێی نووستووە، لەوانەیشە ماندووبێو لەمێژبێ هەڵەداوانی پەپولەگرتن بێ تا ژمارەیەکی زۆریان لێ ڕاوبکا.

---

[٢٣] بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ ریسەکەی خۆی کردەوە بەخوری؛ لەزۆرینەی بەندەکانی ئەم کتێبەدا بێ پەروا بێ خوایی خۆی جاڕدەدا، کەچی ئالێرەدا ئەوەتانێ بەرگری لەخوا دەکاو شتە ناسكو جوانەکان دەکاتە بەهرەی خوایی. کەواتە مرۆڤ چەندە جاڕی لەخوا تۆران بدا دواتر خنەخن هەر دەچێتەوە ژێر سێبەری خوا؟!

ئالانی

سەماکەرە خنجیلانەکان! لێم زویر مەبن کەئەو گچکە خواوەندە تەمێ دەکەم، تینی بۆ دێنم تابیکاتە هاوارو گریان.. بەڵام خواوەندێکەو لەهاڕژنی گریانیدا خۆشیو شادی دەهێنی. لەمەولایش بەفرمێسکی سەرگۆنایەوە بۆ لاتانی کێش دەکەم تا داواتان لێ بکا لەگەڵ خۆتانا بی خەنە سەما، هەر ئەوەندە کەوتە سەما ئەوامنیش بەگۆرانی چڕینەوە دەبمە یاوەری ئەو. گۆرانییەکانم لاوژەیەکن وەك شەپازلە ئەیان مالم بەبناگوێی قورسە گیان دا.. گیانی ئەو شەیتانە خۆی هەڵ ناوەو لەخەڵکی وایە جیهانگیرە.

لەو کاتەدا خواوەندی خۆشەویستی ((کۆبیدۆن)) لەگەڵ کیژۆڵە دڵ فڕێنەکان دا سەمای دەکرد زارا هاتو بەستران چڕینەوە دەنگی لێ هەڵبڕی.

ئەی زیندەگانی! ئەوڕۆژەی چاوم لەچاوت هەڵ چەقی وام زانی کەوتوومەتە بنەوەی ناخەکانەوە.. بەڵام تۆ منت بەتۆڕی زێڕین هەڵ کێشایەوە، کاتێ ناوی قووڵاویتم هێناو گوتم بێبنە، قاقایەکی گاڵتە چیانەت ڕەها کردو پێت گوتم: ((ئەمەی تۆ دەیبێژی هەر ئەوەیە کە ماسییەکان دەیڵێن، ئەوانیش کە ناتوانن بگەنە بنی قووڵایی وادەزانن قوڵاییەکە بێبنە. تۆبڵێی بێ بارو بێ میزاج بم؟! تۆ بڵێی ئافرەتێك بم.. بەڵام ئافرەتێکی بێ بەش لەئاکار پەسندی؟.. لە بارەی سیفەتەکانمەوە دەم هەڵبەستی خەڵك زۆرە.. بەڵام هەمووشیان لەسەر ئەوەن کەپڕ لە نهێنیمو کۆتاییم نایە.

خەڵکینە! ئێوە پەسند ئارایتان لەمن دا دەبینن؛ لەوەش بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی دیکەتان نیە.

بەڵێ ژیان لەگاڵتەجاڕی خۆیدا ئەم حیلەو قاقایەی لێدا.. بەڵام بەش بەخۆم باوەڕی پێ ناکەم؛ لەوکاتەش دا کەخۆی دادەشۆرێ ئەو پێکەنینەی لێ ناسەلمێنم.

ڕۆژێکیان لەگەڵ داناییە تۆسنەکەم دا کەوتمە چپەو رازەوە، ئەویش بەڕقەوە پێی گوتم

تۆ حەزت لەژیانەو خۆشت دەوێو داوای دەکەی هەر ئەمەیشە کەپاڵت دەدا فرە سوپاسی ژیان بکەی.

ئەگەر خۆم ڕانەگرتایە وەڵامی داناییم بەچەتوونی دەدایەوەو راستیشم بۆ وەدەر دەخست.. هەرچەندە دانایی رقەبەریم لەگەڵ دا دەکا، دەبێ وەڵامی کاریگەرتری بۆ ساز بدرێ تا نهێنییەکانی هەڵ بماڵ درێن؟!

لەناخی دڵمەوە بێجگە لەژیان هیچ شتێکی دیکەم خۆش ناوێ.. ئەوکاتەی چارەی ژیانم نەوێ پلەی ژیان خۆشویستنەکەم دەگاتە ئەو پەڕی. ئەگەر هات و بەرەو دانایی تەکانم داو هانام بۆ هێنا لەبەر ئەوەیە کەلەژیان یادکردنەوەی من دا ئەوزۆر پێ هەڵ دەبڕێ.

دانایی چاوی ژیان و زەردەخەنەی ژیانی هەیە.. بەڵکو تۆڕی زێڕینیشی هەیە. کەدانایم تا ئەم رادەیە لەژیان بچی دەبێ چی بکەم چیم بۆ بمێنێتەوە؟!

کاتێ ژیان لەبارەی دانایی‌یەوە لێی پرسیم، وەڵامم دایەوە، دانایی ئەوەیە کە مرۆڤ بەهەموو توانایەوە ئیشتیای دەکاو لێی تێر نابێ. بەچاو دەی قۆزێتەوە تالەودیو ڕووبەندەوە دەموچاوی دەردەکەوێ و بەگەوی تۆڕەکەی‌دا پەنجە رادەداو لەبارەی جوانی‌یەکەیەوە دەپرسێت و ناشزانێ ئەو جوانی‌یە چیە؟

لەگەڵ ئەوەشڕا پێشترین ماسی خۆی ناگرێ و بۆ چێشتەداو تەکان دەداو سەرسەختانە هەل دەبزورقێتەوە. زۆر جار داناییم دیوە لالێوی دەگەزی و قژی لێ بەردەدایەوە. کەئەمە ئاکاریەتی لەوانەیە فێڵبازو بەد بێ.. بەڵکو لەوانەیە ئاکار ژنانی بێ. تا زاتی خۆشی دانەشوات ئەوا ناگاتە ئەوپەڕی دڵ ڕاکێشان.

دوای ئەوەی لەبارەی دانایی‌یەوە بەژیانم راگەیاند بزەیەکی شەیتانی بەسەر لێودا رابووردو چاوی لێ وێك هێنان و گوتی:

((ئەوە باسی کێ دەکەی؟!.. لەوانەیە مەبەستت من بێ؟.. ئایە مرۆڤ- با ڕاستیش بێ- مافی ئەوەی هەیە کە ئەو هەموو شتانە بداتە ڕووی هەرکەسێك کەمەبەستی بێ؟

کەواتە کابرا! تۆ لەبارەی دانایی خۆتەوە دەڵێی‌چی؟ ئەوا لەلایەکەوە ژیانی خۆشەویست هەردووچاوی کردنەوە، لەلایەکی دیکەشەوە وام زانی بەچاڵ و زەندۆڵی زۆر قووڵدا رەهێڵ دەبمەوە))

ئەمە پێدا هەڵ دان و سروود چڕینی زارا بوو. هێشتا سەما دوایی نەهاتبوو.. کیژۆڵەکانیش لەبەرچاوم گوم نەبوو بوون خەمێکی قووڵ دای گرت و گوتی:

((ئەوا خۆر لای کردەوە.. مێرگ ئاونگی لێ نیشت.. دارستان بەکزەباوە کەوتە شنەشن. سەیرە! شتێکی نادیار، نەناسراو دەورەم دەداو چاوم لێ زەق دەکاتەوەو دەڵێ:

((ئەرێ زارا! هێشتا لەژیان دای؟.. لەپای چی زیندەی؟.. ئەم زیندەگانی‌یەی تۆ چ سوودێکی هەیە؟ گوایە مانەوەت لەژیان دا کارێکی شێتانە نیە؟وای بۆ خۆم! یاران: ئەوەی لەمن دا رازی دامەزراندووە شەوە وزەنگە.. داماویم لێ وەشارن.. بەرسنگی ئێوارەش بگرن‌و مەهێڵن پێم بگا.

زارا ئاوای گوت..

## سروودی گۆڕستان

ئائەوشوێنە دورگەی گۆڕستانە.. دوورگەی کشوماتە.. گڵکۆی لاوێتیشیم هەر لەوێ‌یە.. ئەوجا تاجە گوڵینەی نەمرایەتی بۆ ئەو گۆڕیچانە دەهێنم.

ئاوا لەگەڵ نەفسی خۆم دا رازم گرت‌و بڕیارم دا خۆم فڕێ بدەمە فەرتەنەوە!

ئای بۆ وێنەکانی لاوێتی.. بۆ تارمایی‌یە خەونەکانی لاوێتی.. ئای خۆزیم بەساتە نیگای ئاشقێنی!.. داخم ناچێ بۆ وردەکاتەکانی ژیانی خواوەندانە؟!

زوو بەزوو بەرەو نەمان هاتم.. وام لێ هات کەبیرەوەری‌یەکانت بهێنمەوە بەرچاو. دیسان خەیاڵاتی ئەو خۆشە ویستانەت بهێنمە بەرچاو کەبۆخۆیان ئارام گرتووی گۆڕستانن.

ئای ئازیزترین لەدەست چوو! سروەی بۆن خۆش لەلای تۆوە هەڵ دەکاو دڵەکەم فێنیک دەکاتەوەو فرمێسکم لەچاو دەبارێنێ.. سروەیەکەو دڵی ئەو تەنیا دەخاتەوە لێ دان کەبەسەر شەپۆلەکانەوە دێت‌و دەچێ. تەنیایەکم‌و وادەزانم لەهەموو کەس پتر شایانی شادیم.. ئەی یادگارینە! کارەکە وەهایە، چونکە رۆژێ لەرۆژان ئێوە بۆ من بوون‌و ئەوا منیش بەردەوام بۆ ئێوەم؛ کەواتە پێم بڵێن: ((زێڕینە میوەکانتان لەلقەکانیانەوە دەوەرنە سەرچی؟ ئەی رۆژگاری لاوێتی! بەردەوام کشتگای ئەو ئاشقێنی‌یەتم کەبەمیراتت خستووم‌و هەر بەیادی تۆ پەسند ئاراییم– دوای هەڵ بڕانی– بەرەنگی ئاڵوو واڵاوە بۆ خۆی نوورانی دەبێ.

بەداخەوە، ئەی رۆژگاری سیحرو جوانی! باشتر نەبوو کەلێم جیانەبنەوە؟.. وەك ئەو باڵندانەی کەوینو بەلای کەسێکەوەن متمانە بەخۆبێ ئاوا لەخۆمو حەزەکانم نزیك بوونایەوە. نەك بەچەشنی باڵندەی سرکو داوەڵ لیم تەوەلابن؟!

ئەی وردە کاتی لاوێتی! بەڵێ تۆش وەك من ئامادەبووی تاسەر بەڵێن نەشکێنی.. بۆشم نیە بەناپاك ناوت بهێنم؛ چونکە بەوردە کاتی خوادادم داناوی. ئەی وردە کات! زۆر بەپەلە راتکرد.. بەڵام هیچ کاممان لەدەست یەکدی رامان نەکردوە.. نەمنو نەتۆ هیچ کاممان بەرپسی نایاکی نین.

ئەی مەلی ئاواتەکانم! لەپێناو کوشتنی من دا تۆیان مراندو بویتە نیشانەی تیری بەد.. تابەخڵتانی خوێنەوە بگاتە دڵەکەم.. بەڵێ تیری چڵکن هاتو جێگای کوشندەی پێکام.. چونکە تۆ بەلای منەوە ئازیزترین شتی.. بەڵکو سەرجەمی سامانم بووی.. سەبارەت بەوە لەساوایی تۆدا بڕیاری پووکانەوەم درا.. لەپێش وادەی تۆدا بڕیاری نەمانم درا.

لەو کاتەدا تیرەباران کرای لەئاوریشم نەرمتر بوویو زەبوونتریش بووی لەو زەردەخەنەیەی کەتیلەی ستەمکار دەی سڕێتەوە! هەرچی دەیڵێم با دوژمنەکانم گوێیان لێی بێ تاوانی کوشتن لەوکەتنەی دەرهەق بەمنتان کرد سووکترە.شتێکتان لێ زەوت کردم کەناتوانم بەهیچ شتێکی دیکە جێگەی بگرمەوە. دوژمنەکان! ئەواپێتان دەڵێم: ئەرێ هەر ئێوە نەبوون خەونەکانی لاوێتیمتان سەربڕین؟ ئەی هەر ئێوە نەبوون خۆتان کردە کۆسپی کارە- سەراسا (معجزات) کانم؟! بیرو بیرەوەریتان لێ زەوت کردم.. ئێستاش ئەوە تام تاجە گوڵ بۆ یادی ئەو زەوت کراوەم هەڵ دەگرم.. ئەی دوژمنەکان! بۆ ئێوەش باری نەفرینم هاوردووە.. چۆن دەنگێك لەشەختە بەنداناو لەئەنگوستە چاودا دەخنکێ ئاواش ماوەی نەمرایەتیمان بڕیو خنکاند. هەر ئەوەندەم دەسەڵات هەبوو کە لە چاوتروکانێك دا سەرنجێکی ئەو نەمرایەتییە بدەم؛ چونکە هێندەی چاوبنێنە سەر یەك ئاوابوو.

ساتی خۆی هاتو پاکێتیم بەگوێیدا چپاندم:

پێویستە هەموو بوونەوەرێك خوایانە بێ. ئەی رۆژگاری لاوێتیم! تۆش تارماییە بۆژۆکانت بۆ ناردووم، ئەو مبارەکە رابوورد. پەندی لاوێتیش هاتو پێی گوتم: ((بەلای منەوە پێویستە هەمو رۆژانێك پیرۆزبن)) هەبێو نەبێ ئەو قسەیە زادەی ئەو پەندە خۆشکیلەیە. ئەی دوژمنەکان! سەرەنجام هاتنو شەوگاری

ئاسودەییتان کردە پەژارەو خەو زران. ئەدی پەندە خۆشکیلانەکە چی لێهات و لەکوێ خۆی شاردەوە؟!

لەوەبەر چاوەڕوانی بەختیاری بووم کەچی بایەقوشی بەدو وسامناکتان ناردە سەر ڕێگام و ئاواتەکانم لەناوچوون.

ڕۆژێکیان نەزرم کرد کەلەهەموو ڕق و پێناخۆش بوونێك بگەڕێمەوە کەچی هەرچی لەدەورم بوو بیمارتان کرد؛ کەواتە سەرگەردی پاك و ڕزگار کەری من بۆ کوێ چوو؟!

بەکوێری ڕێگای بەختیاریم گرتە بەر.. کەچی لەرێگای کوێرەدا کۆمەڵێك چقڵو چەوێڵتان فڕێدا. وام لێهات ڕقم لەو کۆنە ڕێگایە ببێتەوە کەدەستم بۆ دەکوتا. ئەو کاتەی توانیم گرانترین کارم بەجێبهێنم. . ئەوکاتەی توانیم بەبۆنەی زاڵ بوونم بەسەر زاتی خۆم دا بیکەمە ئاهەنگی سەرکەوتن– ئێوە لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەم ڕا هەستان و دۆستەکانی منتان نیگەران کردن و دەنەتان دان بیکەنە هەڵلاو بەگلەیییەوە پێم بڵێن: گوایە من ئەو خۆشەویستانەم تووشی ئێش و ئازاری سەخت کردوون. ڕاستیەکەی ئێوە باشترین کارەکەرە هەنگتان لەکۆڵەسی من ئاوارە کرد و پاڵفتە هەنگوینەکەشتان لێ کردمە ژەقنەمووت ئای کە سواڵکەری چەتوونتان کردن بەگژ خێرەومەندی من دا. تەنانەت پاڵتان نابەزبرە مەردومەکانیشەوە سەرەڕای نالەبارییان بێن و گەمارۆی میهرەبانی‌یەکەم بدەن. پەسندایەتی من بەئیمانەوە خۆداری کرد.. کەچی وەهایش خۆتان لێ بەمەرام گەیاند!

چەندە پیرۆزترین شتی خۆم بکردایەتە سوتگەی قوربانی ئێوە لەکەوڵی تەقوادا بۆ سوتاندنی قەڵەوترین قوربانیتان دەکەوتنە پەلە پەل؛ تاوەکو بۆ چڕوکی پیوەکەی حەوا کەوێ و کام شتی هەرە پیرۆزە تێیەوە گلێ و دژوێنی بکا. ڕۆژێکیان بەتەمابووم بکەومە سەماو هونەری سەماکەشم بۆ ئەودیو حەوت تەبەقەی ئاسمان بڵندبکەمەوە، کەچی سەرتان لەباشترین گۆرانیبێژم تێك دا؛ ئەوجا زۆر ناقۆلایانە لاوژاندی و قیڕاندی و بەئاهەنگە کەڕەنای ماتەمینی گوێی گوتامەوە.

ئەی سروود بێژی پاکیزە! هەر ئەوەندە بوویتە دارستی ستەم، بوویتە بکوژ.. لەوکاتەدا خۆم ئامادەکرد کەجوانترین سەمای خۆم بکەم، ئاوازەکانت نەوازش و نەرمونیانییان بڕیم. تا بەسەماوە سووڕ نەخۆم نابمە ئەو کەسەی مانا بەرزەکان بەهێما لێبداتەوە.. ئەندامەکانیشم ناتوانن بەجموجووڵی خۆیان وێنەی نایابترین هێما

بکێشن.. ئیدی بانهێنی پۆشی ئاواتەکانمبمو یەکالایان نەکەمەوە. خەونەکانی لاوێتیم مردوون و مانای پرسە باریشیان نەماوە.

من سەرسامم؛ چۆن بەرگەی ئەو هەموو زەبرانەم گرتووە!

من سەرسامم؛ چۆن بەو هەموو برینانەی کە دەمیان کردۆتەوە ئۆقرەم گرتووە؟!.. کەواتە گیانەکەی من چۆن چۆنی لەم گۆڕستانەوە دەبووژێتەوەو دەژێتەوە؟!

بەڵی لەمن دا شتێك هەیە کەتیر جێ کوشندەی ناپێکێ.. کەسیش لە وزەی دا نیە بیخاتە گۆڕەوە، هێندە بەتەوژمە جی بەتاشەبەردەکان لەق دەکاو بەیەکیان دا دەهاڕێ، ئەو شتەی بریتییە لە ((ویست)ی خۆم، ویستێکەو گۆڕانی بۆنیە، بێ چرپەو هەرا تێ دەپەڕێ.. ویستی من دێرینەو کول نابێ، گوڕ ئەدا بەقاچمو.. هەر دەڕۆم، هێزێکی بالایەو هێندە سەختە لەناو ناچێ!.. ویستێکەو بەکشوماتی بەقۆناغەکانی ساڵەهای ساڵ دا تێ پەڕدەکا.

ئەندامەکانی لەشم سەرجەم پێکراون و کوڵەوارن تەنیا پێم نەبێ کە ئەو ویستە خۆگرە نەگۆڕە سەختە تینی وەبەردا دێنی و بەزرمەوە گۆڕەکانی هەڵ دەتەکێنی و بێ ئۆقرە لە هیچ گۆڕیچکەیەکدا خۆی درێژ ناکاو راناکشێ.

ئەی ویستی خۆم! ئەگەر خۆگر هەبێ تەنیا هەر تۆی... ئەو خۆگرەیەکە رۆژانی لاوێتی بەربادی ناکەن.. لەگەڵ تێپەڕبوونی خۆیان دا بەردەوام لاوچاکە.. زیندەیە.. پڕ ئاواتە، لەسەر ئێسك و پلوسکی ئەو گۆڕانە دادەنیشێ کەبەزەردە ماچی زەمانەوە شەقڵ بوون. ئەی ویستی خۆم بەردەوام گۆڕەکان هەڵ دەتەکێنی.. کەواتە درووود بۆ تۆ ئەی ویستەکەی لەمەڕ خۆم؛ چونکە لەکوێ گۆڕستان هەبێ لەوێ ژیانەوە نیە.

زارا ئاوا گوت...

## بەسەر (خۆ)دا سەرکەوتن

ئەی داناکان! لەباوی ئێوەدا ڕاست ویستن هەر ئەو هێزەیە کەپاڵتان پێوەدەنێ و تێزەتان دەدا، هەر ئەو ویستەیە کەلەلای خۆمەوە بە (ویستی هێنانەبەرچاوی هەبوون)) ناوی دەبەم. ئێوە دەتانەوێ گشت هەبوویەك بخەنە ژێر رکێفی رامانی خۆتان، بەڕاستی ئێوە سڵ لەوەش ناکەنەوە کە ئەو (هەبوون)ە- لەبەرچاوگیرابێ،

واتە لەوەو بەرکەوتبێتە بەر ڕامانەوە، ئیدی گەرەکتانە هەموو بوونەوەرێك مل کەچی ویستی خۆتانی بکەن.. تا بەزاڵ بوونەوە لەمشتومالّی بدەنو ببێتە ئاوێنەیەكو وێنەی هۆش بەسەریەوە ڕەنگ بداتەوە. ئەی دانایانی فرە دانا ئەمەی خرایە ڕوو بەرتەمای ئێوەیە.. ئەوە ویستی ئێوەیە بەرانبەر هێزی خێرو شەڕو هەڵ سەنگاندنی بەهاو نرخی شتەکان.

ئێوە دروست بوونی جیهانێکتان دەوێ کەلەبەر دەمیدا بەچۆك دابێن، ئەمەش ئەو پەڕی کەیفو دواین ئاواتتانە. بەڵام ئەو ساویلکانەی پێیان دەبێژن -گەل- لەڕووبارێك دەچن بەزۆر کەشتییەك خۆی تێ فڕێ بداو دەستوورو یاساکان بگرێ بەکۆڵییەوە.. ئەوجا هەمان دەستوورو باو بەفیزێکەوە بەسەر یەوە ڕۆنیشنو ڕووبەند لەسەر دەموچاویان دابدەنەوە.

ئێوە ویستو باوی خۆتان ناردوونەتە سەر ڕووباری زەمانە.. بەڵام خواستی هێز هاتە بەرچاومو ڕاستی ئەو چاکەو خراپەیەی بۆ وەدەرخستم کە پەچنیوەی باوەڕی گەلانە.

ئەرێ دانایان! جگە لەئێوە بەویستی کێ ئەو دەستوورو باوە داسەپێنراون؟ بەویستی ئێوە نەبێ کێ بەخشڵو گەوهەر ئارایشتی کردوونو بەنیشانەو ناوی نایاب ڕەنگی کردوون؟ ڕووبار دادەپەڕێو دەستوورو باوی لەگەڵ خۆی هەڵ گرتوون.. لووتی کەشتییەکەش دڕ بەشەپۆلەکان دەدا.. کێ دڵ ئەداتە شەپۆڵو کڵەو کە لە بەربەرەکانیی بێ هوودەدا کردوویانەتە کەف چڕێن؟

ئەی دانایان! ئەو مەترسییەی هەڕەشە لەچاکەو خراپەتان دەکا لەڕووبارەکەدا خۆی حەشارنادا، بەڵکو تێکڕای مەترسییەکە لەخودی ویستی هێزدایە، چونکە هەر خۆیەتی ویستی هەمیشە زیندەو داهێنەر.

هەرچییەکی بیڵێم لەبارەی ژیانو زیندەگانییەوە، دەبێتە ڕوون کەرەوەی باوەڕم لەڕووی چاکەو خراپەوە. کاتێ بەبیرسای خۆم دێمە سەر ئەوەی کەنەریتگەل چ کارێك لەزیندەوەردا دەکا مەسەلەکە یەکالادەبێ. کەزیندەبوو(کائن حی) بەگوزەرگانی خۆیدا تێ دەپەڕی هاوشان ڕەگەڵی کەوتم؛ تاشارەزای نەریتەکانی بم، کەزانیم ژیان کڕو ماتە ئاوێنەیەکی هەزار لام لەبەردەم دا هەڵنا تاچاوەکانی بهێنمە زمان، ئەوجا بەچاوتروکان لەتەکما کەوتە گفتو دوان.

لەهەرڕێگاو بانێك دا لەزیندەیەك هەڵەنگوتبم وشەکانی (گوێڕایەڵی، بەرفرمانی..) گوێیان ڕەقاندوومەتەوە، هیچ زیندە یەك نیە خۆی لەمل کەچی بەرزتر رابگری. شارەزای ئەوەش بووم کەلەژیان دا ئەو کەسە بەرفرمانە کە ناتوانێ گوێڕایەڵی نەفسی خۆی بێ.. ئەمە نەریتی هەموو زیندەیەکەو ئیدی لێی دەرناچێ..ئەوەی لەم دوایی‌یەدا بیستم ئەمەیە:

فەرمانداری گرانترە لە فەرمانبەری‌و. گوێڕایەڵی، چونکە هەرچی بار قورسی مل کەچەکانە دەکەوێتە سەر شانی فەرماندارەکەیان‌و زۆرجاریش بەو بارگرانیە شان‌و ملی فەرماندارەکە جدەو دەبێ.

لەهەموو فەرمانێك دا جەربەزایەتی‌و مەترسی هەیە؛ زیندە چەند جار فەرمانێك دەربکا ئەوەندە جاریش خۆی دەخاتە ئەنگێزو مەترسی‌یەوە. هەرکاتێ زیندە لە نەفسی خۆی‌دا فەرمانی داسەپاند مانای وایە سەرانەیەك ئەدا بەدەسەڵاتی خۆی.. یان بڵێین سەرانەیەك بۆ دەسەڵاتی خۆی دەژمێرێ، چونکە دەبێتە دادوەرو بەجێ هێن‌و سەرگەردی ئەو یاساو دەستوورانەی خۆی دای دەنێ.

دەربارەی هۆکارو ئەو هێزەی کە زیندە ناچاری پێ‌ملی‌و فەرمان سەپاندن دەکا زۆرم پرسیوەتەوە.. تەنانەت کە ئەو هێزە وا زیندە دەکا لەگەرمەی حوکم داری‌دا بەرفەرمان‌و مل کەچ بێ.. ئیدی گەیشتوومەتە ناخی دڵی ژیانەوە. ئەوجا – داناکان! هەرئەوەیە کە گوێ بۆ گوتەکەم رابگرن!

بەراستی دڵنیابووم کەویستی هێز لەهەموو زیندەیەك دا هەیە.. زانیشم کەخودی مل کەچەکان بەتەمای سەردارین؛ چونکە لەویستی مل کەچ دا بنەمای ((سەردارێتی بەهێز لەسەر بێ هێزە)) هەیە. کەواتە ویستی مل کەچیش بەتەمای سەرداری‌یە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کەسێکی لەخۆی زەبوونتر دا بسەپێنێ.. هەر ئەم خۆشایەتی‌یە تاکانەیەی بۆ ماوەتەوەو دەست بەرداریشی نابێ.

لەبەر ئەوەی کەزەبوون دەبێتە بەی دەستی بەهێزترو ئەویش بەوە دەنازێ کەسەرداره بەسەر زەبوونەوە. ئەوا بەهێز ترە کە لەپێناوی هێزو دەسەڵاتەکەی‌دا مەترسی‌یەکانی ژیان دەکاتە نیشان کردو خۆیان تێ فڕێ دەدا. ویستی هێز شاراوەیەکە تەنانەت لەبواری خۆ بەخت کردن‌و خزمەتی دوولانەو چاوبازیی دڵدارانیش دا ، لەبەرئەوەیە کەزەبوون ڕوودەکاتە پێچەڕێگاکان بەو مەبەستەی

بەقـەڵادا تێپـەڕێو چـوار مەشـقی لـەدڵی بـەهێزتردا ڕۆنیشـێو دەسـتیش بەسـەر هێزەکەیدا بگرێ.

ژیان نهێنی خۆی پێ سپاردمو گوتی:-

چارنیـە دەبـێ هەمیشـە بەسـەر نەفسـی خـۆم دا بـاڵابم، ئێـوەش وادەزانـن ئـەو خۆتـەکان دانـە ویسـتێکی خـۆ داهێنـە یـان غـەریزەو ڕەمەکێکـە پـاڵم پێوەدەنـێ بـۆ ئامانجێکی باڵاترو دوورتـر لـەوەی دەستیبەسـەردا بگـا.. لـەکاتێك دا بێجگـە لەیـەك بەریانو لەیەك نهێنی هیچی دیکە لەگۆڕێ نین. منیش (نەبوون)م لەهەڵ چەرخانەوەی ئەو تاکەتییە پێ پەسەندترە.

ڕاستییەکەی لەهـەر کوێیـەك بینیتـان ئـەوا گـەڵای دارە گـەورەکان بەردەبنـەوە، ئەوسا بەچاوی خۆتان دەی بینین کەلە پێناو هێزدا ژیان خۆی بەخت دەکا.

پێویستە لەسەرم کەببمە ڕەنجدەرو دوا ڕۆژو ئامانج، لەهەمان کاتیش دا هەرخۆم ببمە تەگەرە لەنێوان خۆمو ئەو ئامانجەی- تەکانی بۆ ئەدەم.. لەبەر ئەمەشە کەمرۆڤ شارەزای ئەو پێچە ڕێیە نابێ کەلەبەریدا پێی دابڕاوە، چونکە دەرکی بەڕاستێتی ویستی من نەکردووە.

ئەوشتەی دەی خوڵقێنم هەرچۆنێك بێ.. ئەو شتەی بەعەزرەتییەوەم هەرچۆنێك بێ- پێویستە لێی بەرگەشتەبمو لـەو پـەرۆش خۆشویستنەشـم هـەڵ بگەڕێمـەوە.. ئەمەش سەرنویشتێکەو خواستی خۆم بڕیاری لەسەرداوە.

ئەو کەسەی بەخواستی ژیان دەمی خۆی هەڵ هێنابێتەوە تووشی ڕاستی نەبووە. چونکەویستی وەها نەبووە. (نەبوون)یش بێویستی ئیرادەیە.. هـەروەك ئـەو کەسـەی بەژیانەوەدەنازێو ڕای دەبوێرێ کەچی بۆی نالوێ داوای ژیان بکا!

ژیـان لـەکوێ وەدەرکـەوێ ویسـتیش لەوێیـە. وێـڕای ئـەوەش مـن داوای ویسـتی هێزدەکەمو داوای ویستی ژیان ناکەم.

شتی زۆر لـەگۆڕێدا هـەن کەبەلای زینـدەوە لـە خـودی ژیـان بـاڵاترن.. خـۆ ئەگـەر ویستی هێز لەکایەدا نەبێشتی چاکتر لەژیانی ناکەوێتە بەرچاو. ڕۆژێ لـەرۆژان ژیـان ئـەوەی فێرکردووم. منیـش ئـەی دانایـان! بـەم فێرکردنـە پـەردە لەسـەر نهێنییـەکانی دڵتـان هـەڵ دەماڵم.. ئـەوجا پێتـان دەڵێـم: نەچاکـەی هەمیشـەو نەخراپـەی هەمیشـە

لەگۆڕێدا نین؛ چونکە پێویستە بەبێ وچان چاکەو خراپە هەردووکیان بۆ بڵندانی تەکان بدەن.

ئێوەش ئەی نرخ بڕان!.. ئەی دەم تێوەردانی چاکەو خراپەبێت و ئیرادەی هێزتان نەبوایە ئایە دەتان توانی کێش و پێوانەی خۆتانیان لێ بخەنەکار؟.. کەلەناخی دەروونتانەوە تەمادارن ئەوە لەپێناو ناوبانگ و هەست بەکاریگەر بوونتان و گیان هەڵچووەنتانە. ئێوە نافامن کە ئەو شتانەی ئەیخەنە بەرخەملی خۆتان هێزو پێزێکتان تێدایە لەو هەڵسەنگاندنەی ئێوە گەورەترەو لەنەشونمادایەو بەسەر زاتی خۆیدا بالآدەبێ.. بەڕادەیەك قۆزاخەی خۆی شەق دەکاو لەتوێکڵی خۆی دەردەچێ.. ئەوجا ئەوکەسەی گەرەکیەتی داهێنی چاکە یان خراپە بێ پێویستە ئەوەی لەمەوپێش مەزندەی کردووە بی رووخێنێ و تێکی بدا. ئابەو چەشنە دەردەکەوێ گەورەترین خراپە بەشێکە لەگەورەترین چاکە. بەڵام ئەم چاکەیەش ئەوەندەت مۆڵەت دەدا، دەرکی پێ بکەی کەداهێن و خولقێنەرەکان زەفەری پێ دەبەن.

هەرچۆنێ بێ دەشێ ئاشکرای بکەین. کارەکە سەختەو هەموو کارێکی گرانیش تینمان دەخاتە بەرێ.. هەر راستییەك پەنهان بدرێ ئەوا دەگۆڕێ و تێمان دا دەبێتە ژەهری کوشندە. ئەو راستی گەلەی ئاشکرایان دەکەین ئەوەندێکی بتوانین لێیان تێکومەکان ئەدەین؛ چونکە خانو بەرەی زۆر لەگۆڕێن و پێویستە بەرزیان بکەینەوە.

زارا ئاوای گوت..

## گەورە مەزن

من دەریایەکم تێدا گێژ دەخواتەوە قولاییەکانی هێور بوونەتەوە، کێ بەگومانە کە ئەو بیچم سزو رمووزنانە پەنادەدا پیشەو خویان هەر گاڵتەوگەپە؟! بناوانەکانم خۆڕاگرن و دانا ڕوخێن بەڵام بەشەپۆلی بێڕەزاوە کەفچڕێن دەکەن و بەحیلکە وەڵام و پێکەنین دەی کەنە سەداو ئاهەنگ. ئەمڕۆ کابرایەکم لەو گەورە پیاوانەی کەلە بەرخاتری (گیان) ئێزا (کفارة) دەدەن چاو پێکەوت. گیانی منیش هێندە گاڵتەی بەو ناشرینەهات لەپێکەنین دا نوقم بوو.. بەڵام ئەو گەورەیە دەرنەکەوتەوە.. هەر ئەوەندە

بوو تاھەناسەی ئاسوودە بداتەوە سنگی خۆی پف ھەڵدا، ئەوجا بەراستینە ترسێنەکانی‌یەوەو جلە شندڕەکانیەوە لقە دڕکاوی‌یەکی بی گوڵم بۆ دەرکەوت.

ئەو راوچیە نەفێرە پێکەنین بووەو نەشارەزایی حاڵ بووە، بەدەمووچاوی تۆزنەوە لەجەنگەڵی زانیاری‌یەوە گەڕاوەتەوە. دوای ئەوەی لەوێ لەگەڵ جانەوەرەکان دا کەوتووەتە زۆران و گەوزان.. ئەوجا وێنەی ئەو جانەوەرانەی بەرووخسارەوە شەقڵ بووە. ئەوەتا وەك پڵنگ وزاق بەخۆی ئەدا؛ بەش بەخۆم ئەوجۆرە گیانانەم خۆش ناوێن کەبەسەر پەچنیوی خۆیانەوە کرژدەبنەوە.

برادەرینە! ئێوە دەڵێن دەمەقاڵێ لەسەر وازو جۆرە رەنگەکان نیە. بەم گفتەتان پێ دەچێ ئێوە نەزانن کە سەرتاپای زیندەگانی خەباتێکە لەبەرخاتری وازو ڕەنگەکان. چێژو واز(زوق) بریتی‌یە لە ھاوسەنگ+ تەرازوو+ تەرازووباز. دەئەوجا وای بۆ ئەوکەسەی دەیەوێ بژیو نەشکەوێتە خەباتەوە لەپێناو ھاوسەنگەکان و تەرازووەکان و تەرازووبازەکان دا!

خۆزگە ئەو کابرا گەورەیە لەمەزنایەتی خۆی‌دا ماندوودەبوو تاوەکو جوانی تێدا دەربکەوتایە. لەبەر ئەوەی کەبەدەست گەورایەتی خۆیەوە رەنجوورو بێ زارە شیانی ئەوەیە کە لێی بچێژم و بزانم تامی چیە؟!

ئەگەر گەورە لەخۆی دا نەگۆڕێ ئەوا ناتوانێ بەسەر ئەندێشەی خۆیەوە بازبدا تاوەکو بەتیشکە خۆری لەمەڕ خۆی داپۆشرێ.. ئەو مەزنە لەپێناو گیان دا ئێزای داو بۆ ماوەیەکی زۆر سێبەراو سێبەری کرد.. دەموچاوەکانی مۆن بوون.. ھەڵ بزرکان. لەوانەش بوو لەچاوەڕوانی دا لەبرسان بمرێ. ئەوەتا چاوەکانی سووکایەتی‌یان لێ دەردەچێ.. لچولێوی ھەڵ قرچاندوون و ئێستاکە منەی ئاسوودەبوون دەکا. بەلاّم ھێشتا لەژێر خۆردا بۆی پاڵ نەکەوتووە.

خۆزگە ئەو کابرایە دەچووە کەوڵی گاجووتەوە؛ ئەوسا لە بەختیاریی ئەوڕا بەرامەی زەوی بلأودەبۆوە نەوەك سووکایەتی زەوی.. خۆزگە وەك گای سپی لەپێش ھەوجارەوە تۆزی دەکرد؛ ئەوسا بەگابۆڕەوە درروودی خۆی پێش کەش بەزەوی‌و ئەوەی لەسەر زەوی‌یە دەکرد!

ئەو گەورەیە ھێندە چەمۆڵاسا بەدەستەکانی چڕوچاوی خۆی شاردوونەتەوەو سێبەرە دەست یاری بەلاجانگەکانی کردووە ڕووی گرژو مۆن بووە. کارەکانیشی وەك

ئەندێشــە دەردەکــەون و کــردەوەی پێــوە دیارنیــە. بێــت و کارگــەر بەســەرکارەکەی‌دا سەرکەوتوونەبێ ئەوا سێبەرەدەستێکی نووتەك ڕووخساری شەقڵ دەکا.

بەلامــەوە کەئــەو کابرایــە بەرگــەی نــیرەی گــاجووت دەگــرێ مــافی ڕێــزی هەیــە. ئاواتەخوازیشم نیگای فریشتە ئاسا لەچاوەکانیەوە تیشك بدەنەوە، ئەو نیگایانەشی هـەرگیز ناورنگێنـەوە تاوەکو ویسـتی پاڵەوانـەکان لـەبیرخۆی نەباتـەوە؛ چونکـە مـن ئەوەم لێ دەوێ ببێتـە پیاوی باڵا نەوەك لەپلـەی گـەورە پیاودا بمێنێتـەوە کـە مـرۆڤ لەوحەلەدا ویستی خۆی لەکیس دەچێ و هەرکزەبایەك بێ ئەنگێوێ یاری پێ دەکا.

ئـەو مەزنـە بەسـەر زەبـر بەدەسـتەکان دا زاڵ بـووەو بـەوە ڕاگەیشـت هێماکـان شـی بکاتـەوە.. بـەڵام ئێستاکە لەسـەریەتی زەبـر بەدەسـتەکان و هێماکـانیش قوتاربکـا تـا هەڵیان دەچەرخێنێتەوە دەیان گۆڕێ بۆ دۆخی ساوایەتی خوایانە.

زانیـاری ئـەو کـابرا مەزنـە نـەفێری زەردەخەنـەبووەو نـە لـە زرگنـی تەکیوەتـەوە.. دیسـان شـەپۆلی هـەوەس پەرستانەشـی لـەدەریای جوانـی‌دا– دانەمرکاوەتـەوە.. پـی ویست ناکا ئەو حەزو شەهوەتەی تارادەی تەسەل بوون تاوبدا.. بەڵکو لەسـەریەتی حـەزەکانی لـەجوانی‌دا نوقـم بکـا، چونکـە حاڵـەتی ناسـکێتی لـەئاکار پەسـندی ئـەو کەسانە جیا نابێتـەوە کـە بەهۆی تێ فکرینـەوە گەیشـتوونەتە چڵـە پۆپـەو لووتکـە. پاڵەوان تا لەپێناو باڵابوون بەسەر ئاسوودەبوونی‌دا دەستی نەخستبێتە بان سەری نابێ تەسلیمی حەسانەوە بێ. دەرك پێ کردنی جوانـی بـەلای پاڵەوانـەوە کـارێکی سەختە؛ چونکە جوانی خۆی نادا بەدەست زەلامە چەتوونەکانەوە.

نێوانی پێ‌لێ هەڵ برین و پێ لێ داگرتن قرێ قامکێکەو بە سووکیش مەی نۆڕنێ.. هەرچـەندە ماوەکـە کورتـە کـەچی دووروگرنگـە.. بـەڵام ماسـولکە گـەلی مەزنـەکان نەهێوردەبنـەوەو نەخواستیان وشکایی‌دێ. جوانی لەوەدایە کە زەبرو هـێز لـەپێناو میهرەبانی‌دا دابەزێ و کۆڵبداو لەباتی ئەوە لەشتی بەرچاودا خۆی شی بکاتەوە.

ئەی گەورەی بەتوانا

لەبێجگەی تۆدا میهرەبانیم ناوێ.. بامیهرەبانی‌یەکەش ئەودوا قۆناغەبێ کەبەسەر زاتی خۆتدا سەردەکەوێ.. ئەگەر نەم زانی‌بایە لەهەموو پرکێشی و بەدکاری‌یەك دا بە دەستوبردی هەرگیز چاکەم بەسەردا نەدەسەپاندی. زۆر جار کەئەو گەداو گەلۆرانە خۆیان بەمیهرەبان داوەتە قەڵەم پێکەنینم پێیان هاتووە، ئیدی دەستە پاچەو بێ‌تین و

توانا کەوتوونەتە گۆڕێ. دەبێ پەسندایەتی خۆت نموونە پەسندایەتی ئەو ستوونانەبێ کەتاچەندە بەرزەوە بن پتر بەهاو بەژن ڕێکیو پتەوییان پێوە نمایانو ئاشکرایە.

بەڵێ ئەی پیاوە گەورەکە !

ڕۆژێك دێ کەبەجوانی بگەیو ئاوێنەی بالأنما لەبەردەم خۆتا هەڵ بنێو تێر تێر بەجوانی خۆت بنازیو خەنی بی.. ئەوسا گیانیشت حەزو وازی تێ دەگەڕێو لەبایی بوونتا بەندایەتیو پەرستن ئاشکرا دەبن. پاڵەوان لەخەونی خۆی دا لە پلەوپایەی پاڵەوانی کامڵ نزیك نابێتەوە تاخۆی لەگیان نەبانو گێل نەکا.

زارا ئاوای گوت...

## لەوڵاتی شارستانەتیدا

بەئاسمانی (ئایندە)دا باڵم گرتەوەو بۆ دوور ڕۆیشتم، کاتێ بەدەورو بەری خۆم دا ڕوانیم ترسم لێنیشت؛ چونکە بێجگە لەزەمانە شتێکی کەم نەدی لە سەرێنی من دابێ.. خێرا پشتم هەڵ کرد تاگەیشتمە ئێوە.. ئێوەی پیاوانی ئەمڕۆ.. لەوڵاتی شارستانەتیداو لەنێو ئێوە دابەزیمو دڵ پاکانە یەکەم سەرنجی خۆمم دانێ؛ چونکە بەدڵ شکاوییەوە هاتمە لاتان.. ناشزانم سەرەڕای سام لێ نیشتنم چی منی هێنایە پێکەنین.. لەمەوبەر دیدەکانم ئەو جۆرە خەتو ئاڵو والأیانەیان نەدیون!؟

من هەر پێدەکەنمو قاچیشم قاپەنگێویان دەکردو دڵم دادەچڵەکێو لەبەر خۆمەوە گوتم: ((دەبێ ئێرە فابریقەی هەوری ڕەنگاو ڕەنگ بێ؟!))

پیاوانی ئەمڕۆ! ئێوە لەبەردەمم قوت بوونەوەو دەموچاویشتان دەیان جۆر ڕەنگ دەبەشنەوە.. دەیان ئاوێنەش لەدەوروبەرتانەوە ڕەنگەکانتان شەپۆلیان تێدا دەدەنەوە..

بەڕاستی ئێوە ناتوانن ڕووپۆشێکی سەیرتر لەخودی دەموچاوەکەی لەمەڕخۆتان بەولاوە پەیدابکەن؛ کەواتە دەبێ کێ بزانێ ئێوە کێن؟

رابووردوو مۆری پاشماوەی خۆی ناوە بەدەموچاوی هەموانتانەوە ئەوجا ئاسەواری تازەشتان خستوونەتە بان. لەبەر ئەوەی هێندە راستیتان پەنهانە هەرچی دەربڕین و ڕەوانبێژی‌یە تێیدا کۆڵەوارە.

ئەگەر هات و یەکێك گەرەکی بێ دەست لەهەناوتان وەربدا ئایە دەتوانن بی سەلمێنن کەئێوە هەناوتان هەیە، لەگەڵ ئەوەش ڕا کەئێوە تەنیا پێخۆیەکن لەخاشاك و کەڕەگەڵای بەیەك دا لکاو؟

ئەوە رۆژگارو ئەوەش گەلان کەچۆن تەك ئەدەن لەودیو ڕوو بەندەکانتانەوە سەرنجتان بدەنێ.. هەر وەکو بزووتنەوەکانتان سەرجەمی نەریتەکانتان وەدەرخەن. ئەوجا ئەگەر رووبەندەکانتان داماڵدرێن و کۆڵەکانتان فڕێ بدرێن و ڕەنگەکانتان بسڕێنەوەو لەجموجووڵ بوەستێن ئەوا دەبنە دێوجامەی باڵندە ڕەوێن.

لەراستی‌دا من پەلەوەرێکی تاساوم؛ چونکی رۆژێکیان ئێوەم بەڕووتی دی و هیچ رەنگێکیش دای نەپۆشی بوون. ئیدی لەورا ترسم لێ‌نیشت.. تەنانەت لەوکاتەدا کەوەك ئێسکە پەیکەر لەبەردەمم دا قنج بوونەوەو هێمای ئاشقانەتان بۆ ئەکردم.

من وام بەلاوە پەسندە کەمجێوری دۆزەخ و خزمەتچی تارمایی‌یەکان بم، چونکە دۆزەخ نشینەکانیش کەسایەتی‌یەکی دیاری کراویان نیە. پیاوانی ئەمڕۆ ! ئەوەی لەشانم گرانە ئەوەیە کە سەرنجیان دەدەمێ.. ئەوجا کەیفی خۆیەتی رووتوقووت بن یان پۆشتەو پەرداخت بن.

ئەوەی لەزەمانی ئایندەدا- دەبێتە هۆی پەژارەو ئەوەی لەڕابووردووش دا باڵندە سەر لێ شێواوەکانی ترساند هەر ئەوەیە کە دەیەوێ لەبارەی راستیتانەوە مایەی دڵنیایی. بێ. چونکە ئەوەتانێ خۆتان دەڵێن: ((ئێمە ئەو راستی‌یە رووتەین لەهەموو پڕو پووچ و باوەڕێك بە دورین)) ئا بەم چەشنە فیشاڵ دەکەن و بەبێ ئەوەی دەفەی سنگتان هەبێ خۆتان بۆهەڵ ئەدەن!

ئێوە کەبەهەموو رەنگاوەری و زەمانە خۆتان نەخشاندووە ئایە هیچ باوەڕێکتان هەیە؟.. گوایە ئێوە بەتاڵ کەرەوەی خودی باوەڕنین هەڵوەشێنەوەی هەموو بیروتێ فکرینێك نین؟.. ئێوە کە خۆتان ناوناوە پیاو گەلێ راستی و دروستی تەنیا بوونەوەری دڕدۆنگ و ئەندێشەوارن.

هەموو چاخەکان لەبیرکردنەوی ئێوەدا– دەستەو یەخە راست بوونەتەوە. ئەو سەردەمانە بەهەموو خەون و وڕێنەیانەوە– بەچاوبیرکردنەوەتانەوە– لەڕاستییەوە نزیکترن.. وێرای ئەوەش کەئێوە گوێ قولاغن.

تووشی نەزۆکی بوون و ئیمان و باوەڕتان لەدەست داوە، بەرلەئێوە داهێن خاوەنی ئەستێرەو خەونەکانی خۆی بووەو توند باوەڕی خۆی راگرتووە

ئێوە چەند دەروازەیەکن کەوتوونەتە سەر گازی پشت، راستیتان هەر ئەوەیە کە بەدەمتانەوەیە:

((هەموو شتێك هەر شایستەی نەمانە)).

بەنەزۆکییەوە گیرتان خواردووە؛ بۆیە وەك ئێسکە پەیکەر لەبەردەمم دا قوت دەبنەوە، بێگومان زۆر بەشتان بەلایەوە شاراوە نەبووە کەدەی پرسی: ((دەشێ لەوکاتەدا کەمن نووستبووم خواوەند شتێکی لێ فڕاندم؟ بەڕاستی ئەوەی لێی فڕاندووم بەشی دروست کردنی ئافرەتێك دەکاو پەراسووەکانیشی لاواز نەکردووم)).
ژمارەیەکی زۆر لەپیاوانی ئەم زەمانە ئاوادەڵێن.

ئەی پیاوینە! بارودۆختان دەم هێنێتە پێکەنین.. پتر بەئەوەش پێکەنینم دێ کە لەنەفسی خۆتان نەبان و سەراسیمەن. نەگبەتیم لەوەدایە کەبۆم نەلوێ بەم سەراسیمەبوونەتان پێبکەنم و ناچاریش بم دەممم بژەنمە دەفرە خواردەمەنییە بێلەزەتەکەتانەوەو لرفی بدەم و بێماشمەوە.

کۆڵەکەم قورسەو بەسووکتان دەزانم. دەربەستیش نیم ئەگەر برێ مێش بەو کۆڵەوە بنیشێتەوە؛ چونکە پێیان بار گران نابم. ئەی هاوچەرخینە! ئەو پیاوەنین کەبم خەنە ژێر باری سەختەوە.

ئای داخەکەم! دەبێ تاسەو حەزەکانم بۆ سەر چ لووتکەیەك سەربخەم؟!

ئەوەتانێ لەپۆپەی گەردن کەشەکانەوە بێ هوودانە چاو دەگێڕم لەشوێنە زاو نیشتمانم دەگەڕێم هێشتا لەیەکەم قۆناغ دا بەنابەڵەدی لەبەردەم دەروازەی شاران دا دێمودەچم. سۆزو پەرۆشی خۆم بۆ لای پیاوانی ئەم رۆژگارە تاودان. بەڵام هێندەی نەخایاند کۆمەڵێکم لێ بەدی کردن لاوەکی و لەمن بەدوور بوون؛ کەواتە چەند گاڵتەم پێیان بێ شانیان هەڵ دەگرێ.. ئەوا بوومە ئاوارەیەك و بە عەزرەتی شوێنەزاو نیشتمانەوەم.. هەر لەئێستاوە بێ نیشتمانم.. مەگەر ئەو نیشتمانەی لێ دەربچێ

کەهی رۆڵەکانمەولەزەوی نادیارداو لەنێوە ڕاستی دەریای بێ پایان دایە. لەبەر ئەوە پێویستە بەسەر ئاوەکانەوە کەشتیەکەم تەك بدەمو خەریکی دۆزینەوەی ئەو نیشتمانەم بم.

پێویستە لەبەردەمی رۆڵەکانم دا ئێزای گوناهی خۆم بدەم؛ چونکە منیش رۆڵەیەکی باوانی خۆم بووم، پێویستە بەهەموو توانامەوە لەزەمانی ئایندەدا ئێزاو کەفارەتی حاڵی حازم بدەمەوە.

زارا ئاوای گوت...

# زانیاری پاك

کەدوێنێ شەو مانگم لێدەرکەوتو بەسەرمەوە تریفەیدا بەخەیاڵم دا هات مێیەکەو لەسەر سکوزایە.. لەوەدەچوو ئەستێرەی رۆژێی لەهەناودابێ. بەڵێ بەژانەوە بوو، لەگەڵ ئەوەش ڕا پێم خۆشتر بوو مانگ نێربووایەو مێنەبووایە، هەرچەندە چەندە سیفەتی پیاوانەی تێدانیە؛ چونکە شەو گەڕێکەو بەنیازی خراپەوە بانەوبانی لێدەکاو بۆی دەردەچێ..مانگیش وەك ئەو رەبەنانەیە کەهەوەس و حەسوودی یان لێ دەردەپڕژێ..ئارەزوومەندی ئەوەیە کەبەخۆشیو لەزەتی ئاشقان بنازێو رابوێرێ.

نەخێر، من ئەو پشیلە چڵێسەم خۆش ناوێ کەبەسەر پلووسکی سەربانەکەناوە دێتو دەچێ، بەش بەخۆم رقم لە هەموو خۆ مەڵاسدەرێکە بەتایبەت ئەوانەیان کە لەبن دەلاقە قایم کراوەکان دا پێ دزیلکە دەکەن!

مانگ بەسەر رایەخی ئەستێرەکاندا بەسەرکزی و کڕنووشەوە رادەبوورێ، منیش رقم لەوانەیە کەبەبێ چرپە رادەخزێنو گوێت لەترپەی پێیان نیە.. هەنگاوی پیاوی جوامێرو بێ پێچوپەنا زەوی دەهێنێتە زمان. کەچی پشیلە بەدزەوە تێ دەپەڕێ، ئەم مانگەش پشیلە ئاسا هەر هەنگاوی گەرداسو ناهەق هەڵ دەهێنێتەوە.

دەغەڵینە! لەئێوە ئەم نموونەیەم هەڵهێنجاو بۆ ئێوەشم هاوردەوە؛ چونکە هەستو نەستی ڕەتاوتان بەدوای زانیاری بێخەوش دا تەواو شەکەتی کردوون.

بەلای منیشەوە ئێوە کۆیلەی خۆشی رابواردنن؛ چونکە ئێوەش زەوی‌و ئەوەی لەسەر زەوی یە خۆشتان دەوێـن.. لەگـەڵ ئـەوەش ڕا ئـاخنراوی نیـهادتانم زانیـوە؛ ئـەوەتا چیتان پەچنیوەتە خۆشەویستی‌یەکەتانەوە مایەی شەرمەزاری‌و ڕەوشت تێك دانە.. کەواتە ئێوە بەتەواوی لەئەستێرەکەی شەودەچن!

دیارە ئێوەومانانیان وەها قایل کردوون کەهەرچی پەروەردەی خاکە بەسـووکی بزانن.. بەڵام ئەم قایل کردنە نەگەیشتووەتە هەناوتان.. چونکە ئەوەی لەئێوەدا قایم بێ تـەنیا هەناوتانـە. ئـا بـەو جـۆرە ژیـری‌و هۆشـتان تـەریق‌و شـەرمەزارە؛ چونکـە هەناوتان خۆی بەسـەردا سـەپاندووە، ئـەویش لەشـەرمەزاری‌دا بـەکوێرە ڕێ دا سـەری خۆی هەڵگرتووە.. کەواتە گوێ بدەنە رازی هۆش لەگەڵ خۆی‌دا:

((خۆزگـە بـۆ شـوێنێك هـەڵ دەکشام‌و لەوێشـەوە بەسـەر ژیـان دا ڕوانی‌بـام‌و خـۆم لەهەوەسـی شـەهوەت رزگـار برکردایە! ئـەوجا لەبـەر دەم هـەوەس دا نەدەبوومـە ئـەو سـەگەی بەهـەناوە کوتـەوە زبـانی دەردەکێشـێ‌و هەوەسـە نەوسـنەکەی تینـی بـۆ دەهێنێ‌و لیکی پێ دەرێژێ.

خۆزگە لەتێڕامان دا بەختەوەر دەبووم بەسەر ویستی خۆم دا هەڵ دەکشام؛ ئەوجا لەبێ ێڵیی خۆ پەرستانەدا رزگارم دەبوو.. ئیدی هێمنایەتی باڵی بەسەردا دەکێشام.. چاوەکانیشم تەنیا مەستە نیگای مانگیان بۆ دەمایەوە!

هۆشی ئێوە دەیـەوێ خۆی لـەزاتی خۆی بدزێتـەوە چونکـە ئاوەکی‌و پەڕیوەیەکە تامـەزرۆی ئاشـقێنی زەوی‌یـە.. هـەر بەوچەشـنـەی مـانگ دڵداری لەگـەڵ زەوی‌دا دەکات.. ئێوەش تەنها چاوەکانتان بەجوانی زەوی دەنازن‌و بەس.

هـات‌و هۆشـتان گوشـاد بـوو ئەوسـا زانیـاری پـاك داگـیری دەکـاو تێیـدا جێـی دەبێتـەوە.. واتـە نـەوەك هۆشتان شتەکان جڵەو گیری خۆی بکـا.. بـەڵکو بەئـەوەندە دابکەوێ کە تارمایی شتەکان ڕەنگی تێدا بدەنـەوە هـەر بـەو چەشنەی کەلە ئاوێنـەی هەزار چاوەدا سێبەر دەدەنەوە.

ئەرێ دەغەڵە ئاگرتێبەربووەکانی حەزو هـەوەس! هەوەسـتان لـەپاکێتی دوورە.. هـەر لەبـەر ئەوەشـە کەلـە هـەوەس‌و ئـارەزوودا تەنگـەتاون. ئێـوە مـەردوومی زەوی پەرست نین.. تەنیا داهێن‌و نوێ خوازەکان زەوییان خۆش دەوێ کەشتێ دادەهێنن‌و نوێی دەکەنـەوە لەخۆشیانا باڵ دەگرنـەوە.. لـەکوێ ویسـتی خوڵقاندن ئاشـکرا ببـێ

پاكێتیش هەر لەوێیە.. هەركەسێك بێیەوێ شتێكی لەخۆی بالاتر بخوڵقێنیئەوە خاوەنی پاكژترینو ویستو خواستە. دوای جوانی كەوتم.. بەلام لەو شوێنەدا دۆزیمەوە كەویستو ئیرادە بەرەو مەبەست راسابوو.. لەو شوێنەدا دۆزیمەوە كەمەردووم لەپێناو گۆڕانكاری و تازە بوونەوەی وێنەكان دا خۆشنوودی نەمان بێ، چونكە خۆشەویستیو مەرگ برالەی هەمیشەن.. ئەو كەسەی ڤیانی گەرەك بێ بەمردنیش رازییە...

ترسنۆكو بوودەڵەكان! ئەمە ئەوەیە كەپێتان دەبێژم.

..بەلام نیگا وەرچەخاوە مێچكەكانتان حەزیان لەوەیە كەلەتێڕامان دا نوقوم ببنو دەشتانەوێ ئەوەی بەترسەوە چاوی تێ دەبڕن بە ((جوان)) ناو ببرێ.. بەلام لەو حەلەدا كام ناو بەفەڕو پیرۆزە گلاوی دەكەن .

ئەی ڕەدووكەوتووانی زانیاری پاك!

بۆیە نەفرەتاوین چونكە لەوحەلەدا وەك سك پڕە بار گرانەكان بەسەر دنیاوە دەردەكەون. لە ((زایین))دا كۆڵەوارنو زەوتان تێ ناكەوێ.

ئەوەتا زارتان بەوشەی پڕ لەنەزاكەت دەئاخنن تا وامان تێ بگەیەنن: دڵتان كانگای میهروسۆزە، كەچی هەمووشتان ناپاكو دوو روون.

تائێرە بە وتەی زبرەوە بەرەو روتان بوومەوە .. دەشزانم كە تالۆیژمو گوتەكانم دڕن.. بەلام بێ خەتام؛ چونكە لەرێزە وەریوی خوانی زەماوەندی ئێوە وشە بەوشە چنیومنەتەوە. بۆیە وشەكانم رەقو زبرن چونكە بەگوێی دەغەڵەكانیان دا رادەگەینم.. ئەوەتا چنگم پڕ كردوون لە قاوغە سەدەفو دڕكەماسیو كونە لووتی ئێوەی ناپاكیان پێ دەئاژنمەوە.

بێپشوو هەوای پیس لەدەوری ئێوەو خوانو مێزەكانتان هەڵ دەكا، هەوایەكی ناپوختەو بەبیرەچەپەڵەكانتانو فڕوفێڵەكانتان چڕبوونەتەوە.

پێویستە سیپالی خاو خلیچكی لەخۆتان دامالن تا متمانە بەخۆتان بكەن، كەسێكیش باوەڕی بەخۆی نەبێ واز لەدرۆ ناهێنێو ناتەواوی خۆی بەدرۆزنی پڕ دەكاتەوە .

خۆ پارێزگارەكان .. خۆ بەچاك زانەكان! رووی دەمم لەئێوەیە كەدەموچاوی خۆتان بەڕووبەندی خواوەندانە داپۆشیوە، نەخێر ئێوە كرمەرێزی درێونو بەكالای سەروەران خۆتان پۆشتەو پەرداخت كردووە.

ئەی زەلامە تێرامێنەکان ! ئێوە هێجگار خۆ هەڵکێشن، تەنانەت زارا خۆیشی بەکەوڵە خواوەندییەکانتانەوە گیرۆدە بووە کەلەو دیویانە پەپکەمار خۆیان لێ حەشار داون.

ئەی پاك زانیارییە خوازەکان! پێش ئەوەی بۆم دەربکەوێ کەئێوەش وەك ئەو خۆ گونجێنە ساختانە خۆتان ساز ئەدەن لەچاوانی ئێوەدا گیانی خواوەندێکم دیتووە.

نێوانی منو ئێوە دوورکەوتەوە کەلەنێوتاندا نەپیسەمارم بۆ جیاکراوەتەوەو نە بەر بۆگەنەکەشی کەوتووم.. بەدڵیشم دا نەهاتووە کە لەبەر چاوم دا مار پەلاس (حربا و) یك بەحەزو هەوەسیەوە ڕەنگ گۆڕکێ بکا؟!

ئەوەش بوەستێ کەلێتان نزیك بومەوە تاریکیم لێ ڕەوییەوە.. ئەوا کازیوەیەو ئیدی دەکەونە بەرگزنگ.. هەر یەکەو مانگێکی هەیەو دەیەوێ لەپڕ هەوەسی خۆیدا ئاوابێ و لەبەرچاونەمێنی.

سەرنجی ئەو مانگە بدەن! ئەوەتا بەئاسۆگەی خۆیەوە رووزەردو هەڵ بزرکاوە.. بەیانیش دەستوبرد بە رووناکییەکانییەوە لێی راساوە.. هەموو خۆرێك خۆشویستنە ئاشکراکەی لەحەزو تاسەی داهێنانیدا دەدرەوشێتەوە.

ئەی نابینن کەوا بەیان بەسەر دەریادا خۆی کێش دەکاو حەزو پەرۆش هێناونیە جونبوش؟!

لەخۆشەویستی و گڕەهەناسەی بەیان دا هەست بەتینوێتی ئەو دەکەن.. هەر وەك بییەوێ بەجارێ شەپۆلەکان هەڵ بمژی.. ئەوا شەپۆلەکانیش بەخرۆشانەوە بەرەو بەیان بەهەزاران مەمکی قیتەوە بۆی بەرز دەبنەوە.. بگرە خودی نێرەوی دەریاش تاسەی راموسانی ئەستێرەی رۆژ دەکا.. تا ئەویش بەجارێ بیخواتەوەو شەپۆلەکان ببنە هەورو ببنە ڕێبازی رووناکییەکان .. بەڵکو هەموویان لەنووردا بتوێنەوەو ببنەوە بەیەك نوورو بەیەك ڕووناکی.

من ئەستێرەکەی رۆژمو.. زیندەگانیشم خۆش دەوێ.. ئەستورایی ئاوی فرە قووڵم خۆش دەوێ؛ ئا –ئەمە زانیارییە پاکیزەکەی لەمەڕ خۆمە..! من لەهەموو ناخێك ڕادەچمو کێشی دەکەم.. تەکان دەدەمە ناخەکان تا بۆلای خۆم بالآببنەوە!!

زارا ئاوای گوت...

# زانايان

کەمن نووستبووم تومەز مەڕێك دێتو دەکەوێتە داپاچینو کرۆژتنی ئەو تووڵە دارغارانەی بەژوور سەرمەوە کرابوونە تاجە گوڵی پیرۆزی.. ددانەکانیشی لێ گیردەکاو دەڵێ: ((زارا لەخێڵی زاناکان نیە))

ئیدی بەدەم لەوەڕو کاوێژەوەو بەشانازی‌یەکەوە دەڕوا. ئەمە ئەو هەواڵە بوو کەیەکێك لەمنداڵەکان پێی ڕاگەیاندم.

حەزدەکەم لەپەنا ئەو دیوارە رووخاوانەی لەدرزەکانیانەوە گوڵاڵەو چاڵووك سەوز بوونو منداڵان یاری لێ دەکەن تەخت لەسەر خۆڵەکەی رابکشێم. هێشتا من لەچاوی منداڵەکانو لەچاوی چاڵووك گوڵاڵەکاندا زانام، چونکە ئەوانە تەنانەت لەدۆخی ئازار پێ گەیاندنیش دا هەر پاكو پاکیزەن.

ئەوا مێگەلەکە بەزانای دانەنام؛ ئەمەش بەختی خۆمەو لێم پیرۆز بی. بەراستی من شوێنی زاناکانم بەجێ هێشتو توند لەدوای خۆمەوە دەرگاکەم راکێشا.

گیانە برسی‌یەکەم زۆر بەدیار سفرەوە دانیشت. وەك زاناکان خووم بەوزانیاری‌یەوە نەگرتووە کەتوێکڵ شکێنەکان کردوویانە پیشەی خۆیان. من ئەویندارى ئازادیم.. شەیدای دەرباز بوونم بەنێو هەوای پاك داو بەسەر زەوی ساردا.. دیسان ئەوەم بەلاوە پەسەند ترە کەوڵە گایەك بکەمە خەوگا نەك شکۆو نازناوی زاناکان بکەمە سەرینی ئاسوودە. خورتی بڵێسەی بیرکردنەوە بەجارێ تەنگەنەفەسیان کردووم؛ ئیدی ناچارم بۆ سارای گوشاد خۆم بکوتمو لەدەست ئەو ژوورانەی تۆزدای پۆشیون هەڕابکەم. بەڵام ئەو زانایانە بن سێبەریان گرتوون قەرەی ئەو رێگاوبانە ناکەون کەخۆرەتاو داخی کردوون.. بەڵکو بەبیانووی پشکنینو دۆزینەوە لێی پاڵ کەوتوون.. هەر وەك سەیرانچی یان کەدەمیان بەل دەکەنو سەرنج دەدەنە رێبوارانی سەرشەقامەکان.. بەڵێ ئەو زانایانە ئاوا دەم دادەقەڵێشنو چاو دەبڕنە گڕوبڵێسەی بیری نێو دەماغی خاوەن بیرەکان. خۆ بێتو دەستت وێیان بکە وەك جەواڵە ئارد تۆزیان لێ هەڵ دەستێ.. بەڵام هیچ کەس گومان نەبا کە ئەو تۆزەی لێیان هەڵ دەستێ ئاردی ئەو گوڵە گەنمە زەردانەیە کە وەرزی هاوین خۆیان پێ دەڕازێنێتەوە!!

هەر کەزاناکان دانایی خۆیان پیشان بدەن وەك نۆبە تێدار چەقوچۆ دام دەگرێ؛ ئەویش سەبارەت بەئەوەیە کە حوکمو ڕاستی ئەوان بۆنی زەلکاو دەدەنەوە.. بارەهاجار دانایی ئەوانە قڕەی بۆ قیان گوێ ئاخن کردووم!

ئەو زانایانە شارەزای خۆیان هەیەو گرێ پەنجەکانیان نەرمونۆڵن. هیچ ڕێژەیەکیش لەنێوان ڕاستو ڕەوانی منو ئاڵۆزی ئەواندا نیە.. پەنجۆڵەکانیان لەریسو تەونی خۆیان کول نابنو پەردە بۆ هۆش دەچنن.. بەچەشنی سەعاتەکان. هەرکاتێ بەندۆڵیان کۆك کرا ئەواکاتت بۆ دابین دەکەنو سووکە سووکەش دەکەونە چرکە چرك. ئەوانە بەرداشن هەر دانەوێڵەیەکیان بەگەروودا بکرێ دەی هاڕن.. هەریەکە خۆی لەپەنجە بزووتنەوەی ئەوی‌دیکە گرتووە.. هەمووشیان خەریکی هەڕەشەو لێکدی قراندنن.. خۆیان گرتووە ئاخۆ کامیان لەزانیاری‌یەکانی‌دا باڵادەبێ، لەم خۆ لێ گرتنەدا لە خێڵە جاڵجاڵۆکە دەچن. زۆرجار دیومن بەپارێزەوە ژەهری خۆیان دەتکێننو دەست کێشی بلووری لەدەست هەڵ دەکێشن . زاناکان لەساختەکردنی یاری تاوڵەدا شارەزایی تایبەتیان هەیە.. ئای چەندە بەسەر تاوڵەوە چەمیونەتەوە و ئارەقە لەنێو چەوانیان تکاوە!

هیچ بەندیواری‌یەك لەنێوان منو ئەوان دا نیە، چەندە درۆکانیانو ساختە یاری‌یەکانیان لەپەسندایەتی منەوە دوورن، دیسان ئەو پەسندئاریی‌یەی بۆ خۆیان داناوە دوورترە.

هەرچەندە ئەو زانایانەم دیتبێ بەسەریان دا باڵابووم.. هەر لەبەر ئەوەشە کەرقیان لێمە؛ چونکە نەیان گەرەکە هیچ بوونەوەرێك بەسەریان دا باڵابێ. جا بۆ ئەوەی زرمەی پێی من خەفەبکەن هاتوون تەختەڵەیان ناونەتە بان سەریانو گڵەبانیان کردوون. تا حاڵی حازریش زۆرینەی زاناکان کەمتر لەقسەکانی من تێ دەگەن.

چ گومرایی و نابووردەیەك لەمرۆڤ دا هەیە هاتوون کردوویانەتە بەرزەخێك لەنێوان منو خۆیان دا.. بەچاو مەنزڵگای خۆیانەوە ئەم قەڵاتە بەپچی خوازراو دادەنێن. سەرەڕای هەمووی یەکبینە بەسەریانەوە دڕۆمو بیروڕای خۆم بڵاودەکەمەوە، خۆ ئەگەر بەسەر عەیبی خۆشم دا ڕۆیشتبم هەمیشە بەسەر ڕووی ئەوان دا گوزەردەکەم؛ ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەیەکسانی لەنێو ئادەمیزاددا نیە. ئەمەیە کەعەدالەت هاواری بۆ دەکا. ئەوجا ئەوەی بەرخواستی منە ئەوان هیچ مافێکیان نیە بیکەنە بەرخواستی خۆیان.

زارا ئاوای گوت...

# شاعیران

زارا بەپێڕەوێکی خۆی گوت: لەوەتی راستی لەشم زانیوە بەلای منەوە بەپێوانەیەکی تەسك نەبێ گیان ئەوگیانە نیە؛ لەبەر ئەوەیە کەدەبینم بیروگوتەی : ((هەرچی لەنێو نەچێ..)) هێمایەکە لەهێماکان.

پێڕەوەکەی لە وەڵام دا گوتی: زارا! لەمەوبەریش ئەوەت گوتووە.. بەڵام ئەمیشت کردە سەربار: ((شاعیرەکان بەزۆری درۆ دەکەن)) ئەی لەبەر چی ئەمەشت گوتووە؟

زارا گوتی: تۆ دەپرسی (بۆچی.....) منیش لەوانە نیم بەرپرسیاربم.. من زادەی دوێنێ نیم، ئەوەی خۆم رام لەسەری بێ لەمێژە هەستم بەهۆیەکانی کردووە.. خۆناشێ مەبەستت ئەوەبێ کەببمە عەمباری بیرەوەریەکانو سەرجەمی ئەو هۆیانە ئەز بەربکەم کەبیرو ڕاکانم لەسەریان دامەزراون؟.. هەر ئەوەندەم ماندوێتی پێ دەبڕێ کە خودی بیروڕاکانم لەبەربن. ئەی لەجیهان دا پۆلە چۆلەکە نیە لەهێلانەی خۆیان تۆرابن؟.. زۆر جاریش لەقەفەزەکەی خۆم دا باڵندەی هێندە سرکم بووە کەدەستم پێدا هێنابێ کەوتووەتە هەڵ لەرزین. هەرچۆنێك بێ، رۆژێك لەڕۆژان زارا چی بەتۆ گوتووە؟ . بەڵێ گوتوومە:

((شاعیرەکان بەزۆری درۆزنن.. ئەی زارا خۆیشی یەکێك نیە لەو گەلە شاعیرە؟! ))

ئایە هەر بەئەمەندە سەفەتەوە تۆ وا دەزانی کە- زارا بانگی راستی لێ هەڵداوە؟..بابشزانم چی والەتۆ دەکا باوەڕی پێ بکەی؟

مریدەکەی گوتی: ((من باوەڕم بەزارایە)).

زارا سەرێکی راوەشاندو بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: باوەڕ (هەرچەندە لەسەریشم دەکەوێ) ئەو شتە نیە کەخۆشنوودم بکا. بەڵام کەمەردووم بەهەموو جەختێکیەوە گوتی: ((شاعیرەکان درۆ دەکەن)) ئەوە راستی دەبێژن . چونکە ئێمەی شاعیر درۆزنی چاکین.. ناچاریشین تابەشی ئێمە هەر ئەو چکە زانیاریەبێ دەشێ بەری درۆ ڕەها کەین. کام شاعیرمان لەو سەردابانەمان دا کەلیکە ژەهریان لێ دادەچکێت گزی لەشەرابی خۆی نەکردووە؟! زۆر شتی واشیان تێدایە زمان لەبەیان کردنیاندا بێ دەسەڵاتە. لەبەر ئەوەی لەزانیاریدا هەژارین بامان داوەتەوە بەلای خۆشویستنی

ئەوانەدا کەبەستەزمانی هۆشن بەتایبەتی کە خۆشەویستی‌یەکەمان بەسەر کیژۆڵە ساویلکەکان دا قلْپ دەکەینەوە .. ئەوجا هەوەس‌و حەزەکانمان بەلای ئەو شتانەدا تاو دەدەین کەپیرێژنەکان لەشەوارەو کەپۆڕەی خۆیان دا دەی لێن‌و دەی لێنەوە؛ ئێمەیش لەلایەن خۆمانەوە دەیان جووینەوەو دەڵێین:

((ئەوەی ئێمەی شاعیر باسی لێوەدەکەین مەسەلەیەکی جاویدانی لەبن نەهاتووی ئافرەتە.))

ئێمەی ئەندێشەوار وای لێ‌دەدەینەوە کە ڕێگەی زانیاری لەبەردەممان دا تەخت‌و هەموارە.. ئەوانەی بەسایەی زانستەوە دەرك بەشتەکان دەکەن نابەڵەدی ئەو ڕێگایەن. هەر ئێمەی شاعیر باوەڕمان بەگەل‌و دانایی گەلە. شاعیران وادەزانن هەر ئەو کەسە پەی بەزانیاری‌یەکانی ئاسمان‌و زەوی دەبا کە لەسەر پێچەڕێی نەدیوی کێویکی چۆڵی ڕەقەن‌دا بەچیچکان دا هاتبێ‌و لەسووسەی بێ دەنگی‌دا گوێ قولاغ بێ.. هەر کە هەستە ناسکەکەیان هەژاندنی خەیاڵ دەیان باتەوە: کەخودی سروشت گیرۆدەی شاعیرانە.. واهەست دەکەن ئەو سروشتە بەسەر گوێلاکیان دا چەمیوەتەوەو سرووشتی جوانبێژی‌و ڕازەکانیان بەگوێ دا رادەگەیەنێ. ئەوجا لەبەردەم ئەو زیندە ڕێبوارانەی بەردەم مان-دا بەکەشوفیشاڵی ئیلهامەکەیانەوە قیت دەبنەوە.

داخەکەم! لەنێوان ئاسمان‌و زەوی‌دا شتی زۆر هەیەو بێجگەی شاعیرانیش کەسی دی خەونیان پێوە نابینێ. بەژوور ئاسمانیشەوە زۆر شتی کە هەیە .. خواوەندەکانیش تەنیا چەند هێمایەکن‌و شاعیران دایان هێناون.. بەراستی ئێمە هەر بۆ بالا وزاق بەخۆمان دەدەین.. بۆ مۆڵگەی هەورەکان بالامل دەبین‌و تۆپەڕەنگین فووهەڵ دراوەکانیان بەرێ دەکەینە سەر ئەوجا بەخواوەندو ئادەمی‌یە بالاکان ناودێریان دەکەین .. لەراستیش دا چونکە سووکەڵەن جێی خۆیانە کەلەسەر تەختی بالا ڕۆنیشن.

وای بۆ خۆم ! کەبەدەست هەموو کۆڵی‌یەکەوە ماندووم. چونکە ئەویش دەیەوێ نەفسی خۆی بکاتە تێهاتەیەکی ژمارده.. دیسان لەو سەریشەوە بەدەست شاعیرەکانەوە زۆر ماندووم.

زارا هەر ئەوەندەی گوت؛ کەچی مریدەکەی تاوگیر بوو.. بەلام پیشی خواردەوەو بەری لێ ڕەها نەکرد، دیسان زاراش بێ دەنگ بوو، بەمەندی چاوی لەبەرخۆنان، وەك

بی‌یەوێ بەجەرگەی خۆیدا ڕۆبچێ! ئەوجا هەناسەیەکی ئاسوودەی داو گوتی : ((من زادەی دوێنێم..[٢٤] زادەیزەمانی دێرینم.. بەڵام لەسبەینێ و دوای سبەینێ و لەئایندەی دووردا شتێکم تێدا هەیە. کۆنەشاعیرو تازە شاعیران باشیان ماندووکردووم، چونکە لەباوەڕی من دا– ئەو کەف و کوڵەن کەهەرگیز ڕووناویان لەبنەوە دەرنەکەوتووە بەڵکو بنچك و لۆغانی ئەو دەریایانەن و شکایی یان هاتبێ.. بیروڕایان بەرەو ناخ نابێتەوە،.. لەیەکەم لێشاودا هەست و نەستیان دەنیشێت. ئەو خێرو بێرەی لەتێڕامانی ئەوان دا چنگ دەکەوێ کەمە هەوەسێکەو کەمە پەستی‌یەکە، کێش و پێوانە شیعریە کانیشیان بریتـین لەچەندکایەیـەك و پـەیتا پـەیتا ئەندێشـە تارمایی‌یـەکانیان لەسـەر کێشـە بڕگەکانیان هەڵ دەخلیسکێن.. هێشتا لەترپەو ئاهەنگی شیعردا هەستیان بەهیچ هێزێکی شاراوە نەکردووە. شاعیران نەگەشتوونەتە رادەیبێ خەوشی، چونکە بۆ ئەوە خەڵکی لەخشتە ببەن دێن گۆلاوەکانیان شلوێ دەکەن و وایـان دەبەنـە دڵـەوە کەگولاوی ئەوان بێ پەین.. گەرەکیانە نەفسی خۆیان قنج بکەنەوە کـە لـەنێو بیرو باوەڕە جۆراو جۆررەکان دا زاڵن! وێـرای ئـەوەش ئـەو کـار ناچلانـەن بەتوولـە ڕێـی سەرگەردانی‌دا مل دەنێن.. دەڕۆن و ئاوە ڕوونەکانیش بەدزوێنی خۆیان لێڵ دەکەن و خراپ دەیان شڵەقێنن.

---

[٢٤] هەرچەندە راهەڵ وەشاندنەوەو دژواریی ئـەم –بۆچوونـی و ئـەو بۆچوونـی– لـەم کتێبـە فەلسـەفەیەیدا مشـەیەو خۆیناکاتـە بـەرپرس و لـەو جغـزە دەربـاز بـووە؛ ئـەوەتانێ تـۆزێ لەمەوبـەر گوتـی (مـن رۆڵـەی دوێنـی نیـم...) ئـەوا لـێرەش دا بەجەختـەوە دەڵـێ: ((مـن زادەی دوێنێم و زادەی زەمـانی دێرینـم و...) بـەڵام بـەدوای قسـەکەی پێشـوویدا رسـتـەیەکی حـاڵ و دۆخ دەهێنێتەوە کە نووسیویە: ((ئەوەی خۆیشم رام لەسەر بێ لـەمێژە هەستم بەهۆیـەکانی کردووە)) ئەوا لەبەرچاوەی ژووتر هەڵ کشاوەتەوەو بۆ پێرێ و بەسر پێرێ و دێرزەمان.

دیسـان زمـانی فەلسـەفە دەربڕینەکەشـی ((فەلسـەفەی هـەبوون)) زمـانی شـیعرەو لـەوێوە هەوێنەکەی دەگرێتـەوە، بەباوەری مـن ئالەبـەر ئەوەیـە کەلەئەندێشـە واری‌یـەوە گلاوەو بینـا نابینا دەربڕینە شاعیرانەکەی سەمتی پێ دەگۆڕێ و تووشی پێ لێ هەڵبڕین و پـێ لێ داگرتنـی دەکا.

ئالانی

ئای بەداخەوە! بەتەمای ڕاوەماسی تۆڕم داهێشتە دەریای شاعیرانەوە.. بەڵام چەندم هەڵ وێژنیبێتەوە کەللەی کۆنە خواوەندێکی پێوە هەڵ زنابوو .. ئا بەو ڕەنگە سەخاوەتی دەریاکەیان دەرکەوت و لەبات هەمو شتێك بەردی ڕەقی خستە مستی برسی‌یەوە! دەشێ شاعیرەکانیش لەدەریاوە دەرچووبن.. دیارە کەمێك مرواریشیان تێدا هەن. شاعیران پتر لەو ماسی‌یە سەدەفانە دەچن کەبە قاوغە درك خۆیان تەنیوە.. ئەوەندێکی جنگم لەهەناویان وەردابێ لەباتی – گیان – کەفەڵۆکە خوێم بەدەستەوە هاتووە.. شاعیرەکان لەدەریاوە فیزیان وەرگرتووە.. ئەی ئەوە نیە دەریاش لەفیزو ئاغربوون دا خۆی بەسەر تۆپی تاوسان دەزانی؟! ئەوەتانێ لەبەر دەمی گاحۆلەکاندا تل بەشەپۆلەکانی دەداو چەترۆکەی ئەتڵەسی لێ دەترازێنێ.. پەڕاوێزی کالای زیوبینی لێ پەخش دەکا.. ئەوجا گاحۆلیش بەمۆڕەو خێسەوە چاوی تێ دەبڕێ؛ چونکە گیانی ئەو بە لەوەڕی قەراغوجاخەوە خەجلیوەو خەریکی ملوموشی خۆیەتی.. ئەو چی بەسەر جوانیی دەریا و تاوسانەوەیە! ئەمە پەندو نموونەیەکە بۆ شاعیرانی دەهێنمەوە.. بەراستی بیری شاعیران تاسەو فیزەبای تێ گەڕاوە.. بەڵکو دەریای لەخۆبایی بوونە. بیری شاعیر ورك دەگرێ و خولیای کەسێکە گوێی بۆ ڕاهێڵێ و تەماشای بکا.. ئەوجا باتەماشاکەرەکەش بریتی بێ لەگا حۆڵێك.

یاران! ئەم بیر کردنەوەیە بەتەواوەتی ماندووی کردووم ..

دووریش نیە زەمانێك بێتە بەرەوە کە (بیر) لەزاتی خۆی داو لەنەفسی خۆی‌دا ماندووبێ.

هەندێ شاعیرم دیتوون بەسەر شیعرەکانیان دا بەرگەشتە دەبن..

کاسەی غەزەب بەسەر کۆنە هەڵ وێستیان دا قلپ دەکەنەوە .. !!

هەندێکی کەشیان تاوانە بژێری بیرکردنەوەن، هەر لەنێوەندی شاعیرانیش دا :

(( ئەو بیر گومڕایانە پەیدابوون؟!))

زارا ئاوای گوت...

# رووداوه زلەكان

ئەوا لەنزيك دوورگە بەختيارەكانی زاراوەو لەدەريادا دوورگەيەك قنج بووەتەوە.. بەسەر دوورگە كەشەوە بێ پسانەوەگڕكانێك تۆپەڵە ئاگر دەردەهاوێژێ. گەل و بەتايبەتی پيرەژنەكانيان دەڵێن: ئەو دورگەيە تاشێكی هەڵناوە كەدەرگای دۆزەخی پێ دابخا.. بەڵام هەر لەوێ دەرفەتێكی تەنگ بەگڕكانەكەدا دەڕواو دەگاتە ئەو دەرگايەو لەوێ كۆتايی دێ.

لەوزەمانەدا كەزارا لەدوورگە بەختيارەكان دا نيشتەجێ بوو كەشتی يەك لەبەردەم ئەو دوورگەيەدا– كە كێوێك بەسەريەوە گڕی فڕێ دەدا– لەنگەری گرت. دەرياوانەكان دابەزين و بۆ ڕاوەكەروێشك بڵاوبوونەوە.. لەدەمەو نيوەڕۆدا كەشتی يەوانەكە ڕێبوارەكانی گلێر كردنەوە.. پياوەكان چاويان لەزەلامێك هەڵەنگوت ئەوا بەئاسمان دا خۆی لوول دەدا، پاشان لێيان نزيك بووەوە بەدەنگێكی ئاشكرا هاواری كرد: ((زەمانە نزيك بووەتەوەو زۆريش نزيك بووەتەوە!))

خێرا تارمايی يەكە بەسەريانەوە بەرەو گڕكانەكە تێ پەڕی، كەلێی ورد بوونەوە كەسی زارايان تێدا بەدی كرد؛ چونكە لەوەپێش بێجگە لە كەشتی يەوانەكە زارايان ديتبوو، هەروەك چۆن گەل ئەو كەسەی خۆش دەوێ كەلێی دەترسێ ئاواش ئەو دەرياوانانە زارايان خۆش ويستووە.. ئەوجا سەرقافڵەكەيان گوتی: ((ئەوەزارايەو خۆيەتی بۆ دۆزەخ دەڕوا)).

هەر لەوكاتەوە كە دەرياوانەكان دابەزينە دوورگەی گڕەوە خۆ وون كردنی زارا لەنێو خەڵك دا بووە بەقاو.

بێت و كەسێكيش هاواڵی پرسیبايە ئەمە وەڵامی يارانی بوو: ((بەشەوی ئەنگوستە چاو سوار كەشتی يەك بووەو خۆی داوە بەدەم دەرياوە، كەسيش نەی زانيوە ڕوودەكاتە كوێ!؟))

ئا بەو ڕەنگە بەهۆی بزربوونی زاراوە پەژارە ئەو ناوەی داگرتەوە.. ئەمەش دوای ئەوەی كە دەرياوانەكان چيان بەچاوی خۆيان دیبوو بڵاويان كردەوە.. بەڵێ دوای سێ ڕۆژی دی تەواو خەم دای گرتن، لەنێو گەڵدا واتەوات داكەوت كەشەيتان زارای

فڕاندووە.. بەڵام یارانی زارا گوێیان نەدایە ئەم واتە واتە.. بەڵکو قاقاپێی کەوتنە پێکەنین‌و گوتیان: ((ئەوەی ئێمە باوەڕی پێبکەین کارەکە پێچەوانەیە، واتە : زارا شەیتانی فڕاندووە.))

وێڕای ئەوەش ئەم بزربوونەی زارا بیری دۆستەکانی خەجلاند هێشتا پێنج ڕۆژی رەبەقی بەسەردا تێ نەپەڕیبوو زارا گەڕایەوە نێویان‌و فرە شادمان بوو.

ئەوجا زارا باسی خۆی‌و سەگی ئاگری بۆ گێڕانەوە:

((زەوی پێستی هەیە.. ئەو پێستەش کۆمەڵێ نەخۆشی هەن یەکێك لەو نەخۆشیانەش مرۆڤە. نەخۆشی‌یەکی دیکەش هەیە پێی دەڵێن( سەگی ئاگر) هەر ئەو سەگەشە بۆتە هۆی بێنەو بەرەی درۆو دەلەسە لەنێو خەڵکەکەداو درۆکانیش بڕاستێنن. کەبەدەریاکانیش دا تێم تەقاند لەپێناوی ئاشکرا کردنی ئەو نهێنی‌یانەدا بوو چاوم بە ((ڕاستی)) کەوت لەبنی پێ‌یەوە تا بۆتەقەی ملی ڕووت‌و قووت بوو. ئێستا ڕاستی سەگی ئاگرم لەلاپەنهان نیە.. ڕاستی شەیتانی بەدفەڕ دێوە یاخی‌یەکانم لەلابزرنیە.. ئەو دێوانەش وەنەبێ هەر بەتایبەتی پیرێژنان بتۆقێنن)).

ئەوجا بەنەڕەوە گوتم: دەی سەگە ئاگرینە کە!لەبنی قوڵایی‌یەکانتەوە دەر بازبە.. ئاپێم بڵێ: بناوانەکانت چەندە قوڵن؟.. ئەو شتەی بەڕوومان دا دەم هاوێژی دەکەی‌و دەی تفێنی لەکوێوە دەی هێنی؟.. تۆ بە هەڵپەوە تینگ بەدەریاوە دەنێی تاهەڵی بلووشێ.. ئەمەش کارێکەو بەسوێر تاڵیی چەنەبازی‌یەکەت دەردەکەوێ. بەڕاستی تۆ کەسەگی چاڵاوەکانی خۆراك لەقەوزەڵان سەرووی شوێنەکان وەردەگری. تۆ بەچەشنی ئەو دوێنەرەی هەر لە ورگی خۆی‌دا قسەبکا چونکە لەهەر جارێك دا گوێم لەقسەی شەیتان‌و دێوە بەدفەڕە یاخی‌یەکان بووبێ بۆم دەرکەوتووە کەلەسووکایەتی‌و درۆکردن دا لەتۆ دەچن.. ئەوەتای لەگەڵیان ڕێك کەوتووی بی‌کەنە حەپەلوور.. لەگەڵیان ڕێك کەوتووی بی‌کەنە سمکۆڵی لم پڕژاندن‌و تاریکستان. ئێوە زلترین خۆهەڵکێشن، لە قوڕ کولاندن دا وەستای چاکن، لەهەر جێگایەکیش داسەپێن دەبێ بەقوڕو ئیسفنجە پەستاوی کونۆچکەدار دەورەتان بگیرێ. هەر زەلامێك خاوەنی ئەوسفەتانە نەبێ ناتوانێ داوای رەهابوون بکا. بەلاتانەوە ئازادی ئەو قیژەو هەرایەیە کەخۆتان پەسەندی دەکەن.. بەڵام بەش بەخۆم لەوەتی دووکەڵ‌و شیڕە شیڕ بەدەوری ڕووداوە زلەکانەوە هەڵ دەستن باوەڕم بەو ڕووداوانە نەماوە.

ئـەی ئەهریمـەند! بـڕوام پێبكـە شۆڕشــە پــڕ هاتوهــاوارە جەهەننەمی‌یــەكانتان لەزۆربەی كاتی برقرەمان دا بەگەورە ڕووداو حەلێب ناكرێن.. بـەڵكو لەهـەرە قووڵایـی ساتی بێ دەنگی‌دا بەمەزنە ڕووداو دادەنرێن..شتێ نیە بەگەردی ئەوانـەدا بخولێتـەوە كـەزەناو قـڕەی تـازە دەخولقێنــن.. بـەڵكو ئەوەیــە كەبەگــەردی تــەوەرەی ئەوانــەدا دەسووڕێتەوە كە ڕژێمە تازەكان بنیاد دەنێن.

هۆشەیتان! چارت نی‌یە دەبێ دان بنێی بە گەوجایەتی شتێك دا كە درنگـەی تـۆی لێ بەرزەوەدەبوو تەپودووكەڵی تۆی لێ هەڵ دەستا..

ئـەرێ هـۆ شـەیتان! ئایـا كـاری زل ئەوەیـە كەشـارێك بتوێتـەوەو ببێتـە مۆمیــاو ستوونی قنج داچەمنە سەر قوڕوقاڵ؟.. ئەمەش قسەیەكی دیكەیەو ئاراستەی ستوون ڕووخێنەكانی دەكەم:

ئـەو پـەڕی شـێتایەتی‌لەوەدایە خـوێ بكرێتـە دەریـاوە..كەسـتوونەكان داپــەڕێن قوڕقاڵـەوە؛ چونكـە لەسـەر قـوڕی سـووكایەتیتان وەپـاڵ خرابـوون.. ئـەوا ئێسـتاش بەرووخساری خواوەندانـەوە ڕاسـت دەبنـەوەو ئـازاری سیحربازیشـیان پێـوە شـەقڵ بووە، بەراستی خۆیان بە قەرزدارو سوپاس بژێری ئیوە دەزانن،چونكە ئێـوەی كـاول كەر ڕووخاندووتانن. تا ئێستا ئەوەتام ئامۆژگاری دەچێنم بەگوێی پاشایان دا. ڕەتـی دەكەم بەنێو كەنیسەكان دا.. دەچپێنـم بـە گوێـی ئەوانـەدا كەڕەوشت پەسندی لاژكـی كردوون.. بـەگوێی ئـەو كەسـەدا كەبووەتـە پیری زەمانـەو دەڵێـم: ((بـۆ ئـەوەی بـەرەو زیندەگانی بابدەیتـەوەو پەسندایەتیش بگەڕێتـەوە بـۆ لات، واز لـە (هـێز) بهێنـە بـابت ڕووخێنێ)).

لەبەردەمی سەگی ئاگرین دا ئاوای گوت...

بەحەپەوە قسەكەی پێ بڕیمو هەڵی دایە((دەڵێن كەنیسـە، ئـەرێ كەنیسـە چیـە؟)) گوتم:

((كەنیسـە ئـەو شـتەیە كـتو مـت لەدەوڵـەت دەچـێ.. بـەڵكو درۆزنـترین جـۆرە دەوڵەتە)).. بەڵام سەگەكە تۆ چخە! تۆ چاكتر با خەبەری هاوجۆری خۆتی.. دەوڵـەت خـۆی جانـەوەرێكی مارسـە.. حەیوانێكــە وەك تــۆ ڕمووزنــە.. دەوڵــەتیش دەیــەوێ قسەبكاو قسە چەنیو خۆی بەوەڕینەوە بكاتە قانگە دووكەڵ.. تا خەڵكەكە فریو بداو

بیان هێنێتە سەر ئەو باوەڕە: فەرموودەكانی دەوڵەت لەناخی كارو فرمانەكانەوە دەزێنەوە..

گەرەكیەتی ببێتە گەورەترین جانەوەری سەر رووی زەمین و جیهانیەكانیش ئەوچۆنی بوێ ئاوای بنۆڕنێ[٢٥] لەدەمولمۆزی سەگەكەڕا بێڕەزاترین واتای زرگنی و حەسوودی دەركەوت، ئیدی قوڕاندی: ((ئەوە دەڵێی چی.. گوایە كەسێ هەیە باوەڕی وابێ كەدەوڵەت گەورەترین جانەوەری سەر رووی زەمینە؟!)) ئەمەی گوت و لەلغاوەیەوە گێژەڵوكەی دووكەڵ دەرچوو. ئەوەندەی كەبۆی وەڕی؛ وات دەزانی لەڕقان دا شەقی بردووە. ئەوەندەی نەخایاند هێور بۆوە. ئەوجا پێم گوت: ها.. سەگی ئاگرین! رق و پەستی هەڵیان ئاخنیوی، ئەمە دەبێتە بەڵگە كەمن دەرهەقی تۆ راستی دەبێژم. ئەوا بەردەوام جاڕی راستی دەدەم: هەر لەدەست و پێوەندی ئاگرەوە باسی سەگێكی كەت بۆ دەكەم.. ئەم سەگەیان بەراستی لەدڵی زەوییەوە قسە دەكا. لیكی زمانە شۆڕەی لەسیمی زێڕە. هیچ حسابێكیش بۆ خۆڵەمێش و دووكەڵ و كەفوكوڵی گەرم ناكا، بە دەورییەوە قاقایەك دەرەوێتەوە دەڵێن هەورەو بە پەڵە رەنگینەكانییەوە كەیف دەنوێنی .. ئەو دوژمنی وەڕینە .. دوژمنی كەفچڕینی لغاوەیەو دوژمنی هەناوەترشەیە.. ئەوە سەگێكەو زێڕوپێكەنین لەدڵی زەوی وەردەگرێ؛ چونكە دڵی زەویش لەزێڕە. بشزانە: ئەو سەگە تۆیە!

هەر ئەوەندە ئەم قسانەی بیست، بێدەسەلات مایەوە لەتەریقیانا كلكی لەنێو گەڵگرت و.. بەلووره خۆی كرد بە غارەكەیدا.

ئەمە ئەو رووداوە بوو كەزارا بۆ یارانیخۆی گێڕایەوە.. بەڵام ئەوان هێندە گوێیان پێنەدا.. پتر گوێ قوڵاخی هەواڵێك بوون دەربارەی دەریاكان و ئەو كابرایەی بەسەر دوورگەكەوە باڵی گرتەوە!كەزارا ئەوقسانە لێ بیستن گوتی: دەبێ دەربارەی ئەم گوتەیەتان چۆن گومان بەرم؟.. تۆ بڵێی تارمایی بووبم؟.. لەوانەیە ئەوەی رێبوارەكان دیتبێتیان خۆی نەبووبێ و ئەندێشەكەی بووبێ؟.. پێ دەچێ ئێوە چیرۆكی ((رێبوارو

---

[٢٥] بێگومان زارا لەم وەسفەیدا مەبەستی تەنیا ئەو دەوڵەتەیە كەبەفەرمانڕەهایی خۆیان دەست دەخەنە بینەقاقای گەلەوەو فزەی لێ دەبڕن. ف

ئەندێشەکەی)) تان بیستبێ؟ ئەندێشەکەم جڵەو گیر بکەم.. نەبەشکم تێ تەقێنێ و بەکەیفی خۆی فرسەت لەناوبانگم ببینێ!

زارا بەسەر سوڕمانەوە سەری ڕاوەشاندو لەبەر خۆیەوە دەی پرسی:

ئەوە لەبارەی ئەو ڕووداوەوە چ دەڵێم؟.. حاڵی حازر لەخۆم دڕدۆنگم!!

نازانم خەیاڵو ئەندێشەی لەمەڕ من بۆچی هاتە زمانو پڕ بەدەم هاواری کرد:

((بەڕاستی زەمانە نزیك بووتەوە))؟!

زارا ئاوای گوت...

## نجومگەر

سەرنجم دایە ئەو خەڵکە خەمێکی خەست دای گرتبوون.. هێزو بڕشتی کارگەرە بەگوڕەکان داهێزابوون، تومەز ئەو ئامۆژگاریی‌یەیان پێ وەربووە ئیمانیان پێ پەیدا دەکا کەهەموو شتەکان لەیەك دەچنو هەموشیان بەتاڵو پوچن.. دوا بەدوا نامێنن.. بەڵێ ئەو ئامۆژگاریی‌یەی لەبەرزیو نشێودا دەنگی دایەوە دەی گوت: ((هەمووشتێ پووچەو ئیدی نامێنێ)).

ئێمە درەوی خۆمان کرد.. بەڵام خەلەو خەرمانمان بە –کوێروو–ڕەش داگەڕاو داوەشا. دەبێ لەتاریکە شەوداو لەودیوی ئەستێرە بەدفەڕەکەوە چی کەوتبێتە خوارێ؟! بەڕاستی ڕەنجەڕۆبووینو شەرابەکەشمان تێك چوو! بەڵێ گۆڕاو بوو بە ژەقنە مووت. لەوەدەچێ کەچاوی بەدوپیس کێڵگەو بەندی دڵەکانمانی ئەنگاوتبێ و وشکی کردبێ.

تێکڕا وشك هەڵاتووین؛ گڕیشمان تێ‌بەربێ. بێجگەی خۆڵەمێش هیچمان لێ هەڵ ناوەرێ.. لەوەش گەڕێ کە هەموو شتێکمان پێوە ماندوو بووە.. نەخوازەڵا زمانە بڵێسەی ئاگریش پێمانەوە هیلاكو وشەکەتە.

ئەو کانیاوانەی کەوتنە بەردەممان داچکانو دەریاشمان لێ کشایە دواوە.. لەژێر پێمان دا زەوی کەوتوتە بوومەلەزە .. بەڵام دەمی دانەقلاشت ڕۆمان هێڵێ.. ئیدی

لەکوێ بگەینە دەریایەك و خۆمانی تێدا نقوم بکەین؟.. بەهاوارەوە داوای دەریادەکەین کەچی بەسەر گەناوەکانەوە دەنگمان بەرش و بلاو دەبێ!!

بەراستی ئێمە زۆر رەتاین بەشکم مردن بەدەست بهێنین کەچی هێشتا ئەولاشە زیندووانەین کە لە گۆڕیچکەکانیان دا چاویان داقەلاشتوون)).

نجومگەرێك ئاوای گوت. بەتەواوی کاری لەدڵی زارا کردو گۆڕی؛ تاوای پێهات لەخەفەتباری و شەکەتیدا، بچێتە خێڵی ئەوانەوە کەنجومگەرەکە لە پێشبینی خۆیدا باسی کردن.. ئەویش ورە بەربداو ئەوان ئاسا گرفتاری سەر زەوی بێ!

زارا بەیارانی خۆی گوت: زەمانە هێندە دوور ناخایەنێ کەئەو تاریکستانییە رووی زەوی دابپۆشێ.. سڵ لەئەوەدەکەمەوە هۆیەکم دەست نەکەوێ ڕووناکیی خۆمی پێبپەڕێنمەوە بۆ ئەو دیوی کەو لە کوژانەوە ڕزگاری بکەم من نورێکم ئامادەکردووە لەجیهانی دیارو نادیارەوە ڕووناکی بداتەوەو لەلۆغانەکانی تاریکیدا تیشك بهاوێژێ.. ئەوجا بەهەموو دڵتەنگییەوە دەشێ کێ هەبێ ئەو نوورە بپارێزێ؟

زارا بەدڵێکی حەسرەتناکەوە سەری خۆی هەڵ گرت، سێ رۆژی رەبەق بەبێ نان و ئاو خۆی راگرت و نەی زانی حەسانەوە چییە؛ زمانی بەستراو نوقمی خەوبوو. هاوڕێکانیشی بەدرێژایی شەوانە خەمبارانە بەدەوریەوە دانیشتن و چاوەڕوانی ئەوەبوو بێتەوە سەر خۆی و خەمی لێ برەوێننەوە.

دواتر چاکەوەبوو. وەك دەنگ دانەوەیەك لە دوورەوە بێ دواندنی:

((هاوڕێیان! گوێم لێ بگرن تا ئەوەی بەخەون دیومە بۆ تانی بگێڕمەوە.. ئێوەش لە لێکدانەوەیدا یاریدەیەکم بدەن، هەرچەندە خەونەکەشم گیردەستەو مانا کەشی لێ پەناداوین. لەخەوما دیتم:

زیندەگانیم بەجێ هێشت و بوومە پاسەوانی گۆڕستانی سەر ئەو کەژە رەقەنە رووتەنەی کۆشکی مەرگی بەسەرەوەیە. پاسی ئەو دارتەرمانەم دەکردن وەك تالانی سەرکەوتن دالانە تاریکەکانیان پێ هەڵ چنرابوون. دەم بینی؛ ئەوانەی لەنەبەردی ژیان دا گلاون ئێستا هەلاژیاوی نێو ئەو تابووتانەن کە بەشووشە داپۆشراون؛ بەخێسەی ترسناکەوە زەق تەماشایان دەکردم.. ئەو بۆنە خۆشە ئەبەدییەی هەڵی مژی هەر ئەو تەپوتۆزەیە کەلەگیانمەوە هەڵ دەستێ و هیلاکی دەکا.. تۆزێکەو هێندە قورسە ناتوانم لەگیانمی بتەکێنم!

تارمایی تاریکی و تەنیایی و دەنگ دانەوەی شەوگار گەمارۆیان دابووم.. تەنیا هاوڕازم کشوماتی مەرگ بوو کەقەدەرێ ناقەدەرێ لرخەی گیانەڵای تێدا بەرز دەبووەوە..

کلیلە ژەنگاویەکانم هەڵ گرتبوون، ئەو دەرگا قایمانەم پێدەکردنەوە کەسیڕەی گریژنەکانیان هێندە ناسازو بەد بوو پڕ بەدالانەکان دەنگی دەدایەوە، سەردەران و شیپانەکانیان لەباڵی ئەو پەلەوەرانە دەچوون کەلەکاتی هەڵ نیشتن دا بەئاگادەهێنرێن و تەپاو تل خۆیان کرژ دەکەنەوەو دەی کەنە قاژەو قیڕە.

دوای ئەو دەنگدانەوەیە کەشەوگار کپ دەبوو بەتەنێ ئەو پەڕی ترسم لێ دەنیشت و لەبێ دەنگی ترسناکەوە دەگلام. ئەگەر دروست بێ ئەو جۆرە خەونانە کاتیان هەبێ ئەوا کاتەکە لەسەر خۆ تێپەڕی، تا ئەو رادەیەی شتێك ڕووی‌داو بەحەپەسانەوە لێی بەهۆش هاتم.

سێ‌جار دەروازەکە لێ دراو بەچەشنی هەورە تریشقە دەنگی دایەوە.. دالانەکانیش وەك نرکەی شێر دەنگیان لێوە دەرچوو. لەکلۆمەکە هاتمە پێشەوە چەند خەریك بووم هێندەی گرێ قامکێك نەبزووت، گەردەلوول هەڵی کردو بە قایمی لەگریژەنەی بردو تابووتێکی ڕەشی هاویشتە لام.. رەشە با لوولی داو بەگڤە گڤەوە تێکی شکاند.. ئیدی هەزاران قاقاو حیلکەی لێوە دەرچوو.. بەهازاران منداڵ و فریشتەو کوندو شێت و وێت و پەپوولەی زل زل بەدەورم دا کردیانە باز بازێن و گاڵتە پێ‌کردنم. ترسێکی بێڕەزام لێ نیشت.. ئیدی نەمزانی چۆن ڕەهێڵ بووم و کەوتمە سەر زەوی و کردمە هاتو هاورێکی ناساز؟! سەرەنجام بەحەپەسانەوە لەقیژەی خۆمەوە بێدار بوومەوە.

زارا قەدەرێك واقی وڕما!.. هەر ئەوەندەی زانی: ئەوا خۆشەویسترین مریدی راست بووەتەوەو دەستی دەگرێ و دەڵێ:

((لێدانەوەی خەونەکەت لەخودی ژیانی خۆت دایە.. ئەرێ زارا! تۆ ئەو تابووتە نەبووی کەژیانت هەرچیەکی هەبوو لەخراپەو بەدی و فریشتەی مۆن تێتی ئاخنین؟! ئەی هەر زارا نەبوو کە بەحیلەی منداڵانەوە بەسەر گۆڕەکان دا تێ دەپەڕی و گاڵتەی بەئێشك چیەکانی گۆڕستان دەهات و گاڵتەی بەهەموو کلیل بەدەستێك دەکرد کە بەدرنگەو خڕە خڕەوە ئەم دیواودیوی دەکردن؟! لەمەولا ئەوانەش لەتۆ دەتۆقن، قاقای

پێکەنینەکەت بێهۆشیان دەکاو دەیانخات بەزەویدا.. دواتر بێداردەبنەوە. ئا بەم ڕەنگە دەسەڵاتت بەسەریان دا دەشکێت.

لەئاسۆوە ئەستێرەی تازەت لێ وەدەرخستین، ئەو بەهایەی لەشەودا پێمان نەدەزانی بۆت پەخش کردین.. بەڕاستی پێکەنینەکەی خۆتت بەسەرمان دا ڕەواندەوە.. ئێمەش وەك چەتری ڕەنگاو ڕەنگ کردمانە سایە تریقەی منداڵان لە تابووتەکانەوە بڵند دەبێتەوە.. لەڕەنج و زەحمەتی کوشندەوە زریانێك هەڵ دەکاو لەمێژەوە بەتەمای بووین.

نەفسی خۆت دەوری دوژمنەکانتی بینی، خەونەکەشت بێ زاری کردی.. بەڵام بەئاگاهاتیو خۆت لێ داڕنینو ترست نیشتەوە. دیسان ئەوانیش دێنەوە سەر خۆیانو دەگەڕێنەوە بۆلای تۆ.

ئابەو ڕەنگە مریدەکەی قسەی خۆی دەربڕی. ئیدی یارانی لێی کۆبوونەوەو نەوینە دەستی تا قایلی بکەن لەجێگاکەی ڕاستەوەبێو خەم نەخواو بگەڕێتەوە نێو دۆستەکانی.. بەڵام زارا لەسەر خەوگاکەی لێی دانیشت، وەك کەسێکی گەڕاوەی دوورە سەفەر نەپەرژێتە سەر ئەوەی کەکێی لەدەورەیە ئاوا چاوی زەق کردنەوە.. بەڵام ئەوان وازیان لێ نەهێناو ڕاستیان کردەوەو ڕایان گرت. خێرا بەهۆش هاتو ڕەنگوڕووی گۆڕا. ئەوجا کەوتە پەنجە تێ وەردانی تاڵە ڕیشەکانیو بەقیژەوە گوتی:

هەموو شتێك لەوادەی خۆیدا دێتەدی، ئەو شتانەش زەمانی خۆیان دێتە بەرەوە.

کەواتە هەر لەئێستاوە خواردنێکی خۆشمان بۆ ساز بکەن.. تامنیش ئێزای خەونەکەم ببژێرمەوە.. با نجومگەرەکەش لە تەکما بخواو بخواتەوە.. پاشان دەریایەکی پیشان دەدەم کەخۆی تێ فڕێ بداو بۆ خۆی بخنکێ. بەڵام چاوی بڕینە دۆستە خەون لێی دەرەوەکەی، سەری ڕاوەشاندو بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی لێ نەتروکاندن.

زارا ئاوای گوت...

# سەرگەرد

رۆژێکیـان زارا بەسـەر پردێـك دا تـێ دەپـەڕی، کۆمـەڵێك شـەل و کوێـرو ناتـەواو دەورەیان داو قەمووریکیان لێی هاتە پێش وپێی گوت:

((زارا! بەلای گـەل دا ئاوڕێك بدەرەوە؛ چونکـە گـەلیش کـەڵك لەپەیرەوی یـەکانت وەردەگرێ.. ئەوا خەریکە باوەڕ بەرێنمایی تۆ بهێنێ، ئەوجا بۆ ئەوەی باوەڕی گەل بەتۆ قایم بێ پێویستی بەیەك شتە: ئەوەیە کە بـەر لەهـەموو شـتێك ئێمـەی گـێڕو نوقسان و هـەڵ بژاردەی گـەل دڵنیـا بکـەی.. ئـەوجا بـۆ ئـەزمونی خـۆت ئـەوا چـەند سەرێکی هەڵ بژاردەو تێ هاتەت لەبەردەم دان و تازووە ئەم هەلە لەکیس خۆت مەدە؛ ئێسـتا دەتوانـی کوێـرو گـردە نشـینەکانیان چـاك بکەیتـەوەو شـەکەتەکانیان بحەسێنیتەوە. ئەمە بەرێگەی زامن بۆ رێنمایی گەل و باوەڕهێنـانی بـەزاراو مایـەی دڵنیابوونی.

زارا وەڵامی دایەوە:

ئەو کەسـەی پشتی قەموور چاك بکاتـەوە، ئـەوا ئـەو زیرەکیـەی هەیـەتی لێـی دادەڕنێ.. ئەمە ئامۆژگارییگەلە. ئەگەر بینایی بگەڕێتەوە بۆ چاوی کوێر ئەوا هـەموو شتە دزێوەکانی سەر زەوی دەکەونە بەرچاو؛ ئەوسابە نەفرینەوە ئەو کەسە دادەشوا کـە چـاوی بـۆ چـاك کردوونەتـەوە. ئەگـەر شـەلەش قـاچی ڕەهابـێ ئـەوا ئـازارێکی قورستری بـەمیرات دەکـەوێ؛ چونکە هـەرچی ریسـوایی هەیـە لەسـەر شـانی کەڵەکـە دەبێ و بەرەو مەبەستی خراپەکاری بەیەرغە هـەڵنگیدەدا.. ئەمـە ئەو ئامۆژگارییەیە کە گـەل رای دەگەیـەنێ. ئیدی پێویست دەکا ئـەوی گـەل لـەزارایوەرگرتووە زاراش لەگەڵی وەربگرێتەوە؟

لەوەتی دابەزیومە نێو خەڵك و خواوە بەلامەوە کارێکی ئاسایی و ئاسانە بنۆڕمە کۆمەڵانی گەل کە:

ئەمـەیان یەکـەڵ چاوە.. ئـەویان گوێیـەکی بـڕاوە.. ئـەمیان بێقاچـە.. ئەوانـە بـێ زبانن.. ئەمانەشیان بێ کەپوون.. ئەوەش کۆمەڵێکی دی کە بێ سـەرن. ئابەو چەشنە

شتە ناشیرینەکانم دیتن.. لەوانەش درێو تر چەند شتێکن باسم نەکردوون و ناشتوانم لەزوربەیان بێ دەنگ بم!

زەلامم دیتوون هەمووشتێکیان لەدەست داوە بەڵام برێ شتی لەئەندازە بەدەریان ماوە؛ لەوە دەچن یەك چاوی زل بن، یان دەمێکی فراوانی داپچڕاوبن، یان ورگێکی زل.. یان هەر تاقە ئەندامێکی زلی ناقۆڵابن. ئەم پیاوانە بریتین لەو زەلامانەی خاوەنی نەنگی و ناتەواویی پێچەوانەن.

لەکەنارگەی خۆم داپەڕیمە خواریێ و گەرەکم بوو–بۆ یەکەم جار بەسەر ئەو پردەدا تێ بپەڕم کە چ لەنێوقەدا بەحەپەسانەوە راوەستام، ئەوەی بەچاوی خۆم دیتم هەرگیز بڕوام پێنەدەکرد، گوتم: خۆ ئەوە هەر گوێیە؟!.. گوێیەکی فراوان و هێندەی بەژنی زەلامێکە، لێی هاتمە پێشەوە.. لەو دیویشەوە شتێکی باریکەلەم بەدی کردوو دەش جوڵایەوە، هێندە زەبوون بوو بەزەییت پێدا دەهاتەوە؛ تومەز ئەو گوێ زلە لەسەر یەك لاقی ریوەڵە خۆی هەڵ ناوە.. ئەو لاقەش بریتییە لەمرۆڤێك. بێت و بەچاویلکەوە لەو شتە ورد ببویتایەتەوە روویەکی مۆنی زرگنت لێ وە دەردەکەوت.. گیانێکی بێ نموودت تێدا بەدی دەکرد کەلەسەر بنکەی خۆی هەڵ دەلەرزی و خۆی هەڵ دەئاوساند!

گەل پێی گوتم: وەنەبێ ئەو گوێیە هەر پیاوێك بێ و هیچی دی.. بەڵام وێرای ئەوەش مەردێکی مەزن و بلیمەتی زەمانەیە. جگە لەوەش رۆژێ لەرۆژان کە گەل باسی گەورە پیاوانی کردبێ لێم نەسەلماندووەو بەرۆکی باوەڕی خۆشم بەرنەداوە: (ئەوە پیاوێکەو خاوەنی نوقستانیی پێچەوانەیە؛ چونکە لەهەموو شتێك دا کەمی هەیەو لەیەك شت دا زۆری هەیە.)

پاش ئەوەی زارا گوتارەکەی ئاراستەی ئەو قەمووره کرد کەنوێنەری گەل بوو بەپەستییەوە رووی وەرگێڕاو قسەی بۆ مریدەکانی کرد:

((بەڕاستی لەنێو مەردمگەل دا دەڕۆم واهەست دەکەم بەنێو پەردو ئەندامە لەشی پەرپیودا رەت دەبم، ئەمەش دیمەنێکی بەسامەو دەکەوێتە بەرچاوم؛ چونکە ئەوەی دەیبینم دەڵێن پارچە لەشی داپچڕاون و لەقەسابخانەدا هەڵ دراونەتەوە، خۆ ئەگەر ئەم چاوانەم لەحاڵی حازر رابکەن و پەنا ببەنە بەر رابووردوو ئەوا بەرەنگاری هەمان دیمەنی ناساز دەبنەوە.. دیسان لەوێش هەمان پەردووە..هەمان وێرانەیە..هەمان

دەستو پـای کۆتولەتـە.. هـەمان ڕووداوی تۆقێنـەرە.. بـەڵام ئـەوەی پیاوبـێ نایەتـە بەرچاوم..

یاران! ئەوەی تینم دەگەیەنێتێ زەمانی ئێستاو رابووردوویە. بێتو هەڵ کەوتی دوارۆژم نەدۆزیایەوە بەرگەی ژیانم نەدەگرت. زاراش تێکڕا چاوێکەو هێندە بینایە پەنـهانی دەسمـێ..داهێـنو خۆڕاگــرە.. لــەخۆی دا دوا ڕۆژو گوزەرگــەی دوارۆژە. داخیشم ناچێ کەسەقەتێك بەسەر ئەو گوزەرگەوە خۆی قنج دەکاتەوە!!

دیسـان ئێـوەش دەپرسـنو دەپرسـن: زارا کێیـە ؟ بـەچی نـاوی ببــەین؟ بێجگـە لەپرسیار هیچ وەڵامێك بەدەست ناهێنن، منیش بۆ خۆم هەر بەو چەشنەم.

ئایە زارا ئەوکەسەیە بەڵێن دەدا یان بەڵێن جێبەجێ دەکا؟.. داگیرکەرە یان میرات بەرە.. پزیشکە یان ئەو نەخۆشەیە چا کەوەبووە؟ ئایا شاعیرە یان پیاوی راستییە.. رزگار کەرە یان خۆسەپێنە؟ تۆ بڵێ: پیاوچاکە یان پیاوخراپە؟!

من هـەر ئـەو کەسـەم کـە لـەنێو خـەڵکیدا بـەچمکێکی ئـایندەدا دەڕۆم.. ئـەویش لەدیارو نادیارەوە دێتە بەرچاوم، هەموو بیری خۆشم خـەریك کردووە بەکۆکردنـەوەو یـەك خسـتنی ئـەو شـتەی بەسـەرنهێنییەکانو کوێـرە ڕێکەوتەکانـەوە پەرشـوبڵاو بووەتـەوە. من نـەم دەتوانی مرۆڤ بم ئەگەر مرۆڤ شـاعیرێکی نـهێنی شـیکەرەوەی سـەرگەردی براکانی نەبووایە لەبەر ئەو شتە مەی کە بەکوێرە ڕێکـەوتو رۆژگـاری ناودەبەن. خۆ کردنە قوربانیش لەپێناو ئەوانەدایە کە ڕۆیشتوونو لـەپێناو ئەوەش دایـە (هەرشـتێکی کـە بـووە) بیگـۆڕی بـۆ ((ئەوشـتەی دەتـەوێو مەبەسـتتە)) بـەو مەرجەی کەبووە![26] تەنیا خودی ویست دڵسۆزو مزگێنی دەری شادییە. هاوڕێیـان!

---

[26] ئەم بەندە نووسینەی زارا هێندە دژوارە بێتو کوێرە ڕێکەوتو زەمانەی بۆ نەبەزێنین هیچ بەهیچ ناکەین. بوونە مرۆڤایەتییەکەی ئەم کابرایەو هەڵ کشانی بۆ ئەولای زاتی خۆی نەکردووەتە رووداوی رەبەق ورەها؛ بۆیە مەرجی هێنانە دی لەخەیاڵ چرپی شاعیر گـرێ داوە کەئەودیوی سنوربکەوێو بەرزەخەکان بسمێ. کار بە ئەوەشەوە نەوەستێو لەپێناو ئەو ئافەریدەی ئـەو مەبەستنی لەگەڵ ستەمی دەهـردا دەسـتەویەخە بـێ، هـەموو شـتێکی هەبوو لەڕابردوودا، بگۆڕدرێت بخرێتە ژێر رکێفی (هێزی ویست) لەئێستا وئاییندەدا، ئەو بوونەوەرەی لەمەرجی رابووردووشەوە گلاوە، دەبێ قوربانی لەقەبەڵ بکرێو کەمەندکێشی

ئەمە پەڕەوێکە و ئێوە ی پێ فێردەکەم.. دەبێ بشزانن کەهێشتا ئەو (ویستە) بەندییەکی دەست بەستەیە.

ویست لەخۆیدا ڕزگار کەرە.. بەڵام دەبێ ئەو هێزە خودی ڕزگار کەرەکە دەبەستێتەوە چی بێ؟

تاکە دەردی ((ویست)) بریتییە لەوشەی (هەبووە) ویست بەرانبەری ئەو وشەیە ددانی دەسوێتەوەو غەزبناکەو لەچەمکی ((هەرچییەکی بووە)) بەمەرام ناگا، ئیدی ویست بەدبینانە سەرنجی ((هەرچیەکی نەما)) دادا. بۆشی نیە کە بەرەو دواوە هێزی خۆی تاوبدا. لەوە زەبوون ترە کەزەمانە و ئەوەی زەمانە گەرەکیەتی تێکیان بشکێنێ.. ئەمەش دەردێکەو خۆی بۆ ویست حەشارداوە.

گوتمان ویست ڕزگار کەرە .. بەڵام تێ ڕامانی ویست بۆ خۆڕزگار کردنی لەو دەردەو بۆ ڕووخاندنی دیواری بەندیخانەکەی دەبێ چی بێ؟

داخەکەم! هەموو بەندییەك شێت دەبێ، ویستیش ئەگەر دێوانە نەبێ هەرگیز ناتوانێ خۆی قوتاربکا.

زەمانە بۆ دواوە ناگەڕێتەوە، هەر ئەمەشە کە رقو مەکری ویست دەبزوێنێ.. بەردە عازەبەیەك لەگۆڕێیەو ویست ناتوانێ هەڵی برێ، ئەو بەردەش بریتییە لە: ((فرمانی هەڵ کەوت= الأمر الواقع))

سەبارەت بەوە بەرقەوە ویست دەیکاتە فەرتەنەو درەختەکان لەڕیشەوە هەڵ دەکەنێ.. هەرچی لەگەردش و مەکردا شان لەشانینەدا ئەوا تۆڵەو سزای دەگەیەنێتێ.. ئا بەو چەشنە ویستە ڕزگارکەرەکە دەبێتە هێزێکی بەدکارو جامی غەزەبی بەسەر ئەوانەدا قلْپ دەکاتەوە کە رازین بەوەی- ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ زەمانی (ئەو شتەی نەماوە). ئایا تۆڵەی ویستیش هەر ئەوەندە نیە کە لەزەمانە بەرگەشتەیە؟. چونکە ئەو شتەی زەمانە بیخاتەوە ویست دەسەڵاتی پەرچ دانەوەی نیە.

---

ویستی لەمەڕ ئێستا بێ...کەواتە ئەی ئەندێشەو تێڕامانی شاعیرانە.. ئەی سەرگەردی ستەمی کوێرەڕێکەوتو زمانە بەفریابێنو دەستم بەدامانتان؟!

ئالانی

بەڕاستی ویستی ئێمە هەنگاوتەی شێتی‌یە، لەوەتی شێت بوون فێری بیر کردنەوە بووە ئادەمیزادیش نەفرینبار بووە، ئا بەو ڕەنگە لەهەموو زەمان و شوێنێك دا سزا دەبێتە یاوەری ئازار.. تۆ بڵێی بیری تۆڵە جەڕابێ بەنەفسی خۆیەوە؟.. ئەوجا بێین و بڵێین وشەی تۆڵە بێژەیەکی درۆزنانەیە و دەربڕی مەبەستە لەکانگای دڵەوە. هەموو خاوەن ویستێك لەخۆیدا ئازارمەندە چونکە ناتوانێ بۆ سەردەمی رابووردوو بابداتەوە تا ئەو شتەی نەماوە بی هێنێتەوە.. ئا لەبەر ئەوە دەبێ ویست و سەرجەمی ژیان ببنە کەفارەت و ئێزا و سزا.

بەهۆی ئەم بیرو باوەڕانەوە ((هۆش)) خۆی خزاندە هەورانەوەو شێتایەتی لێ هەڵقوڵاو هاواری کرد: هەموو شتێك نامێنێ و هەموو شتێك شایەنی نەمانە. خودی داد فەرمان دەدا کە زەمانە رۆڵەکانی خۆی بکاتە نێچیرو تێکیان بشکێنێ، ئەمەش کارێکەو (شێتی) رای گەیاندووە، نامووس و یاسای ئەدەبیش رێکی ماف و سزاکان دانراوە. کەواتە چۆن لەدەست لافاوی ڕووباری ژیان قوتاربین کەژیان لەخۆیدا بریتی بێ لەسزا؟.. ئەمەش هەرئەوەیە کە شێتی جاڕی داوە. ئێمە ناتوانین تاکە ڕووداوێك لەهەبوون-دا بسڕینەوە، ئەی دەبێ سزا بتوانێ ڕووداوەکان نەهێڵێ؟.. ئەی دەبێ بۆ بێجگەی ئەو کارانە لەهەبوون دا نەمرایەتی هەبێ کە یەکبینە ((کار)) دەکا بە ((سزا)) و سزاش دەکا بە کار؟.. تاوەکو ویست نەگاتە ئەو ڕادەیە کەلەزاتی خۆی نەبان و بەرگەشتە بێ هەرگیز لەو بازنە بۆشە رزگار بوونی بۆ نیە.. ئەوساکەش دەبێتە ویستێکی دوورەوە خراوی بەرگەشت.

برادەرینە! ئێوە شارەزای ئەو گۆرانیانەن کە شێتی دەیان لەوسێنێ. کاتێ فێرم کردن کە ویست خوڵقێنەرە مانای وایە لەبیستنی ئەو گۆرانیانە دوورم خستوونەتەوە. ئیدی ((هەرچی‌نەما)) بەچەشنی رازو ڕێکەوتە نایابەکان پەرشوبڵاودەبێ. ئەمەوایە- تا ئەو کاتەی ویست هەڵ دەداتێ: من خۆم ئەمەم ویستووە، پاشان دەڵێ: ئەمە ئەوەیە کە ئێستاکە دەمەوێ و لەمەولاش.. سبەینێش هەردەمەوێ.

ئایا تا ئەمرۆ ویست بەم شیوەیە هاتووەتە زمان.. ئەی گەنگێ دەی‌درکینێ؟ تۆ بلیی لەبەندو کۆتی شیتی خۆی دامالی بێ و بەهەموو -ورەیەکی‌یەوە خۆی کردبیتە سەرگەردی ڕووداوەکان و مژدەی شادی ببەشیتەوە، یان ویست هاتبیت و بیرۆکەی

تۆڵەی فڕێ دابێتە ئەولا، ئیدی ددانی لێ نەکرۆژێ. ئەی دەبێ کێ توانی بێتی فێری باشاری رۆژگاری بکا.. بەڵکو فێری شتێکی بکا لەژوور ئەو باشارکردنەوەبێ؟!

دەبێ ویستی توانا خواستی خۆی ئاراستەی شتێك بکا لەباشارو خۆلە گەڵاگونجاندن مەزنتربێ.. بەڵام ئەمە دوورە و بۆی ناکرێ؟! ئەی دەبێ کێ فێری بکا، هەمان خواست بەرەو رووی (ئەوشتە بکا کەنەماوە)؟

زارا خێرا لەقسە وەستا.. هەروەکو ترسێکی توند دای گرتبێ چاوی زەق بوونەوەو کەوتە لێ هەڵ ڕوانینی هاوڕێکانی.. بەڵام هێندەی نەخایاند کەوتەوە پێکەنین و لەسەرخۆ گوتی:

لەنێو خەڵکیدا ژیان سووك نابێ؛ چونکە بێ دەنگی بۆ مرۆ کارێکی سەختە نەخوازەڵا ئەو مرۆیە چەنابازبێ!!

زارا ئاوای گوت.. بەڵام ئەو قەموورەی گوێی بۆ ئەو گفتۆیە گرتبوو، بەچەمۆڵەش دەموچاوی خۆی شاردبوونەوە، قاقای زارا سەرسامی کردو چاوی کردنەوەو گوتی:

بۆچی زارا بەشێوەیەك ئێمە دەدوێنێ کەجیاوازە لەو شێوەیەی مریدەکانی خۆی پێ دەدوێنێ؟

زاراش گوتی: بۆچی دەبێ ئەمە شتێکی سەمەرە بێ؟ گوایە بۆچی دروست نەبێ کە(قەمور)یش بەقسەی دووجارە قەموورانە بدوێنرێ یان بدوێ؟

قەموور هەڵی دایە:س قەیناکا.. با زارا وەك مامۆستای منداڵان مریدەکانی بدوێنێ..بەڵام بۆچی زارا بەشێوەیەك شاگردەکانی دەدوێنێ کەجیاوازە لەو شێوەیەی نەفسی خۆی پێ دەدوێنێ؟!

## پەندو دانایی ئادەمی

وەنەبێ بەرزاییەکان ترسێنەربن.. بەڵکو قوڵاییەکان شتێکی ترسناکن. لەنزمانیدا چاو بەسەر کەندڕدا دەڕوانێ و دەستیش بەرەو لووتکە خۆی ڕادەدا..ئەوجا گێژەنی جووتە (ویست) دڵ لەگیروگاز دەنێ.

یاران! ئایە ئێوە دەزانن کە ویستە دووفاقەکەی من چیە؟ ئەوەتا ئەنگێزو مەترسی گێژم دەدا؛ چونکە لەشۆڕبوونەوەمدا چاو دەبڕمە بڵندانی، لەحەواش ڕا پەل بۆ پاڵ

پشتێك دەكوتم. لەلایەكەوە ویستی خۆم بەمرۆڤەوە بەستووەو شەتەك دراوی كۆت و پێوەندەكانم، لەولایشەوە دەمەوێ لەو مرۆڤە ئاسایی‌یە خۆم قوتار بكەم و بەندیواری تەنیا مرۆڤی بالآبم و ویستی دووەمم هەر بەرەو ئەمیان تەكانم پێبدا. حالّم لەنێو خەڵكی‌دا وەك كوێرێكە نەزانێ كێی لەدەورەیە، ئەوجا بۆ ئەوەی كەدەستەكانم متمانەی لەدەست نەدەن بۆ ئەوە خۆیان دەكوتن بەسەرپالْ پشتێكی پتەودا بكەون.

خەڵكینە! من ناتان ناسم.. ئەمەش تاریكستانی‌یەكە و خۆمی‌تێوە دەپێچم، بەڵكو پرسەیەكەو پەنای بۆ دەبەم.

ئەوا من لەبەردەم دەروازەدا ڕۆنیشتووم‌و روو دەكەمە سێ بەندی‌یەكان و دەقریشكینم: ئا دەی! كێ دەیەوێ لەخشتەم بەرێ بالیم بیتە پیشەوە؟.

یەكەم پەندی ئادەمی ئەوەیە كە تەسلیمی فریودانی خەلك بم.. ئەمە پەندیكەو دەبێ ئیشی پێ بكەم.. تەنیا لەبەر ئەوەی كەلەنیو مەردومگەل دا فیلباز هەن پێویست ناكا بەناچاری خۆم بپاریزم.

ئەگەر من لەجیهان دا هەلویستی خۆ پارزتنم وەربگرتایە ئایە مرۆڤ دەی توانی بالۆنەكەم قورس بكاو نەی هیلێ بەرەو ئاسۆی بەرین بەرەلآبێ و تێبتەقینێ؟

كەخۆم لەئاقار خۆپارازتن گیل كردووە ئەوە گرنگی بەخۆدانیكەو تا نەم گەیەنیتە چارەنووس خۆم لێ خافڵ نابێ. ئەگەر لەهەموو كاسەیەك گوریزبكەیو لیی نەخۆیەوە ئەوا لەتینوان دا دەخنكیی.. ئەگەر بشتەوێ لەنیو خەلكی‌دا پاكیزەبی پێویستە خۆت رابهینی كە بەئاوی پیس خۆت بشۆی! ئای چەندە لەگەڵ دلی خۆم دا كەوتمە رازو پرسە و پیم دەگوت: ئەی پیرە دلەكە! دەئەوجا بۆخۆت بسرەوە. ئەگەر وەك نازو نیعمەتیك چاوت بریونەتە تۆلە سەندنەوە ئەوا تیی‌دا سەرناكەوی.

ئەمەش دووەم پەندە ئادەمی‌یەكەی منە: هیندەی لەتەك خۆشەكینەوەدا— دەسازیم كەمتر لەتەك لەخۆ بایی بوودا— دەگونجیم؛ چونكە زەخمی لەخۆبایی بوون كانگای گشت بەلآیەكە.. بەلآم برینی خۆشەكاندنەوە شتی چاكتری لێ سەوزدەكەین. ئەوانە دەربایستی كەسایەتی خۆیان نین‌و هیچ دەوریكی نادەنێ. ئەوجا منیش وەهام پی خۆشە لەنیو ئەوان را بنۆرمە ژیان، چونكە بۆ نەخۆشیی سەودایی دەرمانی چاكن.. لەتەك بایی‌بووەكان دا خۆم دەسازینم؛ چونكە حەكیمی خەم رەوینن، بۆ ئەوەش مرۆڤ لەبەرچاوم دا بكەنە ئەكتەریك‌و وەستای چاكن!

سەرەرای ئەوەش کێ دەتوانێ لەسەر کـزی بـایی بووەکانـەوە خـۆی بگەیەنیتـە قووڵاییـیەکان! بۆ ئەو نموونە ئادەمیانە خیرم گەرەکەو هیندە بێ نموودن بـەزەیم پیـدا دینـەوە.. ئـەو بـێ نمـوودە لـە خۆبـاییبووە دەیـەوێ (بروابـەخۆبوون) لـەئیوە دابتاشێو خۆراك لەنیگاکانتانەوە- وەربگرێو سوالی ستایش لەچەپلـەکوتانی ئیوە بکا.. مەردومی ئاوا هیندە خۆش باوەرە هەر ئەوەندە وەستایانە لەبارەیەوە درۆی بۆ هـەڵ بریـژی دەی سـەلمینێ.. سـەرگەردانیکە هـەر ئـەوەندە بچەقیتـە نرخـو بـەهای خۆیەوە دەکەویتە گومانەوە. ئەگەر پەسندایەتی راستەقینە لەزاتی خـۆی بـێ ئاگابێ ئەوا کەسی لەخۆ باییبووش لەبارەی نەوازشیەوە شتیکی لی دەزانێ.

سێیەم پەندی ئادەمیانەی من لەسەر ئـەوە بـەندە: کـە ریگـە بەشـەرم شـکۆی ئیـوە نەدەم بم تۆرینێو نەهیلێ تەماشای خراپان بکـەم. مـن هـەر چـەندە سـەرنجی ئـەو ئافـەریدە سـەیرو سـەمەرانە بـدەم دلـم دەکریتـەوە؛ ئەوانـە بوونـەوەریکنو هـەتاو فەراهەمیان دەهینێ؛ وەك : گەلە پلنگو دار خورماو ماری زەنگۆلە دارو شتی دیکەی سەیرتر. ئای کە لەنیو خەلکیدا ئەو نموونە سەمەرانە زۆرنو هەمووشیان بەگەرمای خۆر لەهیلکە جووقاون. لـەنیو ئـەو خراپانـەش دا زۆر شـتی نـاوازەو نایـاب دەسـت دەکەوێ.

بەتێ روانینی مـن کامتـان زۆر هۆشمـەندە ناگاتـە دوا پلـەی دانـایی. هـەروە بـەلای منەوە (خراپە)ش زیاد لـەخۆی وەسفی دراوەتێ، زۆر جار بەگومانـەوە لەبەرخۆمـەوە پرسیومە: ئەوە بۆچی مارەکان یەکبینە زنگۆلەکانیان دەترنگینن؟

هەموو شتیكو تەنانەت خراپەش ئایندەی خۆی هەیە. تا ئەمرۆکەش خۆرەتـاوی قرچـەی نیـوەرۆ -لەوپـەری گرشـەی هـەڵاتنیدا- بـۆ مـرۆڤ دەرنەکـەوتووە. لـەم رۆژگـارەدا زۆر شـت هەیـەو بـەخراپ دادەنـری، کـەچی قەبارەکـەی لەسـیزدە پـێ تیناپـەرێو لەسێمانگیش پتر نامینیتـەوە، لەمـەولاش شـتی لەوانـە گـەورەتر لـەدایك دەبێ. پیویستە ژیان ئەژدەریکی باڵا بخولقینی کە شایانی مرۆڤی باڵا بێ. لەمـەولا رۆژە سوتینەرەکان گەرمایی داهینان دەگەیەننە ئەو دارستانە ناسكو ئاودارانەوە کە هیشتا هیچ دەستیکیان وێ نەکەوتووە.

چار نییە دەبێ کیوی یەکانتان ببنە پلنگ و دووپشکە کانیشتان ببنـە تیمساح؛ ئەوجا راوچی نیو جەنگەڵ بەنیچیری خۆی خەنی دەبێ.

ئەی گرۆی کارخاس‌و دادخوازان! بەراستی لەنیوتان دا گەلی شتی پیکەنیناوی هەیە.. ئەو شتەی ناوتان ناوە شەیتان‌و لیشی دەترسن بەراستی دەم هینیتە پیکەنین. مەودای گیانی ئیوەو شتە مەزنەکان دوورە. ئەگەر مرۆڤی بالاتان بەکارچاکی‌یەوە لی وەدەرکەوت ئەوا ترس‌و لەرزتان بەمیرات دەخا . ئەی دانایان‌و زانایان! هەر ئەوەندە دانایی‌و پەندیاری مرۆڤی بالا لەشادی‌و بێ پەروایی‌دا تیشکی دایەوەو گری‌تیبەردان ئەوا پشت هەڵدەکەن‌و دەرۆن.گەورەکان! ئاوا چاوم پیتان هەلەنگوت‌و باری نهینیشم هەڵ هینا. ئیستاش بۆتانی‌جار دەدەم: ئەو مرۆڤە بالایەی کەپیتان رادەگەیەنم ئیوە لەلای خۆتانەوە بەشەیتانی شەیتانەکانی ناودیر دەکەن!

ئەو گەورانە ماندوویان کردووم.. کامیان هەرە گەورەیە پتر لە پەلوپۆم دەخا، من حەز لەوە دەکەم بەسەر پلەو پایەی ئەوان دا رابوورم لە ژوور ئەوانەوە رووبکەمە مرۆڤی بالا.

کاتێ سەرتۆپی گەورەکانم لەبێ پەروایی‌دا دیتن راچلەکیم، روتورەوان هەستم کرد ئەوا هەردوو قۆلم دووبالیان لی پەیدا بوون بۆ ئەوەی بەئاسۆگەی زەمانی ئاییندەدا بسوریمەوەو لەو گەورانە هیجگار بەدووربم.. من روودەکەمە رۆژگاری هەرە دوور، بەرەو خۆرەتاوی نیو رۆکان مل دەنیم کە نوقمی ئەو رووناکی‌یانەن هیشتا هیچ هونەریك خەونی پیوە نەدیون. ئەوجا خواوەندەکان ئاشکرا دەبن‌و لەئاست هەر رووداویکی سەر زەوی شەرمەزار دەبن.

برادەرینە! .. کارخاس‌و داد خوازان.. خۆزگە لەحالەتیك دا ئیوەم دەدی کەخۆتان لی بگۆری‌بایەو ئەو خشلانەتان وەدەر بخستنایە کەبەلەخۆبایی‌بوون‌و فیزە بە هەلاوساون.. خۆزگە منیش خۆم لی دەگۆری‌و لەنیوتان دا رۆدەنیشتم.. تاوەکو خۆشم نەزانم من کیم؛ چونکە ئەمە دوا پەندمەو بەسەر پەندو دانایی ئادەمی‌یەوە قنج بووەتەوە.

زارا ئاوای گوت...

(مەندترین سەعاتی بێ چرکە)

یاران! ئەری ئەوەچیم لی بەسەرهاتووە؟!

خۆ بەتەواوی شپرزە بووم‌و ریم ویڵ کردووە.. بەداخەوە! زۆرم لەشان گرانە.. کەچی بۆ کۆچورەو هەی پیی لی‌دەکەم.. تەکان دەدەم لیتان بترازیم‌و بەجیتان بهیلم؟!

بەلێ، پێویستە زارا بگەڕێتەوە بۆ دۆخی گۆشەگیری خۆی، قەی ناکا.. خۆ ورچیش بەمۆنی و بۆلەیەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ مغارەکەی خۆی!.. ئەوە چیم لێ بەسەرهاتووە سەبارەت بەچی و کێ ناچاری کۆچورەوم دەکا؟!

بەلێ، ئەوە ئەمیرەکەمەو خەشم گیربووە.. خانمە کە قسەی لەگەڵ کردمو ئیرادەی خۆی بۆ جاردام.. برادەرینە! تا ئیستاش ناوی ئەو خانمەم پێ نەگوتوون.. ئەوە ((سەعاتەبێ دەنگەکە)) مەو لەبێ دەنگیدا رۆچووە، ئەمیرە جەزرەبەکەمەو دوینێ بۆ خۆی لەتەکما کەوتە قسە.

ئیستاش کە لەناکاو بەجیتان دەهیلمو بۆ ئەوەی دەرهەقم دلتان رەق نەبێ ئەوەی رووی‌دا لیتان ناشارمەوە و ریك بۆتانی دەگیرمەوە.ئایا دەزانن لەکاتی چوونە خەودا خەوخۆش لەچی دەترسێ؟ ترسیکەو لەبەری پێیەوە تا تەوقی سەری مەردوم دادەگریتەوە؛ چونکە تا زەوی لەژێریەوە نەخزی خەونەکان دەست پێناکەن. ئەوا چەند پەندیکتان بۆ دەهینمەوەو گویم بۆ رادیرن:

((دوینێ بەلای بێ‌دەنگترین سەعاتەوە زەوی لەژێر پیمەوە دەرچوو.. خەونەکانیشم دەستیان پیکرد، میلیش بەسەر سەعاتی ژیانمەوە وردەتەکانی دەدا. لەوە بەر کشوماتیی ئاوام بەدەوری خۆمەوە نەبیستووە.. ئای کە ترسی خستە دلمەوە! ((لیم بیستو بێ‌دەنگانە پیی گوتم: زارا! تۆ ئەمە دەزانی. هەر ئەوەندە ئەو چرپەیم لێ بیست زەندەقم چوو.. هاوارم کرد هوروژمی خوین کەللەی گرتم.

((بێ دەنگانە دەستی پێکردەوە: زارا! تۆ ئەمە دەزانی و ئاشکرای ناکەی.

چاو نەتراسنە لیی راپەریمو وەڵامم دایەوە: بەلێ من ئەمە باش دەزانم.. بەڵام نەم گەرەکە ئەوەی دەیزانم جاری بدەم.

((بێ‌دەنگانە گوتیەوە: ئەرێ راستەکەتۆ گەرەکت نیە= (لاترید))؟ .. زارا! لەتەك تۆمە، لەنەدیوی ئەم بەرەنگار بوونەوەیەدا خۆت مەشارەوە. وەك مندالٚ لەرزیمو بەگریانەوە گوتم: وای بۆ خۆم! دەمەوێ راستەورووبم، بەڵام ئەوە لەکیشی من دا نیە؟ بم بەخشە ئەم کارە گرنگەو لەژوور توانای منەوەیە.

بێ‌دەنگانە گوتیەوە: زارا! دەبێ بایەخی تۆچیبێ؟ دەقسەی خۆت بیژەو لیك هەلتەکێ.

گوتی: ئایه كەدەلیم ((گرنگ نیە)) ئەمە تەنیا وتەی منە.. كەواتە دەبێ من كێبم؟.
من چاوەروانی كەسیكم بۆ جاردانی ئەم وشەیە لەمن لەبارتربێ. من شایەنی ئەوەنیم بەرەنگاری چاوەروان بمو لەپای ئەودا لیك هەڵتەكیم.

بێدەنگانە گوتیەوە: تۆ كەنەتوانی بگەیتە ئەو –نابوودی–یەی گەرەكمە بۆچی باشی؟.. ئەو كالأیەی نابوودی خۆی پێ پۆشتەوپەرداخت دەكا ئەوە شتیكی سەختیان‌و پیست قایمە!

گوتم : بەراستی كەولی نابوودیم زۆر خۆی بۆ گرت. ئیستاش لەكن بنكەی بالأی خۆمەوە سرەوتووم. تا ئیستاش كەسی بۆ لای ترۆپكەكانی بالأی خۆم رێ بەدی نەكردووم.. توانیشم بەناخەكانی خۆم دا رۆبچم‌و بیان ناسم...

دیسان بێ دەنگانە گوتی: ئەرێ زارا ! خۆ تۆ بۆئەوە ئامادەكراوی جێگۆركێ بەكیوەكان بكەی. ئەدی ناتوانی دۆزەخەو قوولأییەكانی خۆشت بگویزیەوە؟

گوتم: جارێ قسەی من كیوەكانی رانەداون.. ئەوەی گوتوومە هیشتا بەگویی خەلك نەگەیشتووە . بەلێ، بۆلای ئەم جیهانیانە هاتووم.. بەلأم هیشتا پیوەندیم پیوە نەكردوون.

بێدەنگانە گوتی: ئەرێ تۆ چووزانی كەلەشەوگاری هەرە كشومات دا شەونم دەباریتە سەر گژو گیا.

لەوەلأم دا گوتم: ئەو كاتەی ریگەی خۆم دۆزیەوەو پییدا رەت بووم خەلكی گالتەیان پێدەكردم. لەراستیش دا ئەوساكە هەردوولینگم دەلەرزین. ئەوجا خەلك‌و خوا پییان گوتم: زارا! وادیارە ریگات هەلەكردووە. بەلكو وات لی هاتووە نەشزانی هەنگاو بهاویژی!

دووبارە بیدەنگانە گوتی : دەبێ گالتە پیكردنیان بەتۆ چ بایەخیكی هەبێ؟ ..
زارا! تۆ ئیستا لە فەرمان بەجێهینان رزگارت بووە؛ ئەوجا پێویستە هەر لەئیستاوە فەرمانداربی ئەی نەت زانیوە، ئەگەر كەسیك بەلای كۆمەلەوەزۆر گرنگ بێ دەبێ ئەو كەسە لەشتەگەورەكان دا فەرماندارو فەرمان رەوابێ؟

بەجێ هینانی ئیشی گەورە كاریكی گرانە.. لەئەوەش گرانتر ئەوەیە كە مرۆ فەرمانی گەورە گەورە داسەپینێ. گوناهیكت هەیەو شیانی لی خۆش بوونە؛ خاوەنی دەسەلأتی‌و ناشتەوێ فەرمان داسەپینی.

گوتم: خۆمن نەرەی شیرم نیە تاوەکو فەرمان دەربکەم. هەروەك بەگویم دا بچپینی گوتی: وشە بێ دەنگەکان بەتەنێ گەردەلوول بەرپادەکەن.. ئەوەی جیهانیك بەریوە دەبا ئەو بیرو باوەرانەن-وەك درابن بەسەر بالی کۆتردا- بەهەموولادا بڵاودەبنەوە.. زارا! تۆش وەك تارماییەك بۆ زەمانی ئایندە برۆ تێپەرە. ئا بەو چەشنە بەرەو پیش ملی ریگاکەت بگرەو جلەوی فەرمانداری بگرە دەستت.

گوتم: بەراستی شەرم دەمگرێو تەریق دەبمەوە.

بێدەنگانە دەستی پێکردەوە: پێویستە خۆت بکەیتەوە منداڵو شەرم نەکەی . لەبەر ئەوەی کە درەنگ بەپلەی لاویتی گەیشتووی هیشتا فیزی ئەولاویتییە بەرۆکی بەرنەداوی.. بەڵام کەسیك بیەوێ بگەریتەوە بۆ دۆخی مندالی، پیویستە بەسەر لاویتییەکەیدا زاڵ بێ. لەبیری خۆم دا نوقم بوومو هەل لەرزیم، ئیدی کەوتمە جوونەوەی قسەکەی لەمەوبەرم: ((نەم گەرەکەو ناتوانم)) لەم حەلەدا بەهەر چوار لام دا قاقایەك دەنگی دایەوەو جەرگو هەناومی بەردانەوە. دوا جار گوتی: زارا! بەرو میوەی تۆ گەییوە بەڵام بۆ خودی خۆت نەگەیوی، ئەوجا بۆ ئەوەی کەپتر لەدڵ رەقیدا نەرمونیان بێ پێویستە بابدەینەوە بۆ گۆشەگیریت.

دیسانەوە پیکەنینەکە بەرزەوەبوو، هەستم پێکرد ئەوا میرساتەکەم لێ جیابووەتەوە.. ئەوجا پتر نوقمی بێ دەنگی بووم، کەوتم بەسەر زەویداو سەرئارەقەی خۆم گەرام.

ئیستا، یاران! هەمووشتیکم پێراگەیاندنو ئیدی بۆ گۆشەگیری دەگەریمەوەو هەموو شتیکم لێ ئاشکرا کردن. بەلێ ئەوا بەجیتان دەهیلم.. دواتر فیرم کردن، بزانن کێ لەهەموو کەس پەنهان ترو بێدەنگترەو کیش گەرەکیەتی متەقی لیوە نەیە.

ئای داخەکەم، برادەرینە! چیتان پێبلیم لەلام هەیەو چیتان پێببەخشم هەرلەلام هەیە. کەواتە بۆچی هەر لەئیستاوە دەست بە شینەوە نەکەم؟! تۆ بلی بوومە پیاویکی رژدو چرووك.

هیشتا زارا ئەو قسانەی تەواو نەکردبوون خەمو پەژارە دای گرت؛ چونکە ناچاری کۆچورەو بوو.. بانگی گریانی لێ هەڵ داو کەسیش نەی توانی دڵ نەوایی بکا.. لەو لایشەوە تاریکایی شەو داهاتو زاراش بەتەنێ پشتی لەمریدەکانی هەڵ کردو لەتاریکەشەودا ئاوابوو.

# زەردەشت ئاوای گوت
# بەشی سێیەم

((کاتێ ئێوە تاسەی بلندایەتی دەکەن بۆ سەرووی خۆتان (هەڵ دەروانن.. بەڵام کەمن بەرەو ژوور هەڵ کشام (ئاگام لەوەش بوو کە لەژێر پێمدابوو. ئایەکەسی وەهاتان تیدا هەیە لەسەر لووتکەبێ و بشتوانێ پێبکەنێ؟. کەسێك بەسەر لووتکەی چیاکان دا دەورانی بێ گەمەی بەهەموو مەرگەساتیکی ژیان دێ گەمەی بەهەموو بەرەڵاگەو شانۆی ژیان دەکا.))

زەردەشت
خوێندنەوەو نووسین / بەشی یەکەم

# ریبوار

کە زارا روویکردە بەرزایی دوورگەکە نیوە شەو لای کردبووەوە.. بۆ ئەوەی پیش گەردو گولی بەیان بگاتە کەناریکی دیکە خیرا کەوتەرێ؛ چونکە لەوێ تووشی ئەو کەشتی یانە دەبوو کە بۆ ریبوار گواستنەوەی دوورگە بەختیارەکان راگیرابوون.

زارا کەوتە بیرەوەری کۆچو رەوی تافی مندالیو بەتەنێ، دیمەنی ئەو چیاو گردۆلکانەی بەخەیاڵدا رابووردن کە لەژیانی خۆیدا پییان هەڵ دەگەرا، ئەوجا گوتی:

((من هەر ئەوکەسەم کەبەگەشتو پێ هەڵ گەرانی چیاکان دا راهاتوومو پەروەردەی ئەو لووتکانەمو کەیفم لە پێدەشت نیەو ناتوانم ئۆقرەی تیدا بگرم. چیم بیتەرێو چیم پێ ببرێ لەباوەری من دا رووداوەکان لەکۆچو بالابوون بەولاوە تی ناپەرن.. ئەوەی لەم جیهانەدا دیتە بەرچاوم تەنیا ئەوەیان دەبینم کەلەدلم چەسپیوە، ئەو زەمانە تێپەری کەلە مەترسییەکانی بەختەوە چاوەروانی رووداوەکان بم. ئایە لەم رۆژگارەدا شتیك بەدەست دەهینم کەلەمەو بەر لەدلم نەچەقیبێ؟

لەئیستا بەولاوە هەر گۆرانیکی بەسەرم دابێ، گەرانەوەو خۆدووبارە بوونەوەمە.. دووبارەی ئەو زاتەمە کەبەتەواوی لە شتەکانو ئالوگۆری زەمانەوە گلاوە.. بەلام لەحالی حازرم دا لەسەر دواین لووتکەو لەبەردەم سەختترین ریگا بۆی وەستاومەتەوە.. ئیستاش بۆ ناخۆشترینو قورسترین کۆچ خۆم تیك دەنیم.

بۆ یەکیکی وەك من زۆر دوورە خۆی لەو سەعاتە لابدا کە هاواردەکا: ((تۆ بیری شانازیت گرتۆتە بەرو لووتکەکانیش لەنشیودا بەیەك دا دەچن.. تۆ بەم ریگایەدا تێ دەپەریو لەوەو بەریش دیتووتە کە دواین مەترسییەو خۆتی تێ دەهاویژی.. ئەمە ریگای هاتونەهاتەو بەلای تۆوە دواین پەناگایەو خۆتی بۆ دەرەتینێ.

تۆ بەریگای شکۆمەندیدا رەت دەبی دەشی ورەت بەرزبێ کەهەر بۆخۆت هیلی گەرانەوە بۆ لای خۆت ببری.. تۆ بەریگای شانازیدا بەتەنێ رادەبووریو کەسیش لەدواوە پالەپەستۆت نادا، پێیەکانت شوینەواری ئەو هەنگاوانەتیان سرینەوە کەبەسەر ریچکەکانی دواتەوە دیاربوونو بەئاسۆی ریگاکەوە شەقلی وشەی (نەکردە- مستحیل) دەرکەوت هەر کاتێ پلەو پەیژەکان لەژیر پیتەوە دەرچوون

چارنيەو دەبی بە تەوقەسەری خۆتـا هـەڵ بگـەریو بـەباری ئـەودیدا هۆبدەيتـەوەو پێبنێ بەدلی خۆتاو بەرەوژوور هەڵ بكشيتەوە ئەوجا ئەوەی بەلاتەوە شيرين بووە دەبيتە نۆشی گيانو چاكت دەكاتەوە.

ئەو كەسەی زياد لەخۆی رەنجابێو كۆششی بارگـە كردبـێ ئـەوەندە ناخايـەنێ تووشی داهيزان دەبێ، پيرۆزبايی لەو كۆششەبێ كە ورەو خواست بەتين دەكا. خيرو بير لەو زەويەدا نيە كەهەنگوين بەخشو شيردەربێ.. ئەوكەسەی بەتەمايە باوەش بەشتی زۆردا بكا باخۆی رابهينێو چاوبگيرێ ئەوديوی سنووری زاتی خـۆی بـێ. هەركەسێ مەبەستی بێ بەلووتكەدا هەڵ بزنێ.. پێويستە بەتوندو تۆلی ئاوەهاوە گـور ببەسـتيتەوە؛ چونكـە ئـەو جـۆرە كەسـانەی بـەملوموۆش‌و دزەوە دەكەونـە هەڵپشـكنين دەسـەلاتيان هـەر ئەوەندەيـە بـەديار بيروبـاوەری سـووكەلەو خـۆش دەستەوە هەڵ بويستن.

تۆش ئەی زارا! كەدەتەوێ سەرپاكی بەلگەكان بناسیو بەنيو شتە پەنهانەكان دا رابـووری دەبـێ بەسـەر زاتـی خـۆت دا بخولييتـەوەو ليـی دەرچـیو بـەرەو ژوورتـر ببيتەوە، ئەوسا بەسەر ئەستيرەكانی خۆت دا دەروانی كـە ئاسـۆ بەئاسـۆ- بيجگـە لەئاسۆ بلندەكەی خۆت- ئەو ئەستيرانە گچكە دەبنەوە.

بەلێ لووتكەی من لەو شوينەدايە كە ليی رادەوەستمو بە ناخەكان دا دەنۆرمـە خـوارێ.. ئـەوجا زاتـی خۆمـی بەئەسـتيرەكانيەوە تيـدا دەبينـم.. ئـەوەش ئـەو دوا بلندی‌يەيە كەبەتەمام بگەمە لووتكەكەی.

ئا بەم رەنگە زارا لەگەڵ خۆیدا كەوتە رازو بەسەر بەرزايی‌يەكەدا هەڵ كشاو دلـە بريندارەكەی بەپەيرەوە توندوتيژەكان پاساو دەدايەوە.

كەگەيشـتە ترۆپكـی بلندانی‌يەكـە دەريـای لەبـەرچاودا كشـاو رەوی‌يـەوە، بەشـلەژانەوە رەق راوەسـتاو بـۆ ماوەيـەكی زۆر لـەبێ سـرپەيیدا نوقـوم بـوو.. ئەسـتيرەكانيش بـەتاقی ئاسمانـەوە دەجريوانـەوە، بەسـەر ئـەو تەپۆلكەشـەوە كزەبايەكی سارد هەلی كردبوو.

بەخەمناكی‌يـەوە هـاواری كـرد: ((چيـم لـەچارە نوسـرابوو ئـەوا بـۆم دەركـەوت، ئەوەتام نەترسانە ديمەبەرەوە، ئەمەش دواين گۆشەگيری‌يەو خۆمی تێ دەهاويژم.

ئەی دەریای تاریك و بەربەبلاو لەبەرپیم دا، ئەی ناحەزی دووراو دوور! تۆ شەوگاری پرمەینەتی.. تۆ چارەنووس و پلاری قەدەری.

من ریگای بالاترین کیوی خۆمم گرتووەتەبەرو رچەشکینی دوورترین گەشتی خۆمم، کەواتە دەشێ دابەزمە ئەو چالگانەوە کەناخەکانیان دوورترن لەسەرجەمی ئەولووتکانەی تائیستا وەسەریان کەوتووم.

دەبێ لەپەژارەوە بۆ ئەو ناخانە دەربچم کە لەمەوپیش تییان دا نیشتوونەبووم، ئەوجا دەگەمە هەرە قووڵایی کەلەوێدا خەمەکان بەبێ تاریکستانین، ئەمە چارەنووسی خۆمەو ئامادەشم خۆمی تێ فرێ بدەم.

جاران دەم پرسی: دەبێ کانگای کیوەکان لەکویوە بێ؟.. دوایی بۆم دەرکەوت چۆن تاشە بەردەکان و لووتکە ئاودرەکان لەدەریاوە بەدی دەکرین، چیاکانیش بەویوە قنج بوونەتەوە. پایەبەرزیش بۆیە بەجیی خۆی دەگا چونکە لەپایە نزمییەوە رەها بووە).

لەوحەلەدا کە زارا بەسەر ترۆپکی چیاکەوەبوو، گرەو هەڵاوی سەهۆلبەندانیش لوولی دەدا– ئاوای گوت! بەڵام نەگەیشتە کەنار، ئەوجا لەنیو رەوەزەکان دا راوەستا تابەتەواوی شەکەت بوو؛ ئەوسا کولی هەستاو گوتی: ((دیسان دەریا شەو لەخەوە، بەنیگای سەیرەوە چاوە خەوالوەکانیم تی دەبرێ و هەڵاوەهەناسەی دێ بەسەرم دا.. نوقم بووی خەونەکانیەتی و لە پالگەی رەقەن دا تەپاوتلیەتی. گویم لێیە بەدەم بیرەوەری مەرگەساتەوە دەنالێنێ.. لەوانەیشەوە ئەو نرکەونالەیە بیدار کردنەوەی بەدوومی بێ لەزەمانی داهاتوودا.

ئەی مەودای بەرین و تارکستان! لەخەمناکیدا دەوت لەتەك دا دەکەم.. لەسایەی تۆوە بوومە تۆلەستینی نەفسی خۆم.. خۆزگە هیندە بەدەست دەبووم کەلەبچەی خەونەکانتم دەپساندو رزگارم دەکردی!)).

زارا بەئاگاهات و قاقا گالتەی بەزاتی خۆی هات، رقی هەستاو لەبەر خۆیەوە دەی پرسی: دەبێ زاتی من هیندە خورت بێ بەلاوژەو لاوانەوە بکەویتە پرسەی دەریاکان؟.. یان لەگیانەڵای ئەم ئاشقینییەدا بەردەوام بێ و خۆی بدا بەدەستەوە؟!.. ئەوجا گوتی:

((زارا! لەهەموو زەمانێك دا تۆم ناسیوە کەدەستەویەخەی کارە پڕ مەترسیکان دەبی و بێگوێپیدان خۆتیان تێفرێ دەدەی.. زانیومە کە بەدرێژایی ژیانت ختوکەی جانەوەرە درندەکان دەدەی و تییانەوە دەژەنی!! فەرامۆشیت بەوە دەهات کە بەهەڵاوی ئەوان خۆشەویستی لەمەر خۆت بورووژینی و ئیدی بەنەرمە چرنووکەوە بۆ لای خۆیان کیشت بکەن.

پڕ مەترسی لەوەدایە کە (خۆشەویستی) چاوبریتە کابرایەکی نوقم بوو لە تاکەخوازیدا.. بەرکەنارو تەریك هەرچی شتیك سروەی زیندەگی تیراگەرابێ ئەوا خۆشی دەوێ.. ئای چۆن بەئاسانی بوومەتە دیوانەی خۆشەویستی ولەتەکیا باشاردەکەم!))

زارا ئاوای گوت و دەستی کردەوە بە گالتە بەخۆ کردن. ئەو دۆستانەی هاتنەوە یاد کەبەجیی هیشتن.. وای لەخەیاڵ گەرا کەسەبارەت بەرێبیرەکانی ئەمەوە ئەو دۆستانەی خراپ دەبن و تیك دەچن، بۆیە لەخۆی بەرگەشتەبوو، پیکەنینەکەی بوو بەگریان و هەڵ رشتنی ئەو فرمیسکە تاڵ و سویرانەی خەشم و ئارەزوویان تیدا ئاویتە دەبوو.

## خەون و پەردەك

-١-

کەدەریاوانەکانی نیو کەشتی یەکە هەوالیان دا بەیەکدی ئەوا زارا لەنیویان دایەو کابرایەکیش پیی راگەیاندوون کە لەگەڵ زارادا لەدوورگە بەختیارەکانەوە هاتۆتە لایان، ئیدی تارادەیەك پەژارە دای گرتن.. چاوەروان بوون کە بەهۆی بوونی زاراوە لەنیویان دا شتیك روویدا.. بەڵام زاراش بۆ ماوەی دوو رۆژ لەوکەشتییەدا متەقی نەکرد! هەرچەندە ئەوان چاویان تێدەبری کەچی ئاوری لی نەدەدانەوە. ئەوەندیکی پرسیاریان لی بکردایە کرومات دەبوو. دواتر گویی شل کرد بۆ ئەو قسەو باسەی دەربارەی ئەم بلاوبووەتەوە.. چاوەروانی هەوالی ترسناکی دەکرد کە پەیوەندییان بەم کەشتییەوە هەیە، کەشتییەکەو لەدوورەوە هاتووەو بۆ دوور مل دەنێ.. زارا سلی لەکاروانی دوورە قۆناغ نەدەکردەوە.. گویی نەدایە مەترسیی گەشت و رەو دوای

گوێ شل کردنیکی فرە دەمی هەل بچراو زمانی کرایەوەو گوتی: ئەی پرکیشە پەراگەندەکان! ساهەرکەسیك هەن.. ئەوەتان خۆتان بەم کەشتی‌یە چارۆکەدارە ستەمگەرە سپاردووە کەبەسەر شەپۆلە هارەکانەوە– وزاق دەدا.

ئەی مەستانی شەرابە نهینی‌یەکان ! لەگەڵ ئیوەمە.. ئەوەتان بەنیو هیلی تاریكو روون دا خۆتان کیش دەکەن.. بەرەو ئاوازە شیوەنی هەموو نایەك رەو دەکەن.. ویلی هەمان خرۆشە ئاوازن لەم سەراوسەری دیارو نادیاردا.. سڵ دەکەنەوە دەستتان لەریگاکەتان بکوتن کەچی بەسەر نیشانە پەتەکانەوە لەرزۆك بوون.. ئەو لایەنەتان پێ باشە شتەکان بەهەست بقۆزنەوە نەوەك لەریگەی بەرەنجامی و پشکنینەوە دەرکیان پێ بکەن. بەهەموو پەنهانی و خەون و خەیالەوە دواگوتارم بەرەو رووی ئیوە دەکەمەوە، کابرایەك بەرەو رووتان بووەتەوە کەلەهەموو کەس پتر نوقومی گۆشەگیری‌یە.

لەوپەری چری و ئەنگوستەچاوی‌دا بەلیوی بەبارو دەموچاوی تۆزنەوە خۆم فریدایە تاریکستانەوەو پییدا تیپەریم.. لەوەو بەریش خۆری زۆرم دیتوون و بەنەدیودا ئاوابوون!

لەبەردەمم دا ریگایەکم بەدی کرد بەکەندولەندی بەرزایی‌یەکان دا تی هەڵ دەکشا.. ریگایەك بوو تووش و رووتەن، زۆرە ملانە پیم نایە بان وتەکانم بەخۆم دا.. گویم لە خرەی چەوەڵان بوو کە لەژیر پیم دا دەپژا! بەبێ چرپە رۆیشتم.. هەولم ئەدا کەئەو بەردانەی لەژیر پیمەوە دەخزان رایان گرم؛ نەوەك لەلاپێ‌دا هەڵ تریزیم. من پیدا هەڵ کشام کەچی دیتم ئەوا قورسە گیانەکەی دوژمنم بەرەو قووڵایی‌یەکان دام دەکیشێ. دیسان پیدا هەلکشامەوە کەچی ئەو قورسە گیانە بەچەشنی گرگنە ئادەمی‌یەکان و مشکەکویرە ژیر گڵ نشینەکان ئابلوقەی دام.. دیتم: قسەی قورقوشم ئاسا دەرژینیتە میشك و گویمەوە.. هەروەها لەسەر خۆ بەگالتەوە پیی دەگوتم:

زارا! ئەوە تۆ ئەو بەردەی لافی دانایی لی بدەی و بۆ بلندانی خۆت هەڵ داوە؟.. بەڵام دەبێ کام بەردی بەرەو ژورکە نەگەرابیتەوە بۆ جیگای خۆی؟!

ئەرێ زارا! ئەی سەنگی دانا.. بۆ ئەوەی جێ بەئەستیرەکان لەق بکەی خۆت بۆ بلندانی فرێ دەدەی ئیستا ویکرا فریدەرو فریدراو هەرخۆتی. وەك هەموو بەردیکی بەرەو ژوور فریدراو دەکەویتە خوارێ.. تۆ فەرمانی بەرد بارانت داوە.. ئەمەش

سەنگە ساری‌یەکەو بەسەر خۆت دا دەسەپێ؛ ئەو بەردەی بەرەو ژوور هەلت داوە دەکەویتەوە بەسەر خۆت دا.

ئەو گرگنەیە هیندە بێدەنگ بوو منیشی تەنگە نەفەس کرد. چونکە بیت‌و هاوریکەت کرومات بی پتر هەست بەتەنیایی دەکەی لەوەی کەست لەتەکدا نەبی!

بەسەرگەردانی لەخەون‌و خەیالدا و بەبیری پەرتەوە دیسان بۆی هەڵ کشامەوە. هەستم بەدڵ گوشینی خۆم کرد وەك ئەو دەردەدارەی بەخەونی بێسەرەوبەرە بەئاگادێ تالەبیداری‌دا هەست بەئازارەکانی بکا. من بەلینداری ئەو هیزەم کە بە ((ئازایەتی) ناوی دەبەم.. ئەمەش ئەو هیزەیە هەرچی بوودەلەیی‌و داهیزانیکی رووم کەلەم گەردوونەدا هیچ ئازاریك هیندەی ئازاری مرۆڤ بەتین نیە؛ هەر بەو ئیشەوە بەدوای ئاوازی کاروانەوە رەوتی خۆی دەگرێ.

ئازایەتی بۆ ئەوە باشە کاتێ مرۆڤ بەقولاییەکان دا دەروانیتەبنەوەو گیزی سوار سەری دەبێ.. ئەوجا ئازایەتی فریا دەکەوێ‌و دەرەقەتی ئەو گیژ خواردنەوەیە دێ. هەموو هەڵویستیکی مرۆڤ دۆزەقەی خۆی لەژیر دایە، ئەویش دەبێ چاو بگیرێ‌و ئەو چاڵ‌و زەندۆڵانە ببینێ‌و ئاقاری هەلویستەکەی خۆیانی تیدا بزانێ.

ئازایەتی باشترین کوشندەیەو بەزەیی پیداهاتنەوەش دەکوژێ.. هیچ چالیك هیندەی بەزەیی پیدا هاتنەوە قووڵ نیە، چونکە نیگای مرۆڤ بەناخی ئازارەکان دا دەروا تالەوسەری ناخی ژیانەوە دەردەچێ. لەو ساتەدا کە ئازایەتی هیرش دەهینێ، ئەو ئازایەتی‌یە بکوژی چاکەو تەنانەت مردنیشت بۆ دەکوژێ؛ چونکە لەدەروونی خۆی‌دا–دەلێ:

((ئای کەسەیرە! ئائەمە بوو ژیان؟.. کەواتە جاریکی دیکەش بۆی دەگەریمەوە))

لەم جۆرە باوەرەدا لاوژەی بەتینی ئاوازی کاروانە دەبیتە هیزیکی پالنەر بۆ زات کردن‌و نەبەردایەتی. ئەوجا کێ جووتە گویی بیستنی لی رواون داببیستێ‌و گوێ بگرێ.

٢

گرگنەم راگرتەوەو گوتم: پێویستە هەر یەکیکمان بمینیتەوەوئەوی دیکەمان تیدا بچێ. هەر خۆشم بەهیزترم؛ چونکە بیرو تێفکرینم فرە قوولەو تۆ دەرکی پێناکەی‌و

پەی بەهێزو توانای من نابەی.. هەر ئەوەندەم گوت و گرگنەکە لەسەر شانم خۆی فڕێداو ئیدی کۆلم سووك بوو، دیسان گرگنە لەسەر بەردیکی بەرانبەرم هەڵ تووتا.. تومەز رووی کردووەتە دەرەیەك، وەك بەریکەوت لەوێ دۆزیبیتیەوە، بەهاوریکەم گوت:

((سەرنجی ئەو دەرگایە بدە، دوو بەردەمی هەیە، لیرەوە جەمسەری دووریگا پێ دەکاو کەسیش نەگەیشتووەتە ئەو پەریان، یەکیکیان بەرەو ئەبەدیەیە دادەکیشێ و دریژ دەبیتەوە، ئەوی کەشیان بەرەو ئەبەدیەیەکی دی هەڵ دەکشێ و دەروا.. ئەو دووریگایە یەکدی برلیرەوە دەترازین، واتە لەم دەرگایەوە دەست پێ دەکەن، ناوەکەشی بەسەر دەرانی یەك دەروازەوە نووسراوە ((چاخ)) ئەوجا گوتم: ئەرێ: گرگنەکە! تۆ لەوباوەرەدای کەسیك یەکێ لەم دووریگەیە بگریتەبەر دلنیادەبێ کەبەریان ((تجاه))ی هەریەکەیان لەیەکدی جودا وازە؟

بەسووکییەکەوە گوتی: بەریانی هەموو راستە هیلیك درۆزنەیە، راستە قینەش هەڵ گەراوەیە؛ چونکە خودی زەمانە ئەم سەراو سەر بریتییە لەهیلیکی بازنەیی.

لەوەڵام دا پیم گوت: ئەی قورسەگیان! تۆ ئیشەکە هیندە (بەسووك مەزانە؛ دەنا بەجیت دەهیلم و لیرە) بۆخۆت بەبێ قاچ پەکت دەکەوێ. لەبیریشت نەچێ من تۆم بۆ بلندانی گرت بەکۆلمەوە. ئیستا بیر لەم ((چاخ))ە بکەرەوە کە ئیمەی تیداین.. لەدەرگای ئەم چاخەوە ریچکەیەکی ئەبەدی دەکشێ و کۆتایی نایەو بۆ دواوە دەگەریتەوە.. کەواتە دواوەشمان هەر ئەبەدییە.. ئیدی هۆ کابرا. بۆ خۆت تێ بگە!

ئەدی پی ویست نەبوو هەموو شتیکی شارەزای رۆیشتن لەرابووردوودا ئەو ریگەیەی بری بایە؟!

ئەدی پیویست نەبوو هەرشتێ توانای پێ گەیشتنی هەبووبێ لە رابروودا راگوزاری خۆی تەواو کردبایە؟!

ئەگەر هەموو هەبوویەکی ئیستا لەوەپیش هەبووبێ ئەی دەربارەی (چاخ) باوەرت چۆنە؟.. ئەی گوایە ئەم دەرگایە ((هەبوون)ی پیشینی نەبووە؟.

ئەی نابینی: شتەکان هەموو دەچن بەیەك دا، ئەم چاخ و زەمانەش هەبووی لەمەولایش بەدوای خۆیدا کیش دەکا.. بەلکو نەفسی خۆشی دیسان کیش دەکا؟

كەمەسەلەكە ئاوابێ ئەدی پیویست ناکا ئەوشتەی خاوەن هیزی-رۆیشتن-ە جاریکی دیکەش تەکان بداو رووبکاتە ئەم راگوزارەو بۆ لای سەرەوە تێ بتەقینێ؟

سەرنجیکی ئەو جالجالۆکەیە بدە کەلەسەر خۆ لەژیر تریفەی مانگەشەودا- دەجوولیتەوە.. سەرنجی خودی مانگ‌و زاتی من‌و زاتی خۆت بدە کەلەکن ئەم دەرگایەوە کۆبووینەتەوەو نهینی‌یەکانی ئەبەدی بەگوێی یەکدی‌دا -دەچپینین! ئەدی باوەرناکەی: دەبوو لەمەو بەر لەم شوینەدا گشتمان راوەستاو بووبین؟

ئەدی لەسەرمان نیە بگەریینەوەو دووبارە تەکان بدەین، ئەو ریگای دیکە بگرین کەلەپیشمانەوە مارودوو خیرا تێ‌هەڵ دەکشێ.. ئەدی پێویست ناکا هەتا هەتایە دووبارە ببینەوە؟

ئاوا قسەم دەکردو تا دەهات دەنگیشم نزم دەبووەوە.. بیرو ئەودیوی شاراوەی بیرەکانم ترساندبوویانم. کوتوپر لە نزیکمانەوە حەپولووری سەگیکم بیست.

بەدلم دا هات کە ئەوجۆرە وەرینەم لەمەو پیش بیستبێ؛ بەبیرەوەری‌یەکانی رابووردووم دا گەرامەوە.. ئەو حەپولوورەی خستەوە بەرگویم.. کەیادگاری دوورترین رۆژگاری منداليم بوو.. یادگاریکەو ئەوسەگەم دەهینیتەوە بەرچاو کەتووکی راست دەبۆوەو لەشەوگاری کشومات دا بەلەرزینەوە ملی دریژ دەکرد. ئەوا سەگەکانیش بۆیان دەرکەوت کە تارمایی‌یەکان لەم جیهانەدا بۆ خۆیان دین‌و دەچن.

لوورەی سەگەکە سۆزو بەزەییمی جوولاند. هاتەوە یادم کە تۆزیك پیش وەرین تازە لەودیومالەکەوە مانگ بەچەشنی مەرگ‌و بەبێ چرپە سەری پیوەنا.. هەردووای کەمێ ئەومانگە بەسەر بانەکەوە ئارامی گرت.. وەك تۆپیکی گرتێ‌بەربوو داوەرانی شتیکی نەگونجاوی بوو.. ئەم دیمەنە سەگەکەی خەشم گیرکرد، دیارە سەگەلیش باوەری بەدزو تارمایی هەیە.

کەبۆ جاری دووەم ئەم سەگ وەرەم بیست دیسانەوە بەزەیی پیدا هاتنەوەم لی بووبەخوو ئیدی بەچاکی دای گرتمەوە.

ئیستا گرگنەو دەرگاو جالجالۆکە لەگەڵ چپەو رازدا بۆ کوێ ئاوابوون چیان لی بەسەرهات؟!

تۆبلیی نوقمی خەون بووبمو ئیستا بەهۆش هاتبمەوە؟ ئەوەتام لەنیو کەنەکە بەردەکان دا تەرەبووم بیجگە لەتریفە مانگی تەنیا بەئاسمانەوە ئاودەنگیکم لەتەك دا نیە!

هاتمە بەرەوە، کابرایەکم چاو پی کەوت، ئەوا لەسەر زەوی کەوتووەو داپۆشراوە، سەگەکەش بەخۆگیڤ کردنەوە باز بازینی دەکرد و زۆر بەتوندی دەوەری؛ هەرکەدیتمی ئەوا بۆ لای ئەو دیمە پیشەوە دەستی بەنووسکەو لورە کرد. لەبەرخۆشمەوە دەم پرسی: دەبێ لەمەو پیش ئاوا سەگ لووری فریادم بیستبێ؟!

راستیەکەی، ئەوەی لەو شوینەدا کەوتەبەرچاوم تائیستا شتی ئاوام نەبیستووە، دیتم: ئەوا شوانیکی لاو تەکان دەداو لەگیانەلادایە، نیشانەی تۆقین لەروخساری نیشتبوو؛ رەشماریك لەدەمیەوە خۆی داهیشتبوو تەکە تەکی بوو.. لەخۆم دەپرسی: بروانا کەم لەمەو بەر دیمەنی هیندە قیزەونم دیتبێ.. یان دەموچاوی ئاوا سامناك و بزرکاوم بەرچاو کەوتبێ؟! هەبێ و نەبێ ئەو شوانە لەشیرین خەودا بووەو ئەو رەشمارە خزیوەتە گەروویەوە تیی گیراوە.

بەهەردوو دەست خەریکی راکیشانە دەرەوەی مارەکەبووم بەلام بەخۆرایی تینم بەخۆم دا، خیرا لەئەندەروونی نەفسی خۆمەوە دەنگیکم بیست تومەز شوانەکە وریا دەکاتەوەو پیی دەلێ: دەی توند قەپی لی بگرە.. تا بەددان سەری نەقرتینی وازی لی نەهینی.

بەتاوی ئەم هاوارە کۆمەلە دەنگی ترس و بیزو رق و بەزەیی پیداهاتنەوەی خۆمم بیست.. ئەو نالەو دەنگانە وەك تاکە دەنگیك لەمنەوە هارژنی کرد!

ئەی ئەو دلیرانەی کە دەورەی منتان داوە.. ئەی پەیدۆزەکانی جیهانی دەریا و خۆ بەدەستەوەدەرانی کەشتیی غەددار! ئیوە بەشتی نهینکارو مەتەڵ کەیفتان ساز دەبێ.. کەواتە خەونی تاکەخوازیك لی بدەنەوە، ئەو مەتەلانە هەڵ بهینن کە هەبووی رابووردوو هەبووی داهاتوویان تیدا پەنهانە.

کام هیمایان ئەو شتە دەگەیەنێ کەنەماوەو کامیشیان ئەوە دەگەیەنێ کە لەئاییندەدا پەیدا دەبێ؟ ئەو شوانەی مارەکە خۆی بەزاردا کردبوو کێیە؟

ئەی ئەو مرۆڤەی کە لەمەولا تووشی دەبێبەو بەلامارزەوە. دەبێ کێ بێ و کێ نەبێ؟!.

ويـراى هـەمووى هـەر ئـەوەندە رينمـاى شـوانەم كـرد خـيرا فـەرمانى بـەجىٚهيناو ددانـى لى گيركردن.. دواى تـۆزىٚ سـەرە مارەكـەى دوور هاويـژانـە تـف كـردەوە، ئـەوجا راپەرىو لەسەر جووتە قاچ راوەستا.

بيچمى شوانە بەجۆرىٚ گۆرا نەبووەوە بەشوانەكەو نـەش بـووەوە بـەمرۆڤ.. ئيـدى لەبەر تيشك دا هەرهاتو گـەورە بـوو.. بـەو جـۆرەى كەدايـە قاقـاى پيكـەنين، بەهـەموو ژيانم شتى ئاوەهام نەبيستووە.

براينە! ئەو پيكەنينەى بەر گويم كەوت لەجيهانى مرۆڤ دا نەبيستراوە.. هـەر لـەو ساتەوە بەحـەزو هەوەسيكەوە دەسـووتيم كەشـتيكى وەهـام نيـە پيـى بكوژينمـەوە.. ئيسـتاش تامـەزرۆى ئـەو پيكەنينـەم قـەپ لەهـەناوم دەگرىٚ. كەواتـە لەئيسـتا بـەولاوە چۆن بەمەرگ رازى دەبم.

زارا ئاواى گوت...

## خۆشنوودى زۆرەمل

زارا قـەدى دەريـاى دەبـرىو ئـەم خـەمو پەژارەيـەش سـەريان تـىكردبـوو، خـەونو نهينى گـەمارۆيان دابـوو مـەوداى چـوار رۆژى رەبـەقى بـرىو لەدوورگـە بـەختيارەكان تـرازاو هاوريكـانى لـەوىٚ بـەجىٚ هيشـتن، ئـەوا ئيسـتا ورەى پيداهاتـەوە، بەسـەر ئازارەكانى دا زال بـوو.. لەسـەر هـەڵ ويسـتى خـۆى پيىداگـرت، ئـەوجا رووى كـردە چارەنووسو قـەراردادەى خـۆى، لەگـەڵ ميزاجو دەروونـى خـۆىدا كەوتـەرازو نيـاز، لەكەيف خۆشىدا گەرايەوە دۆخى جارانىو دەى گوت:

چونكـە حـەزم لەگۆشـەگيرىيە ئـەوا هانـام بـردەوە بـەرى. ئـەوا ئيسـتا لەبـەردەم ئاسمـانى سـامالو مـەوداى دەرياكـان دا بـەتاقى تـەنيام، رۆژگـاريش بـەرەو تـاقى ئيوارەيە.. ئەوسا كەيەكەم جار لەگەڵ دۆستەكانم يـەكانگير بووم لـەدوانيوەرۆدا بـوو، هەر لەم كاتەدا بوو دووەم جاريش كۆم كردنەوە.. عەسران ئەو كاتەيە كە رووناكىيـە شـەپرزەكان هيـور دەبنـەوە، چونكـە ئـەو كامەرانىيـە پەرشـو بلاودەبيتـەوە ئـەوە بـەگوزەرەكانى خۆىدا لـەنيوان ئاسمـانو زەوىدا تـى دەكشـىٚو بـەخش دەبيتـەوەو

لەگیانی رووناکی دا ئارامگەی خۆی دەدۆزیتەوە ئائەوەتا بەتاوی کامەرانی دۆخی شەپرزەی رووناکی دەکەویتە باری خامۆشی.

ئای بۆ ئیوارەی زیندەگانیم! دیسان بەختەوەری یەکەشم رۆژێ لەرۆژان داپەریوەتە خوارێ بۆ نیو دۆڵو ئەودالی ئارامگەیەك بووە، کەبەدیداری گیانە نوورانی‌یەکان گەیشتووە پەناگای ئاسوودەیان بۆ کردووەتەوە.

ئای بۆ ئیوارەی زیندەگانیم! بۆیە لەژیانم دا دەست بەرداری زۆر شت بووم تا لەپیناوی ئەورا بگەمە شەتلە جاری بیرە زیندووەکانمو لەوێ بیان رۆینم.. بۆیە لەژیانم دا وازم لەزۆر شت هینا تا بگەمە رووناکی‌یەکانی بەیان.. ئەورووناکە بەیانیەی کە ئاواتەکانم بەدەوری گەردیلە نوورەکانی دا دەسوورینەوە.

رۆژێ لەرۆژان داهین ئەودالی هەڤالەکانی بوو.. بۆ ئاواتە زادەکانی دەگەرا. بەڵام ئەوەی زانی بیتو بۆ خۆی نەیان خولقینی هەرگیز دەستی ناکەون؟

کەمن رووم کردە رۆلەکانی خۆمو بۆ لای ئەوان گەرامەوە مانای وایە نیوەی کارەگرنگەکەی خۆمم تەواو کردەوە. پێویستە لەپیناو ئەو رۆڵانەدا زارا خۆی بگەیەنیتە رادەی تەواوبوون. ئەو شتەی مرۆڤ لەناخی دلیەوە خۆشی دەوێ بریتی‌یە لە رۆلەی خۆیو بەری رەنجی خۆی. لەکوێدا خۆشەیستی بەتین دەرکەوت لەویش دا هیزی پیك هین خۆی حەشار دەدا. من بە تی‌فکرینی خۆم ئەوەم زانیوە. گوڵالەی رۆلەکانم یەکبینە لەبەهاردا یەخەیان دەترازینن، بای وەشت لەریزەکانیان هەڵ دەکاو دەیان لاژینیتەوە، رۆلەکانم درەختی باخو رووەکی زەویو زاری بەپیتی خۆمن.

ئەم درەختانە بەپاڵ یەکدی‌یەوەو لەسەر دوورگە بەختیارەکان ریك هەڵ چوون. لەمەوبەدوا یەکە بەیەکە هەلیان دەکەنم. دارو بێدار بەپەرتەوازە دەیان نیژمەوە. ئەوجا فیری ئەوە دەبن کەدەرەقەتی تەنیایی بین. هەر درەختە پشت بە ورەی خۆی ببەستێو بەرانبەر بەدەریا راستەوەبێ و قەدی پتەوبێ. وەك زیندەیەکی گەردن کەشو بۆ مانەوە یان منارە ئاسا هەڵ بچنو لقوپۆپیان بچن بەیەك دا .

ئالەو کاتەدا کە گەردەلوول لەدرەختەکان هەڵ دەکا پێویستە گشتیان لەو دەریایە مۆرببنەوە کە شەپۆلی قەبە لەبن کیوەکە دەسرەوینێ. دەبێ شەوو رۆژ خافڵ نەبنو نهینگەی خۆیان بەسەربکەنەوە. ئەوجا بۆ ئەوەی بزانرێ کەلەپشتاو پشتی منن دەبێ لەبەر زەبری ئەزموونەکان دا خۆراگربن.. بۆ ئەوەی کەبزانرێ لەبنجی منەوە

کەوتوونەتەوەو رەگا ژۆيان کردووە دەبی ئیرادە پتەوبن.. تاکاتی قسە کردنیشیان بەخامۆشی بیتە بەرچاو.. کەلە حالی بەیدەست بوون دا بەخشندە بوون دەشێ بە وەرگر دەربکەون. ئاوا هەر کەسیك بەسفەتیمانگرو داهین شوین پیی زارا هەڵ بگرێ دەبیتە کەسیکی وەها لەبان لەوحەکانی من دابو یاسای من هەڵ بکولێ، ئابەو رەنگە شتەکان دەگەنە راددەی کامڵو تەواو.

ئەوەتام لەپیناو ئەو کەسایەتییەو نموونەی ئەو کەسایەتییەدا بۆ پیك هینانی کەسیتی خۆم دەرەنجیم.. خۆداری لەکامەرانی دەکەم.. لەپیناو دەرك پێکردنی شاراوەی خۆم داو لەدوا تاقی کردنەوەم دا خۆم دەهاویژمە گشت مەینەتی یەکەوە.

کاتی کۆچم نزیکە، ئەندیشەی ریبوارو دریژترین زەمانو بیدەنگترین سەعات بیداریان کردمەوە: ((دەبێ کۆچ بکەم)).. ئیدیبا– گڤەی کرد بەکوونی قفلەکەداو لاشیپانی راتەکاندو گوتی: ((ئادەی راستەوەبە!)).

بەلاَم دەست بەستەی رۆلەکانم بووم، لەعەزرەتی ئەوەدایە کەبوومەتە نیچیری رۆلەکانمو لەپیناویان دا خۆم بەخت دەکەم، بەلایمنەوە ئەو حەزو تاسەیە وینەیەکی بەرچاوە بۆ راستی لەنیو چوونم. رۆلەکانم سامانی خۆمن؛ دەبێ لەم ملك دارییەدا هەموو حەزیك تیدا بچێو ببیتە باوەریکی قایم.

بەخۆری خۆشەویستیم کەللەی سەرم گری دەسەندو خوینی لەکوڵ دەی سووتاندم.. بەچاوی خۆم دیتم: خیلە تارمایی گومانو دوو دلی گەمارۆیان دەدام.. ئاواتە خوازبووم کە شەختەی زستان هەلم پروکینێ تا ئەو حەلەی سەهۆلبەندان دەم خاتە ددانە چۆقێ.. ئەوەندەی نەخایاند تەمومژی کریوە نەفسی رامالیم.. ئەوجا زەمانی رابووردوو گۆرەکانی خۆی هەڵ تەکاند، ئەو ئازارانەی گۆر کرابوونو لەگۆریچەدا زیندوو بوون ژیانەوە. هیشتا هیزی نەمان پەلاماری ئەو ئازارانەی نەدابوو چونکە لەسەر کفنەکانیان خەوتووبوون.

هەموو شتیك پیشانی دەدام کەوەختی رەوکردنم نزیکە. تاوەکو ناخەکانم نەکەوتنە گینگلەو بیرە رووژاوەکانم پییانەوە نەدام هۆشم بەلای ئەو بانگەوازەوە نەبوو. خۆزگە هیزیکی زالم دەبوو نەی دەهیشتم هەڵ بلەرزم لەوحەلەدا هەست دەکەم ئەوا هیزی بیرکردنەوەم دەیەوێ لەناخەکانمەوە دەرفەتیك بکاتەوە. ئەو کاتەی هەست بۆ جموجولی بیرەکانم رادەگرم– کەدەیانەوێ خۆیانم بۆ وەدەرخەن– تەواو هەست

بەدلە فرکێ دەکەم. ئەی بیرۆکەی خۆم! لەوکاتەدا کەلەمەندیەکانم بێ چپەتری خودی ئەو بێدەنگییەت خۆی لەگەردنم توند دەکا. بیرۆکەی خۆم! زۆرم هەوڵ دا کەلە ناخەکانی خۆمەوە بت هینمە دەرەوە.. بەڵام زەبر گزی لی کردم؛ ئیدی من ئەوەندە وازم هینا کەلەزاتی خۆم دا بت شارمەوە من هیشتا بە ئەو پەری هەلمەتی شیرانە بەهرەوەر نەبووم. ئەی تێفکرین! بەقورسی خۆتەوە لە قووڵاییم دا بناو بووی.. رۆژیك دێ و هیزی شیرم بەبەردابێ و نرکەی شیر بکەمە دەنگی خۆم و لەناخەوە بت خەما تەنکاو.. ئەگەر ئاوا بەسەر نەفسی خۆم دا زاڵ بووم، ئەوا بۆ سەرکەوتنی مەزنتر هەڵ دەکشیم و کۆتایی ئیشەکانمی پێ دەهینم. تاوەکو دەگەمە ئەم زەفەرمەندییە بەسەر دەریاکانەوە ویڵ دەبم و شارەزایی هیچ کەناریك نابم کەمەترسی رووداوەکان دەستبازیم لەتەك دا بکەن.. کەواتە ئاوردەدەمەوە بۆ : ئەو شتەی لەدوامەوەیەو بۆ : ئەو شتەی لەپیشمەوەیەو ناشزانم کۆتایی تا کویوەیە!

ئایە ساتی دوا تی کۆشانم نزیك نەبووەتەوە؟.. راستیەکەی گیرۆدەی ژیان و دەریام کەچاویان تی بریوم.. تۆ بلیی ئەو ساتی تیکۆشانەم لەبەردەممەوە لای دابێ. یان هەر لەبەر دەممەوە بێ..؟

ئای بۆ عەسری زیندەگانیم.. ئای بۆ بەختەوەریی دوا ئیوارانم.. ئای بۆ لەنگەرگای نیو قەدی شەپۆلەکان.. ئای بۆ کشوماتی جەرگەی گومان!! ئەوا وریاتان دەکەمەوە هیچ متمانەشتان پێ ناکەم.

بەراستی جوانییەکەتان ستەمگەرەو لیی دەترسم.. هەروەك چۆن ئاشق لەو خەندەیە سڵ دەکاتەوە کە زۆر بەناسکی یەوە سنووری سەرلیوان دەبەزینێ.

هەروەك کەسیکی بەناموس چۆن دەست دەنێ بەرووی دولبەرەکەیەوەو میهرەبانی لەدلەرەقەکەیەوە دەرنەکەوتووە ئاوا منیش ساتی کامەرانی لەخۆم دەتەکینمەوە.

دەك دوات برێ ساتە بەختیارەکە! بەسایەی دابەزینی تۆوە -لەوکاتەدا چاوەروانی قولترین داماوی بووم- خۆشنوودی و کەیف خۆشی زۆرە ملانە بەسەرم دا کشا.. بەراستی هاتنەکەت لەناوەختا بوو!

دەك دوات برێ ساتە بەختیارەکە ! لاچۆ لەبەرچاوم.. برۆ لەمەلبەندی رۆڵەکانم دا مشووری پەنایەك بخۆ.. زووکە بگەرە لایان، پیش ئیوارە پیرۆزباییان لی بکەو بەختەوەری منیان پێ رابگەیەنە .

زارا ئاوای گوت...

بەدریژایی ئەو شەوەی چاوەروانی بەد بەختی خۆی بوو بەفیرۆچوو، بەپیچەوانەوە شەوەکە نوورانی وکشومات بوو.. سەعات بەسەعات بەختیاری لیی نزیك دەبووەوە، بەر لەکازیوە زارا خۆی هینایە پیکەنین و گوتی:

((بەختیاری کارم تی دەکا کەچی من کار لە ژنان ناکەم. ئەدی هەر ئەوەنیە کە (بەختیاری)ش ئافرەتیکە؟!)).

## پیش خۆر هەڵاتن

ئەی ئاسمانی دوور! کەلەبان سەرمانەوە گومەزی سامالت هەل ناوە.. ئەو رووناکیانەی سەرو بەرتیان گرت بووەوە بەجیم هیشتن. ئیستا خیسەت لی دەکەم و موچرکەی خواوەنداش دام دەگرێ.

کەی بەبلندانییەکانتا هەڵ کشابم ئەوا بەناخی خۆم دا رۆچوم، تا سامالی تۆ نیو خۆیم نەگرێ و پیی گەورە نەبم هەست بەپاکیتی خۆم ناکەم. تۆ هەر ئەوەی کە ئەستیرەکانتم لی دەشاریتەوە، هەر وەکو خواوەندەکەش خۆی لەبلندایەتی خۆیەوە دەپیچێ.. تۆ کروماتی، بەوکروماتییەش دانایی خۆتم بۆ جاردەدەی!

لە تویی بی دەنگی خۆت راو بەسەر چرەکەفی ئاسۆگەوە خۆتت بۆ وەدەرخستم.. ئەوجا هەرچی خۆشەویستی و پاکیزەیخۆتە بۆ گیانە کەفاویەکەی منت جاردا. بەجوانی و رووبەندی جوانیتەوە هاتیتە لام کە بەبێ قسە بم دوینی و دانایی خۆتم بۆئاشکرا بکەی.. ویرای ئەوەش شارەزای گیان پاکیی تۆ نەبووم. پیش خۆرهەڵاتن هاتیتە لام.. بەلێ هاتیتە لای منی تەنیا لەسایەی گۆشەگیریدا. هەر لەئەزەلەوە من و تۆ دۆستی یەکدی بووین و خەمەکانیشمان وەك دڵ ئارامی یەکەمانەهەریەك بوون.. دیسان بنی قووڵاییەکانمان و خۆری هەردووکمان یەك بوون. ئەگەر زۆریشمان

نەزانیبایە نەدەکەوتیەنە رازو نیازەوە .. دواتریش بێ دەنگی بالی بەسەرمان دا نەدەکیشاو مامەلەی شارەزایی خۆمانمان بەبزەوە دەر نەدەبری.. گوایە رووناکیەکانت لەرووناکستانی منەوە دەرنەچوون؟ .. ئەی بیرۆکەی تۆش هەر خوشکی بیرۆکەی من نیە؟!

پیکەوە فیری هەموو شتیك بووین.. پیکەوە خۆمان راهینا کەچۆن بەسەر زاتی خۆمان دا بلند ببینەوەو بە زەردەخەنەی بێتەمەوە رووبکەینە ناخی خۆمانو بەتیلی بیگەردەوە زاتی خۆمان نوقمی سەروبەری دیارو نادیار بکەین، ئەمەمان لەکاتیك دایە کە پەرۆشو حەزی خەفەو ئامانجە ئاواتەکانمان لەژیر مانەوە وەك پەلە باران تاودەستینن.

کەلەشەو رەویدا ئاوەکی دەبوومو بە ریگاکان دا ویل دەبووم نەفسی من حەزی لەچی دەکرد؟.. کە بەرەو ترۆپکی چیاکان پێ هەلّ دەگەرام دوای چی کەوتبووم؟.. ئەی ئاسمان! ئەرێ ئۆغرم هەر بۆ لای تۆ نەبوو؟.. ئەی گەشتەکانیشم هەمووی بریتی نەبوو لەرۆیشتنیكو بەتاوی مەشق؟ ئایە بیجگە لەسوورانەوە بەحەوادا ویستی من هیچ ئامانجیکی دیکەی هەبوو؟.. ئەوەندەی رقم لەهەور هەلّاو سەرپۆشی رووناکیەکان بووەتەوە دەبێ ئەوەندەش رقم لەشتی کە هەبووبی؟.. بەراستی چارەی خودی رقی خۆیشم ناوێ؛ چونکە ئاسمانەکەی خۆم! هەر ئەوەندە بوارەی بدەمێ سامالی توش لیلّ دەکا..

ئەی ئاسمانی بەراستی هەموارو لەهەموو شتیك دا چەسپیو! من چارەی ئەو هەورانەم ناوێ؛ دەلیی پشیلە کیوییینو بەماتە ماتە خۆیان لەمنو تۆ دەدزنەوەو سنگ پیوە دەنین. چ من و چ تۆ لەدەست ئەو هەورە خۆ رەپیش خەرانە بیزارین.. ئەو هەورانە بوونەوەری ناچیزەنو تیك دەکەنەوەو لیلّ و راران، نازانن دلّ سۆزانە لەعنەت بنیرن یان دلّ سۆزانە پیرۆز بایی بکەن.. ئەی ئاسمانی رووناکی! ئەوەم پیخۆشترە بترنجیمە کەورگیکەوە یان بترازیمە چالیکەوە نەك لەبەر دەمتا بوەستمو تەماشات بکەمو لەهەمان کات دا هەورەکان تیك بکەنەوەو بەری سامالت لێ بگرن.. ئای چەندەم حەز دەکرد بەتیرە برووسکەی زیرین ئەو خیلە هەورانەم بەئاسۆگەی تۆوە دابکوتنایەو ئیدی سەرەتاتیکیان نەکردایە! ئەوجا بەهەورە تریشقەی خۆم شرینگەم لە مەنجەلە هەناوەکانیان هەلّ بستاندایە.. زۆرم پێ خۆشە گالۆکی

خەشميان تێ بسرەوينم؛ چونكە ئەی ئاسمانی پرنوورو بەرين بەژوور سەرمەوە! ئەو هەورانە راستيەكانی تۆ لەمن دەشارنەوەو راستی منيش لەتۆ دەشارنەوە.

ئەوەم بەلاوە باشترە كەگويم لەهەورە تريشقەو لرفەو نالەی گەردەلوول بێ نەوەك گوێ بگرم بۆ مياوە مياوی ئەو پشيلانە كە بەدزەوە خۆيان رەپيش دەكەن. لەنيو كۆمەل دا وينەی ئەو هەورە رارايانە زۆرن.. دەرۆن و لۆقەدەكەن. بەراستی كاسە خەشمی خۆم بەسەر ئەوان دا قلپ دەكەمەوە.

((كەسيك نەزانێ خيرو بير ببەخشيتەوە با خۆی فيری لەعنەت ناردن بكا)) ئاسمانی ساماڵ ئەم سرووشتەی پێ راگەياندووم؛ ئەمەش ريبيريكە بەچەشنی ئەستيرەكان لە شەوەزەنگ دا ئاسمانی من نوورانی دەكا.

ئەی ئاسمانی نوورانی تاوەكو تۆ بەژوور سەرمەوەبی واز لە فەر بەشينەوە ناهينم، دەشێ يەكبينە بەيانی من بەباری هەمواردا تابينابێ؛ ئەوجا بە باوەری لەمەرخۆم سەرجەمی قوولايیيە تاريكەكان رووناك دەكەمەوە.

زۆرم رەنج دا تا پيرۆزمەندو دلنيا بووم، ئەو خەباتەشم لەپيناوی ئەوەدابوو تا بالەكانم ئازادبكەمو بەكامی خۆم بۆ فەرو پيرۆزی بيان رەوينمەوە. چۆن ئاسمانو گومەزی زەنگەكان گەردن كەش دەبنەوە.. چۆن خۆشی بەردەوام بلند دەبيتەوە فەرو بەرەكەتی منيش بەژوور هەموو شتيكەوە بەرز دەبيتەوە؛ كەواتە خەنی لەو كەسەی ئاوا پيرۆز مەندە! چونكە شتەكان بەگشتیو ئەو ديوی خيرو شەريش لەسەرچاوەی ئەبەدی هەڵ كيشراون، چاكەو خراپە لەخۆيان دا بريتين لە ئەنديشەی راگوزارانە و خەمو پەژارەی نمناكو گەواله هەوری راكردو بەرەونەمان.

بەراستی ئەوە كاريكی بەفەرەو لەعنەتی نيە كە وەهابزانين: ئاسمانی ريكەوتو ئاسمانی بێ تاوانیو ئاسمانی سەرگەردانیو ئاسمانی شلووقیو شلەژان بەسەر هەموو شتيك دا خۆيان رادەدەن!

وشەی ((ريكەوت)) كۆنترين ماكزايە بۆ هەموو شتيك لەجيهان دا.. هەموو شتەكانيشم بۆ لای ئەو گيراونەتەوە، بەلێ بۆ لای ئەو وەجاخزادەيەو لەبەندايەتی ئامانجو مەبەست قوتارم كردوون.. بەو رەنگە ئازادی خۆشەويستی ئاسمانيم وەك گومەزەكان بەسەر هەموو شتيكەوە بلند كردنەوە؛ چونكە فيری ئەوەبووم كە هيچ ويستيكی ئەبەدی نيە بەرزيان كاتەوەو لەسەرووويانەوە مەبەستەكانی والابكاتەوە.

بەراستی سنووریکم بۆ ئەو ویستە، تۆ بلی بۆ ئەو شیتی و شلووقی‌یە داناوە.. ئەمەش لەکاتیك دا بوو کەفیربووم (بەراستی گەیشتن) کاریکی نەکردەیە، بەنەکردەیش دەمینیتەوە.. ئەوەی هەیەو نیە کەمە هۆشیکە تۆزقالە پەندیکە وەك هەوین ئاویتەی هەموو شتەکان دەبن و ئەستیرەکان هەلیان دەلووشن.. خۆ بیت و شیتایەتی نەبووایە هەرگیز ئاویتە یان نەدەبوون.

لەبواری دانایی‌دا مرۆڤ هەر ئەوەندە دەتوانیٚ کەمیکی لی ببەخشیٚ. بەلاٚم لەهەموو جیگایەکیش دا باوەریکم بەدی کردووەو خاوەنی بەختیاری‌یەك بووە.. ئەویش باوپیدانی سەمایە بەسەر چوارپەلی کویرە ریکەوت دا.

ئەی ئاسمانی بەرین بەژوور سەرمەوە! ئەی ئاسمانی ساماڵ! هەموو بی گەردی‌یەکی تۆ بەندە لەسەر باوەری من کە لەگەردوون دا جالجالۆکەیەکی نەمرنیە، هیندەی تەونی جالجالۆکەکانیش دانایی تیدا نیە، ئەی ئاسمانەکە! بابەرو ماوەی تۆ شانۆیەك بیٚ بۆ ریکەوتە خەتەراتی خواوەندانە.. یان خوانیك بیٚ و خواوەندەکان نەردی خۆیانی لەسەر هەڵ بدەن.. کەواتە بۆچی پیستی رووت سوور هەڵ گەراوە؟ دەبیٚ لەبەر ئەوەبیٚ کە دەربرینەکەم رەوان نەبیٚ.. یان لەبەر ئەوەبیٚ فەری من نەفرینی بۆ هاوردبی؟.. لەوانەیە بۆیە شەرمەزار بووبی چونکە لیت تاك بوومەوە.. ویستم ئاوەهابم و لەقسە بوەستم، چونکە شەفەق لەئاسۆی تۆوە دەرکەوت؟!

لەجیهان دا چالو چۆلی واهەن رۆژیان پیٚ رانەگەیشتەوە.. پیٚویستە هەندیٚ شت لەبەردەمی‌دا حەشاربدریٚ.. ئیدی ئەوا رۆژمان لی بووە؛ کەواتە باجیابینەوە.

ئەی ئاسمانی بەرین، کەبەپاکی بەژوور سەرمەوە گرت گرتووە.. ئەی خۆشنوودی درەوشاوەی پیش خۆر هەڵهاتن! لەپر رۆژمان لی بۆوە؛ کەواتە بالیکدی جیاببینەوە.

زارا ئاوای گوت...

## پەسەندایەتی گچکەوەبوو

### ١

کاتـێ زارا دابەزیــە ســەر وشــکانی، دەســت بــەجێ رووی نــەکردە ئەشــکەوت و کیوەکەی .. بەلکو بەوناوەدا خۆیدا بـەدەم رۆیشتنەوە، هـەر شتیکی بدیتایـە لیکـی دەدایەوەو لەبەرخۆیەوە دەی گوت:

من روباریکم و بەپیچە ریـی خـۆم دا ماردوو دەکـەم و بەرەو سـەر چاوە دەبمـەوەو روو ناکەمـەوە ریژگـە. مەبەسـتی زارا ئـەوەبو لـەم گەشـتەی دا بزانـێ لـەو ماوەیـەدا کەدیار نـەبووە خەلکەکە چیبەسـەر هـاتووە.. حـالی حازر نازانـێ ئایـە مرۆڤ گـەورە بـووە یـان گچکــە بووەتــەوە. لــەدوا قۆنــاغی رۆیشـــتنەکەیدا لەبـــەردەم ریـــزە خانووبەرەیەکی تازەدا وەستاو دەرحال واقی ورما:

دەبـێ ئـەو خانووبەرەیـە ببنـە هیمـای چیو چـی پیشـان بـدەن؟ ئـەوەی راسـتی بـێ ساختی ئەو گیانە جەربەزەیەنین کە بە فەراهەم هینانی خۆی زاتی خۆی پیشان دەدا. دوور نیە لە جانتاو هەگبـەی منداليکـەوە دەرچووبن و منداليکـی ديکـەش بيـان خاتـە گەنجینەی یارییەکانەوە.

بۆچی پیاو دەتوانێ بچیتە ئەو خانووچکانەوە لیيانبيتـە دەرەوە..؟ لـەوەدەچێ بـۆ بووکـە شووشـەو بیج بیجـە خـانمی ئاوریشم لەبـەر سـازکرابن.. یـان بـۆ ئـەو بەچکـە پشیلانە دروست کرابن کەبـە هەلپـەوە خۆیـان کۆدەکەنـەوە پـەلاماری نیچیر بـدەن، کەچی خۆیان دەبنە نیچیر؟!

بەوردی زارا چاوی تی برین.. خەمیش دەنگی بزرکاند بوو.. ئیدی گوتی: هـەموو شتیك بچووك بووتـەوە؛ بـەکۆیدا لابکەمـەوە ئـەو دەرگایانـەم دیتـە بـەرچاو کەسـەر دەرانەکانیان نزم بوونەتەوە،

بیت و کەسانی وەك من پییاندا تیبپەرن دەبی خۆیان دابنەوینن .

تـۆ بلیـی زەمانـە هینـدە بخایـەنێ تـا دەگەریمـەوە نیشـتمانەکەم.. ئـەوجا لـەوێ ناچارنـابم بەرامبـەر هـەموو بچووکیك دابنەویمـەوە؟ ئەمـەی دەگـوت و بەتیلـەی چـاوان ئاسـۆی دووری دەبـری.. لـەم حەلـەدا بـەدەم هەناسـەوە تـەکانی بەتاسـەیەکی قـوولدا. زارا خـۆی دابین کـرد، ئـەوجا بـۆی وەسـتایەوە کــە دەربـارەی پەســەندی گچکـەوەبوو گوتاریك بدا..

## ٢

بەلای ئەو گەلەدا رادەبوورم و چاودەکەمەوەو نەفسی خۆم وریا دەکەمەوە، کەچاو لەباشی و پەسەندی‌یەکانیان دەنووقینم پیاوانی ئەو گەلە لیم نابوورن.. کە حەسوودی بەو پەسندایەتی‌یە دەبن و خۆم لەوە بە بالاتر دەزانم دیسان لیم خۆش نابن.

کە بلیم گچکە مرۆڤ شایەنی پەسەندایەتی گچکەیە ئەوا پیم دەوەرن.. کەزەینم لەدەرك پێ کردنی کەلکی بوونیان لە ژیاندا کول بێ ئەوا پیم دەوەرن. من لە کەلەبابیکی ئاوارە دەچم پۆلە مریشك بەشەرە دەنووك دای باریبنێ.. رقیشم لییان نابیتەوە؛ چونکە بەوە راهاتووم کە گرنگی بە ملۆزم و جارسکەری بی بایەخ نەدەم.. هەرگیز بەرەو شتی بچووك و بێ نرخ تیری خۆم بەرەو ژوور نەهاویشتووە، ئەوە لە ژیشك دەوەشیتەوە کە بۆ هەموو جوولەیەك پەری خۆی، درکی خۆی بژدەکاتەوە. گچکە مەردومەکان بەبێ ئەوەی هیچ کامیکیان بیرم لی بکاتەوە لەکەپۆرەی خۆیان دا باسم دەکەن، قەپوقر یان بەئەندازەیەکە سەرپۆشی تی فکرینم بۆ دەتەنی؛ ئیستاش چیژ لەجۆرە بێ دەنگی‌یەك وەردەگرم کەلەمەو بەر پیم نەزانیوە، کەلەپۆرەی خۆیان دا هەیانە بەدەستە براکەی دەلێ: چیمان بەسەرەوەیە، ئەو بۆخۆی ئیمەش بۆ خۆمان، چونکە هەوریکی سەهەندەیەو دای کردووەتە بەلایەك و راپیچمان دەکا.. کەواتە با خۆمانی لی بپاریزین.

دوینێ ئافرەتیکم بینی خیرا مندالەکەی پەل کیش کردو نەی هیشت لیم نزیکەوەبێ و قیژاندی: گەلۆ! مندالەکانتانی لی دووربخەنەوە دەنا بەو دووچاوانەی گیانە ناسکەلەکانیان دەسووتینێ!

هەر ئەوەندە بکەوتمایەتە قسە بەئەنقەست خۆیان دەهینایە کۆکە، پییان وابوو بە پرمەو کۆکین بەرهەلستی گەردەلوول و فەرتەنەی من دەکەن و بەدوای دا دەبەنەوە.. ئیدی لەترسان گۆییان تەپین و نەیان دەویست لەدەنگی من دا هەست بە ئاهەنگی کامەرانی بکەن.

دەلین وەختی ئەوەمان بەدەستەوە نیە بۆ زارای تەرخان بکەین، بەڵام بەرەبابیك هیچ سەری نەپەرژیتە سەر زارا دەبی بەکەلکی چی بی؟

گریمان خەلکەکە بۆ شکۆپیدانی من هاتبن. ئایا من دەتوانم بەدیار شکۆمەندی ئەوانەوە خۆم بخەفینم؟ ئەی ئەوە نازانی کە سەناخوانی ئەوان بۆ من درکە پشتینیکەو هەر ئەوەندە کلۆتم بگریٚ لیی قوتارنابمو لەخۆمی دابمالم شوینەوارەکەی دەمینی

لەنیو ئەم خەلکەدا فیری راستییەکی دیکە بووم: (هەر کەسیك گویٚ بداتە سوپاس گوزاری وای پیشان دەدا ئەوەی پیی درابی بیبەشیتەوە).. لەراستیش دا مەبەستی ئەوەیە پارسەنگی زمان لووسیو پیداهەل دان بەلای خۆیدا سلاوبداتەوە!

لەقاچەکانم بپرسن: ئایە بەم جۆرە نزیك بوونەوەیە لەخۆیان بایی بوون؟.. قاچی من کەپییان خۆش بی بەئارەزووی خۆیان بکەونە سەما هیچ پابەستەی هەواو نقامی تایبەتی نابن. ئەو گرۆهە ئاکارە پەسندە گچکەکانیان زمان لووسانە دەهیننە بەرچاو؛ هەمووشی بۆ ئەوەیە سەرنجی منیان بۆ کیش بکەن.. ئەوەتا دەفی بەختیارییە ریسواکەیان لی دەدەن تالە هەلپەرکیٚدا قاچەکانم سەغلەت بکەن.. بەش بەخۆم کەبەنیویان دا تیدەپەرم چاودەکەمەوەو ئاگاداری خۆمم، ئەوانیش هەردینو بچووك دەبنەوە. ئەوەی کردوویانەتە بنکەی پەسندایەتیی خۆیان هەر ئەوەشە تووشی ئەم بچووك بوونەوەیەی کردوون؛ چونکە گەرەکیانە لەپەسندایەتی خۆیان دا بحەوینەوەو بەنەوازشەوە تیکی چرینن، ئا بەورەنگە لەخۆرەپیش کردن دا قالْ بوونو بەلایانەوە خۆشە. ئەوجا بەکاوەخۆ بۆی هەلْ زناونو گەلە بەگەلە بوونەتە کۆسپ لەریگەی ئەوانەدا کەبە چوستی تەکان دەدەن لەپیشەوە رابوورنو بەپاش دا نەشکینەوە.

هەیانەو باری پیشەوە دەگریٚ کەچی یەکبینە بۆ دواوە مل دریژ دەکاتەوەو بۆ رەوتی شوین کەوتووەکان دەبیتە کۆسپو تەگەرە.

پیویستە سەر لەبەری قاچو چاوەکان لەگەلْ خودی خۆیان دا درۆزن نەبن.. کەچی لەنیو ناکەس بەچەکان دا درۆزن لەئەنداز بەدەرە !

دوورنیە لەنیویاندا خاوەن ویستو ئیرادە هەبێ.. بەڵام زۆرینەیان بەویستی بیجگەی خۆیان کاری گەرن.. لەنیویان دا دڵ سۆزیشت دەکەونە بەرچاو بەڵام زۆرینەیان لەزۆڵە کە نمایندەکانن، هەیانەو دەوری نمایندە دەبینێ بەبێ ئەوەی ویستی خۆی هەبێ.. یان دەکەویتە نمایشەوە بەبێ ئەوەی لیی بزانێ. بەدەگمەن دلسۆز لەو گرۆهەدا هەڵ بکەوێ! بەتایبەتیش لەدەستەی نمایندەکان دا.

لیرە چونکە پیاو گەل سفەتی پیاوەتییان تیدا کەمە ئافرەتان خۆیان بەپیاو حەلیب دەکەن، واتە لەمەوە (ژنەکورانی) پەیدا دەبن. لەنیو ئەوانەدا تەنیا کەسیك دەتوانێ ژن ئازاد بکاو ئافرەتی راستەقینە بخولقینێ کەبەتەواوی پیاوەتی تیدا رەخسابێ.

دەغەلترین شت کەلەنیو ئەو خەلکەدا کەوتە بەرچاوم هەڵویستی فەرماندارەکانیان بوو کە بەسایەی ئاکار پەسندیی بەرفەرمانەکانیانەوە کەسیتی خۆیان دەنواند، ئیستاش ئەو کاربەدەستانە بەگالە گالەوە گەردان بەچاوگە ناوی ((خزمەت)) دەکەن؛ کە دەلین : (خزمەتی کرد، خزمەت دەکا، خزمەت بکە، خزمەتمان، خزمەتتان....هتد)

دەك هەشت بەسەر، سەروەرییەکەم! بیتو جارنەدەی کەسەر تۆپی خزمەتکارەکانیانیو نۆکەرییەکەمیانی؟!

داخەکەم نیگای من ئۆقرەی لی براو کەوتە سووسە تاخۆی کرد بە حەشارگەی دەغلیو دژوینی ئەوان دا، وەنەبێ بەختیاری ئەوانم لی پەنهان بووبێ کە بەختیاری ئەو میشەیە بەسەر ئەو شووشە پەنجەرانەوە دەوزینێ کەتیشکی خۆریان بەسەردا دەشکیتەوە.. لەنیو ئەو گرۆهەدا چەندە بەزەیی پیدا هاتنەوەم دیتبێ لەبەرامبەریدا زەبوونیم بۆ دەرکەوتووە. کەسەرنجیان دەدەیتێ وەك ریزەی لم دەنکە دەنکە بەسەریەك دا دێ– ئەوانەش بەو چەشنە مامەلە بە رەوابینیو میهرەبانی دەکەن.[٢٧]

---

[٢٧] بۆ (ص١٩٦: كحبوب الرمال تعطف واحدتها على الاخرى))

دیسان ((حب الرمال)) بەدەنکە حیل/یش دەگوترێ، یان (حب الرمال) و شتی وا، بەڵام من هەر بە – دانەدانەی لمم لیدایەوە.

کاميانم کەوتبيتە بەرچاو لافی لێ داوە کەبەو کەمە بەختياریيەی هەيەتی قايلە.. بەلاّم بەئەوەندەش دانا کەوێ؛ چاوی هەوەس دەبريتە کەميکی دی تابی خاتە سەر ئەو چەردەيەی هەيەتی .. بەم روانگە هەنديك بەتەمان بەچاکەدانەوە لەشەری هەنديکی کە خۆيان بپارێزن.. بەلاّم بەش بەخۆم لەم ريرەوەدا تەنيا داهيزانو ترسنۆکی دەبينم، هەر چەندە ئەوانيش لەنيو خۆيان دا ئەو مامەلەتە بەکار پەسندی رەچاو دەکەن.

ئەگەر بەريکەوت ئەو جۆرە زەلامانە بە زبریو گری دوابن ئەوە لەهيزەوە نيە، من وام بۆ دەرکەوتووە کە لەئەنجامی هەوکردنی قورگيانەوەيە، هەر ئەوەندە هەلاّيکی گەرم وەبەر ئەستۆيان کەوت دەنگيان گرو در دەبێ. ئای کەمەردومگەليکی مەکری فيلبازن! ئەوا ديارە پەنجۆلەکانيان شووشو لەبارن کەچی لەمشت داگرتن دا گۆجن و پەنجەکانيان بەسەر لپەدەستيان دا نانوشتينەوە.

ئەو پەسەندايەتیيەی لەباوی ئەوان دايە لەدەستمۆ بوونو ناوەجاخی دەرناچێ، لەم ريبيرەوە گەيشتوونەتە ئەوەی کە گورك بکەنە سەگ، بەلکو مرۆڤيش بکەنە باشترين ئاژەلی مالیو مل کەچی دەسەلاّتی خودی مرۆڤی بکەن.

ئەوانە بەکەيفو پيکەنينەوە دەلين:-

تازە ئيمە شوينی خۆمان گرتووە لەبەينی ئەوانەدا شەرە گا دەکەنو خۆيان دەخەنە مەترسیيەوە.. هەروەها لەبەينی ئەو رەوە بەرازانەدا کە بێ پەروا بەرەلاّن، ئيدی ئەوا حالەتی نيوەندیی خۆمانمان وەرگرتووە..

-ئەم حالەتەی ئەوان بەريکوپيکی دادەنين،

بريتی يە لە حالەتی داهيزرانو داتەپين.

٣

---

-رەوابينی : انصاف.

هەرچەندە قسەی زۆرم بۆ ئەو گەلەکرد بەڵام نەتیی گەیشتن و نەبۆشیان لەبەرکرا. زۆریان پێسەیر بوو کەنەبوومە ئامۆژگارو پییان بلیم: خۆیان لە بیویلی بپاریزن. ئەمە شتیکی راستە کەمن ئەو ئامۆژگارەنیم لەنیویان دا خۆم بلەقینم و بلیم:

گەلۆ! وریا بن.. گیرفان برەکان پارەو پولتان لێ نەفرینن.. بەلێ من پەیامی ئەو جۆرە گەفینەم لە ئەستۆی خۆم نەبەستووە.

بەلایانەوە سەمەرە بوو کە ئەوەم لەخۆم نەگرتبوو هیرو گەمژەکان بیدار بکەمەوە تا هۆشیان بەلای پەندو پەندواریان و ئامۆژگاری و ئامۆژگارانەوە بێ.. دیارە گوییان بۆ ئەو مامۆستا کارامانە دەلەقێ کە – بەچەشنی جیرەی قەلەمە مەرەکەبی سەر تەختە– بەدەنگ دان و نەرە کرکراگەیان بروشینن.

خۆ ئەگەر تیم را بخورینایە: ئەو شەیتانە ترسنۆکانەتان بەلەعنەت بکەن کە حەزیان لەهەل نووزان و دەست بەسنگەوە گرتنی بەندایەتی یە ئەوا دام دەبارینێ و جاریان دەدا: زارا بێ باوەرومارزە. دەنگی ئەو مامۆستایانەی فیری کرنووشیان دەکەن بەسەر دەنگی ئەمان دا زاڵ دەبوو. منیش خۆم پی نەگیراو بەگویی گەلە مامۆستاکەم دا چپاند: منم زارای بێدین و لەخوابەری ! ئەگەر بیزم لێ نەکردنایەوە دەم فلیقاندنەوە، چونکە لەمۆریان دەچن لەکوێدا سووکایەتی و گولی تەشەنەی کردبێ پییدا هەڵ دەگەرین.

بەلێ قسەکانی خۆم بەگویی ئەو گەلە مامۆستایەدا چپاندن کەمن ئەو زارا بیدینەم و دەشلیم: شارەزای لای کەسیکم بکەن زۆر لە زارا بێدینتربێ؛ تاوەکو بەپەیرەوەکانی بنازم و کەیفم خۆش بێ.

بەلێ من زارای بی دینم.. ئەوانەی لەمن دەچن لەکوین؟ ئەو کەسانە لەمن دەچن کەویستی زاتی خۆیان هەر بەخودی خۆیان دەبەخشن. سەبرو قایل بوون فرێ دەدەنە ئەو لاو حەزیش لە خۆ بەدەستەوەدان ناکەن. منم زارای کافر. ئەوەی پیی دەبیژرێ ریکەوت لە مەنجەلی خۆم دا هەلاهەلای دەکەم و لیی دەگەریم تاپێ دەگا ئەوجا دەی کەمە خۆراکی خۆم. زۆر جارم دیوە خیلە ریکەوت وەك ئاغای قسە رەوا بەرەو رووم هاتووە بەلام ویستی من لە لووتی داوەو ناچاری کردووە کرنووشم بۆ

بباو بپاريتەوە لەلای خۆم دالدەی بدەم، ویستەکەم پیی گوتووە: (دۆست پەنا ناباتە بەر بیجگەی دۆست!)

کە وشەکانم گوییەك نەکوتنەوە لە گویێ خۆم بچێ دەبێ قسە بۆ کێ بکەم؟.. بەهەر حاڵ دەنگی خۆم بەرەو ئاسمان دەکەمەوە تا بەگەردەلوولەوە تێ هەڵبکاو بلێ: ئەی مەردومگەلی ناوەجاخ! رۆژ بەرۆژ سووکتر دەبن.. ئیدی بەرەو توانەوە دەبنەوەو دادەوەشین.. گچکە پەسندی‌یەکانتان‌و نەرمی دان بەخۆدا گرتنتان قرتان تێ دەخەن.

خەلکینە! ئیوە زۆر خۆتان دەسازینن‌و وازیش لەشتی زۆر دەهینن، ئەو زەمینەی تییدا نەشونماتان کردووە بریتی‌یە لەگلی خۆسازاندن‌و زەبوونی. ئایە قەدی پیرەدار ئەگەر رەگەکانی بەرەقەنی زەوی‌دا رۆنەچن‌و لەگاشە بەردەکان نەئالێ پتەودەبێ‌و گەردن کەش دەبێ؟.

لەسایەی کەمتەرخەمیتانەوە بۆ دوارۆژی مرۆڤایەتی تەونی کفن دەکەن.. ئیوە خیلە جالجالۆکەن‌و بەکاری بێ هودەوە خەریکن‌و خۆراك لەخوینی وەچەکانی داهاتوو وەردەگرن، ئای لەشت وەرگرتن دا چۆن دزیکن؟!

ئیوە بەسووکە پەسندی‌یەکانتانەوە خۆ هەڵکیشن‌و خەریکی راووڕووت‌و کاول کردنن. تەنانەت جەردەکانیش نەختێ پیاوەتییان تیدا ماوە؛ چونکە لەکاتی راووڕووتدا تا زۆر پێویستی نەکا– دەست نادەنە کاول کردن.ئارامتان کردووەتە بنەمایەك‌و پییەوە هەلەوگیرن دەشلین ئەوەی دەستتان ناوەتە بانی بەخششە، بەڵام من پیتان دەلیم: شتەکە فرینراوە..دزیتی‌یە.. خۆ ئەگەر تێ بگەن جەردەن‌و خودی خۆتان رووتەوە دەکەن.

بۆچی واز لەرارایی ناهینن‌و ویستی خۆتان ساغ ناکەنەوە .. بۆچی لایەك بەلایەك دا ناخەن، یان ئەوەتا بچنە ناخی تەمەلی‌یەوە یان خۆتان فرێ بدەنە گەرمەی کارەوە.

خۆزگە تی دەگەیشتن کەچی دەلیم: ((چیتان ویست ئەوەبکەن.. بەڵام لەپیشەوە خۆتان فیربکەن چۆن ببنە خاوەن ویست. خزم‌و کەسەکانتان وەك خۆتان خۆش بوین، بەڵام لەپیشەوە خۆتان خۆش بوێ.

ئایە هەتانە بەگەورەترین خۆشەویستیو بە گەورەترین سووکایەتییەوە نەفسی خۆی خۆش بویّ؟

ئایا قسە کەلکی چی هەیە کەگویّ بیستی لەمەرمنتان نەبیّ؟ ساتی من هیشتا نەهاتووەتە بەرەوە.. ئەوا هاتمە نیوتانو مزگینی دەری زاتی خۆمم.. من بەیانیم.. کەلەشیری بەیانیمو هیمان ریگاوبان تاریکە.

سەبارەت بەنزیك بوونەوەی ساتی من ساتی ئیوەش نزیك دەبیتەوە.. بەتیّ پەربوونی رۆژگار بچووك دەبنەوە.. تادیّهەژارو نەزۆك دەبن.. کەواتە گژوگیای بەدفەرنو لەزەمینەیەکەوە دەرچوون لەگژوگیا بی خیرترە.

زەمانە هیندە ناخایەنیّ ئەو گژوگیایە بەدەست خۆیەوە شەکەتو بۆژۆ دەبیّ.. لەوکاتەش دا کە دەسووتیّ تینووی ئاگرەو تینووی ئاو نیە.

ئەو ساتەی دەی کاتەوە هەورە تریشقە بەختەوەرترین ساتە. دەبیّ ئەوە چ نهینییەك بیّ ئاوا پیشی خۆرەتاو دەداتەوە؟ بەش بەخۆم لەم نهینیو هەورە تریشقەوە جۆگەلەی ئاگر هەڵ دەبەستمو بەریی دەکەم.. ئەو پەیامبەرانە دەنیرم کەبەزمانی بلیسە قسە بکەنو بەخۆرەتاوی مەزنەوە هەرەشە بکەن.

زارا ئاوای گوت...

## لەسەر کیوی زەیتون

زستان میوانیکی مەکر بازەو هاتووەتەلام.. دەستە شینەوەبووەکانی خۆمم بۆ دریژکرد تەوقەی لەتەك دابکەم. هەرچەندە ئەو میوانەم خۆش دەویّ کەچی حەزدەکەم خۆمی لی قوتار بکەم.. تا بەقاچی خۆم نەجوولیمو گەرمایی لەتیّ فکرینو لاقەکانم رانەگەریّ یەخەم لەیەخەی بەرنابیّ.. من لەدەست زوقم رادەکەمو روودەکەمەوە شوینیك گڤەی بای لینەییّ، ئەوجا دەگەمە کیوە زەیتوون.. ئەو شوینەی تیشکی خۆر چۆکی لی داداوە؛ لەویّ دەحەویمەوەو بەمیوانە دڵ رەقەکەم پیّدەکەنم؛ چونکە لەشیوینیك دا مۆڵی خواردووە بەشیخە- تەقەورەقە- و میش

كوشتن را دەبويرێ، ميوانەكە بە وزەی ميشكو دوو ميش قەلس دەبێ.. بەتەماشە هەموو شوينيك بكاتە چۆلەوانى.. تەنانەت گەرەكيەتى بەشيوەيەك بنۆريتە تريفەی مانگە شەو كە لەتاريكستانى ريگا بسلەميتەوە.

بەراستى ميوانيكى رەزاقورسەو دادەسەپێ، لەگەڵ ئەوەشرا پياوانە ريزى لێدەگرم، باكم نيەو پەناش نابەمە بەر خواى ئاگر.. هەروەك چۆن شلە ژنانىيەكان ليى دەترسنو دەستە داوينى خواى ئاگرن. باشتر وايە مرۆ لەسەرمان دا چۆقەیددانىبێ و پەنا نەباتە بەر بتەكان. بەدەست خۆم نيە رەمەكو غەريزەكانم ئاوام پێدەلين.. دەست بەردارى دوژمنايەتى ئەوبتە ئاگرينە نابم كە لەدەغەزیو مۆنى خۆیدا گردەستينێ. ئەگەر كەسيكم خۆش بوێ لەزستانا پترم خۆش دەوێ تاوەكو لەهاوين دا. لەزستان دا هەست بەئەوەدەكەم لە- گالتە كردن بەدوژمن-دا بەهيزم. كەلە خەوگادا پيخەف لەخۆمەوە دەئالينم هەست بەئازايەتى خۆم دەكەم؛ ئەوسا - بەختيارى- يە ساوا نازدارەكەم دەی كاتە گالە گاڵو پيكەنين.. لەولايشەوە خەونە درۆزنەكانم بەقاقاوە بۆی دەستيننەوە.

رۆژێ لە رۆژان بەئەشكو پيى قەوى تەكانم بەخۆم نەداوە.. ئيدی نازانم ئەو شتەی زۆرم لێ دەكا گوربەستمەوە چيە؟.. ئەگەر جارێ لەجارانيش پەنام بردبيتە بەر درۆ لەبەرئەوەبووە كە درۆكەم زادەی خۆشەويستيمە. ئەمە سەودايەكەو دلى منى ئاسوودە كردووە. بەتايبەت لەوكاتەش دا لەسەر پيخەفەكەم رەهيڵ بمو بەری ئاسمان بەهەورو هەڵا گيرابێ.

ئەوەنديكى لەپيخەفیسادەو بێبايەخ دا گەرم دەبمەوە ئەوەندە لەخەوگای نەرمونۆڵو رازاوەدا گەرم نابمەوە. من سوورم لەسەر هەژاريى خۆم.. بەچاو هەموو وەرزەكانەوە هەژاری لەزستان دا دۆستو ياوەرمە. لاسارانە هەموو بەيانىيەك بەهۆش خۆم ديمو بەئاوى سارد خۆم حەمام لەميش دەكەم، ئەم كارەشم تەنيا بۆ ئەوەيە بەزم بەزستان بگيرم.. با ئەو دۆستە دڵ رەقەشم بەرووم دا بلرفينێو بنركينێ. لەم حەلەدا پيم خۆشە بەرووناكى مۆميكى كەوە يارى بەتاريكای زستان بكەم.. تا شتەكەی لێ زل بكەمو بەئاگابێ.. ئەوجا پرينچكە نوور لەخۆلەميشى ئاسۆیخۆيەوە رەوانە بكا.

لەبەرەبەیان دا لەوکاتەدا قاپو قاچاخ لەبەر دەم ئاوەرۆدا ئەدەن بەیەك دا.. كە ولآخە بەرزە سم دەكوتێ بەبۆرە شەقام داو دەحیلینێ ئالەو ساتەدا گیانی ئازار بەخەبەرم دەهینێ. ئەوجا مۆلەق دەوەستم و چاوەروانی نوورم لە ئاسمانەوە كە لەپیریكی ریش ماش و برنج دەچێ و سەری وەك كلووی بەفر بترسكیتەوە. ئای لەئاسۆی ئاسمانی زستان چەندە مات و مەندە؟!.. جار جارەش بەسەر خۆردا زالە.. وازی لی دەهینێ تا لە بێ دەنگی خۆیەوە بگلی.. تۆ بلیی خۆریش لەو ئاسمانەوە خوودار بووبێ، لەماتی و بێدەنگیدا رووناكیی‌خۆی قەتیس كردبێ.. یان لەمنەوە فیری شتی ئاوەها بووبێ؟! لەوانەیشە هەر یەكەمان ئەم كشوماتی‌یەی بۆ خۆی فەرام هینابێ؟.

شتە چاكەكان سەرچاوەی جۆراو جۆریان هەیە؛ چونكە بەخۆشی یەكەوە بەنیو هەبووندا بازدەدەن. ئەوەنێ خیرا وەدەركەون و ئاوابن.

بێ دەنگیی بێ پایانیش زادەی هاوبەشی ئەو شتە باشە بەكەیفانەیە.. هەر لەبەر ئەوەیە كە رووی منیش وەك رووی‌ئاسمانی پاش باران گەش بووەتەوەو نیگای هیمن لەچاوەكانم دا حەواوەتەوە. چۆن ئاسمانی زستان بەری رۆژی خۆی دەگرێ منیش رووی خۆری خۆم دادەپۆشم و ویستی خۆم حەشاردەدەم.. لەزستانیشەوە فیری ئەم جۆرە مەكرانەبووم. لەم هونەرەم دا پلەیەكم بەدەست هینا. كەنەی هیشت بێ دەنگیەكەم بەخودی بی دەنگی ناوزەدەبی، وام لی‌هات بەفیلْ لی‌كردن و خەلەتاندنی خۆبەزل زانەكان بكەومە گەمەو رابواردن.. بەقسەو یاریی نەردەوە خەریكیان بكەم و بخەجلین. ئا بەم رەنگە كەس بۆی نیە بەناخی دانایی و ئەو پەری ویستی من دا برواتە خواری.

كەبی دەنگی و مەندیم پەیداكرد ئاواش داهاتمە مەبەست.

زۆر پیاوی فیلبازم دیوە كەرووبەندی بەرداوەتەوەو ئاوەكانی لەناخ دا شلەقاندوون تاكەس نەتوانێ بچیتە ئەو پەری سروشت و نیهادیەوە، ئەوجا فیلبازە مەزنە كار سەختەكان دەورەیان داوەو سەرپاكی ئەوماسییانەی لەقوولایی بناوانەكانی دا پەنای دابوون راویان كردوون.

ئەوانەی بێ دەنگی نایان زرینێ ئەوکەسانەن دڵو دەروونیان پاکو بێگەردە.. بەڵام ئەو پەری نهینگەیان بۆ هیچ چاویك دەرناکەوێ.. ئەو نهینگانە لەژێر توێ ئاوە روونەکان دا بریتین لەناخی بێ پایان.

ئاسمانەکە! تۆ بەرووی سپیتەوەو بەچاوی گەشتەوە نیشانەیەکی بۆ نەفسی من، ئەو شۆڕشوئاشووبەی نەفسی من نیو خۆی گرتووە تۆش لەنەدیوتەوە هەر ئەوەت پەناداوە. وەك ئەو کەسەی زیری قووت دابێ، پێویست دەکا خۆم بشارمەوە، نەوەك لەفرۆشگای نهینگرەکان دا نمایشی گیانی خۆم بکەم. بۆ ئەوەی قاپقاپەی بەرز سەر پێ بکیشم؛ ئەوانە نیهاد وشکی، کۆنەخوازی داوەشاون.. هەرگیز ناتوانن لەئاقار بەختەوەریی من دا چاو هەڵ بهینن.

لەپیناو ئەمەدا بیجگەی بەدبەختیمو سوانە بەفری لووتکەکانی خۆم نەبێ چی دیکەیان بۆ وەدەر ناخەم.. ئەوەیان ناخەمە بەر چاوان کەخۆر بەهەموو روناکییەکانیەوە کیوەکەی من کەمەر بەست دەکا، خۆ ئەگەر لەگوزەری من دا شتیکیان بیستبێ بریتییە لەنرکەی ئەو فەرتەنەیەی بۆ یان حەوالەدەکەم.. هەرگیز ئەوەیان بەدڵ دا نایە کە باشووری لێ وەردەگرمو لەگەڵ خۆم دا دەی هینم.

لەبەر ئەوەی لەبینەو بەرەی رۆژگاردام ئەم خەلکە دلیان پیم دەسووتێ.. لەهەمان کاتا هاوار دەکەم:

(واز لەریکەوت بهینن، بابیتە لام.. ئەویش وەك کۆرپە ساواکان پاکیزەیەکە بۆ خۆی.

ئەگەر فەرتەنەی زستانم نەکردایەتە منزلی بەختیاریمو لەویدا گیرم نەدایەو کەوڵو کەوای زستانەم لەخۆمەوە نەگرتایە. ئایا ئەو خەلکە توانای ئەو گوزەرانە بەختەوەرییەی منیان دەبوو؟

ئەگەر من لەبەر دڵ پێ سووتانی ئەوانەی لەفیلی خۆیان دا ئازار دەچیژن بەزەییم بجوولێو ئەگەر لەسەرمانا لەبەردەمیان دا بلەرزمو رازی بم کەمیهرەبانی ئەوان باوەشم بۆ بکاتەوە ئەوە هەمووی لەبەر خاتری یەك (دانایی رووح سووکە) لەدلی

خـۆم داو ئـەو كريوەيـەی ليـی هـەڵ دەپيچـێ و نـای شـاريتەوە.. ئـەو ئـازارەی لـە زامیسەهۆڵبەندانيشەوە بێ پەنهانی ناكا.

هـەندێ كـەس كەدەيـەوێ گۆشـەگيربێ بـۆ ئەوەيـەتی لەدەسـت نـەخۆش رابكـا.. هەشيانە بۆ ئەوەيەتی لەبەردەمی نەخۆشەكەدا بوەستێ.

وازيان لی دەهينم:

باگوێ لەنالين و سكاڵای من بگرن لەبەر شەختەی زستان دا..

من بەم جۆرە نالينەوە لەژوورە گەرمەكانيان گرنگترو سەيرترم.. با بەزەيتتا پيم دا بيتەوە .

ئەوجا با بلين:

ئەوە زارايەو لە سەرمای زانياری دا بەشەختەوە سەردەنيتەوە!

بەڵام من!

بەقاچە گەرم و گورەكانم بەسەر (كيـوی زەيتـوون) دا رادەكـەم و لەمۆڵگـەی تيشـكی خۆردا بەگۆرانیيەوە تيرا دەچركينم و گاڵتە بەهەموو دڵ پێ سووتانيك دەكەم.[٢٨]

---

[٢٨] ئـەو جـۆرە زيـدە رەویيـە لـەويچوون خـوازەی شـاراوەدا، لايـەنيكی تـازە بـەتازەی نايابيژیيـە لـەزمانی ئـەلمانیدا .. بـەڵام وەك دەی زانـين بـەپيی گيـانی ئـەدەبی جيـهانی و گشتی نابيتە قالبيكی رەوانبيژی بۆ هەموو دەربرينە زمانيك .

ئەوەندە هەيە كە زمانی عەرەبی باشترين زمانـە كەبليمـەتی نووسـەران بەهـەر زمـانيك بـێ پيی تاقی بكريتەوە /فليكس.

*

تيبينی:

ئەمە ئاشكرايە كەنيتشە بەر لـەوەی بەسـەر فەلسـەفەدا بشـكيتەوە زمانـەوانی فيلۆلۆژيـی ئـەلمانی بـووە، رای هـەندێ لەشـارەزايان ئەوەيـە كەبنكـەی فەلسـەفەكەی لەسـەر كرۆكـی دەربرينە زمانیيەكەيەوە دامەزراندووە. ئەگەر فەلسەفە دژوارەكـەی لـەخۆیدا گەردشـيك بـی ئەوا نايابيژیيەكەی شۆرشيكی ديكەيە بەسەر رەوانبيژی باودا!

زارا ئاوای گوت...

## لەسەر ڕێگا

کە زارا بەرەو چیاو ئەشکەوتەکەی دەبووەوە بەنیو چەند شارو گەل دا ڕادەبوورد بەکاوە خۆ ئۆغری دەکرد. لەناکاو بەسەر شاریکی گەورەدا کەوت، هەر کە پیی خستە ناوەوە شتیکی لی قووت بووەوە، وەك چەپەربالی لی ڕەواندنەوەو بەری ریی لی گرت.. ئەو شیتەی کەفی دەچاند خەلکی شارەکە نازناوی ((بەختیارۆکی زارا)) یان بەسەردا بری بوو؛ چونکە لە جموجوولو دەراوی قسەدا لاسایی زارای دەکردەوە، کەمیك پەندیاری بەچاولیکەری ئەو پەیدا کردبوو.

شیتە زارای دواند:

ئیرە گەورە شارەو تییدا بەهیچ مەرامیك ناگەی‌و زۆریشت لەکیس دەچێ.

پیم نالیی لەپای چی خۆت لەم بارودۆخەوە دەگلینی؟ کەواتە نەختیك بەزەیت بەپیی خۆتا بیتەوە؛ ئیدی هەر لەدەروازەی شارەوە لیی بوەستەوەو تفی خۆتی لی بکەو بگەریرە دواوە. ئیرە بۆ بیرو تیفکرینی نایاب دۆزەخیکە بۆ خۆی.. لیرە بیرە بەرزەکان دەتوینەوەو دەبنە ئاویتەیەکی لنجاو! لیرە هەموو سۆزیکی ئابرومەندانە دادەوەشێ، تەنیا وشکە سۆزەکان بۆیان هەیە بدەن بەیەك داو نەفسی خۆیان جاربدەن.

---

ئەوجا ئەگەر خوالی خۆشبوو (فلیکس فارس)بەوە نازیبیتی کەزمانی عەرەبی زۆر بەهیزەو دەرەقەتی ئەو زمانە تایبەتی‌یە هاتووە، ئەوا ڕیگە بەخۆم نادەم زیدە بەکوردیەکەم بنازم، لیشم تاقی کردەوە!!

ئالانی

ئەریّ بۆنی قەسابخانەکانت نەکردووە کەلەویّ بیرو باوەڕەکان سەردەبردرین.. بۆ چرووکی چیشتخانە بازارییەکانت بەلووتا نەچووە کەلەویّ بیری سەربراو بە هەرزان دەفرۆشن؟

ئەریّ هەلمو بوخاری ئەو هۆش و گۆشانەی بوونەتە قوربانی نابینی وەك چرەدووکەلّ بەسەر ئەم شارەوە تەمیان کردووە؟

ئەی ئەو گیانە هەلواسراوانەت ناکەونە بەرچاو، وەك سیپالە شر هەلّ خراون، کەهەلیان بدەیتەوە دەبنە ئەو رۆژنامەو غەزەتانەی لەنیو مەردومگەلەکەدا بلاّودەکرینەوە؟!

ئەریّ گویت لیّ نیە کەبەیانو گفتی ورشەدار لیرەدا دەگۆڕیّو دەبیتە گەمەی وشەو قسەچنینی بیّماناو خشتەی رۆژنامەکانیان پیّ سیخناخ دەکریت، ئەم رۆژنامانەش سەرەنویلکیکن بۆ خۆیان؟!

خەلکی ئیرە بەیەکدی دەویرنو ناشزانن لەسەرچی ناکۆکن .. ئەوەتان کاسەی غەزەب بەسەر یەك دا قلپ دەکەنەوە، ئەوەی بەگویتی ئاشنادەکەن تەنیا زرینگەی پارەکانیانە!

خەلکی ئەم شارە زلە کەسیرەنو بەمەی هەلّدان نەبیّ گەرم نابنەوە.. هەر ئەوەندەش گەرمیان تیرا گەرا پەنادەبەنە بەر وەیشمەی بیرە ساردو سرەکانیان، ئەمانە بەدوای ((را)) گشتییەکان دا جەلە دەبنو لەپلەی جۆشاندا پیی کاریگەر دەبن.

ئەم گەورە شارە کۆگای ئاکاری ناپەسندو هەوەسبازییە، دیسان هەر لیرەش دا سیفەتگەلیکی پەسند هەیەو لەهونەر ئارایی‌دا شوینی خۆیان گرتووەو پەنجۆلەی نووسینو پاشلی قورقوشمیان هەیە.. ئەو کەسانەیبەم سفەتە پەسندانە رازاونەتەوە، خاوەنی ئەو پشتییە چەرمانەن کە نیشانەی ئافەرینو شکۆیان پیدا بەردراوەتەوە.. ئەو خاوەن فەزلاّنە کچ گەلیان هەیەو پاشلّ پووچن.. بەلاّم هاتوون لە پووش کەفەلیان دروست کردوون.

ئـالیرەدا دڵ پێسـووتانو شـکۆی فـرەو کزەلۆکـیو نـاوە جـاخیکی زەبـەندە لەبەردەمی لەشکر خوادا دەبینـی؛چونکە لەپایـە بـەرزی ئـەورا ئەسـتیرەکان بەهەنکـەو تـەکان دادەوەرنـە خـوارەوە.. هـەر سنگو بـەرۆکیك لەوسـتارانە بێبـەش بـێ پرمـەی تاسەو حەز بۆ ئەو بلندانیە رەوانە دەکا.

مانگ ئاسمانی خۆی هەیەو شوین کەوتووەکانیشی بەو ئاسمانـەدا دەسورینەوە. گەلی سوالکەر کەلەگەڵ رەوشتە باشە سوالکەرەکان دا سوور نـەخوا، دروودو نویـژ بـۆ ئـەو شـتانە دەکـا لەسـوورگەی مـانگ دا دەخولینـەوە، نویژەکـەش بریتیـیـە لـەم وشەگەردانی (تصریف)یە:

((خزمـەتی .. خزمـەتم.. خزمـەتمان.. خزمـەتیان -کـرد...)) ئـەوجا خـاوەن فەزلـەکانیش بـەم درووودانـەوە ویـرە ویـری بـۆ دەکـەن روو دەکەنـە فـەرمانداری بـالأو بەتـەمان لـە پایـەی ئـەوەوە ئافـەرینو نیشـانەی بریقـەدار بپەریتـە بـان سـنگە تەسکەکانیان.

ئەگـەرچی خـودی مانگ بەگـەردی زەویو زادەی گڵ دا خـول دەخواتـەوە، خـودی فـەرماندار دیسـان بـە دەوری ئـەو شـتانەدا دەسـووریتەوە کەبەرهـەمی زەویـن. هیـچ شـتیك لـەزەویدا هینـدەی زیـری کوتـاڵ فرۆشـەکان وەجـاخزادە نیـە، مـیر لەشـکر خواوەندی قالبە سکە نییە، هەر کەلەشکر خوا تەگبیری دامەزراند ئەوا کوتـاڵ فرۆش دیتو بریار دەدا.

زارا! ئەوا بەو نوورو هیزو چاکەیەی تیتدایە سویندت ئـەدەم کەئـەم شـارە (شـاری کوتـاڵ فرۆشـەکان) بـەجێ بـهیلی. ئیـدی بگـەریرەدواوە. ئـەو خوینـەی بـە دەمـاری دانیشـتوانی ئـەم شـارەدا دەگـەرێ پیس بووە.. کەواتـە تـف لـەم گـەورە شـارە بکـە؛ چونکە سەرەنویلکی هەموو پیسیو خاشاکیکە.

ئیرە شاری سینە تەسكو دەروون لاوازەکانـەو پـر بـەزارت تفی تـی بکـە.. شـاری چـاوپیسو پەنجۆلـەژنانیو شـاری بـێ ئـابروو سـێ بـەندی بەدکارانـە.. شـاری چاوچنۆكو بەسەر یەك دا کەلەکەبووە مۆرانـەی فەساد دایان دەوە شینێ.. هـەوەس بازن.. بریندارو گەرن.. پیلانگیرن..!!

-تف لەم شارە بکەو بگەڕێرەوە دواوە-

ئەو شێتەی لەخەشمانا کەفی دەچری زارا دەستی نا بەدەمیەوە، پیی گوت: ئیدی بەسەو بی دەنگ بە!!ئەم قسەو بزووتنەوەیەت فرە ریسی بوو، خۆم لەبەر راگرت. ئەدی پیم نالیی چی وای لەتۆ کرد کەلەدەوری ئەم زەلکاوە نیشتەنی بی و ئەوان ئاسا ببیتە بۆق و دووپشك..!؟

ئەی دەمارەکانی تۆش گەناوەکانی ئەو قلرخەیان تیرا ناگەڕێ.. ئەوەنیە باش باش دەقیرینی و جنیو دەفرۆشی؟!

ئەی بۆچی خۆت نەکرد بەدارستانیك دا.. بۆچی نەچووی زەوی‌یەك بکیلی.. ئەی نابینی لەهەموو لایەکی دەریاوە دوورگەکان سەوز دەچنەوە؟

تۆ بەلای منەوە زۆر سوك و رسوای؛دەبوو پیش ئەوەی ئامۆژگاریەکانت بەسەر من دا بریژی ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکردایە. سووك کردن و داشۆرینی لەمەر من پەلەوەری هەرەشەیە، هەر ئەوەنیە کە بەژووپیسی زەلکاوەکانەوەیە.. بەلکو لەکانگای‌میهرو حەزەوە باڵ دەگریتەوەو خۆی لوول دەکا.

ئەی شیتی کەف چڕ! خەلکی پیت دەلین -بەختیارۆکی زارا- وەلی من پیت دەلیم: بەرازەکەی خۆم! واز لەم قۆرەو فیشقەیە بهینە، بەهەرحاڵ بەش بەخۆم مەدحی شیت گیرم کردووە، ئەگەر بێ دەنگ نەبی ئەوا منیش نکوولی لی دەکەم.

پیم نالیی ئەم زەنا زەنایەت لەپای چیە؟.. ئەگەر بەتەمای سوپاسی ئەم خەلکەی ئەوا دەستی لی بشۆ. دەشێ وابێ، بۆیە لەپاڵ زبلخانەکانەوە لیی دانیشتووی و دەنەرینی.. ملووموشی ئەوەتە شتیکت وەچنگ کەوێ و بۆ تۆلە سەندنەوە خۆتی پێ‌چەکدار بکەی. وادەزانی کاری تۆ بەلای منەوە پەنهانە؟

ئەدی نازانی تفی لالغاوەت کەفوکولی خەشم و کینەیەو لەدلتەوە سەر دەکا؟

بێ‌دەنگ بە! چونکە وتەکانت با -راستی-شیان تیدا پیچرابیتەوە زیانم پی‌دەگەیەنن .. گوتم: ئیدی بیدەنگ

بە!

باله قسه جوونەوەت دا هەزار راستيى قسەى من خۆى حەشاردابێ، تۆ هەر بەو گوتانەى لەمەر خۆم بەدناوم دەكەىو خراپەم پێ دەگەيەنى.

زارا ئـاخى هـەڵ كيشـاو لەگـەورە شـارى هەلـە روانـىو ئـاواى گـوت... دواى بيدەنگى‌يەك هاوارى كرد:

((وەنـەبێ تـەنيا هـەر ئـەو شـيتە بيزار بوونـى مـن دەربـبرێ.. بـەلكو بـەش بـەخۆم چارەى ئەو شارەم ناوێ. شار لەشيتە دەچێو شيتەش لەشار دەچێ.. لـەم دووانـەدا شتيك نيە شيانى چاك كردن بێ يان پتر خراپ كردن بێ.

واى بۆ ئەم شارە گەورەيە! خۆزگە گيژەلووكە و لافاوى ئاگر لوولى ئەداو دواتر دەى كردە خۆلەميش!

خۆدەبـێ ئـەو جـۆرە فەرتەنەيـەى لى هـەڵ بكـاو هەرەشـەى خۆرەتـاوى مـەزن رابگەيـەنێ.. خۆرەتاويكـەو ژوان بەسـتەى چـارەنووسو زەمـانى خۆيـەتىو دەبـێ رەهابێو دەرچێ.

شيتە! ئەوا ئەم ئامۆژگارى‌يەت دەكەمو مالاوا: ((كەمرۆڤ بۆى نەلوا ڤيانى خۆى ببەخشێ بالەپيناوى‌دا بروا!))

زارا ئـاواى گـوت... و بـەريگاى خـۆى‌دا رۆيشـت و گـەورە شـارو شـيتەى بەجێ‌هيشتن.

## بەندە راكردووەكان

### ١

داخەکەم! هەرچی ئالۆ والآو ناسك بوو بەسەر میرغوزاردا دەشەکایەوە، کەچی ئیستا سیس‌و ژاکاوە. ئالیرەداو لەمەوبەر خەریکی هەنگوین برینی ئاوات‌و ئومید بووم‌و شانە بەشانە بۆ کۆلەسی خۆمم دەبرد.

پیری بەسەر دلە لاوەکان دا- دەسەلاتی پەیدا کرد، ئیستا وەختی ئەوە نیە بەسەر ئەم لاوانەدا بکەوینە زرتوزۆپ، ئەوچینە هیندە شەکەتن دەست بەستەی تەمەلی دەبن‌و بەگفتی خۆیان پاکانەی حالی خۆیان دەکەن، کە دەلین: بەتەواوەتی بامان دایەوە بۆ خۆ پاریزگاری.

لەوکاتەدا هەنگاوی دلیرانەیان هەڵ دەهینایەوە بەچاکی تییان هەڵدەباویشکام.. بەلام ئیستا زانیاری‌یەکەشیان وەك قاچەکانیان سروگۆتە.. وایان لی بەسەرهاتووە گەمەیان بە- بەرەبەیانی ئازایەتیان بێ‌و لیی پەشیمان بن!

زۆرینەیان وەك سەماچییەکان لووت بەرز بوون‌و بەحیلکەوە جاریان ئەدا کە مریدو پەیرەوی دانایی منن‌و خیرا لەقوولایی تی فکرین رۆدەچوون. ئیستاش ئەوەتان لەبەردەممەوە بەکوورە کوورەو لەسەر ئەژنۆ بەرەو (خاچ) خۆیان کیش دەکەن.

جاران وەك خیلە پەپوولەو شاعیران بەگەردی سەربەستی‌و ئاگردا چەرخەیان دەکرد کەچی هەستیان بە گیرو گازو وەیشەمەی رۆژگار نەدەکرد... ئەوجا بولای ئاگردان قاچاندیان تاوەکو بەچەشنی میزەر بەسەرو ئامۆژگارە پەندیارەکان خۆیان لەبەر کوانوو رادیرن و لەبەر تینی ئاگر ئەم دیواو دیوی لی بکەن.

سەبارەت بەئەوەی کەبەرکەنار بووم‌و لە بەرچاو نەماوم دەبێ ئەو گرۆهە ئازایە داهیزابن.. ئەوجا بێ هوودانە گوێ قولاخی شیخەی کەرەناو هەرەشەی من بووبن؟!

بەداخەوە! بیجگە لە چەند دلیکی قایم لەرووی زەمانەدا گیان توندو خۆراگر شك نابەم.. لەهەمان کات دا ئەو رەشۆکی‌یە بوودەلانەی سەرباری ژیانن بەخۆیان‌و بێ جەرگییانەوە زۆرو زەبەندن!

دەشێ ئەوەی هاتبیتە ریگام دیسان هاتبیتە ریگای ئەوانەش کەبەچەشنی منن.. ئەوەی من ئاسا بێ دەبێ هەڤالە پیشینەکانی بریتی بن لەپارچە لاشەی مردوان‌و مەشق کەرانی یاری‌و بەزم.

هــەر ئــەوەندە بــەلای ئــەو گرۆهـــەدا رابووردایـــە دەســـتەی دووەم لـــەتابووری ئیماندارەکـان دەهاتنــەلای، ئەمانـــەش ڤیــانی زۆرو شــیتایەتی خەســـتو شـــکۆی ساوایەتیو نەوازشی منداليان تيدا فرەو زالە. ئەوجا ئەوەی من ئاسايە پێ ويستە خۆی لەسۆزو پەرۆشی ئەو خیلە ئیماندارە بپاریزێو گویی پینــەدا.. چونکـە ئـەو کەسەی شارەزای بێباریو زەبوونی ئـادەمیزاد بـێ، بـروا بەئـەوە ناکـات لەبـەهاردا میرغوزاران هەمیشە ئالو والادەبن!

ئەگەر ئەو ئیماندارانە لەسەر ئەو رەمـەكو غەریزەیـە هـەڵ نەکەوتنایـە ویسـتو ئیرادەیان دەگۆرا. ئەوەش دیارە کەناکامڵ شان لەشانی کامڵ نادا. کە گەلای شەنگ پووکایەوە ئیدی لەپای چی سکالاَ بکەمو هەڵ نووزیم..؟

ئەی زارا! واز بهینە؛ با گەلاکان دابوەرن.. لی گەرێ با بۆخۆیان هەڵ بوەرنو زریان راپیچیـان بکـا.. وازیـش لـە سـکالاو کروزانـەوە بهینـە.. باشـتر وایـە هەناســە فـرێ بدەیتـەوە، دەی توند بپرمینـەو یارمـەتی (بـا) بـدە کـە لـە پـەلوپۆی ئـەو گـەلاَ ژاکاوانـە هەڵبکا.. دەی زارا تۆش فوو لەگەلای خەزان بکە.. با– هەرچیەکی لەدەورو بەرتـەو سیسو ژاکاوە تەرتو تونابێو نەمینێ.

## ٢

بەندە راکردووەکان دەلین: ئیمە بۆ خۆ پاراستنو تەقوا دەگەریینـەوە. کورینـە! زۆربەی ئەو تۆبەکارانە بوودەلەن؛ زات ناکەن بۆ دەرباز بوونیان پاراستن بکەنە بیانوو بۆ خۆیـان. بەش بـەخۆم پەنجـە دەکـەم بـەچاویان داو جـاردەدەم: ئـەرێ ئەوەنیـە بـۆ کرنووشو نویژ کردن یاتان داوەتە؟! بەهەموویان دەلیم: ئەگەر نویژ کردن لەو خەلکە عەیب نەبێ، ئەوا بۆ ئیمەمانان مایەی شەرمەزارییە؛ چونکە لەئەنجامی بیرکردنەوەوە هەستمان وریا بۆتەوە. بەچاو تۆوە نویژ بەخراپە دەگەرێ چونکـە ئـەو شـەیتانەی لەتۆدا خۆی مت داوە کـەیفی بەئـەوە دێ دەست بەسـتەبێو ئارەزوومـەندی خـۆش گوزەرانی بێ. غایلە دەخاتە دلتەوەو پیت دەلێ: خوا هەیە. تۆش بەندەیەکی لـەو

نووره رادەکەی کەبیرو هۆشی خەجلاندووی. کەواتە ئیستا هەر گومرابەو رۆژانەش خۆت بکە بەتاریکستانیدا.

بەراستی بۆ رەهابوون کاتیچاکت هەڵ بژاردووە ئەوا بالندە کانی شەوگار بالیان لی رەواندووەتەوە، ئەمە ساتی ئەو تاریك پەروەرانەیە لەئیشو کاردا مان دەگرن..

ساتی راوکردن نزیك بووەتەوە.. ئەمەش بۆ ئەو نیچیرە نیە بەهیرشەوە بۆی راپەری. بەلکو لەخۆیدا قەتیس مانە لەبۆسەدا، بیجگە لەپسەپسی نزاو نویژ چی دیکەی تیدا نابیستریّ.. ئەمەنیچیر بازیی ئەو کەسانەیە لافی دانایی لی دەدەنو جاری دانایی دەدەن. نەخیر داوی تیدا دەنینەوە بۆ بەیدەستی هەموو دلیك.

هەتا پەردەیەك هەلمالدریّ شەیتانۆکەیەك تۆ بلیّ شەمشەمە کویرەیەکی گچکە دیتەوە بەرچاو کە لەو دیویەوە فرتەی لی دەکا.. لەوانەیە لەگەڵ شەمشەمۆکەیەکی دیکەدا خۆی پەنادابیّ. چونکە سەرنجی هەرلایەك بدەم کۆمەلیك خۆیان دەشارنەوە.. ئەوجا گرۆهی تازەی رۆشنبیر بەسایەی بۆنو بۆندانەوەی پاریزگارییەوە بۆ لای بۆسە خواردووەکان کەمەندکیش دەبن. ئەمانە کۆردەبەستن بۆ شەوگارکردنەوەو دەبیژن: با بۆ دۆخی ساوایەتی بابدەینەوەو لەخوای کارساز هەڵ نووزیین. ئەمەش لەو کاتەدا دەکەنە ویردی خۆیان کە گەدەیان پر بوویّ لەحەلوای دەست کردی تەقواکەران. هەندیّ جار لەکاتی شەوارەدا کۆمەڵ بەستن بۆ تەماشای ئەو جالجالۆکە ئۆینبازەی لەودیو بۆسەوە دەوەستیّ وئامۆژگاری هاوری جالجۆلەکەکانیدەکاو پییان دەلیّ: ((باشترین شت کەمایەی ئاسوودەیی جالجالۆکەکان بیّ ئەوەیە کەلە سیبەری سەلیب دا جۆلایی خۆیان بکەن.ئایا نایان بینی بەتۆر داهیلانی نیو زەلکاوەکانەوە رۆژگاریك بەریّ دەکەن، وادەزانن دەگەنە بناوان.. ئاگایان لەوە نیە بیتو کەسیك لەشوینی بیّ ماسیدا کات بەراوکردن بباتە سەر ئەوە رەوانیە بە(کاریکی سەرکیلی)ش ناوببریّ.

جار هەیە دەیان بینی تەقوا کەیان تیکەڵ بەکەیف سازی دەکەن. ئەو جۆرە مەردومە دەرسی سەرنج لیدان لەمۆسیقا ژەنیکەوە-وەردەگرن کە ئەودالی ریگایەکە بیگەیەنیتە دلی کچۆلان پاش ئەوەی کە پیرەژنەکان بەسەنا خوانی هیلاکیان کردبیّ.

يان دەچنە لای دانايەك كەشيتايەتی ئەو دانايە هيشتا فەريكە، بۆ ئەوەيانە خۆيان لەسەر ترس‌و بيم رابهينن، ئەوجا لەژوريكی تاريك دا پيرەدانا لەگەليان رادەوەستێ، لەوحەلەدا كەگيانی خۆيان وەك تيشك پەروازی كردووە چاوەروانی گيانيكی ديكەن دەربكەوێ!

يان ئەوەتان گوييان بۆ جادووگەريكی كۆنە سالْ كلۆردەكەن كەبەنيويان دا رايەلەدەكاو گڤە با ئاسا دەست دەكا بە لۆرەونالە؛ هەمووشی بۆ ئەوەيە تابەرەو كۆگانی خەم كيشيان بكا.

هەنديكيان ئيشك چيەتييان لی بووتەپيشەو فيری بوقی ژەنين بوون.. تا لەشەوان دا بۆی دەربچن‌و ئەو كۆنينانە بژيننە كەرۆژگار پيچاونيەتی‌يەوە.

دوينێ لەنزيك ديوارە رووخاوەكانی باخچەوەتی پەريم دەربارەی (ديرينەر زيوەكە) پينج وتەم لەدوو پاسەوانەوە بيستن:

يەكيان گوتی: ((ئەو خواوەندە هيچ چاوديری رۆلەكانی خۆی ناكا كەچی باوانە ئادەمی‌يەكان لەو باشتر چاوديريی رۆلەكانی خۆيان دەكەن))

ئەوی ديكەيان هەلی دايە: ((بە پيری خۆيەوە خەجليوە ئيدی سەرئەوان ناپەرژێ))

دەشێ ئەو باوكەيە زارۆی هەبن؟.. كێ ئەمە دەسەلمينی كەخۆی پێ ئيسپات نەكرێ؟.. زۆرتر حەزم لەوەبوو كە بی‌بينم بەلگەی خۆی لەباپيريكەوە بهينيتەوە.

تۆ بيژی بەلگە بهينيتەوە؟.. يان لەچ زەمانيك دا بەلگەيەكی هاوردبيتەوە؟ چەسپاندنی ئەم لايەنەی بەلاوە كاريكی گرانە.. بەلام لەلايەكی ديكەوە سوورەو دەشێ ئەومەردومگەلە بەتەوزيمی باوەری پێ بهينن.

بەلێ باوەر پێ هينان (باوە) قوتار دەكا. واتە: باوەری خۆی بەخۆی، ئەمەش رەوشتی ئەوانەيە كە لە تەمەن دا هەلْكشاون.. ئەی ئەوەنيە ئيمەيش لە گەلەی پيرانين‌و گشتمان نموونەی يەكدين؟!

ئیشك چیەکان بەو رەنگە قسەیان دەکرد، هەرچی ئیشك چی هەیە ناحەزی رووناکی‌یە. دواتر هەریەکەو بەئاوازیکی غەمگین فوی کرد بەکەرەنادا.

دویٚ شەو کە بەلای کۆنەدیوارەکان دا تیٚ پەریم ئەو دیمەنەم هاتە بەرچاو، خەریك بووم لەپیکەنین دا دڵو هەناوم هەڵتەکین. بەراستی کەسەرنجی ئەو کەرەگەلە سەرخۆشە ئەدەمو گویٚ لەنموونەی ئیشك چیەکان دەگرم، کەخواوەند گومانبار دەکەن- دەبی هیندە پیبکەنم تا دەخنکیم.

رامانو وەستان بەدیار گومانو دوودلی‌یەوە سەردەمیك بوو بەسەرچوو. ئیدی کیٚ مافی ئەوەی هەیە بیٚ بەلای ئەو شتەی تاریکە مردووانەدا لەگۆرەکانیانەوە بیان ژینیتەوە؟!.

سەرینی کۆنە خواوەندەکان بەسەرچوو، چەرخی رۆژگار پیچانیەوە. بەو کەیفە خواوەندییەوە نەمان؛ بەتاریکە شەودا رانەبووردن تاخۆیان فریٚ بدەنە تاریکستانی مەرگەوە. هەرکەسیك لافی پیچەوانەی قسەم لی بدا ئەوە تەشقەلە چیە.. کۆنە خواوەندەکان خۆیان کوشتو بەدەم پیکەنینەوە خنکان..

ئەو کاتە خۆیان کوشت کەیەکیکیان ئایەتە گەورەکەی بیٚ باوەری بەدەمدا هاتو گوتی:- منم پەروەردگارو خوای تۆ.. ئیدی لەئاقار من دا خواوەندی کەت نابن. لەوەدەچیٚ ئەو پیر خواوەندەیان دەمارگیربوویی؛ تا بەو ئەندازەیە حەپەسابیٚو خواوەندەکانی هینابنە پیکەنینو بەسەر باڵا کورسی‌یەکانیانەوە لاژابنەوەو بەدەنگ هاتبن: ئایە لەو نەری (نهیی)یەوە -ئەوەی- رانەگەیاندووە کە چەندین پەروەردگار هەنو مافی خوایەتیان هەیە.. وەنەبیٚ هەر تاکە پەروردگاریك لەگۆریٚدا بیٚ؟

ئەوجا کیٚ جووتە گویی سووکەلەی هەن بابی بیستیٚ[٢٩] زارا- لەشاری مانگابەلەك دا- ئاوای گوت. شارە خۆشەویستەکەی بەجیٚهیشتو بەپیادە دووقۆناغی مابوو

---

[٢٩] لە(صماح ی بیستەم لە- سفر الخروج-دا هاتووە: (منی پەروەردگار خوای‌تۆم کە لەمیسر - یانەی بەندەگی- وەدەرم خستی؛ نابیٚ بەرانبەری من خواوەندی کەت هەبن.. پەیکەر دامەتاشە، وینەی ئاسمانی لەسەرەوەو هی زەمینی لەخوارەوەوئاوی لەبنی زەوی‌دا- وەرمەگرەو دروستی مەکە کرنووش بۆ ئەو نموونە پەیکەرانە مەبەو مەیان پەرستە))

بگاته ئەشكەوتەكەی‌و بەدیداری (مار وهەلۆ) كەی بگاتەوە. لەم حەلەدا هەمووگیانی كەیف خۆشی لی دەباری.

## گەڕانەوە

ئەی گۆشەگیری! هەر تۆ نیشتمانی منی، لەولاتی وەحشییان دا بەنامۆیی زۆر مامەوە. ئیستاش نیشتمانەكەم! ئەوەتام بەچاوی پڕ فرمیسكەوە هاتمەوە بۆ لات.

گۆشەگیری‌یەكەی لەمەر خۆم ئەوجا بانگی لی هەڵ بدەو دایك ئاسا هەرەشەم لی بكە.. لەحالی ئەو كەسە بپرسەوە كەلەكن تۆ رای كردووەو دوور كەوتووەتەوە.. لیی بپرسە كە چۆن وەك گیژەلووكە لیت ترازاوەو هاوار دەكا:- بەدریژایی تەنیاییم بێ دەنگیم فەرامۆش كرد؛ دەلیم پرسە ئاخۆ فیری بێ دەنگی بووم؟.. ئەوجا پیشم بلێ:

هۆ زارا! هیچ شتیكی تۆ لەمن پەنهان نیە، لەنیو گەلەدا هەستت بەتاكایەتی‌و نامۆیی خۆت كردووە.. ئەوسا كە لە باوەشی مندا بووی هیندەت هەست پێنەكردووە.

لەنیو تەنیایی‌و نامۆیی‌دا فرە جیاوازی هەیە؛ ئەمەش پەندیكەو ئیستا فیری بووی.. بۆت دەركەوتووە تا هەتایێ لەنیو خەلك دا بەتاك‌و نامۆ دەمینیتەوە. چەند

---

ئای نیتشە بۆخۆت‌و دەست پاكیت لەبەلگەكاری دا؟! ئەم فەیلەسووفە لەپیناو مەبەستی خۆی‌داسلی لەنیوەناچلی قسە نەكردووەتەوە؛ لەكابرایەك دەچێ بەنیو مسلمانان دا جار بدا كەنویژ نەكەن بەبەلگەی ئایەتی (ولاتقربوا الصلاە) ئیدی لیی بوەستیتەوەو نەلێ : (وانتم سكارێ).

ئەرێ شتیكی سەیر نیە كابرایەك گەرەكی بی خەلكی لەگومرایی رزگار بكاو نەیەلێ بەلگە بۆ هینراو لەتەك خودی بەلگەدا سەروبن بكرین‌و نەیەوێ (ئەنجام مردە) لەئاقار ریبیری جاویدانی دا بكریتە خوا، كەچی لەو بەلگەكاری‌یەی‌دا هەستی‌و پێ دابگرێ لەسەر سەلماندنی چەند خواوەندیك؟!

ڤیانت بەسەردا بریژن لەسەرت دەبیتە بار؛ چونکە بەرلە هەمو شتیك بەخۆ گونجاندنەو لیت بەتەما کەوتوون.

لیرە لەپەناگای خۆت دا دەحەوییتەوە، دەتوانی هەرچی بتەوێ بیلیی. کە مرۆڤ گلایە گۆشەگیریەوە لەخەتەراتی سەختە سروشتی خۆی سڵ ناکاتەوە.

لیرە شتەکان بەخۆشی‌یەوە دەچنە بەر رکیفی روونبیژی تۆوە؛ چونکە سەرجەمی ئەو شتانە بۆ لای تۆ دەگەرینەوە کە هەلت برن‌و تۆش بەرزدەبیتەوە.. هیمای شتەکان لەرەوە ولاخی جلەو بۆ شل کراو دەچن کە بۆلای راستیەکانت دەبەن‌و هەلت دەگرن.

ئالیرە بۆت هەیە بەرەو رووی هەموو شتیك بدویی؛ چونکە هەر وشەیەکی دلسۆزی بۆ ئەو شتانە بگوترێ، دەبیتە مایەی سوپاس‌و ستایشی شتەکان، واتە بۆیان دەبیتە شوکرانە بیژی.

تەنیایی شتیکەو نامۆیی و کەساسی شتیکی دیکەیە. ئەرێ زارا! ئەوەت نایەتەوە یاد کە بەدیار لاشە مردوەکەی نیو دارستانەکەوە دۆش دامابووی، پەلەوەرەکەی ژوور سەرت قیژاندی‌و نەشت دەزانی بەرەو کوێ دەبیتەوە؟ بەئاواتەوە بووی هەلۆکەت‌و مارەکەت بین بەفریاتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لەنیو مەردوومگەلەکەدا توشی بارەهاچەرمەسەرێ بووی کەلەنیو جانەوەرەکان دا شتی ئاوەهات نەدیوە، دلنیابە؛ ئائەمەیە نامۆیی‌و کەساسی!

ئەدی زارا! ئەو زەمانەت نایەتەوە بیر کەلەباوەشی دوورگەکەتدا بووی، ئەوسا لەسەرچاوەیەکی مەی دەچووی کەبەنیو کووچە بەتالەکان دا هاژەت بکاو پریان بکاو بیسەرو حیساب تینووەکان مەی نۆش بکا.. بەلام تۆ لەنیویان دا هەروا بەتینویتی بمینیتەوە؟!

ئەرێ ئەو زەمانەت لەبیرە کەبەسکالاوەو لەژیر بالی شەوەزەنگا دەنگت هەڵ دەبری‌و دەت پرسی: دەبێ بەختەوەری لەوەرگرتن دا فرەتر نەبێ لەوەی کەلەبەخشین دایەو دەبێ لە دزیتیش دا بەختەوەری یەکی ئەوتۆ نەبێ کەلە وەرگرتندا نیە؟ بەهەرحاڵ. ئائەمەیە نامۆیی‌و کەساسی!

ئەو زەمانەت نایەتەوە یاد کە (قولترین سەعات لە بێ دەنگی‌دا) تۆی لەنەفسی خۆت وەدەرنا.. کەبەچپەوە پیی دەگوتی: بلێ‌و برووخینە، گالی دەدای لەئارام‌و بێ

دەنگی خۆت نەبان بی. ئەو هيندە ئازايەتی‌یەی تيتدا بوو نەی هيشت؟ ئائەمەيە نامۆيی و کەساسی.

ئەی گۆشە گيريەکەی لەمەر خۆم! چەندان ترپەو سرپەی بەختيارانە لەميهرەبانی تۆوە دەردەچن؟!

لەنيومان دا نازو گلەيی‌نيە.. راستورەوان هەردوکمان لە دەروازەکانەوە رادەبووين.. لەلای تۆ هەموو شتيك درەخشانەو ساتەکان سووکانی پيتا تیّ دەپەرن.. ئەوساتانەی لەتاريکيدا قورسە رۆن و لەرووناکی دا چوستە رۆن.

ئاليرە- هەست بەوەدەکەم هەموو شتيك گيان و مانای هەيە.. هەموو بوونەوەريك گەرەکيەتی‌سرووشت و نيهادی خۆی دەربڕی. ئەوەی لەمەو لايش دەبی هەربەتەمايە لەمنەوە فيری روونبيژی ببیّ.. بەلام- لەویّ- قسەکان بیّ‌هوودەو پووچن.. لەبيرکردن و تيداچوون باشترين پەندی ئەو خەلکەيە.. لەوانيشەوە فيری ئەمە بووم. ئەگەر يەکيکيان گەرەکی بی لەهەموو شتيك بگا- دەبیّ دەست بەسەر هەموو شتيك دا بگریّ. دەستە پاکيزەکانم بۆ ((وەرگرتن)) خۆيان رەپيش ناکەن. لەبۆ درنی هەناسەی ئەوانەوە دلم دەشيويتەوە؛ بەداخەوە! لەو شوينەی دەيان کردە هەراو هەناسە برکیّ زەمانيکی فرەم تی پەراند.

ئای کە گۆشەگيريەکەم بەختيارييانەيەو پييەوە دەنازم! چۆن بۆن خۆشيکەو بەدەورم دا بەرامە دەداتەوە؛ ئيدی لەم کشوماتی‌يەدا پر بەسی‌يەکانم هەوای پاك هەڵ دەمژم.. بەلام- لەویّ- بەبیّ گویّ لی گرتن هەموو شتيك قسەدەکا. ئەگەر هات و يەکيك بۆ جاردانی رەوشت باشی زەنگەکان رابوەشينیّ، لەولاوە زرنگەی پارەو پولی کەفرۆشيارەکان هەقلی مەقۆيان پی دەکەن- زايەلەی ئەو زەنگانە دەخنکينیّ. لەوی هەموو شتيك قسە دەکاو کەسيش نی‌يە لەو قسە چەنييە تیّبگا هەموو شتيك دەکەويتە ئاوەرۆکانەوە بەلام بەرەو سەرچاوەو بناوان تەشەنەناکا.. لەویّ هەموو شتيك قسە دەکا، هيچ کام ناگاتە پلەی تەواوەتی.. لەویّ هەموويان دەگارينن کەچی کەسيکيان تيدانيە قايل بیّ لەهيلانەو کولانەدا بەسەر هيلکەکانەوە کربکەویّ.. هەمووی قسە دەکاو قسەکانيش وشکەدۆش و خاوجوون. ئەو بەيان و دەربرينەی لەسەر لچو ليوی خەلکی جاران سەخت بوو ئيستا نەرم‌وشلەو دەموکاويژی ئەم زەمانە دەيان جويتەوە.

لەوێ هەموو قسە دەکەن و پەردەی سەرنهینی یەکان دراوەو هەلماڵدراوە.. ئەو رازەی دوینێ لەتوییی دڵان دا شاراوەبوو ئەمرۆ لەسەر دەمو دووی تەپڵ کوت و هوولەکیشەکانە. ئەی سروشت و نیهادی بەشەر چەندە سەیری! تۆ هەراو هوریای ری‌رەوە تاریکەکانی.. ئەو مەترسی یەبووی لەو دیومەوە بەجیم هیشتی و خۆمم لی قوتارکردی. توند ترین مەترسی کەهاتەریم خۆسازاندن و بەزەیی بوو. هەمووبوونەوەریکی ئادەمی گەرەکیەتی مامەلەت بە خۆسازی و میهرەبانی بکا.. یان وەهای سەودا لەگەڵ بکرێ. هیندەی لەنیو خەلکی‌دا ژیابم راستی‌یەکانی خۆمم لەدلی خۆم دا پاراستوون.. دەست و هەناویشم لەبەر درۆو دەلەسەی میهروبەزەیی پیدا هاتنەوە شیتانە هەڵ لەرزیون.

بەلێ ئاوا لەنیو خەلکی دا ژیاوم.. بەخۆ لی گۆرینەوە لەنیویان دا دانیشتم.. نزیکە باوەرم بەخۆم نەمینێ تاکۆلیان پیوەهەلبگرم و بەم قسەیەشم نەفسی خۆم قایل بکەم:بەراستی من شیتم و دەرك بەراستینەی ئەوان ناکەم.

کەتیکەڵ بەخەلکی بووی ئەوەی لەبارەیانەوە بی‌زانی لەبیرت دەچیتەوە، کەچاو لەرووکاری دەرەوە هەڵ بەزی‌یەوە لیی بەربەست دەبێ و ناتوانێ بەتانو پۆی دا بچیتە خوارێ.

ئەوان راستی منیان نەزانیوە، شیتانە خۆمم تی خزاندن، لەباتی ئەوەی پتر لەگەڵ خۆم دا بگونجیم هاتم لەتەك ئەوان دا خۆم سازاند! چونکە بەوە راهاتووم کە دەربارەی خۆم دلّ رەق بم. ئەم چاودیری یە لیم بووەوە بەتۆلە لەخۆم و بۆ خۆم.

لەنیو خەلکی دا رۆنیشتم و مەگەزە ژەهراوی‌یەکانیان پییانەوەدام و خراپەی خۆیانیان گەیاندمێ بەچەشنی ئەو دلۆپانەی یەکبینە دەمالن بەسەر بەردی رەق داو کار تی دەکەن. ئەوجا بەنەفسی خۆمم دەگوت: ((باری سووکایەتی لەخۆی دا پاکو بێ گوناهە)).

لەنیو خەلك دا هیچ مەگەزیك هیندەی کارسازان (صالحین)) ژەهرین نین؛ ئەمانە چزووی ژەهراوی دەژەنن بەهەموو چاکەیەك داو درۆو دەلەسە بەهەموو چاکەیەوە دەنین؛ کەواتە چۆن رەواپەروەری لەمانەوە چاوەروان دەکرێ؟!

میهرو بەزەیی درۆفیربوونە. ئەویش بۆ ئەو کەسانەیە لەگەڵ کارسازەکان دەژین و هەلسوکەوت دەکەن بەزەیی هاتنەوە بەهەوای قورسییەوە گیانە ئازادەکان دەپەستیتەوەو نایان هیلێ لەنەفامی ئەو کارسازانە تی بگەن!

لەوێ فیری ئەوەبووم کە نەفسی خۆم داپۆشم.. سامانی خۆم وەشیرم؛ لەنیو ئەو مەردومگەلەدا ئەوەم کەوتە بەرچاو: هەموو دەولەمەندیك هەژاری هۆش و فامە. دڵ پێسووتان گومرای کردم کیشی کردم بنۆرمە نهینی و خەمڵ کردنی رادەی هۆشی ئەمو ئەو.. پەندیارە دەمارگیرەکان بەگرۆهی دانایان ناودیر بکەم. لیم زیاد نەکردو فیری ئەوەبووم برشتەیەك وەربگرم.. فیرە ئالوگۆری وشەکان بووم، ئەوە نیە گۆرهەلکەنەکانم بەپشکنەرو زانا– ناو بردوون!

گۆرهەلکەنەکان بەزۆری تووشی دەردبوون.. چونکە ئەوەی لەکەندو گۆرەوە دەردەچێ شتیکی قیزە وونی کوشندەیە.باشتر وایە نیشتەی بن گەناوەکان نەشلە قینم. ئەگەر زیندەگانی هەبێ ئەوا بەسەر ترۆپکەوەیە. ئەوەتام بەسەر بلندانی کەژەوە هەوای پاك هەڵ دەمژم.. لەشوینیك دام بۆنی کۆمەلگای مرۆڤ ناچێ بەلووتم دا..

ئەوەتام بەترۆپکەوە زیندە هەوا ختووکەی لووتم ئەدا؛ ئەویش بۆ هیزو ژیان هەلمژین. دیت و فراوان دەبیتەوە.

## سێ خراپەکان

### ١

ئەم بەیانیە لەدوایینە خەونەکانم دا بینیم ئەوا بەسەر کەندریکەوە راوەستاوم و بۆ ئەودیوی ئەم جیهانە هەرەس دەهینێ، منیش تەرازوویەکم دانابوو جیهانم خستە تایەکیەوە.

ئاخ! خۆزگە بەرە بەیان کتوپر هەلی نەدەکوتایە سەرم. چەندە لەبەرەبەیان دا خەون و تارمایی گەمارۆم بدەن هیشتا کازیوە باشتر پیم دەویری و غیرەت دەی گری!

خەونەکەم ئاوای پیشان دام: کەسیك زەمانی بەدەست بی دنیاش دەپیوێ.. ئەو کەسەی باش دەکەویتە تاووتوو دەشتوانێ ئەم دنیایە بکیشێ. کەسێ جووتە بالی بێ رەزای هەبێ لەمەودای زەوی تی دەپەرێ. کەتیژ ببینی بگاتە جەرگەی گرفتەکان-دەتوانێ شارەزای نیواخنی ئەم جهانە ببێ...

دەبێ ئەمرۆکە خەونەکەی من پشتی بە چ ئارامیك بەستبێ تاوەکو ئەم جیهانە بەسەنگو تەرازوو بدا؟! خەونەکە بۆ خۆی بارکیشیکەو نیوەی چارۆکەیەو نیوەکەی دی گەردەلوولە.ئەوەتانی کشومات بەبالی پەپوولە مەلەدەکاو خیرا بە چنگی باز هەلمەت دەهینێ؟

دەبێ دانایی چیشتەنگاوەکەم رازی خۆی چپاندبیتە ئەو خەونەمەوە؟.. کام دانایی؟ ئەوەی کە گالتەی بە هەموو ئافەریدەیەکی بێ سنوور دی. منیش دەبیژم: لەکوێدا هیز هەبێ ((چەند)) دەسەلاتدارە کەواتە (ژمارە) بەهیزترە.

بێ گومان هەرشتیك پابەندی جیهانی دواهاتوو بێ ئەوا خەونەکەی من دەورەی داوە.. لەگەڵ دەستە ملۆزمو نهینگرەکانیشدا خۆی جەلەنەکردووە.. نەداچلەکیوەو نە دەستە دامانیش بووە. دیتم دنیا بەدەستمەوە لەسیویکی گەیوی زیرینی لووسو گەش دیمەن دەچێ.

لەسەر لاکەندیکی بلندەوە کەبەسەر دەریادا دەی روانی دنیام دی لە درەختیك دەچوو بەپەل رادانەوە هیمام بۆ بکاو قەدی تیك باهەڵ دراویشی وەك پالپشتی ریبواری ماندووبێ.. دیتم: جیهانی‌یەکان بۆ دیدارم دین.. کەبۆ لام دین هەردەلیی دوو دەستی تەبەق لەسەرن هەرچی چاوی پرنەوازش حەزی لی بکا لەسەری رۆکرابێ.

ئەوا جیهانەکەی جاران کەزۆر چارەگرانو بەدناو بوو ئەمرۆ لەمرۆڤایەتی خۆیدا بەرووح سووکم دیتە بەرچاو.. جهانیکەو بەنهینی‌یەکانی خۆیەوە قەتیس نەماوەو ریگە لەم خەلکە ناگری.. نایەوێ لەنادیاری خۆیدا نوقمیان بکاو پەندودانایی ئەوان سروکاس بکا.

من قەدر زانو سوپاس خوانی خەونەکەی ئەم بەیانی‌یەمم، چونکە لەیەکەم سات دا جیهانی کیشا.. بۆم دەرکەوت جیهانیکەو لەمرۆڤایەتیی خۆیدا رووح سووکە.. خەونیك بوو هاتو دڵ نەوایی کردم.. ئەوەتام بەشوینی‌یەوەمو بەری نادەم. ئەوا رۆژ بووەوە ئەوجا سێ خراپە گەورەکان دەخەمە نیو تەرازوو.

ئەوەی خەلکی فیری ئەوەکردووە پیرۆزبایی بکەن فیری ئەوەشی کردوون نەفرین بکەن، ئەو سێ شتەی لەزەوی دا شیانی نەفرینن کامەن؟ ئەو سێیەن کەدەمەوێ بیانکیشمو ئەمانەن: ((دەسەلات سەپاندن، هەوەس، خۆپەسندی)) تا ئەمرۆ ئەو سییە شیانی خەسترین نەفرینی خەلکن. ئەمە ئەو لاکەندە بوو کەبەدەریادا دەی روانیو بەسەریەوە راوەستابووم.. دەریاکەش بەرووم دا پەلە گەوالەی سپی تل ئەدان. بەلێ ! هەر ئەو پیرە گەمالە هیمنەیە.. ئەو رمووزنە نایابەیە کە بەسەدان سەرەوە خۆی بلند دەکاتەوە.

دەمەوێ لیرەو لەسەر دەریای هەلچوو تەرازووی خۆم هەل بنیم ئەو درەختە تاکانە پرسیبەرەی گشت پۆشی بەبۆنو بەرامەی خۆی پرکردووە هەل بژیرمو بیکەمە شایەد لەسەر خۆم.

کە (ئیستا) بەرەو (ئایندە) دەبیتەوە دەبێ بەسەر چ پردیك دا سەمتو بەریانی خۆی رابگرێ؟.. دەبێ ئەو هیزەی خۆبلند کەری سەرنشیو دادەکیشیتە نزمانیو بەرزیش هەل دەکیشیت بۆ پلەی بالا تر چ هیزیك بی؟

هەردوو تای تەرازووەکەم یەکسان وەستان. کەسێ پرسیاری قورسم فرێ دانە تاریکیانەوە خیرا سێ وەلامی هاوسەنگ تایەکەی دیکەیان ریك هینایەوە.

## ٢

هەوەس – بۆ ئەو دەرویشانەیە کەولنشینو خەرقە پۆشن، کەجەستەی سەراسیمە ریسوا دەکەنو لەهەمان کات دا سزای دەدەن. هەوەس بۆ خنکاوانی دەریای جیهانی دووەمە کەدەی کەنە نەفرین بۆ جیهانی یەکەم.. چونکە هیرش دەباتە سەر گومرایانو دووریان دەخاتەوەو هەی دییان لی دەکا.

هەوەس – بۆ بەد ئاگریکەو هەرچی بەد هەیە تییدا دەسووتێ، ئاگری سووتە مەرۆیەکە بۆ چرووکی لی هەل دەستی..

هەوەسی دلە ئازادەکان سۆزیکی پاكو پەروازە.. بۆ بەهەشتی زەوی بەختیارییەو پێ زانینی دوارۆژە بەچاکەی ئیستا.

هەوەس بۆ سیسەڵو داهیزراو ژەهریکی شیرین تامە. ویرای ئەوەش شەربەتی هیزە، سەرتۆپی مەی ئەو شیرانەیە کەبە هەوای سەرخۆش بوونی کزەلۆکەکانەوە نۆشی دەکەن.

هەوەس – مەزنترین خۆشایەتی‌یەکە دەبیتە هیمایەك بۆ کامەرانی‌و ئاواتی فرە بلند؛ چونکە لەژیان دا زۆر شت مافی خۆیەتی؛ بەجووت گرتن خۆشایەتی وەربگرن‌و بگرە لەوەش پتر. زۆر شتی دیکەش هەن لیکدی ترازانیان پترە لەئەندازەی رەوی نەوەیان لەنیوان ژن‌و پیاودا. دەبی رۆژیك لەرۆژان کێ توانی‌بیتی دەرك بەراستی لیك دوورکەوتنەوەی ژن‌و پیاو بکاو مەودای لیکدی ترازانیان بزانێ؟!

بەلێ هەوەس.. بۆ ئەوەی کە بەرازو هۆسەچی ترس‌و بیم راماڵ نەکەن دەهینم چەند وارشەیەك لەنیوان بیروراکانم دا هەڵ دەچنم‌و قروقەپ قسە ناکەم.

بەتەمابوونی خۆفەرمانی قەمچیەکەو دلە سەختەکان داغان دەکا، سزای شەهیدبوونیکەو لەسووتگەی زیندووانەوە گرە پیچەی چر بۆ ستەمگەران ئامادە– دەکا.

تەمای خۆ فەرمانی لغاویکی بێ ئامانە کام گەل زۆرلووت بەرزە پیی جلەوکیش‌و رام دەبی. گەمە بەو ئاکارە پەسندانە دەکا کەوا بەسەرگەردانی خۆیان داوەتەسەر قەلپۆزی بەخۆنازین. تەمای خۆفەرمانی بوومە لەرزەیەکە و هەرەس بەهەموو کۆن‌و داوەشاویك دەهینێ. ئاشوبگیریکەو ئەو گۆرستانەی بووەتەوە بە قسلە بەرد هەلی دەتەکینی‌و تۆلەو سزا دادەبەزینێ.. زایەلەی پرسیارەو بەرووی هەموو وەلامیکی گرژو مۆن دا بەرز دەبیتەوە.

تەمای خۆفەرمانی ئەستۆی مرۆ دادەنەوینێ‌و دەیان خاتە سەر باری خۆکیش کردن‌و کۆیلەیان دەکاو شۆریان دەکاتەوە بۆ چالی خراپتر لەبوودرە بەرازو کونەمار.. ئەمە وەهایە تا بە سووکایەتیی خۆیانەوە خەفەدەبن.

تەمای خۆ فەرمانی ئەو مامۆستا تۆقینەرەیە کە وانەی سووکایەتی‌و نەفرەت دەلیتەوە.. بەرووی شارو ولاَت دا– دەقریشکینێ: ئادەی ریم بۆ چۆل بکەن! بەم رەنگە یەکبینە هاواردەکا، ئیدی شار هاواری لی هەڵ دەستێ‌و دەلێ: ئەوا ریم بۆ چۆڵ کردی.

تەمای خۆفەرمانی دیسان بۆ لای پاکزاو گۆشەگیرەکان بەرزدەبیتەوە، ئەم کارەشی بۆ ئەوەیە گیرۆدەیان بکا.. ئەوجا بۆ ترۆپکی بەخۆ نازین بچێ.. هەر دەلیی ئەوینیکی گرتێ بەربوویەو لەخەیالی دا وینەیەکی کەیف خۆشی رەنگ ئاڵ دەکیشێو دەستی ئەفسانەی لی دەخاتە کار! کێ بەم هەوەسی خۆ فەرمانییە دەلێ تاسەو بەرتاما؟ ئەوەش خۆ تەکان دانیکە لەبلندانییەوە بۆ قووڵاییو لە پیناوی هیزدا. لەم لیژبوونەوەیەدا شتیکم ناکەویتە بەرچاو کە پیی بگوترێ گەرم داهاتنی لەرزوتا یان نیشانی دەردوبەڵا.

نابێ تاسەر ترۆپکە تاکانەکان هەر بەسەر خۆیان دا بشکینەوە.. کەواتە هەرچی ملەی بەرزە با بۆ بناوانەکان شۆرببنەوە.. با لە گیژەنو گەرووی قووڵاییەکانەوە بای فەرتەنە هەڵ بکا!

ئەم جۆرە (تەما)یە هیندە بەرزە نایەتە گوتن؛ لەمیژە زارا بە ((پەسندایەتی بەخشندە)) ناوی بردووە، لەوەدەچێ بەم جۆرە وەسفە بۆ یەکەم جار ستایشی خۆ پەسەندی کردبی. خۆپەسندی تابینایەکە بۆ زات، ئەمیش زادەی تەقینەوەی گیانی بەتواناو جەربەزەیەکە لەگەڵ لەشی تەواودا ریك دیت لەرووی جوانیو سەرکەوتنییەوە، ئەوجا- هەرچی لە دەرەوەی گیانە هیزی لی وەردەگرێ، ئەندیشەی ئەو گیانەش ئاوینە ئاسا رەنگ دەداتەوە (یان دەوروبەرەکەی رەنگی پێ دەداتەوە)!

ئەو لەشە نیانەی هیزی دلنیاکەری تیدایە سەماکەریکەو بەجموجووڵ دڵ خۆشیی خۆی دەنوینێ.. ئەدی کەیفە خۆ پەرستانە لەو جۆرە گیانولەشانەدا خودی پەسندایەتی نیە؟!

ئەو کەیف سازە لەبارەی چاکەو خراپەوە چۆنی لی بلێ بەو قسانە لەنیو نزاریکی پیرۆزدا نەفسی خۆی پەرژین دەکاو دەی پاریزێ.. ئەوجا بەناوە پیرۆزەکانەوە دەکەویتە ورتە ورت؛ وەك بییەوێ بەنزاخویندن هەرچی مایەی سووکایەتی یە لەخۆی بتەکینیتەوە.

ئەو کەیف سازە نزم بەخراپە دەزانێو لەنیوی دەبا؛ بەلایەوە ریسوا ئەو کەسەیە هەر بنالینێو سکاڵابکاو لەسوود چنینەوەدا- دوا نەکەوێ.. جا خوای دەکرد ئەو سوودو قازانجەی تۆزقالیك دەبوو.

ئەو کەیف سازی‌یە لەگەڵ دانایی دوورە راست باشار ناکات؛ چونکە برێ دانایی لە تاریکیدا نەبێ، رووناکی نادا، ئیدی وەك تارمایی شەوانە دەردەکەوێو هاواری لی هەڵ دەستێ: هەموو شتیك بەتالە!

ریزی ئەوانە ناگرێ کە راران‌و لەباتی نیگای راستەو روو، دیسان لەباتی دەستی دڵ سۆزی راکیشان، داوای سویندی زلە زلە- لەخەلکی دەکەن.. ریزی ئەو جۆرە دانایی‌یەش ناگرێ کە لە بەدگومانی‌یەوە خولیای توندو تۆڵی بی.. چونکە بەم شیوەیە هەموو نەفسیك بوودەلەیی لەمەر خۆی دەردەخا.

بەلای ئەو کەیف سازەوە قسە ساودانیش سووکایەتی‌یە، لەسەگیك دەچێ خویریانە بکەویتە سەرپشت. زۆر ماریفەت‌و دانایی لەخۆکیش کردن‌و کلکە سووتی‌دا لەو سەگە دەچن.

بەڵام لەسەرووی هەموو پێ ناخۆشبوونیکەوە کەیف سازی خۆپەرستانە رقی لەپیاویکە ملی پان بێ بۆ ستەم‌و بەرگری نەکا.. کەتفی ژەهراوی بگرنە دەمولەوسی بی‌خواتەوە. بۆ هەموو شتیك بارکیش بێ‌و قایل بێ.. ئەمانە رەوشتی کۆیلەو بەکرێ گیراوەکانن.

خۆ پەسندیی بەختیارانە، نەفرەت لەرووی هەموو بەندایەتی یەك دەکا.. دیسان گەمەی بەو سەرکزانە دێ کەتێ هەلدراوی بەردەمی گەورەو خەلکو خوان.

ئەمەیە خۆپەسندی کەدەستووری وایە: هەرکەسیك نابوود بێ‌و چاو شۆرانەو دڵ شکستانە پێ ملی بەندایەتی‌و پەرستش بێ بەخراپی دادەنێ.. هەروەها ئەو کەسەش بەخراپ حەلیب دەکا بەمەرامەوە دانەوێ‌و بەلچ شۆری‌یەوە بکەویتە لپەدەست ماچ کردن.

خۆپەسندی بەختیارانە هەموو نەرمە قسەیەکی کۆیلەو پیرو دەردمەندەکان بە (کویرەپەند) ناودەبا.. قسەی کاهینەکانیش کە لەدۆخی شیتانەو گەزافیان دا بەسەر زارەوەن، دیسان بەلایەوە ری‌ونەن.

دانا درۆزنەکان بریتین لەسەرجەمی کاهینەکان‌و ئەوانەی لەژیان- بیزارن.. تیکرای ئەوانەش دەگریتەوە کە گیانی ژن‌و خزمەتکاریان تیرا دەگەرێ. ئەوانە جۆرە مەردومیکن پیلان بۆ ((خۆپەسندی)) دەنینەوە.. لەهەمان کات دا ئەم پیلان‌و بەربەرەکانی‌یە بەرەوشت بلندی دادەنین.. هەر لەبەر ئەوەیە بوودەلەو جالجالۆکە

ماندووەکانی دەستی ژیان بەتەمای لاف لێ دانن کە لەمەبەستی کارەکانیان دوورو بەرگەشتەن.

ئیدی ئەوا نوور هەڵ دەقولیو هاژە دەکا.. یەکبینە ئەو مەردومگەلە رادەماڵێ، ئەوجا شمشیری خۆرەتاوی مەزن، شمشیری دەسەڵاتو بریار دەبریسکیتەوە و هەموو شتیك وەدەردەخا.

بەڵام کەسیك (خۆیەتی) زاتیەتی بەلاوە بەریز بێو هاواری خۆپەسندی بکا هەر ئەو بەتەنێ چی بزانێ دانی پیدا دەنێو دەی لی:

((ئەوا مژدەی خۆرەتاوی مەزن دەرکەوت؛ ئەوەندەی پێناچێ نووری ئەو بەهەموو ئاسۆدا– دەدرەوشیتەوە!))

زارا ئاوای گوت...

## قورسەگیان

### ١

دەمی من تەنیا دەمی گەلە. قسەم رەقەو گویی ئەوانە دەرووشێنێ کەبە گریشمەوە خۆیان تاسولووس ئەدەن.. بەتوندی گویی ئەو گلکە نووسەرو دورەگانە دەکوتیتەوە کە بەقەلەمەکانیانەوە خەریکی دروودو سەنا خوانین.

من دەستی شیتیکم هەیە بۆ لەوحەی دەستوورەکانو قەڵاسەختەکان دەبنە بەڵاو فەلاکەت! وای بۆ هەر شتیك بەرو ماوە بدا بەنەخشو قەلەمکاری پر سەمەرەی شیتو شیتایەتی!

دوو قاچەکانم جووتە پای ئەسپیکنو بەسەر بەرزەکی ئەمپەراو ئەو پەری چالەکان فرکە دەکەن.. کەمن قۆناغ بەقۆناغ کایەی لەمەر خۆم دەبرم هەست دەکەم کەیفم سازەو گیانی شەیتانیکم تیرا دەگەرێ.

وەلی گەدەم لەوەدەچێ چیکلدانەی هەلۆ بێ؛ چونکە پتر تامەزرۆی گۆشت مەرە.بەهەر حاڵ ئەگەر چیکلدانەی هەلۆ نەبێ ئەوا چیکلدانەی بالندەیەکی ئاسمان نشینە؛ چونکە من خۆراك لەهەموو پووختەیەکی بەلەزەت وەردەگرم، هەمیشە وازم

لەوەیە کە فرینەرو فرینراو، تۆ بلێ بەهەلمەت بم. ئەوجا کەمن بالگرتووی ئەم زیندەگانییەبم چۆن بەشم بە بالندەوە نابێ؟!.

بۆ من بەسە کەدوژمنی گشت قورسەگیانیك بم تامانەندی بالندەکان بم.. دوژمنیکی سەر سەختی گیانە چرەکانم و سویند خۆریکم و رقەبەرایەتی ئەو دەکەم.. هەر لە زگماکەوە ناحەزی ئەو قورسەگیانەم و بەچەشنی دالّ چنگی لی بەرنەدەم،

لەمەدوا دەنگی خۆم بەسروودەوە هەلّ دەبرم و ئەو ماناو واتایانە دەخەمە ئاوازو دەیان لاوژینم.. سەرەرای ئەوەش کەچۆلەوانم و بەتەنیم و تەنیا گویی خۆم ئاشنای گۆرانی چرینمە.

ئەم زەمینە سروود بیژی زۆری تیدایە بەلاّم تا لەبەر دمیان دا جیگاو یاگەی سیخناخ لەگوێ گران نەبێ دەنگی بەجۆش لەقورگیانەوە سەر ناکا.. مۆرە پەنجەشیان لەگەلّ جوولە دەستیان بەرامبەر نابێ، چاوەکانیشیان تیشك فرێ نادەن و دلیان وریا نابیتەوە، منیش چونکە بێ باوکم لەو جۆرە سروود بیژانە نیم.

ئەوەی لەزەمانی ئایندەدا بالّ بەمەردومگەل دەگریتەوە، سەرەتا ئەو سنوورانەی ئابلووقەی دان و تەرتو تونایان دەکاو تۆزیان دەبا بەهەوادا.. بەئەوەشەوە ناوەستێ ناوی زەویش دەگۆرێ و ناویکی ئەوتۆی لی دەنێ کە واتای نەمانی چری و قورسی سەر زەوی بگەیەنێ.

وشترمرغ لە ئەسپی شووش و باریك خیرا تر غاردەدا بەلاّم لەوەدا کە سەری قورسی دەژەنیتە گلی قورسەوە لەمرۆڤ دەچێ.. خۆ مرۆڤیش لەوشتر مرغ باشتر نیە؛ هیشتا نازانێ چۆن بفرێ.. وادەزانێ زیندەگانیش وەك زەوی قورسە. کەسیك گەرەکی بێ لەخۆیەوە هەست بەسووکەلەیی بالندە بکا دەبی هانا بەریتە بەر خۆپەسندی ئەوجا لەبارگرانی و لەش گرانیی خۆی رزگار دەبی.. ئیدی بامرۆڤ خۆی خۆش بوی؛ ئەمەش رێبیری پێ فیربوونی خۆمە.

من نامەوێ خەلکی بین و باری ((خۆ خۆشویستن)) بەسۆزی نەخۆش تادارەکان بورووژینن؛ بەراستی لەخۆ پەرستی نەخۆشەکانەوە- دەردو دەردمەندی بۆن دەداتەوە!

فیری خۆپەسندیی راست و دروست بن؛ تابتوانن بردە باری زاتی خۆتان بن.. کەواتە باخۆپەسندییەکەتان نەی کاتە کاریك گومراتان بکا، ئائەمەیە فیرکردنی من.

گومرای خۆپەسندی لەوەدایە کە بەلای ناخۆ ویستیدا بابداتەوە، ئەوانەی بە (ناخۆیەتی=الغیریە) وە دەم هەڵ دەهیننەوە، بەکارەمەیی چاوبەستیان خستووەتەکار، کەسیش هیندەی ئەوانە (ناخۆ)ی تووشی ماندویتی نەکردووە.

کە گوترا: (رام بوون لەسەر خۆپەسندی ئەرکە) ئەم وتەیە راسپاردەیەك نیە لەئیوارەو بەیانیەك دا جێبەجێ بکرێ مەشق کردن لەسەر (خۆشویستن) هونەریکی فرە وردو سەختە، جلەویشی تەنیا بەدەست کەسیکی لیزانو قایمەوەیە. چونکە ((قورسەگیان)) وا لەدارا دەکا- کە- ئاگای لەدارایی خۆی نەبێ.. خەزنەدارەکانیش والآ دەکا بەهیچ کلۆجیك نەچنەوە سەر گەنجینەکانیان؛ هیشتا فریای ئەوەناکەوین لەسەر خەوگاکان رابکشیین هەلەوگیری جووتە وشە قورسەکەی ((چاکە)) و ((خراپە)) دەبین؛ ئەوەش میراتیکەو پیمان براوە؛ بەلکو سپاردەیەکەو بیتو رەچاوی نەکەین ژیانمان لی دەتۆرێ. ئەگەر هاتو یەکیك گوتی :

((لی بگەرین، منداڵەکان بین بۆ لام)) ئەو بانگەوازەی بۆ ئەوەیە لەوەختی خۆیدا ریگەیان نەدا کە زاتی خۆیان خۆش بوێ. ئەمەیە داهاتووی قورسەگیان.

ئەوا ئیمە کۆلی قورسمان ناوەتە سەر نەرەی شانو بەرەو کیوە رەقەکان هەی پیی لی دەکەین.. کە ئیمە بیزاری چەقەچەقو برسیتیبین لەدەستیان سکاڵامان بێ پیمان دەلین: ئیوە لەسکاڵای خۆتاندا راستن، ژیانیش باریکی قورسو گرانە.

راستییەکەی مرۆڤ لەژیان دا باریکی قورسە بەسەر شانی خۆیەوە؛ چونکە بەشتی بێ هوودەوە خۆی بارگران دەکا.. حوشتر ئاسا بۆ باری قورس یخی خواردووە، ئەوەتا چی قسەو راسپاردە هەیە لەبان شانی خۆی کەلەکەیان دەکاو تاچاوبردەکا ئەم دنیایەی لەبەردەم دا- دەبیتە بیابانیکی وشکە رۆی ئەوتۆ هیچ جەمسەریکی دیار نەبێ.

وەنەبێ هەر لاوەکییەکان باری شانتان قورس بکەن، شتی ئەوتۆ لەگۆرێدایە لە خۆتانەو لەخۆتان دایەو پیی بارقورس دەبن. دەروونی مرۆڤ لەهەناوی سەدەفە ماسی دەچێ کەقیزەونو لنجە، هەردەستی تی وەربدەی لەنیو پەنجەکانتانەوە دەخزێ. لەبەر ئەوەیە کە قاوغو رووکارە نەخشینەکەی دەرەوەی دەستەبەری دەکەنو باری ئەو دیوی دادەپۆشن. ئەوەش هیندە ئاسان نیە کە مرۆڤ تویکڵو قاوغ بۆ خۆی فەراهەم بینێو چی لەدیوی ناوەوەی دایە دانایانە خۆی لەئاقاردا کویر بکا.

ئەمەش لەخۆیدا هونەریکە پێویستە مەشقی لەسەر بکرێ. زۆر رووکارە تویکڵ هەنو خەلەتانیان پیوە دیارەو مەردومگەلیکیان داپۆشیوە، کەچی باری ریسوواییان وەدەردەخەن. زۆر هیزو (وصفە)ی پاك بەنوقمی دەمینیتەوەو کەس دەرکیان پێ ناکا. زۆر خواردەمەنی بەچیژ هەیەو ئارەزووی کەسیشی ناچیتە سەر. ئەم راستییە بەلای ئافرەتانەوە هیندە شاراوە نیە؛ ئەوانەش باش دەرکی پێدەکەن کەلەنیوان ئافرەتی بفەڵو ئافرەتی لاژگ دا بوارەیەك هەیە بۆ ئاوات مەندیی سەرچلەکان. هەندێ جاریش بەختیان (لەخشتەبردن))دا بەندە بەشتیك بفەلیو شتیك لاژگییەوە. یەکیك لەکارە سەختەکان نهینی دۆزینەوەی مرۆڤە، لەهەمووشی گرانتر ئەوەیە کە مرۆڤ خۆ دۆزەرەوە بێو پەردە لەسەر خۆی لابدا. زۆر جاریش هۆش دەبیتە رێونەی هەست ئەم فەرمانەش تەنیا بەهۆی کارتیکردنی قورسە گیانەکانەوەیە.

تەنیا کەسیك دۆزەرەوەی راستەقینەی خۆیەتی کە لەدلی خۆیدا بلێ: ئەمە چاکەی خۆمەو ئەوەش خراپەی خۆمە. بەم قسەیە مشکە کویرەو گرگن دەمکوت دەبن کە هەر دووکیان بەلایانەوە وایە (چاکە، چاکەی هەموانەو خراپەش، هەر خراپەی هەموانە.)

بەراستی چارەی ئەو کەسانەشم ناوێ کە هەمووشتیك بەجوان دەبینن‌و ئەم جیهانەیان لەهەموو جیهانیك پێ چاکترە، ئەمانە گرۆی قایل بووەکانن- بەدۆش دەژەنن.. لەهەموو شتیك چیژ وەردەگرن. ئەم پێ قایل بوونە بۆ ئەوە ناشێ کە (چیژی دروست)ی پێ پاساو بدرێ. یان بلین ئەو چیژتنە نابیتە نموونەی ((چیژی دروست)) بەش بەخۆم ئەو دەمە بەگەورەو پەرداخ ئەزانم کە هەستیارەو بەپەرۆشەو دەزانێ بلی: ((من)) بۆ خۆم دەمەوێ.. بۆ خۆم نەم گەرەکە.

ئەوکەسەی هەموو شتیك بماشیتەوەو هەموو شتیك هەرس بکا دیارە تاکیکە لەرەوەبەراز، هەرکەسیك بە هەوای رەزامەندی یەوە بزەرینێ ئەوە کەریکەو خۆی دەکا بەنیو کەرگەلەکەداو بۆی دەردەچێ.

بەچاو هەموو رەنگەکانەوە زەردی تەلخ‌و سووری ئالم حەز لی یە؛ چونکە دەچنە رەنگی خوینەوە. کەسیك هات‌و دیواری مالەکەی سپی رەنگ بکا مانای وایە هەمان رەنگی سپی لە نەفسی خۆی هەڵ سووە.

من حـەزم لەخوینـە، چیـژم لەگـەڵ چیـژی ئەوانـەدا ریـك نایـە کـە ئاشـقی لاشـە مۆمیاکراوەکانن لە لایەکەوەو ئاشقی تارماییەکانن لەلایەکی دیکەوە؛ ئەم دوو تاقمە دژی هەرشتیکن کە خوینو گۆشت بێ. من ئەم گەرەکـە لەشـوینیکدا بوەسـتم تـف چرینی چەناباز‌ەکانم وێ کەوێ هەرچەندە ئەو زۆر بلێیانە لافی ئەوەش لی ئەدەن کە تف پژینو لیکی لغاوەیان زیربارانە.. بەڵام هەرگیز وەهانیە کەواتە باشتر وایە لەگەڵ دزو دەغەلەکان باشار بکەم، نەوەك لەبەردەمی ئەو چەنەبازانەدا رابوەستم!

هەرچەندە رقم لەچەنەبازەکانە بەڵام ئەوانەم پـێ نـابوودترن کـە بـەرتف چرینـی ئەوان دەکەون، ئەمانە باشتر نموونەیەکن بۆ گرۆی هەلـەوەرەکان، مانـەندی ئەمانـەش گوایە لەخۆشەویستیرا داوای زیندەگانی دەکەن و هەستیشی پێ ناکەن.

ئەوانەی بەلای منـەوە بەدبـەختی ژیـانن ئـەو کەسـانەن کـە لـەنیو دوو حالەتـەدا گیریـان خواردوە: ئەگەر جانـەوەری درنـدە نـەبووبن دامـاوی ژیرچنگـی درندەبـوون، بەش بەخۆم لەتەنشت ئەو کەسانەوە دەواری خۆم هەڵ نادەم.

دیسان ئەو کەسانەی حەزیان لەسەرکەوتن نیەو زۆریان لی دەکەن بەلای منەوە بەد بـەختن. ژیـانی بـاجگرو بازرگـانو پاشـایان بـەئاوات نـاخوازم... ژیـانی ئەوانەشـم نەگەرەکە کەپیشەیان پاسەوانییە- لەدووکانیکەوە بێ تا هەریمیك.

منیـش تاماوەیـەکی دریژخایـەن فـیری ئـارامو چـاوەروانی بـووم..بـەڵام ئـەوەی چاوەروانی دەکـەم بریتـیە لـە ((مـن)) ئاوەهـاش خـۆم راهینـاوە کـە :- رابوەسـتمو برۆمو رابکەمو بازبدەمو پێ هـەڵ بگـەریمو سـەما بکـەم. ئەمـە پەیرەوی منـە: کەسـی گەرەکی بێ رۆژیك لەرۆژان فیرە فرین بێ پیویستە خۆی رابهینێ دوابەدوا لەسـەر: (راویستان-راکردن-بازدان- پیهەڵ گەران- سەماکردن). ئیدی کـەس بـۆی نیـە قۆنـاغ بویری لی بکاو بەیەك بازرەقە بگاتە مەودای فرین.

تـا گوریسـم لـە دەلاقـەکان تونـد نـەکردبێ فـیری پیـدا هـەڵ گـەرانیان نـەبووم.. تاماسـولکەی بەلـەکم تونـدو تـۆڵ نـەبووبن بـۆ ترۆپکـی ستوونەکەشـتییەکان سەرنەکەوتووم.. گەورە ترین خۆشیو لەزەت ئەوەیە بگەیتە چلە پۆپەی ماریفەتو زانیـاری.. ئاگریك هـەڵ بگیرسـینی هـەر بیتو کلپـە بسـتینێ.. ئـەم تیشـك دانەوەیـە رابەریکـە بـۆ کەشـتییە نیشـتووکانو ئومیـد بەخشـیکە بـۆ ئەوانـەی لـەگیژاوی مەرگەسات دان.

گەیشتوومەتە راستیو راستەقینەی منیش لەوەدایە کە چەندان ریگام گرتوەتە بەرو چەندان هۆم خستۆتەکارو لە یەك پەیژەوە بەپلیکانەدا سەرنەکەوتووم تابگەمە ئەو ترۆپکەی ئیستا دەچمە سەریو لەویوە بۆ دوایین بروانم.

بیتو جاریك پرسی ریگام کردبی ئەوە لەناچاری دابووە؛ چونکە هەمیشە وام بەلاوە پەسەند بووە کە خودی ریگاو بەریانی ریگا بهینمە زمانو بۆ خۆم تاقی بکەمەوە.

لەبارەی پرسو پەل کوتانەوە پیش کەوتنم ئا بەو جۆرە بووە!

ئەگەر مەردووم ئابەو رەنگە نەخارا بیّ ورام نەبوویّ هەرگیز ناتوانیّ نەخۆی بهینیتە زمانو نەریگای لەمەر خۆی بهینیتە زمان.

هەر کەسەو چیژی خۆی هەیە.. ئا ئەمەش چیژی لەمەر خۆمەو نەبەچاکتری نەبەخرابتری چیژەکانی دیکەی دەزانم، ویرای ئەوەش نەپیی شەرمەزار دەبمو نەپەنهانی دەکەم.

ئەمە ریگای خۆمەو دەی گرمە بەر. ئەوجا نازانم کامە ریگای ئیوەیەو لەکویوە یە؟!

ئەوانەی لییان دەپرسیم: ((ریگا لەکویوەیە؟)) هەر بەم پرسیارە وەڵامم دەدانەوە؛ چونکە هەر کەسەو ریگای خۆی هەیەو شەقامیك لە گوریّدا نیە بۆ هەموان بیّ.

## راسپاردەی کۆنو راسپاردەی تازە

### ١

ئەوامن لیی دانیشتووم لەنیو پەردووی کۆنە لەوحەکانو تازە لەوحەکان دا سەرنج دەدەم کەچی هیشتا نووسینەوەی راسپاردەکانیان لەسەر تەواو نەبووە.

ئەدی کەی "سات"ی من دیت.. ساتی شۆر بوونەوەمو ساتی مت بوونم؟ من گەرەکمە جاریکی دی، داپەریمە خواریّ بۆ لای مەردومگەلەکە، ئەمەیە هۆی چاوەروانیم، پیویستە نیشانەی سات نزیك بوونەوەکەم بۆ دەربکەویّ ئەوجا شیری دەم بەخەندە دەبینم کەپۆلە کۆترەکان لەگەلیا قەتارە دەبەستن؟

تاساتم بەدەمیەوە بێ قسە دەکەم.. لەگەڵ نەفسی خۆم دا- دەدویم‌و هەرچیەکی بی زانم بۆ نەفسی خۆمی دەگیرمەوە؛ چونکە هیچ کەس شتیکی تازە بۆ من ناگیریتەوە.

٢

کاتێ هاتمە لای عالەم دیتم بەسەر کۆنە گریمانەکانەوە رۆنیشتووەو باوەری وایە هەموو شتیکی ناسیوەو چاکەو خراپەی ژیانی جیا کردوونەتەوە.

دیتم باوەری خەلکی وایە: هەر باس‌و خواسیك دەربارەی رەوشت پەسەندی بێ کاتی بەسەرچووە؛ ویرای ئەوەش هەر کامیك لەوان کەبەدەنگ چاکەوە دەهات جارێ رووی لە خەوگاکەی دەکرد تابۆ خۆی نوقمی خەویکی خۆش بێ

راوەستام گیل‌و بێئاگاکان وەخەبەر بهینم. من جار ئەدەم: کەسیك نەبووە راستی چاکەو خراپەی زانی بێ. تەنیا داهین ئەم راستی‌یە دەزانێ، ئەویش ئەو کەسەیە کەنیشان‌و ئامانجەکان بۆ مەردومگەل دەخولقینێ‌و مانا‌و چارەنووسی زەوی هەر بەزەوی دەسپیریتەوە.. بیجگەی ئەو داهینە کەسیکی دی رایەی ناکەوێ بۆ هەر شتیك چا کەو خراپەی خۆی بۆ بنیاد بنێ.

فەرمانم دایە ئەو خەلکە هەموو کۆنینەیەك لیك هەڵ بتەکینن.. لەبەردەم گشت پیرە باوەریك دا قنج بوەستن، ئەوجا گەمە بەهەموو ئامۆژگارو کەشیش‌و شاعیرەکانیان بکەن‌و ئەوانەی خۆیان بەخەمخۆری جیهانی ئەمان دەزانن لییان بدەنە هەللاو پیکەنین.

فەرمانم دانێ بەگوستاخی یەخەی داناکانیان بگرن‌و رایان وەشینن.. وریام کردنەوە خۆیان لەو داوەلە رەشانە لابدەن کەبەسەر درەختی ژیانەوە هەڵ نراون.

فەرمانم داو تییان راخوریم.. لەسەر لیواری تەنگەو زیندانی ئەوانەوە لیی رۆنیشتم کەئیقی دەکردەوە لەتابووت‌و پەریوە لاشە بەسەر ئەو تەنگەیەشەوە قەلەرەشەکان چەرخەیان دەکرد، ئەوەندەی نەمابوو بدەمە پرمەی پیکەنین‌و گالتە بەرابووردووی هەلا هەلایان بکەم.. ئەوەی پیی بگوترێ مایەی شکۆمەندی بەجارێ لیك هەڵ وەشابوو.

خەریك بوو- وەك كابرایەكی دەسەڵاتدار بەسەر چاكەو خراپەدا- گەردشیك بەرپابكەم.. وەك كابرایەك ماتەی شیتی لیی دابێ- جامی غەزەبو نەفرین بەسەر گوناهی زلو گچكەدا قلپ بكەمەوە.. ئەوەش دیارە گەمەم بە سووكترین شتیان هاتووە لەبابەت چاكەو خراپەیانەوە.

تاسەو حەزەكانم قریوەو پیكەنینیان لێ دەرپژاندم.. تاسەو حەزەكانم ماریفەتە كیویلەیەكە لەبلندانی كەژەكانەوە بەجووتە بالەوە رەسیوەو پر بەو گەردوونە دەگڤینی.. ئای كە ئەو تاسەو حەزانە بلندیان كردمەوە بۆ سەر ئەو ترۆپكانە. ئەوجا وەك تیریكی بەلەرزەی تەكان دەر لەگەڵ حەزەكانم دا تیم تەقاند!.. ئەو تیرەم لەپرسۆزی دا بەرەو چاوگەی نوور هاتبیتە لەرزە.. بەرەو كەنارەكانی دوا رۆژی تی هەڵ بكا كەهیشتا خەونەكانیان نەگەیشتوونێ..بەرە خۆرەتاوی پرتەو هەڵ بكشیم كە هیچ غایلەو ئەندیشەیەك قەرەی نەكەوتووە.. تیریكمو بەرەو ئەو شوینە تەكان ئەدەم كە خواوەندەكان كردوویانەتە سەماو دەست بەندانو پیشیان شەرمە بەهیچ بەرگیگ خۆیان داپۆشن.

ئەوەی لە گۆرێدایە تەنیا بەهیما نەبێ بۆم وەسف ناكرێ. ئەوەتام لالە پەتانە قسەدەكەمو شاعیر ئاسا بێ بارم.. لە راستیش دا لەوەدا هیچ سڵ ناكەمەوە كە بەناچاری بەیانو دەربرینی شاعیران وەربگرم!

بۆم دەركەوت هەموو شتیك سەماو گەپی خواوەندانە بوو چونكە لەویرا عالەم لەهەموو بەندیك خۆی رەها كردو پەنای بردە بەر نەفسی خۆی، چۆن هەمیشە خواوەندەكان هانا دەبەنە بەرخودی خۆیانو بەنكوولیو بادانەوە بۆ سەر خۆ- دەكەونە پشكنینی زاتی خۆیان، ئاواش عالەمەكە هانای بردە بەر نەفسی خۆی.

لەویدا زەمانم لێ وەدەركەوت؛ بریتی بوو لەگاڵتە جاریك بە كاتی پارچە پارچە. دیتم پێویستە هەبوون= واجب الوجود / بریتییە لەسەر فرازیی بەختیارانەو یاری دەست بازی بەخودی سەرفرازی دەكا

لەویرا كۆنە شەیتانی خۆم دۆزیەوە.. قورسەگیانی تازە دوژمنم دۆزییەوە.. ئەوەم دی كە گۆرستانو یاسا گەلو نیشان ئاراییو خواستو چاكەو خراپەی داهیناون.

دیتم دیسان ئەوان بەهەموویان مەیدانیكیان پیك هینـابوو، ئـەویش بـۆ بـەرپیی سەماكەران ئامادەبوو.. خۆسەماگاش بەبێ شانۆ نیە.. هیچ رووح سووكیك نیـە كـە مشكە كویرەو گرگنی لەژیرپیدا رانەخزین‌و دەرنەفرتین.

## ٣

دیسان هەر لەوێ بەمرازی وشەی ((مرۆڤی بالا)) گەیشتم.. پەیرەویكم بەدەست هینـا كەلەسـەر ئـەم بناغەیـە دامـەزراوە: (مـرۆڤ بوونـەوەریكی ئەوتۆیـە پێویسـتە شتیكی لی هەڵ بكەوێ بەسەر مـرۆڤ دا بكشـێ‌و بـەجیی بـهیلێ. مـرۆڤ لـەخۆیدا نیشـانەو مەبەسـت نیـە بـەلكو ریبواریكـە لـەنیوه رۆو ئیـوارەی خـۆیدا داوەرانـی بەختەوەرییە. بەراستی وشەكانی زارا لەبارەی خۆرەتاوی مەزنەوە لەگەڵ سـەرجەمی ئـەوەی بەسـەرجیهانەوە بـەرزی كردووەتـەوە بریتییـە لـە دووەم ئـاوابوونیكی ئەرخەوانی ئەوتۆ كەلە دوایەوە شەفەقی نوێ دەربچێ.

شـەوگاریك‌و كۆمەلـە ئەستیرەیەكی نویم خسـتە بـەرچاوی خـەلكی، كـە هـەرگیز شتی وەهایـان نـەدیوە.. ئـەوجا پیكـەنیم بەسـەر گەوالـە هـەوری شـەو رۆژدا وەركـردو گومەزیكی قەشەنگی رەنگاو رەنگم لی دامەزراند.

خـەلكیم فیری هـەموو بیرو بۆچوونەكانم كردوون، كەویسـتبیتم ئەونـهینی‌و رازو گـەردانی رۆژگـارەی لەمرۆڤایـەتیدا هـەن یـەكیان بخـەم‌و كۆیـان بكەمـەوە، لەوحەلـەدا سەرجەمی ئارەزووەكانی خۆمم بۆ بەیان كردوون‌و شاعیرانە لـەنیویان دا– دەستم بـە شی كردنەوەی هیماكان كردو لەكویرە ریكەوت لام دان؛ تا فیریان بكەم كـە – داو رۆژ بخولقینن.. بەداهینانەوە سەردەم سەرینی بەسەرچوو رزگار بكەن.

مەردومگەلم فیركرد: ئەو مرۆڤایەتییە قوتار بكەن كە رۆژگاری رابووردوو لەناخی خۆیدا پیچاویەتییەوە؛ ئەویش بەچەمك گۆرینی ((ئەوەی هەبوو)) تا ویستو خواست راست دەبنـەوەو جار دەدەن: (ئـەوەی تـەواو بـوو هـەر ئەوشـتەیە كـە ویسـت ئـیرادە گـەرەكیان بـوو– ببێ–) ئیـدی ئەمـە بەرخواستی تۆیـە یـان ئـیرادەی تۆیـە لـە هـەموو كات‌و زەمانیك دا.

ئا بەم چەشنە ئاشتیم بۆ ئەم مەردومگەلە کەوتە بەرچاو.. فیریشم کردن کە ئەو ئاشتییە ناودیر بکەن.

ئیستا چاوەروانی ئاشتی بۆ زاتی خۆم دەکەم؛ تا بۆ دوا جار بگەریمەوە؛ چونکە دەمەوێ لەنیویان دا بەرەو نەمان بچمو خۆر ئاسا بەنرخترین گەنجینەی خۆمیان پێ بسپیرم.. ئەو خۆرەی گەشاوەی خۆی دەخاتە سەر دەریاکانو لەتاریکیدا ئاوادەبێ.. هەر لە بەخشندەیی ئەورا نیچیرە هەژارەکان بەسەولی زیرینەوە وازی بەسەر کەفی دەریاکان دەکەن. ئاوا لەخۆرەوە فیری ئەم دەست وازییە بووم کەلە دەمی ئاوابوونیدا چاومم لی نەدەتروکاندو لووزەوی فرمیسك لەچاوەکانمەوە هاژەی دەکرد.

زارا گەرەکیەتی ئاوا لەبەر چاوم گوم بێ.. چۆن بەشی خۆر ئاوا بوونە ئەویش ئاوابێ.

ئائەوەتا لەنیو پەردووی کۆنە لەوحەکانو تازە لەوحەکان دا رۆنیشتووەو نوقمی چاوەروانییە: کە هیشتا بەتەواوەتی راسپاردەکانیان لەسەر نەنووسراوەتەوە.

٤

ئاگاداربن! ئەوا لەوحیکی تازەتان بۆ دەهینم.. دەبێ براکانم لەکوێ بن؟ بەلکو بین بکەن بەنیو دۆلداو لەوحەکەم لەتەکدا هەڵ بگرن.. ئەوجا راسپاردەکانی لەسەر شاپەرەی دلان نەخش بکرین؟!.

باری ڤیانم بۆ ئەوانەی لەمەولا دینە بەرەوە- ئەم راسپاردەیەم لی داوادەکا: ((لەگەڵ کەسە نزیکەکەت دا خۆ گونجین مەبە؛ چونکە ئەم مرۆڤە بەردە بازەو دەشێ بەسەریدا تی پەرینو بەرەو ژوور بۆ بلندایەتی گور ببەستینەوە.

مرۆڤ بەشی بەئەوەوە هەیە کە چەندین ریگاو هۆ بخاتە کار تا بەسەر نەفسی خۆیدا گوزەر بکا. تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە لەو ریگەو بانەوە بەریانی گەیشتنە قۆناغ بگرێو بەری نەدەی. خۆ ئەگەر یەکیك هاتو گوتی:- بالا بوون بەسەر مرۆڤدا کاریکەو بەگوریكو بەبازیك دیتە دی)) مەی سەلمینە؛ ئەمە قسەی ئەکتەریکی خەندۆکەو شتی وەها لەگۆرێ دانییە. گوتمان لەگەڵ کەسی نزیکتا خۆ گونجین مەبە کەواتە هەر لەخودی ئەوەوە گوزەربکەو بەسەر نەفسی خۆت دا بالابەو بواری ئەو

کەسەت نەدەی لیت بەنیاز بگا، دەشتوانی تۆ لیی بەنیاز بگەیو بیکەیتە توانایەك بۆ خۆت. ئەوەی تۆ دەی کەیت کەسیکی دی لەوکارەدا ئالوگۆرت لەتەك دا ناکا، چونکە لەم جیهانەدا شتیك نیە پیی بگوترێ ئافەرینەو ئیزا. کەسیك دەسەلاتی خۆفرمانی نەبی پێویستە گوێ رایەلیو بەندە فەرمانی کەسیکی دی بێ.

لەم جیهانەدا زۆری واهەن دەزانن فەرمان داسەپیننە سەر نەفسی خۆیان کەچی ناتوانن گوێ رایەلی ئەو نەفسەیان بنو بەقسەی بکەن!

٥

نەفسە وەجاخزادەکان بیزیان نایە بەبێ بریتیو بارتەقا هیچ شتیك وەربگرن. بەرلە هەموو شتیك نەفسی بالا بیتو ژیانو گوزەرانی خۆی بەهرە گیر نەکردبێ ئەو ژیانە رەت دەکاتەوە بەلام گەلەی بەشەر دەیەوێ بەبێ هەوڵو بەخشین بۆ خۆی بژێ!

ئەوا راستو رەوان بەژیانەوە بەهرەوەر بووین؛ کەواتە لەسەرمانە لەهەموو کاتیکدا بیر لەباشترین شت بکەینەوە کەبتوانین بەرامبەر ئەو ژیانە بی بەخشین، ئایە لەم وتەیە شکۆدار تر لەگۆڕێدا هەیە کە بلیین: ((ژیان هەرشتیکی پیسپاردین پێویستە بۆی بهینینە دی))؟

مرۆڤ بۆی نیە تا خۆشایەتییەك نەبەخشێ بکەویتە رابواردنو چیژ نۆشی، خۆشایەتی هەر ئەوەنیە لە پیناو پیرابواردنیدا رووی تێ بکرێ؛ چونکە پاکژی (طهارة)و خۆشایەتی ویکرا زیندەی خۆدارو خۆ پاریزن، کەسیك خاوەنی خۆشایەتی نەبی و بەسەریدا رانەکا با پەیدۆزی بۆ نەکاو لیی نەگەرێ.. بەلکو باشتر وایە لەپیناو چەپەلیو ئازاردا بۆ خۆی ویڵ بێ.

## ٦

براینە! هەموو پیشەنگیك قوربانی دەرە؛ ئەدی هەر ئەوەنیە ئیمە بووینە تە قۆچی قوربانی و پیشەنگی دەم بەهەرەشە، ئەوەنیە لەپەیکەری رازەکان دا زامەکانمان خوین پژانیانە؟.. سووتگەی پەرستگایەك پیشکەش بکەین گۆشتی قوربانییەکەی لەپیناو ستایشی کۆنە بتەکان دا بتویتەوە؟!.

باشترین شتی ئیمە هیشتا ناسك و ئاودارە؛ هەر ئەم بابەتەشە کە تامەزرۆی پیرە لغاوەکان دەخاتە جونبوش.. ئەوە گۆشتەکەمان تەرو برەو پیستەکەشمان پیستی بەرخە.. ئیدی چۆن هەلپەی ئەو پیرە کاهینانە لەپەیکەرە بتەکان دا ناورووژینین.. ئەی بەم تامی تامی‌یە چۆن ناکەونە هەلەکەسەما؟!.

پیرە کاهینی بتەوان لەزاتی شاراوەمان دا خۆی مت داوە.. خۆی کۆ دەکاتەوە زیافەتیك سازبکا، ئەوجا ئەوەندی تیمان دا خیری پیوە بی هەستێ و رۆی بهیلێ.. ئیدی براینە! چۆن پیشەنگ لەم قۆچی قوربانی‌یە رزگاری دەبێ؟

ئەمە سپاردەی ئیمەیەو ئاوای گەرەکە. کەسیکم خۆش دەوێ هیندە پابەندی ((مانەوە)) نەبێ، ئەوانەی لەبەر چاو گوم دەبن لەگەلیان بەسۆزو نەرمو نیانم؛ چونکە ئەوانە ریبواری لایەکی دیکەن.

## ٧

ئەوانەی شارەزای راست گۆیی و دڵ سۆزین فرە کەمن، ئەوەی لە راستیی راشکاوی (صراحە)دا شارەزابێ نایەوێ بۆ خۆی راشکاو بێ.. زۆرینەی خەلکەکە رووکەشن، ئەوانەن کەخاوەنی بەزەیی پیدا هاتنەوەن؛ هەرگیز بەراستی دەم هەڵ ناهیننەوە، ئەم جۆرە بەزەیی پیداهاتنەوەیەش، چونکە هەرگیزاو هەرگیز بەراستی دەم هەڵ ناهیننەوە، ئەم جۆرە بەزەیی پیداهاتنەوەیەش نەخۆشییەکە لە تویی هۆش و ژیری‌دا. میهرەبانەکانیش لەژیر دەسەڵاتی دلیك دان کە ویستی خۆی ئەدا بەسەر هۆشیان داو هۆشیش بەبی سێودوو بەندە فرمانەو گوێ لەمستە؛ کەواتە راستی لەمیهرەبانەکان دا لەکەلەکەبووی شتیك پیك دێ کەلەچاوی ئەوانرا خراپەبێ.

ئەوجا براینە! ئایە بەشی ئەوەتان خراپە لەلاکۆبووەتەوە کە ئەو جۆرە راستییەی پێ بنیاد بنرێ؟!.

راستی بریتی‌یە لەزادەی جووت بوونی بێ ویلیو بەد گومانیو رەت کردنەوەی ستەمگەرانەو نەویستیو ناکۆکی لەژیان دا. ئای کەریك هاتنو یەك کەوتنی ئەو جەمسەرانە کاریکی چەند سەختە !

نیهادی سەرتاپا تاوەکو ئەمرۆ لەنزیك نیهادی بەدەوە پێ گەیشتووە. براگەل! ئەگەر ئیوە لەبنەمای زانست دەگەرین یاللا راستەوەبن بۆتیك شکاندنی ئەو کۆنە لەوحانە.

## ٨

کەدیتە بەرچاوت ئەوا بەسەر ئاوەرۆگەکانەوە بەردەبازو پرد دروست کراون.. بەسەر رووبارەکانیشەوە پردو چەپەر هەڵ بەستراون ئایە باوەر بەلیقەوماویك دەکەی بکەویتە هاتو هاواری خنکانو فریاد.. لەهەمان کاتیش دا خودی داناکانیش بەدرۆی بخەنەوە؟!

هەر گوزەرگایەك بەسەر رووبارەکانەوە هەڵ نراوە، ئەوەی چاکەو ئەوەی خراپە باش دامەزراوە.. کە زستان دێو رووبارەکان دەخاتە ژیر رکیفی خۆیەوە مرۆی هەرە زیرەك لەسرەوتی سەرجەمی شتەکان دا– دەکەویتە گومانەوە. وەلی ئەوانەی حەزیان لەوەیە نوقمی خەوی زستان نەبنو لەبێ کاریدا پشتینی لێبکەنەوە پییان خۆشە لەو باوەرەدا بمیننەوە کە بەردەبازو بوارەکان قایمو سەلامەتن قوولاییەکانیش لەناخەوە بەمەندی چرکە ناکەن.. بەلام ئەو هەوایەی‌شەختە ئەتوینیتەوە ئەم دڵ ئارامی‌یە بەدرۆ دەخاتەوە. کە ئەو بایە هەلی کردو گڤاندی دەلیی گای هارەو شاخەکانی لەسەهۆڵ دەسرەوینێ. کەشەختە وردوخاش دەبێ پردەکانیش دەرمین.. ئەوجا هەموو گوزەرگاکان نوقمی ئاوەکان دەبنو هیچ کەسیك نەلەچاکەو نەلەخراپە شتیکی چنگ ناکەوێ پشتی پێ ببەستێو خۆی پاڵ بدا.

وای بۆ بەد بەختی خۆمان.. بەلکو ئای لەبەختەوەریی خۆمان!.. ئەوا با هەلی کرد کە سەهۆلبەندان بتویتەوە؛ کەواتە گەلێ براینە! بەمزگینی‌یەوە دابەزنە سەر شەقامەکانو بی‌کەنە قریوەی باهەڵ کردن.

٩

ئەو کۆنە شیتایەتی‌یەی بەچاکەو خراپە ناسراوە کاریکی شیتانەیە ئەگەرچی تاوەکو ئەمرۆش بەسەروەری فالچی و نجومگەرەکانەوە دەخولیتەوە.

لەزەمانی پیشوودا باوەربوون بەنجوومگەری و رەمل لیدان زۆر باوبوو.. بۆیە ئەو خەلکە باوەریان بەچارەنووس هەبوو. بەناچاری دانیان بەهەڵ کەوتن و واقیع دا ناو لەئاشکرا کردن دا کەوتنە دردۆنگی و گومانەوە، ئەوجا بایان دایەوە بۆ ویستی ئازادو بانگیان بۆ هەڵ دا.

((کە تۆخاوەنی ویست بووی مانای وایە بەتواناو چارسازی)).

براینە! تا ئەمرۆ هەرچی لەسەر هینانە زمانی ئەستیرەو دوا رۆژ بنیاد نراوە بریتی بووە لە گریمانەیەك و لەسەر گریمانە دامەزراوە؛ لەبەر ئەوە هیچ کەسیك لەبارەی چاکەو خراپەوە شتیکی نەزانیوە. هەرچی دەربارەشیان گوترابیّ لەسنووری گومان وتەنی و نەدیدە تیسرەواندن دەرباز نەبووە.

١٠

## مەدزە، مەکوژە:

لەزەمانی دیرین دا ئەو گوتانە پیرۆز بوون، هەر ئەوەندە مەردووم بیّ بیستایە خیرا پاپەتی یانە بۆیان بەچۆك دا دەهات و کرنووشی بۆ دەبردن.

.. بەلام ئەوا بەش بەخۆم لیتان دەپرسم، ئیوەش وەلام بدەنەوە: ئایە لەم جیهانەدا دزو پیاو کوژی واهەن هینـدەی ئەو کەسانەی بەو وشە پیرۆزانە سەغلەت بوون سفەتی جەردەیی و پیاو کوژییان تیدا هەبیّ؟

ئەی ئەوە نازانن کە دزیتی و پیاو کوژی دیاردەیەکی سروشتی ژیانن؟ تۆ بلیی: کەسیّ هات و (سەبارەت بەخواستی ژیان) ئەو جووتە وشە نەفیانەی بەپیرۆز دانان کارەکەی نەبیتەکوشتنی راستی‌یەك لەژیان؟!.

ئایە مەبەست لەبەهەلەبردنی ژیان و لی سلەمینەوەی لەخۆی‌دا نابیتە بانگەوازیك لەپیناو مەرگ و نەمان دا؟

براینە! هیچ دوو دڵ مەبن.. وەرن ئەو کۆنە لەوحانە تیك بشکینین.

## ١١

زەمانی رابـووردوو بەسـەر چـوو، وەلانـرا، وەهاپـاش گـوێ خـرا تـەواو دلـم پـێ دەسووتێ. زەمانی رابووردوو پشتی لەبایەخ و بیرو شیتی ئەوتۆ هـەلکرد کـە ئـەو سفەتگەلە دینو لـە بەرەبەیانی داهـاتوودا پـێ دەگـەنو دەرەخسـین، لەمـەودوا ئـەو بەرەبابانە لەهەموو کونینەیەکی بەسەرچوو پردیك بۆ خۆتان هەڵ دەبەستن.

ستەمکاریك گیانی شەیتانی دەکرێ بەبەرداو چ بەتوندیو چ بەنەرمی زاڵ دەبێ بەسەر رابووردووداو چاری دەکا. وازی لێ ناهینێ تا دەی کاتە بەردەبازی بەرپییو دروشمیك.. نەخیر دەی کاتە جیگایەك بۆ کەلەشیری بەرە بەیانەکەی تابەسەریەوە بخوینێ.

بەلام بەزەیی پیدا هاتنەوەکەی لەمەر من ئەوەشی لـەخۆی گرتـووە کەمەترسـی لابیـا، چونکـە بیرکردنـەوەی کەسـیك زادەی هـەراو هۆریابـێ چـەندە تـی هـەڵ بکـا لەسـەرینی باپیری تێ ناپـەرێ.. ئـەوجا لـەوێو لەمـەزندەی ئـەودا– زەمـانی دیریـن کۆتایی دێ .

بەهـەر حاڵ زەمانی رابووردوو دابراو بۆ خـۆی تـرازا، رۆژیکیـش دیتـە پیشـەوە کەهەراو هوریا پەرە بستینێو بەرەو گیژەنی ئاوەکان پاڵ بەمیراتی چاخەکانەوە بنێ.

کەواتـە پیویستە کۆمـەلیك بەشـەرەفمەندی تـازەوە راسـت ببنـەوەو بەربـەرەکانی هەراو هوریاکە بکەنو بەرەنگاری ستەمکاران ببنەوە.. کۆمەلیك بنو هیندە جوامیر بن ئەوەی پیی دەگوترێ ئابرۆ دای بەزیننـە مەیدانەکـەوەو بیکەنـە راسـپاردەیەکی هەلکەنراو بەسەر لەوحە تازەکانەوە.

ئەو کاتە شەرەفمەندی پەیدا دەبێ کە ژمارەی شەرەفمەندان زۆر بێ. ئەم ری بیرو بنەمایـەم هـاوردو بـەم شـیوەیە هیمـام بـۆ کـرد کـە گـوتم: ((سـەبارەت بەئـەژماری خواوەندەکان نەك بەهۆی یەکیکیانەوە– خوا وەندیتی دادەمەزرێ.

## ١٢

براینە! من شەرەفمەندیی نویتان پێ دەسپیرم لە کاتیك دا– داواتان لێ دەکەم کە : بخولقینن.. فیرببن..تۆوی خۆتان بۆ زەمانی داهاتوو بچینن.

ناتوانن ئەو ((شکۆمەندی))یە وەك بازرگانەکان بەزیر سەودای بکەن.. ئای کەشتی کرینو فرۆشتن کەم نرخە!

لەئیستا بەدوا هەرگیز وەجاختان شەرەفمەندتان ناکا بەلکو ئەو نیشانەو ئامانجانەی رووی تی دەکەن پلەی شەرەفمەندیتان پێ دەبەخشێ.. شەرەفتان شاراوەیەکە لە ویستی خۆتان داو لەو هەنگاوەدا کە تەکانتان پێ دەدا سەرووی نەفسی خۆتان بکەون‌وسنوری بشکینن، ئائەمەیە شەرەفمەندیی نویتان دەستبەرداری مەبن.

سەبارەت بەخزمەت کردنی میریك شەرەفمەند نابن. پیم نالین ریزی ئەمیران کامەیە؟.. ئەگەر هاتو چۆن شوورا بەدەوریی بوونەوەریك دا هەڵ دەچنرێ، ئیوەش ئاوا قنج بە دەوریەوە راوەستاون– تاپتر بەرگە بگرێو تەمەنی دریژبێ ئایە ئەم بەدیارەوە راوەستانە شەرەفمەندتان دەکاو پیی ئابرومەند دەبن؟!

ئەو بنەچەیەی فیری خۆرەنگ کردنی نیو کۆشکان بووە بەوە راهاتووە هەمیشە لەبەردەم بۆگەناوەکان دا رابوەستێ، ئیوە لییان بکشینەوە، هونەری راوەستان لەسەر جووتەپێ بۆ نۆکەرانی کۆشك رەوشتیکی پەسندە. ئەوانە بەتەمای لەزەتی ئاسوودەی نین، مەگەر مەرگ قورتومیان بگرێو لەو هەلویستەیاندا بیان گلینێ.

دیسان بەوە شەرەفمەند نابن کە بچنە سەر ئەو باوانەی گیانیکی تێ فرێ دراو پیشی دەلین ((رەوانی پیرۆز))

بەوەش وەجاخزادەیی پەیدا ناکەن کە بین‌و خۆتان بدەنە پاڵ زەویی (میعاد)

ئیوە گەرەکتانە بەم خۆپاڵ دانە رابووردووە بینە ریزی وەجاخزادانەوەو ئابروو مەندبن؟ بەش بەخۆم لەو زەمینە بەفەرەی ئیوەدا هیچ شتیکی تیدا بەدی ناکەم بایی ئەوەبی ستایشی بکەم. ئەرێ ستایشی خاکیك دەکرێ کەبەدترین درەختی رواندبێ، واتە داری خاچ؟[30] تۆ بلیی کە (رەوانی پیرۆز) بەهەرلایەك دا لەشکری سوارەی رادابێ ئایە بزنەگەل‌و قەتارەی قازو گرۆی شیت‌و دەستەی پەتەریەکانی بەدواوە نەبووبن؟

---

[30]ئەوەندیکی ئەو فەلسەفەیەی لە ئاریتییەوە گلاوە و لەبارەی ژیانی عیساوە دەرکی پێکردبێ، هەر ئەوەیە کە رۆژ ئاوا کردوویەتی بە مەتەڵ‌و پەردەك، باشتر وابوو بۆ ئەو نیتشەیەی حەزرەتی مەسیحی تاوانبار کرد بەوەی کە بەزەیی پیدا هاتنەوەو میهرەبانی لەنیو کۆمەڵ دا خستەوە– ئەو درەختەی تەختەی خاچی لی داتاشرا وەك درەختیکی بەد سەیری نەکردایە؛ چونکە هەر هەمان داری گۆرین مەزنترین میهرەبانی بۆ کوشتووە.. بەلام دەبێ بەلەدی ئەوەش بین کە (دژایەتی) خراپترین بەلایە بۆ بیرو ئاسانترین شتە کە خاوەن

براينه! پيويست ناكا خانەدانيتان بۆ ئەو ديوى خۆتان تێبپەرى.. يان بابگاتە هەر شتێ لارىو چەپەك بێ؛ گەرەكە نەفسى خۆتان لەو مەلبەندەو ولاّتانە دوور بخەنەوە كەباوانتان تياندا گيرساونەتەوە.

تەنيا بەنديوارى نيشتمانى رۆلەكانتان بن، بائەم خۆشويستىيە تازە وەجاخى شەرەفمەندانەتان بێ. ئەو شوينانە نيشتمانن كە تاوەكو ئيستا لەو ديوى- دەرياى ديارو نادیارەوە هيچ پييەك نەى شيلان، تيتان رادەخورم: كەشتىيە بايەوانەكانتان بەهەمەلادا بلاوبكەنەوە تا لەنگەريان بۆ دەدۆزنەوە.

پێويستە لەبەردەمى رۆلەكانتان پاكانە بژيرى ئەو گوناهەبن كەلەپشتى باوانتانەوە دابەزيون.. بەبێ ئەم پاكانە خۆ دارنين لەو گوناهە ناتوانن رابووردووتان رزگار بكەن.

ئەمەيە راسپاردەى تازەو لەو حەكەشى بەژوور سەرتانەوە ئاويزان دەكەم.

## ١٣

كەهەموو شتيك بەتالّ بێ ئەرێ ئيمە لەپاى چى بژين! ئايە زيندەگانى لەوە زياترە كەبريتى بێ لەدۆل كوتان = (دق السنابل)و خۆسووركردنەوە لەنزيك ئاگريكەوە. سووتينەر بێ و گەرم كەرەوە نەبێ؟!

ئا ئەمەيە چەنەبازى كۆنەباو كەبەدانايىوپەند دەدريتە قەلەم.. ئەوكەسانەى دەشى لەوسينن بە مەزنەپياو- پيران- ناودين؛ ديارە ئەوبۆگەنەش يان ئەو پۆلكينەش بەشى خۆى خانەدانى وەدەست دەهينێ، ئەوپيرانە چونكە بۆساردن ريزيان لى دەگيرێ.. مندالەكانيش لەهاوردنى وينە راسپاردەكانيان كورتيان نەهيناوە. بەراستى ئاگر چزەى لىهەستاندوون؛ بۆيە ليى دەترسن. كتيبە كۆنەكانى پەندو دانايى ئاميزبەخەونو خەيالى مندالاّنە ئاخنراون.

ئەوكەسەى دۆل دەكوتێ مافىئەوەى نيە قەشمەرى بەكەسيك بكا لەگولەگەنمەكان دەنكەگەنم دەربهينێ ئەو گالتەجارانە شيتگەليكن باشترواية بيانبەستينەوە.ئەوبيچم

---

بيرى تى بكەوێ. ئەمە راستە بەمەرجێ خاوەن بير بەبێ ليكۆلينەوە پيوەرى خۆى رادا بۆ هەر شتيك بىزانێ و نەشى زانێ.

گەلە بەدەوری خوانەوە دادەسەپێن‌و هیچ شتێکی بۆ ساز ناکەن، تەنانەت تامو مەزەیەکیش نادەن بەو خوانە، کەچی لەبەر خۆشیانەوە دەبۆڵێنن:

((بەڕاستی هەموو شتێك بەتاڵە!))

براینە ! بڕوام پێبکەن ئەو کەسەی بتوانێ بخواو بخواتەوە نابێتە دارای فەناو پەنای پووچ‌و بەتاڵ.. کەواتە تێ سرەوێنن، تێك بشکێنن.. دەی ئەو لەو حانە بڕمێنن کە بنووسەکانیان هەمیشە لالووت‌و بێزارن.

## ١٤

((بەلای پاکانەوە هەمووشتێك پاکە)) گەل دان بەم قسەیەدا دەنێ. وەلێ من پێتان دەڵێم: ((لەچاوی بەرازەکان دا هەموو شتێك بەراز ئاسایە...))

ئەوانە گیرۆدەی نەوازشن دڵ شکستن بانگ بۆ خەڵکی دەهێڵن کە باوەڕیان وابێ ئەم جیهانە زەلکاوی چڵك‌و لیتەیە. بەڵام با ئامۆژگارو دەمڕاستەکان بۆ خۆیان لەولیتەیە نیشن‌و هۆشی خۆیانی پێ چڵکە سوو بکەن.. چونکە حەزناکەن ڕووبەڕوو سەیری دنیا بکەن.. بەڵکو حەز دەکەن لەپاشڵەوە بۆی بنۆڕن، ئەوەی سەرنجیان کێش دەکا پشت ملی دنیایەو بەروگەردنی نیە!

بەش بەخۆم لەڕووی ئەو گیرۆدانەدا نای پێچمەوە- با لەسنووری شایستەش لام دابێ- دەڵێم: ڕاستە جیهانەکە لەمرۆڤ دەچێ، ئەویش پشت ملی خۆی هەیە. لەم جیهانەدا سەرەنوێلکی بێ ئەندازە هەیە.. بەڵام وەنەبێ سەرتاپای جیهانەکە بەبەرینی خۆیەوە هەر گەناوێك بێ.

حیکمەت وەها دەخوازێ کەلەم جیهانەدا شتی ئەوتۆ هەبن بۆنی ناخۆش بدەنەوە، چەمکی "پێناخۆش بوون"یش باڵی لێ دەڕوێ و حەزو تاسەی سەرچاوە ڕوونەکان دەخولقێنێ.

ئەوانەی چاك‌وەهەڵ بژاردەن لەژیان دا تێیان دانیە بێبەش بێ لەشتێك کەمایەی بیزکردنەوەبێ، بەلکو لە هەرە باڵایان دا شتی واهەیە پێویستە لیی دەربازبین‌و سەرووی بکەوین. کەواتە براینە! ئەمەش لەحیکمەتەوەیە کەلەم جیهانەدا ناپوختی‌و پەلۆخی فرەبێ.

## ١٥

لەو خۆپاریزگارانەی گیرۆدەی ئەو جیهانی دیکەن زۆرم بیستووە کە بەقسەی وادەکەونە رازو چیپەوە لەگەڵ نیهادی خۆیان دا تانوییوی هەموو بیژەکانیان پیک هاتووە لە گومرایی و خراپە. بەبێ گەمەو بەبێ فریو ئەو قسانە بەراست دەزانن. ((واز لەجیهان بهینە بالەسەر ئەم حالەی بمینیتەوە، ئیدی نەکەی بۆ پەرچ دانەوەی پەنجەت بجوولینی. واز لەو خەلکە بهینە باخۆیان شل بکەن بۆ هەر دەستیك قورتمیان بگوشێو بیانخنکیکێ. لییان گەرێ: باخراپە لەگەڵ یەکدیدا بکەنو بەیەك دابدەنو یەکدی کەوڵ بکەن، بایەکدی قر بکەنو نەکەی پەنجەیان لی قیت بکەیتەوەو بیان سلەمینیتەوە.. وازیان لی بیرە چی دەکەن با بیکەن! بەم رەنگە تیكبکەنەوە بێ نیاز دەبن لەم جیهانەداو پشتی لیهەڵدەکەن..

لەدانایی خۆت سڵبکەرەوە، چونکە ئەویش هەبوویەکی ئەم جیهانەیە، دەبێ دانایی لەمەر خۆت بەنووسینەوە سەرجەمی بکەیتو باش باش سەری ببری. ئەوجا تۆش فیری ئەوە دەبی کەلەم جیهانەدا بێ نیازیو پشتی لی هەڵدەکەی.

براینە! ئەو کۆنە لەوحانە تۆماری خۆپاریزگارە لەخواترسەکان ((المتقین))ن، دەلییان وەرنە پیشەوەو بەجارێ تیکیان بشکینن.. نەخیر گاز لەو راسپاردانە بگرن بەجارێ دایان پاچن بیانکرۆژن نەکەن بەو راسپاردانەوە لیوتان بجولیننەوە، چونکە قسەو ریسەی ئەو کەسانەن کەژیان ناشیرین دەکەنو لەبەرچاوی دەخەن.

## ١٦

ژنەفتم: لەکووچەو کۆلانی تاریكدا بەگویی یەکدیدا- دەیان چپاند: "کەسیك مرو تەسەلی فیربوون بێ هەموو ئارەزوویەکی بەجۆش لەدەست دەدا".

دیتم: تازە لەوحی راسپاردەکان لەگۆرەپانەکاندا هەلواسراونو لەسەریان نووسراوە: ((دانایی ماندووکەرە، شتێ نیە شیانی کۆڵپیوە هەڵگرتن بێ، ئارەزووی خۆت بەهیچ شتیکەوە هەلەوگیر مەکە)).

براینە! بۆ تیکشکاندنی ئەو تازە لەوحانە راخزین، ئەوانەی بەژوورسەرەوە هەلیان دەواسن کەسانیکن بەدەست ژیانەوە ماندوون. لەوحە هەلواسین پیشەی کاهینەکانی مەرگو پاسەوانانی بیویلخانەکانە، ئەرێ ئەم راسپاردەیە گازندەیەك نیە بۆ پەرستنو بەندایەتی؟!

بەڵێ کاهین و پاسەوانەکان فێرە خوێندن بوون، بەڵام ڕەدووی بەرنامەیەکی بەدکەوتوون، کام زانیاری باش بێ خۆیان لێ گێل کردووە، پێشوادەو بەپەلە خۆیان فێرکردووە.. ئەوەی لەبەر پەلیاندابووە بەهەلپەوە ماشیویانەتەوە.. گەدەیان بووەتە کونەدەرد، هەموو شتیکیان بریتییە لەگەدەی بەدهەرس و دەردەزا، لەبەر ئەوەیە کەهۆشیان بەرەو نەمان و تیداچوون گازیان دەکا.

ژیان لەخۆیدا سەرچاوەی خۆشییە، بەڵام ئەو کەسەی گوێی کلۆرکردووە بۆ گەدە هۆشیکی بێ سەرەوبەرە و لەتەك حیکمەتی سیاچارەیدا خراپ دەوردەبینێ، ئیدی ئەندیشەی بۆ پەیدا دەبێ کەهەموو سەرچەشمەیەك ژەهراوییە!

زانست بۆ کەسیکی ئەوتۆ کەبەویستی شیرانە خۆی گورجەوەکردبێ خۆشی و شادییە، ماندوویەکیش بەویستی بیجگەی خۆی بئاژۆێ ئەوا سەراویلکەیەکەو شەپۆلەکان تەتەلەی پێ دەکەن، بێ دەسەڵاتەکانیش ئەو کەسانەن گومرابوون، کەهیزیشیان لێ برابێ بەدەم پرسیارەوە ڕاوەستاون: دەبێ کێ بەپاڵ ئاژواندبنێ؟.. یان کەدەلین: شتیکی ئەوتۆ لەگۆڕێدانیە شایستەی گرنگی پیدان بێ. ئەو دەستەیە بەوە دڵخۆش دەبن کەگوییان بەبانگ هیشتنی بەندایەتی و پەرستش ئاشنابێ، کەدەلین:

((شتیکی ئەوتۆ نیە شیانی گرنگی بێ، کەواتە ویستی خۆتان وەدەرنین و پەکی بخەن)).

براکانم! زارا وەك گرەبا تەوژم دەستینێ و ختووکەی کونەلووتی ڕیبوارە ماندووەکان دەدا..

گرەبایەکی ڕەهایەو دیواری بەندیخانەکان دەسمێ تادەگاتە بەندییەکانی تێ فکرین.

ئەگەر دڵسۆزو ڕزگارخوا هەبێ تەنیا ((ویست))ە، هەر ئەویش دەخولقینێ و ڕادەهینێ، ئەمەش پەیرەوی منە.. مرۆڤ لەسەریەتی فیری داهینان بێ.. لەسەریەتی ڕیچکەی من بەرنەدا، ڕیچکەیەکەو بە (زانیاری) دەگەیەنێ. ئەوجا ئەو کەسەی جووتە گوێی ژنەڤتنی لێ ڕاوەن بابیبیستێ.

## ١٧

کەشتی ئامادەیەو بۆدوور دەرەتێ.. لەوانەیە بۆ نیرەوی نەمان قەدبر بەرێ کەوێ؛ ئەوجا ئایە تیتاندا هەیە گەرەکی بێ بەرەو نادیاریکی گریمانە ئۆغر بکا؟. کەسیکتان تیدانیە بیەوێ سواری کەشتی‌یە سەراویلکەی مەرگ بێ؛ کەواتە لەپای چی گالە گالتانەو گەرەکتانە لەژیان بیزارو نەبان بن؟!

ئەی کولبووانی ئەم دنیایە کەهیشتا بەخاکی ئەم دنیایە نەبووژاونەتەوە بەلینەکەتان هەر ئەوەندەیە کەشەیدای زەوی بن‌و عاشقی شەکەت بوونتان بن بەدەست زەوی‌یەوە؟!

ئەوەش لچە شۆرەوە بووەکانتان کەئیشتیای خۆلینیان پیوە هەلەرۆسکاوە.. ئەوەش نیگاو تیلی چاوەکانتان کە خەیالی خۆشایەتی‌یەکانی زەوییان تیدا دەجوولیتەوەو هیشتا فەرامۆشتان نەکردوون.

لەسەر زەوی داهینراوی فرە هەیە: بریکیان بۆ سوودو بریکیان بۆ پیوە رابواردنن. هیچ نەبێ لەبەر ئەو داهینراوانە زەویتان خۆش بوێ.. هەر زەوی‌یەو کۆگای وای تیدایە دەلیی ریزەمەمی سینە بەرزانە چ بۆسوودی ژیان بن‌و چ بۆ خۆشنوودیی ژیان بن.

ئەی ماندووبووانی جیهان.. ئەی تەوەزەلەکان! زۆر بەجێیە کەپیستتان بەقامچی داغان بێ.. تا ورەو هیزتان پیدابیتەوە.. ئەگەر ئیوە لەو بی‌هیزانە- نەبن کەزەوییان پیوە ماندووە بێگومان دەبێ لەگرۆی فیلبازو لابازەکان بن یان دەبێ لەدەستەی ئەو تۆلەستینە خۆ لیسەرەوانە بن دەلیی رەوەپشیلەی چاوچنۆک‌و سپلەن، کەئیوە وشک هەلاتن‌و نەجمین‌و خۆداری لە راکەراکەی شادمانی‌دا بکەن هەر ئەوەتان بۆ دەمینیتەوە لەسنووری ((هەبوون)) دەربچن‌و ئاوابن، ئیدی نەمینن.

کەدەردەکە بێ دەرمان بێ ئەوا چارەی نیە، زارا بەش بەخۆی ئاوای لی دەزانێ‌و ئاواش دەکەویتە راسپیری؛ کەواتە دەست لەژیان بشۆن‌و ئاوابن. دانانی شیعریکی دوایینەی هەلبەستیک گرانترە لەهۆنینەوەی چەند شیعریکی نوێ لەنیو قەدی‌یەوە، دانانی سنووریکیش بۆ ژیان پیویستی بە جۆرە ئازایەتی‌یەکە، مانەوە لەژیاندا

هیندە پیویستی پێ نیە. ئەمە شتیکە شاعیرەکان لیی دەزانن‌و پزیشکەکانیش لیی نابەلەد نین.

## ١٨

براینە! هەروەك تەوەزەلی چۆن راسپاردەکانی خۆی نووسیون‌و رای گەیاندوون، لەو سەریشەوە ماندویتی گشت راسپاردەی خۆی تۆمارکردوون‌و رای‌گەیاندوون. لەگەڵ ئەوەشرا کەدەقی هەردووکیان یەکە بەڵام واتاکەیان لیکدی جیاوازە. ئایا شت هەیە هیندەی تەمەلی دڵو دەروون گەندەڵ بکاو پرگی پێ هەڵبهینێ؟

ئا سەیریکی ئەو کابرایە بکەن کەچۆن ورەی بەرداوەو خاوبووەتەوە! کەچی ماوەی نیوان ئەم کابرایەو ئامانجەکەی تەنیا بستیکی ماوە.. بەڵام لەولاوە ماندویتی پەکی خستووە، بێ پەلوپۆ بەسەر لمەوە رەهیلْ بووە.. ئەوەتانێ لەداخانا خیش دەخواتەوە!

ئەوەتا بەدەم هیلاکی‌یەوە باویشك دەدا.. بیزارە لەریگا.. لەنیشانکرد.. تۆ بلێ: بیزارە لەنەفسی خۆی.. بۆیە نایەوێ لەمەولا یەك هەنگاو چیە هەلی‌بهینیتەوە.

خۆرەو بەتیشك تیرەبارانی دەکا.. سەگەلە و دەورەیان داوە.. هەر دین‌و بۆ چلپاندنی ئارەقەی لەشی وزاق دەبەن، ئەویش لاسارانە خۆی داوە بەزەوی‌دا. وای بەلاوە باشترە کەخۆرەتاو بیکاتە خۆڵەمیش‌و تۆزی بدا بەهەوادا.

زۆر شتیکی سەمەرەیە مرۆڤ قولانجیکی بمینێ بگاتە ئامانج‌و لەناوبچێ! کەواتە لەو پالە وابنەون‌و بەتووکی سەری رای‌بکیشن تادەگاتە ئەو بەهەشتەی شەیدای بووە.

بەڵام نەخیر! باشتر وایە ئەو کابرایە لەکوێ‌دا خۆی داوە بەزەوی‌دا وازی لی بهینن، تاوەنەوز دایدەگرێو فریوی دەدا.. تاوەکو هەوریش تنۆکەبارانی فینکی لی دەپرژینێ..

لیی گەرین با بۆخۆی نوقمی خەوبێ.. تا ئەو حەلەی بەئاگادێ.. تا بۆخۆی بەسەر ماندووبووندا زاڵ دەبێ تا دەسەڵاتی دەشکێ بەسەر هەر شتیك‌دا کەفیری ماندووبوونی کردووە.

بەڵام ئێوە بکەونە ویزەی ئەو سەگە خوێرییانەی بە حەپەوە و ئەو خێلە مەگەزەی بەوزەوە گەمارۆیان داوە.. ئەم کەلە هێرەیەش بریتی‌یە لەو دەستە رۆشنبیرانەی خۆراك لەو جوانانە وەردەگرن کەزەنگوڵ زەنگوڵ سەری پالەوانەکان دەیان دەلێنن.

## ١٩

من بەدەوری خۆمدا چەند هێلێك دەکێشم و مەرزێك دەکەمە سنووری پیرۆز، لەبەرئەوەشە چەندە بەرەو لووتکە بەرزەوە بم ژمارەی ئەوانەی لەتەکما بەچیادا هەڵ دەگەرین هەڵ دەوەشێتەوەو ئەداتە کەمایەسی. براینە! وریابن، نەوەك هەوانتە خۆرەکان لەبلندانی‌دا فرست بهێنن و لەنێوتاندا دەسیسە بنێنەوە..

هەوانتەخۆر مەگەزێکەو لەکویی لەش‌دا خانەیەکی نەخۆشی دۆزی‌یەوە خۆراکی خۆی لێ دەستێنێ.. هێندە چوختی‌یە بەرەمەك و غەریز شارەزای شوێن لاوازیتانە.. هەر بەسەلیقە دەرك بەو کاتە دەکا کە زەبرو تینتان دائەهێنرێ، ئەوجا ئەوەندە ناخایەنێ لەبن دەستی بێزاریتان‌داو لەکوێ‌دا –دەماری مەردایەتیتان سست بووە ئەو مەگەزە پیسە هێلانەی تێدادەکا.

ئەو جۆرە مەگەزە چ شوێنێك لەبەهێزان‌داو چ جێگایەك لەدلستانی بەریزو وجاخزادەدا زەدەو لاواز بێ خۆی تێدا دەسەپێنێ.. ئەمە پیشەیەتی: لەهەر سەریکەوە دەردێك دەرکەوت ئەو جۆرە مۆرانەیە دەی‌کاتە پیسەهەوای خۆی.

لەنێو چینەکانی مەردومدا نزمترین تاقم بریتی‌یە لەدەستەی هەوانتە خۆرەکان، ئەم نامەردانە لەسەر حیسابی شەرەفمەندان دەژین و خۆراکیان لێ وەردەگرن؛ کەواتە چۆن زۆرینەی هەوانتە خۆرەکان کەلە هێرە ناکەنە سەر نەفسیك– پەیژەکەی بالارۆبێ و هەر لەخوارترین پلەیەوە تابەرزترین پلەی مەودای بەرین بووبێتە–وە؟.

– نەفسیك بێ و لەبەروماوەی خۆی‌دا بەسەرگەردانی کەوتبێتە راکەراکەو شانی دابێتە بەر هەموو کارە رەهاتیکی لەناکاو..

– نەفسیك بێ و نوقمی زەمانی ئایندە بێ و بەرەو ناخی ویست و حەزەکانی تەکان بدا..

– نەفسیك بێ و لەزاتی خۆی سڵ بکاتەوەو پەناشی بباتە بەرو لەفراوانترین جغزداو لەدوورترین بوارەدا گور بەخۆی‌بدا..

– نەفسیك بێ و گەیشتبێتە ئەوپەری دانایی و بەکاوخۆ پیشەنگی شێتەکان بەلاولۆی‌دا بێن...

– ئەوە نەفسیکە لەسەرووی هەموو شتیکەوە ئاشقی خۆی بووە منزلگاو بالأرۆی هەموو شتەکان بووە.. بۆ گشت کشانەوەو رەوینەوەیەك بەرفراوان بووە.

کەواتە چۆن ناچیزەترین هەوانتە خۆر، خۆیان ناگەیەننە باوە مەزنەکان و بەپاکزاترین دڵو نیهادەوە خۆیان نابەستنەوە؟!

## ٢٠

خۆم بەکابرایەکی دڵرەق نازانم، لەگەڵ ئەوەشدا پیتان دەلیم: ئەگەر هات و بینیتان ئەوا یەکیك شۆر دەبیتەوە بکەویتە خوارەوە ئیوەش بەهەردوو دەست پالیکی پیوە بنین و گەرماوگەرم نەهیلن هەناسەی بەبەردا بیتەوە.

لەم زەمانەدا هەموو شتیك خەریکە دابوەشێ ئەرێ کیت دیتە پیش چاو کەدالدەی شتیك بدا بەرەو خوار شۆرببیتەوە؟. بەش بەخۆم دەمەوێ بکەویتە خوارەوە.

ئەگەر لەلووتکەی بەندەنەکانەوە لەزەتتان لەتاویر بەردانەوە وەرنەگرتووە سەرنجی پیاوانی ئەم زەمانە بدەن کەچۆن بەرەو ناخەکانی من گلۆر دەبنەوە!

من لەهونەری گلۆرکردنەوەدا تاکانەم لەمەولاش کەسی لەمن کارامەتر پەیدا دەبێ بەلأم لەحالی حازردا شوین من بکەون کەنەتان توانی مرۆڤیك فیری فرین بکەن بەلای کەمەوە فیری ئەوەی بکەن خیرا خۆی هەڵبدیرێ.

## ٢١

بەلێ ئازاکانم خۆش دەوین، تەنیا هەر لەبەر ئەوەی کەبەزەبر شمشیر دەوەشینن بەتەواوی بەدلما ناچن، چونکە پیویستە دیسان لەهەڵبژاردنی ئەو کەسانەشدا کەتییان دەسرەوینن کارامەبن.

جار هەیە زاتکردنی تەوا لەجلەوکیشیدایەو جاریش هەیە لەهیز هیشتنەوەدایە بۆ کەسیك کەشیانی هیز پێ بەخشین بێ.

کێ شیانی رق و خەشمە ئەوە بکەنە دوژمنی خۆتان، ئەو کەسەی شانی سووکایەتی هەڵدەگرێ دوژمنایەتی مەکەن و بیبویرن، کەدوژمنایەتی دەکەی دوژمنیکی ئەوتۆ دەستنیشان بکە خۆتی پیوە هەڵبکیشی و بهینێ. کەئەم راسپیرییەتان دەکەم بۆ یەکەم جارەم نیە.

هـيزو برشـتى خۆتـان رابگـرن‌و پەزمـەندەی بكـەن، زۆری لـەو بابەتانـەمان هـەن كەبەلایاندا گوزەرتان كـرد خۆتانیـان لێ هەلـە بكـەن.. بەراسـتی شـانیان هـەڵناگرێ ئاوریـان لێ بدەنـەوە ئەوانـە خیلـە ناوەجـاخیكن دەربـارەی گـەلان هینـدە دەریســن‌و دەهوولینن تا كركراگە گوییی خۆیانی پێ دەرووشینن.

ئـەو دورەگانـە چـەندە بكەونـە بەلگـە ئـاراییی‌و بـرو بیـانوو خسـتنەوە روویـان لێ وەربگیرن، قسەو باسیان بریتی‌یە لەئاویتەیەكی راست‌و چەوت شان بەشانی یەكدی، ئـەو كەسـەی گوییـان لێ بگـرێ دەبـێ شۆرشـیكی غـەزنباك بـەرپابكاو شـەلم كویـرم ناپاریزم بكەویتە ویزەی حەشاماتەكە.. كەواتە زووبەزوو خۆتان بگەیەننە جەنگەڵو دارستان.

وازیش لەشمشیرەكانتان بهینن باخەوتووی نیوكالانەكانیان بن. بـرۆن بە ریگـەی خۆتانەوە.. وازیش لەگەلان بهینن كە ریچكەی خۆیان دەگرنەبەر، چەندەها ریچكەی سامناكن لەتاریكستانی‌دا هەرگیز تروسكەی هیوایان لێ وەدەرناكەوێ!

لەسـەر ئـەو ریچكانـە تـەنیا كوتـاڵ فرۆشـەكان قازانج دەكـەن چونكـە دراوەكانیـان دەتریسـكینەوە ودەورنگینـەوە. ئـەوا سـەرینی شـاهانە بەسـەرچوو، ئـەو تۆپـەڵو بارستانەی پییان دەلین: (گەلان) شیانی سەركردایەتی پاشایان نین.

سەرنجی ئەو نەتەوانـە بـدەن كـەتیكرایان دەوری كوتـاڵفرۆش دەبینـن، لەبـەرچاوە كەلەهەموو كۆنەهەوارو پەرچەجاریكەوە قازانجی چەپەڵ كۆدەكەنەوە. هەر نەتەوەیەك راست ببیتـەوە خـۆی لەنەتەوەیـەكی دیكـە مـەلاس دەداو لاسـایی دەكاتـەوە.. لەگـەڵ ئەوەشـرا هـەموویان لافی (ریزگرتنـی دراوسـێ‌یەتی) لێ ئـەدەن. ئـای چ سـەردەمیكی بەختەوەرانەبوو، ئەوزەمانەی گەلیك لەگەلان رادەپەری‌و خواست‌و ئیرادەی خۆی جار دەدا كەبەسەر گەلانی دیكەدا زاڵبێ!!

براینە! ئەمە قسەمەو دەی بیژم، چونكە كێ باوی هەبێ‌و خاوەن ویست بێ، مـافی خۆیەتی فەرمان رەوا بێ.ئەمە دەستوریكەو لەشوینیك دا زاڵ دەبـێ كـە دەسـتووریكی باوتری تیدا نەبێ كاری پێ بكرێ.

وای بۆ ئەو خەلکە! بیتو بەخۆرایی نانیان بەسەردا ببەشریتەوە کەسیان دەست ناکەویٚ خەشمی خۆیانی پیٚ بریژن. بیتو ئەو خەلکە لەتالیو سەختی ژیان بەدوور بن لەپای چی بەچ قسەو باسیکەوە خۆیان خەریك بکەنو زویرانە دەم بکەنەوە؟

ئەم کۆمەلە ئادەمی‌یە جانەوەری درندەن، کاریان ئالوودەی خۆ لە بۆ سەدانو رافرانە، قازانجیان بەئاینۆ ئۆینو فیلە. ئەوجا کەژیان گیروگازی تیدا نەبیٚ دەبیٚ ئەو مارزانە چۆن چۆنی لەزەتی لی بچیژن؟!

وا دەزانن بالاٚ بوون لەوەدایە کە درندانە گیانەوەرانی دیکە تیکبشکینیٚ؛ چونکە لە باوەری ئەواندا مرۆڤ باشترین درندەیە.

مرۆڤ هەرچی سفەتی گیانەوەرانە وەری گرتووە، هەر لەبەر ئەوەیشە کەبەچاو هەموو گیانەوەرەکانی دیکەوە ژیانی پر لە چەرمەسەریو سەختترە.. بەلاٚم هیشتا هیندە بلند نەبووەتەوە پشت بالندە بکەویٚ وای بۆ ئادەمی کە ئەویش وەك بالندە فیرە فرین بیٚ[31] چونکە نازانیٚ بۆ چ بالندەیەك بەهەلپەو چاچنۆکی یەوە تەکان دەدا؟!

## ٢٣

ئەوەی من گەرەکمە ئەوەیە کەپیاو شایستەی رەنج وتیکۆشان بیٚو ژنیش شایستەی منداڵ بوون بیٚ، ئەوجا بەجووتە شایستەی سەمابن چ لەسەر تەوقی سەرو چ لەسەر نووکی پەنجەپیٚ. با – وادابنیین: هەر رۆژیك تی پەریو ئەگەر بۆ جاریکیش بیٚ—سەمای تیدا نەکەین رۆژیکی لەکیس چووە.. با– وادابنیین هەر راستی‌یەك پیکەنینیك یا حیلکەیەکیش بی– نەخاتە ئەوە بەیانیکی پووچەو راستی نیە.

## ٢٤

---

[31] هەرچەندە بەلای منەوە– ئالانی– مەترسیی نیتشە لەبالاٚبوونو فرین دا لایەنە تەجریدی یەکەیە.. بەلاٚم ئەو مەترسییەی لەو برگەیەدا–دەری بریوە دەق لایەنە بەرجەستەکەی دەگریتەوە. ئەو ئاشقی قربوونی مرۆڤی سەردەمی خۆیەتی. لەوەتی مرۆڤ بەئامیر بووەتە بالەفر، ئەوەندەی خیری بلند کردەوەو کاری ئاسان کرد دوو ئەوەندەش لەبلندانی‌یەوە مەرگبارانی جانەوەرو گیانداره ژیرەکەی کرد، هەر لەبلندانی‌یەوە هەموو زەوی هیناوەتە لەرزەو نالین.

لەهەموو مارە برینیك دا وشیاربن بەوردی پاریزی بەرنیَو نابەكامانە پەلەی تیدا مەكەن؛ دەنا هەر ئەوەتان بۆ دەمینیتەوە كە هەلی بوەسیننەوە.. سەرەرای ئەوەش لیك ترازان گەلی باشترە لەوەی بە روالەتو فروفیل باری ژنو میردایەتی رابكیشن.

ئافرەتیك پیی گوتم: ((كاتیك فریا كەوتم كۆتی شووكردنم ببپسینم ئەو كۆتە ژیانمی ویران كردبوو))

ئەوەی دەیبیستم: هەر ژنو میردیك هاوشان نەبوو بن، پەرۆشی رق و تۆلەیان تیدا هەلّ گیرساوە، نەفرەت و لابەلووتی یان لەیەكدی بووەتەمایەی دوژمنایەتی تەنانەت لەگەلّ خەلكو خوادا ، كار بە ئەوەندەوە نەوەستاوە ناحەزییەكەیان سەركاو یەخەی كەسانی دی نەگریَ.

پیویستە خەمخۆرەكان باوەریان بەراستیی ئەو شتە بیَ كەهەستی پیَدەكەن، هیزو تواناشیان بخەنەكار لەپیناو پاریزگاریی سۆزو پەرۆشیان دا، نەوەك دەست خەرۆی شتیكی بەلین پیَ دراوبنو لەبنجوبناوانەكەیدا رۆنەچووبن.. با داوای ئەوەبكەن تاماوەیەك بەیەكەوە بن، بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا متمانە بەیەكدی بكەن .. تابتوانن بەدریژایی ژیان بەیەكەوە باشار بكەن.. چونكە ئەمە كاریكی هیندە ئاسان نیە بەدریژایی ژیان دووان بەیەكەوە هەلّ بكەنو پیكەوە بگونجین!

ئەمە راسپیریمە بۆ گشت دلّسۆزو خەمخۆریك.. ئەگەر راسپاردەكەم بیجگەی ئەمەبیَ مانای وایە نەمرۆڤی بالاّم خۆش ویستووە. نەئەوەشم خۆش دەویَ كە لەزەمانی ئایندەدا چاوەروانی دەكەم.

وە نەبیَ ئەركی ئیوە هەر ئەوەبیَ بەزاوزیَ سۆرە وتۆرەی فرەبخەنەوە، بەلكو ئەوەشتان لەسەرە بلند هەلّ بكشین كەواتە با بەهەشتی هاوسەریتان دەروازەی بالاّ رۆبیَ بەرەو لووتكە.

## ٢٥

تەنیا ئەوانەی لە رووداوەكانی زەمانی دیرین دا بەتاقی كردنەوەدا هاتوون دەرك بەوەدەكەن رووداوەكانی زەمانی ئایندەش لەسەر چاوە گرنگەكانەوە هەلّ دەقولین.

براینە! زەمانە هیندە ناخایەنیَو گەلانی تازەگی پەیدادەبن، لەدیارو نادیاری ناخەكانیشەوە هۆنەهۆن سەرچاوەكان دەتەقنەوە.

زەوی کە دەکەویتە هەژان و ئاوە هەڵ قولیوەکان هەڵ دلووشێ، تادێ ژمارەی تینوەکانی پەرەدەستینێ.. بەڵام لەهەمان کات دا زەوی هێزی شاراوەو زۆرینەی نهینی یەکانی فرێ دەداتە بەر رووناکی. لەقوڵاییەکانیشەوە بەتاوی بوومەلەرزە سەرچاوەی تازە دەردە پڕژێنە سەر رووکاری زەوی . هەر کە زەوی بەگەلە دیرینەکانییەوە ژێرەو زەبەربوو ئەوسەرچاوانە بەتەواوی دەتەقنەوەو هاژەدەکەن.

لەوکاتەدا بیت و کابرایەك راستەوخۆ بێ و بانگ بکا: خەلکینە وەرن! ئەوا لێرە سەرچاوەیەك هەل قولیوەو تینوەکان ئاواشتە دەکاو دلەزەبوونەکان گورج دەکاتەوەو بێ ورەو ئیرادەکان توندو تۆڵ دەکاتەوە– هەرچی گەل هەیە– بەتەمای تاقی کردنەوە هرووژم دەهینێ، بۆیەش هیندە حەزیان لەتاقی کردنەوەیە تابزانن کییان فەرماندارو بەرفەرمان بێ. ئەمەش هەوڵ دانیکە لەبواری تاقی کردنەوەو پشکنین و راویژو بەرەنجامی یەوە دەشێ زۆر بخایەنێ!

ئەو شتەی کۆمەلگای مرۆڤ لەنگەری لەسەر دەگرێ بریتی یە لەهەول دان و ئەزموون.. بریتی نیە لە رژیمیك کەزادەی بریارە، ئەمە پەیرەومەو مەردومی پێ فیردەکەم. ئامانجیش لەو هەوڵ دانەدا هەبوونی کەسیك لە فەرمانداریدا لیزان بی.

براینە! هەر قسەیەك کانگاکەی دلی داهینراوو بیری کۆلەواربێ کەریگای ئامانج گرو بنەبر نەگریتە بەر ئیوە گویی پێ مەدەن و خۆتانی لی لابدەن.

## ٢٦

براینە! دەبێ ئەنگیزی گەورە کەدوارۆژی مرۆڤایەتی دەخاتە مەترسی یەوە لەکوێ خۆی حەشاردابێ؟

من دەزانم: کە ئەو مەترسی یە لەنیهادی کارسازو دادوەران دا خۆی پەنا داوە؛ چونکە هەر گرۆیەك کە دەلین: ((ئیمە شارەزای کارسازی و دادوەرین و شتیکی ئەوتون کە تەنیا لەبوخچەی نیهادی ئیمەدا گرێ دراون؛ ئەوجا خاك بەسە ئەو کەسەی لەو شتە شاراوەیەی لەمەر ئیمە دەگەرێ!))

ئەو زیانەی بەدكاران دەی قەومینن بەرابەری ئەو زیانە نیە كە خێرخوایان دەی قەومینن، چونكە قەومانی ئەمان لەخەلك دا كاریگەر ترە بەچاو كەتنی تەشقەلە چییەكانەوە.

براینە! رۆژیكیان كابرایەك لەنیهادیكارسازو دادوەرەكانی نۆڕیو گوتی: ((هەبێ و نەبێ ئەمانە ریابازن)) كەس لەقسەی ئەم كابرایە تی نەگەیشت، كارسازو دادوەرەكانیش چونكە هۆش داخراوبوون هەر تیی نەگەیشتن. گەوجایەتی كارسازان پەندیكی ئەوتۆیە بەراستی بۆ كەس دەرنەكەوتووە بەلام دەبێ هەر بە ((فریسی))یەكان = منافقەكان ناودیربن وایان پێ براوە هەر كەسیك ئاكاریكی پەسند بۆ خۆی بخولقینێ ئەوانە چوار میخەی بكیشن . ئەمە راستییەكەو هیچ گومانیتیدا نیە.

كابرایەكی دی هاتو كەوتە پشكنینی كانگای صالحانو عادلان.. ئەوجا زەمینەی نیهادی ئەوانی بۆ دەركەوتو ئەم پرسیارو وەلامەی هینایە گۆڕێ:

—دەبێ ئەوانە ئەوپەری خەشمی خۆیان بەكێ بریژن؟

بەچاو هەموو ئادەمییانەوە رقی خۆیان بەداهین دەریژن؛ چونكە بەلایانەوە داهین كەتنبازیكی ئەو تۆیە هەرچی لەوحەی كۆنە راسپاردەكان هەیە وردو خاشی دەكا.

بەرەی كارسازو صالحان لەداهینانەدا كۆلەوارن ئەمانە بریتین لە (بەرایی كۆتایی) كەواتە ئەگەر كەسیك دەستی دایە (كەندە)و راسپاردە تازەكانی لەسەر لەوحە تازەكان هەلكەند، ئەوجا كارسازەكان ملی ئەو كابرایەیان كرد بەپەتەوە بەلایەنەوە رووداویكی بەرئاسایە. چ دواڕۆژی خۆیان بەخت بكەنو چ دوا رۆژی هەمووجیهانییان بەخت بكەن ئەوە بەلایانەوە كارەكە بەرئاسایە.

ئەی ئەوە نیە لەهەموو سەردەمیكی رۆژگاردا بەری چاكەخوازو صالحان هەر (بەرایی كۆتایی) بوون [٣٢]

---

[٣٢] سەیرە نیتشەی هاوریمان دان بەوەدا دەنێ كە (عیسا) درودی خوای لی بێ لەخراپەی ئەوكەسانەی بەكارسازو دادوەری ناوهیناون یاخی بووە.. ئەی ئەوەنیە بەشیون كەوتنی ئەو سامی نەژادە زەبوونەوە خۆی دەنوینێ؟ ویرای ئەوەش لیرەدا عیسائیش ناروخینێ.. بەلكو كارەكان تەواو دەكا ئەو بۆ ئەوە نەهاتووە لەوحەی راسپاردەكان تیك بشكینێ بۆ ئەوەش

## ٢٧

ئەریٚ براینە! لەم قسەیەم‌و لەوەی دەربارەی دواین مرۆڤەوە هیچی لێ تیگەیشتن؟

ئەی ئەوەتان بۆ دەرنەکەوتووە کەمەترسی گەورە بۆ ئایندەی مرۆڤایەی لەبیرو باوەری کارسازان‌و دادوەران دا خۆی حەشارداوە؟

دەی راپەرن! ئەوان لەکەولی صالحان‌و عادلان دا خۆیان مت داوە تەرتو تونایان بکەن ئەو سا دەتوانن لەمانی ئەم وتەیەش تیٚ بگەن.

## ٢٨

لەبەرچاومە کارخاس‌و فریوکارەکان بەحالەتی ئاسایشە درۆزنە بروبیانووتان بۆ دەهیننەوە.. کە رووبەرووی درۆکانیان دەبووەوە هیشتا مندال‌و فەریك بوون، بۆیە درۆتان کردە پەناگاو لیی نەپسانەوە.

براینە! تاگالم نەدان لەوحەکان تیك بشکینن‌و کارسازان برووخینن کەشتی مرۆڤم بەرەو گیژاو تەك نەدا، ئەوەتانیٚ ترسیکی بیٚئەندازە لەو کەسە نیشتووە کەپالم پیوە ناوە بە گیژاوەکەدا گوزەربکا.. ئەوەتا تاچاوی بەقوول دا چوون‌و گیژەنی دەریاش دەی هینیٚ‌و دەی با!

((هەمموو شتیکیان شیواندو لەریشەوە خراپیان کرد)).

وەلی ئەو کەسەی مرۆڤی دۆزی‌یەوە دۆزینەوەی دوا رۆژی مرۆڤایەتیشی لەدەست نەداوە .. دەی برا دەریاوانە جەربەزکان بتان بینم بۆ پیشەوە تیٚ هەلٚ بکەین‌و بەرزەك‌و کلەوی دەریا دربدەین، دەستەو یەخەی شەپۆلە کەفچرینەکان بوەستینەوە.. دەی لەسەر بەریانیکی ریك‌و رەوان فیرە رەوت بن، دەی لیٚ مەوەستین چونکە زۆری وا هەن پیٚ ویستیان بەئیوەی پیشەوا هەیە.

---

نەهاتووە وەك نیتشە مەبەستی‌یەتی ئاکار پەسندی هەر بۆ خودی خۆی دابهینیٚ عیسا بۆ ئەوە هاتووە منارەی رەوشت‌و ئاکار پەسندی بلند بکاتەوە لەپیناو رینمایی هەموو مەردوم دا. *ف

ئەوا دەریا هەڵچووەو هەموو شتێکیش لەدەریادا هەیە دەی بەرزە ویست، ورەی پتەو، هێمەتی مەردانەی دەریاوانە چاوقایمەکان بۆ پێشەوە تەکان بدەن.

پەلامار دەدەین و دەربایستی هیچ ڕووداوێک نین.. ئێمە بایەوانی کەشتییەکان ڕەهادەکەین و بەرەو نیشتمانی ڕۆڵەکانمان ئۆغر دەکەین کەدەکەوێتە ئەودیو گێژاوی دەریاوە.. ئا لەو شوێنەدا کە حەزە شێت و هەڵ چووەکانمان گەواڵە بە گەواڵە بەیەکدا دەدەن و دەی کەنە کەفچرینێک ئەو سەری دیارنەبێ!

## ٢٩
## رۆژێکیان خەلوز بە ئەلماسی گوت:

((ئەم سەختیەت لەکوێ هاوردووە، خۆ هەردووکمان خزمین؟!)) منیش پێتان دەلیم: ئەرێ براینە ئەم خاویەتان لەکوێوە بۆ پەیدا بوو؟.. ئەم نەرمی‌یەتان لەپای چی‌یە؟.. ئەم توانەوەیەتان لەبەر چی‌یە؟.

کوا خۆ چەسپاندنەکەی تویی نیهادتان.. کوا دیربەندی هێزو بەهێزتان.. ئەو هیلانەی بۆ توانستی ئیوە کیشرابوون بە چ لایەك دا تییان تەقاندو لەگلینەکانتان دا رەش بوونەوەو دەرنەکەوتن؟!

بیت‌وئیوە ورەی تەواوەتی بەربدەن کەی رۆژێ لەرۆژان بەتەمای زەفەرمەندی دەبن لەتەکم دا، یان ئەگەر ورەو زاتتان وەك شمشیری برندە نەبرسکیتەوە چۆن بۆتان دەرەخسێ لەداهینان دا بەشداریم بکەن؟

دەبی داهین هەروەها سەخت‌و توند بی؟.. ئایە پێ‌خۆشحالی لەوە مەزنتر هەیە کەجێ دەستتان بەسەر تۆمارو لاپەرەی سەدەکانەوە- وەك مۆری سەر پارچە میو زەق‌ونمایان بێ؟

بەراستی کەیف پێ هاتنی مەزن لەوەدایە کە مرۆڤ لەسەر ویستی هەزاران بەرەبابەوە بنووسێ‌و مۆرە دەستی پیوە دیاربی.. بەرەبابەکانیش چونکە شەرفمەندن لەسەخت بەهیزترن چونکە هەر شتیك شکۆمەند بێ لەهەموو شتیك سەختترە. ئەوا من بەژوور سەرتانەوە لەوحەی ئەم راسپاردەیە هەڵ دەواسم: (خۆتان بەتوندو تۆلی بخەملینن)).

## ٣٠

ئەی ویستەکەی لەمەر خۆم! کاتی ئەوەمان هاتووە سنووریك بۆ شتە بچووکەکان دابنیین.. بەتەنێ تۆ خواستی منی.. بەتەنێ تۆ پرسیارو مەبەستی منی؛ کەواتە لەهەموو خوردە سەرکەوتنیکی بی بایەخ‌و ناچیزە قوتارم بکە.

تۆش ئەی ریکەوت کە بەچارەنووس و بریاری خۆمت دەزانم، لەخودی من داو بەژوور زاتی منەوە خۆت هەڵ ناوە.. ئاگات لیم بی‌و بەرامبەر هەموو شتیك‌و کارەساتی گەورە نەفسی من رابگرە.

ئەی ویست! دوا چۆری مەزنایەتیت بۆ دوایینە بهیلەرەوە تا لەکاتی سەرکەوتنتا لاواز نەبی.. کەسیش نیە بگاتە ئاستی سەرکەوتن و نەگلی.

ئەی داخەکەم! چ چاویك لەو پەری زەفەرمەندیدا تاریك و لیلە شەو کویری نەکردبێ..!

ئەی داخەکەم! چ پێیەك لەساتی سەرکەوتن دا هەڵ نەتریزا بێ و لارێ نەبووبێ..!

بۆیە خۆم ئامادە دەکەم تا گەیوە تاویك بم بۆ نیوەرۆی مەزن.. ئەوەتا نەفسەکەی خۆم دەبینم نەرمەوە بووی ئاگرە بۆ حالەتی تێ چەسپان = (الانطباع).. هەوریکی بەژانەوە بوویەو دەی کاتە شرخەو چەخماخە.. گوانیکی سوور هەڵ گەراوەو شیری خۆی دەخوشینێ و دەردەپژینێ.

گەرەکمە زاتی خۆم و ناخی ویستی خۆم تیك بنیم.. ئەوجا وەك کەوان بەتاسەوە بەسەر تیری خۆمەوە داچەمیم و لەئامیزی بگرم.. نەخیر ئەو تیرەم کەبەشەوقەوە بەرەو ستارەی خۆی باڵ دەگریتەوە ..

گەرەکمە ببمە ئەستیرەیەکی پرتەو لەنیوەرۆی مەزن دا.. کەچی کەیف پێ هاتنەوە دیت و دەی هەژینی.. تیری ئاسمانی‌یەو دەی سمێ تاوەکو نەمینی..

گەرەکمە ببمە خۆرو خۆریش لەق نابێ .. ئەوجا خۆم دەپیچمەوە لە ئاسۆی سەرکەوتن دا بپووکیمەوە.

ئەمەیە کەبەتەمایم، ئەی ویستەکەم!.. بابۆ هەموو گچکەیەك سنووریك دابنیین.. ئەی ویستەکەم! هەر تۆ مەبەستمی؛ دەئاگات لیم بێ بۆسەرکەوتنی مەزن.

## چاکەوەبوون

١

کەزارا گەرایەوە ئەشکەوتەکەی و ئارامی تیدا گرت زۆری پینەچوو تا رۆژیکان وەك پەتەری لەنیو پیخەفەکەی دەرپەری و دەستی کردبە نەرەو جرتو جۆپ، چۆن کەسیکی غەریبە لەنیو جیگاکەی خۆی مت دابێ ئاوا دەیقیراندو پەنجەی لی رادەوەشاند دەری بکا.

(ئاوا تووشی دوانە کیتی بوبوو) تەنانەت بەم هاتوهاوارە جووتە گیاندارەکەشی لەسەر تاقی ئەشکەوتەکەیەوە تەرە بوون، ئیدی لەژوور سەرییەوە کەوتنە چەرخە..

کار بەهیندەشەوە نەوەستا جانەوەرەکانی دیکەش سەریان لێ تیک چوو، کەوتنە راخزینو باڵە فڕیو وزاق دانو دوور کەوتنەوە.

زارا لەو هەڵویستەی خۆیدا مایەوەو گوتی: ئادەی بیرۆکەی نایابو راچەنیو لە قوڵاییەکانی زاتی خۆمەوە راستەوەبە. من سپیدەیەکم بۆ تۆ..

کەلەشیر ئاسا روون بوونەوەی تۆم جاردا.. کەچی هیشتا وەك ئەژدەر خۆت داوە بەزەویدا، گویێیەکانت بکەرەوەو ببیستە، چونکە دەمەویێ دەنگی خۆتم بۆ رەها بکەی.. دەی زووکەو راپەرە!.. گویت بکەرەوە! هەورە تریشقەی وەها لەگۆڕێ دایە تەنانەت گۆڕستانیش فیرە بیستن دەکا .

دەی چاوەکانت هەڵ بگلۆفەو هەر چیەکی دەیلیم بەهەردوو چاوت بیبیستە. دەنگیکم هەیە تەماشا بەخشە تەنانەت بەوکەسانەش کەکویری داکزان بیتو یەك جار وشیار ببیتەوە ئیدی خەودات ناگریتەوە چونکە من وەها نەحەملاوم کۆنە باوان خەبەربکەمەوەو ریگەشیان بدەم خەوە خۆشەکەیان بابدەنەوە.

بیرۆکەی نایابم! چاوی لیتە دەجوولییتەوەو باویشك ئەدەی؛ کەواتە راستەوەبەو قسە بکە.. لەگەڵ تۆمە! زارا بانگت دەکا؛ ئەو کەسەی رات دەپەرینێ زارای بێدینە.

من زارامو زیندەگانی تابینادەکەمەوە.. ئازار دەمەزەرد دەکەمەوە.. چەرخی ئەبەدی جەخت دەکەمەوە ئەی بیرۆکەی قووڵو سەرتۆپی هەموو بیرەکانم! بانگی تۆ دەکەم..تۆ ئای خۆشی لەخۆم! ئەوا چاوم لیتە: دییتە بەرەوە، ئا ئەوە منم کە گویم لە دۆزەخەی خۆمە.. دواینەی ناخەکانیشم بەرەو نوور خۆی هەڵتەك داوە ئای کە دلخۆشم! ئادەی بیرە نایابەکەم بیرەپیشەوە.. بۆلای خۆم، ئادەی دەستت بینە!

نا.. نا.. بیگیرەرەوە دواوە.. ئای لەم ناخۆشییە.. وای بۆ بەدبەختیی خۆم!

## ٢

هەر ئەوەندە زارا ئەو قسانەی درکاندن وەك مردوو کەوت بەسەر زەویدا و بۆماوەیەکی زۆر بیهۆش بوو. دواتر مەترسیی نیشتەوە و چەقۆچۆ دایگرت و دەموچاوی بزرکاو حەوت رۆژ بەبێ خواردن و خواردنەوە لەسەر جیگا کەوت. دووجانەوەرە یاوەرەکانیشی بەجییان نەهیشت، بەڵام هەڵۆکەی دەگەرا خۆراکی بۆ پەیدا بکا– تا جۆرەها پاقلە و میوەی لە دەور هەڵدایەوە، جاریکیشیان زۆر

بەزەحمەت توانی لەوکاتەدا کە شوانی میگەلیك خەوتبوو دوو بەرخۆلەی لیبفرینێ، ئید دوابەدوا دایان هاتێ و فرییدانە بەردەمی.

دوای حەوت رۆژە زارا لەسەر خەوگاکەی دانیشت و سیویکی گرتە دەستی و بۆنەکەی هەلمژی، دوو جانەوەرەکەشی خەیالیان کردەوە ئەوا کات لەنزیك بوونەوەدایە ئەوجا پییان گوت:

زارا! ئەوا حەوت رۆژ تێ پەری و هیمان چاوت قورسن. ئەری کاتی راپەرینت نەهاتووە؟ لە ئەشکەوتەکەی بیرە دەرێ، شتەکان بەتاسەتەوەن: هەوا بە بەرامەوە دەت ئەنگیوێ.. گوڵالەکان شەیدای دیدارتن.. هەموو شتیك بەعەزرەتەوەیە زووبە زوو چارەسەرت بکاو چاکەوەبی.

ئایە متمانەی تازەت بۆ پەیدا بووە کە قورسایی خستبیتە سەرشانت و شەکەتی کردبی و هەویر ترشەکەشی کاری خۆی تیکردبێ؟ لەبەرچاومانی وەك هەویری پف هەڵاتوو خپ بووی.. هەستمان پی کردی کەگیانت لە قەبرغەکانتەوە دەردەفرتی.

زارا وەڵامی دانەوە: جانەوەرەکانم ئیوە چەنابازیی خۆتان بکەن، بەڵام وازم لی بیرن با گوێ بۆ ئەو گیانە رادیرم ورەی خۆمی پێ بەتین بکەم.. چەنەبازیی و ریسە ئەم جیهانەم لی دەکاتە باخیکی ئەوتۆ ئەم سەرو ئەو سەری دیار نەبێ.

سەرجەمی شیرینایەتی لە وشەگەل و دەنگەکان دا خۆی پەنهان داوە کەبریتین لە ریزە پردی وەهم و ئەندیشە و لەنیوان بوونەوەرە دابراوەکان دا تا ئەبەد دریژ دەبنەوە.

هەموو نەفسیك جیهانی خۆی هەیەو لەنەفسیکی کەدا جیانیکی دیکە بەدی دەکا، چەند لیك چوون لەنیوان شتەکان پتربێ تەفرەی سەرابیش لەنیوانیان دا پتر دەبێ، کام تەنگانە بەرتەسکتر بێ لی دەربازبوونی سەختترە.

من نازانم چۆن دەشێ شت هەبێ و لە من دا نەبی؟ یان بۆ چی ((من) لەزاتی (خۆم)دا نەبێ؟.. چونکە خۆنەچەسپاندن کاریکی خوددارانەوە نەشیاوە، تیکرای دەنگەکانیش ئەم راستییەمان لەبیر دەبەنەوە، بۆ ئیمەش واباشترە کە بتوانین لەبیریان بکەین.

کە دەنگ و ناو درانە مرۆڤ لەپیناو ئەوەدابووە ورەی ئادەمیزادیان پێ قایم بێ.. قسەو زمانیش هەر ئەو شیتایەتییەیە کەبەشی خۆ لەزەتی خۆی هەیە، ئەی ئەوەنیە مرۆڤ قسە رەوانی خۆی بەسەر هەموو شتیکەوە دەخاتەسەما؟!

ئای کە وشەکان بەلەزەتن.. ئای کە دەنگە فریو دەرەکان خۆشن!.. ئەوەتان بەسەر هەموو رەنگەکانی پەلکە زیرینەوە سەما بەخۆشەویستیمان دەکەن.

جووتە جانەوەر هاتنە وەڵام:

هەرکەسیك هۆشی ئیمەی هەبێ وا دەبینێ کە شتەکان بۆ نەفسی خۆیان سەمادەکەن چونکە سەرجەمی شتەکان دینە سەر شانۆیهەبوونو دەست لەنیو دەست دەی کەنە پیکەنینو دەکشینەوە دواو پاشان دینەوە.

هەموو شتێ دەرواو هەمووشی دەگەریتەوە.. چەرخی گەردوونیش تا ئەبەد دەسووریتەوە.

هەمووشتێ دەمرێو هەمووشتێ دیتەوە.. لەگەڵ سوورگەی هەبوون دا گولی شتەکان نوورانی دەبن دواییان نایە. شتەکان تەرتوتونادەبن، بۆ تازە کردنەوەی بنیادی هەبوون دەگەرینەوەو ساریژ دەبن.. بەکاوخۆ لیکدەترازین؛ ئەوجا کاتی خۆبەدەستەوەدانە، ئالقەبەندی گەردوون تاهەتایە پاریزگاری خۆیەتی.

هەبوون لەهەموو تروکەیەك دا دەست پێ دەکا. ئەوجا لەسەر تەوەری ((لیرە)) گیراوگیر گەوی ئاسمانەکان (لەوێ) دەکرینەوە.. تەوەریش لەهەموو شوینیك چەقی خۆی وەردەگرێ..ریگای ئەبەدیش هەموو پلەو پیچە.

بزەیەك پەریە سەر لیوی زاراو گوتی:

ئای کەچەتوونن! باش باش ئەوەدەزانن کەچی بریاردراوە لەحەوت رۆژدا تەواو بکرێ.. ئای چۆن رمووزنیك خزایە گالۆکمەوە تا هەناسەم لەبەربڕێ! بەڵام من ددانم لی گیر کردنو سەرەکەیم قرتاندو بۆ دوور تفم کردەوە، ئیوەش هاتوون وەك خۆی لی بکەنەوە؟!

ئیستاش هیندەم قەپ لی داگرتو تفم کردەوە هیلاكو ماندووبووم.. لەئەنجامی ژانو ژارەوە– وەك بەراویتە نەخۆشم

دووجانەوەرەکەم! ئەوا هەموو شتیکتان بەچاوی خۆتان بینی.. گەرەکتان بوو ئادەمی ئاسا لەزەت لەئازارەکانم وەربگرن، ئەی نازانن کە مرۆڤ لەم بوونەوەرەدا دڵ رەقترین جانەوەرە، کاتیك دەحەجمێ کەتەماشای دیمەنی حەسرەتناكو سەرەگاو ئەشکەنجە بکا؟..

لەو رۆژەوە مرۆڤ لەزەتی لەبەهەشتی ئەم زەمینەی بینیوە کە دۆزەخی فەراهەم هیناوە.

ئەگەر پیاویکی مەزن هاواری لی هەلسا خیرا بچوکیك دێ بەدەنگیەوەو لەوانەیشە گۆلەزمانی حەسوودی لەلالغاوەیەوە خۆی دا هیلێ.. کەچی ئەم حەسوودییەشی بەمیهرەبانی و بەزەیی پیدا هاتنەوە ناودەبا؟!

سەرنجی گچکە مەردومەکان بدەن بەتایبەت شاعیرەکانیان کەچۆن بەر رەوانبیژی ئاگرینەوە سکالا لەدەست رۆژگارو لەدەست گەردانی زەمانە دەکەن.. هەر ئەوەندە گوێ بۆ ئەم هەڵ نووزانە شل بکەی کرکەی خۆشایەتی هیچ سکالأبەندیکت لەدەست ناچیٚ و گویی بۆ کلۆر دەکەی.

ژیان بەغەمزەو نازەوە چاو لەوکەسە دادەگرێ کە پیشەی سکالأیە.. کاری تێ دەکاو پیی دەلێ: تۆ دلدارەکەی لەمەر خۆمی؛ کەواتە ساتە نیگایەك چاوەروانم بە تا خۆمت بۆ تەرخان بکەم.

هیچ حەیوانیك هیندەی مرۆڤ دەرهەق بەخۆی دڵ رەق نیە. هەر کەگویت لەنالەو کروزانەوەی ئەو کەسانەوە بوو کەخۆیان بەگوناهبارو خاچ هەڵ گرو تۆبەکار ناو دەبەن، لەو سکالأو فیغانەیان دا پرمە هەوەسی لەزتمەند دەبیستی.

تۆ بلێی لەو قسانەمرا مەبەستم ئەوەبێ کە لەدەست مرۆڤ سکالأبکەم؟ ئەی ئاشقە مارو هەلۆکەی لەمەرخۆم! لەنیو ئەم مەردومگەلەدا بەرپابوونی شەری گەورە لەپیناو خیری گەورەدا کاریکی پیویستە. ئەوەی تا ئیستا فیری بووم هەر ئەمەیەو هیچی دی.

لەهیزی ئادەمی‌دا خراپەی گەورە شتیکی پەسندەو سەختە بەردیکە بۆ لی داتاشینی داهین. مرۆڤیش پی‌ویستە لەچاکەو خراپەی خۆی دا برەخسێ و کامڵ بێ.

من خاچیکم بەملی خۆم دا بەرەداوەتەوەو بڕۆم‌و بزانم لەنیو ئەم خەلکەدا کێ بەدکارە.. بەلکو راوەستاوم‌و هاواری شتیك دەکەم کەس باسی نەکردووە، کەدەلیم: ((داخەکەم بۆ ئەوەی کە گەورەترین خراپەو گەورەترین چاکەی مرۆڤ هیشتا لەم گچکایەتییەدا نەیان گواستۆتەوە!))

راستی یەکەی- سووکایەتی و سووك بینیم بۆ ئەم خەلکە ماریکەو لەقورگم دا گینگلە ئەداو هاکا بم خنکینێ.. بەچەشنی هەوالی کابرای نجومگەر..لەوانەیە هەناسەم لەبەر ببرێ کەپیش بینی کرد:

((شتەکان تیکرا یەکسانن.. شتێ نیە لەگۆڕێدا شیانی مشوورخواردن بێ.. ماریفەت و زانیاریش داخوازە کانیان دەخنکینن.))

ئاوا دیتم کە شەوەزەنگ دەرەویتەوەو دەنگیکی پر لەماتەمینی و شەکەت دەت گوت نووزەی سەرخۆشە لەگیانەلادا، پیی رادەگەیاندم:

خول بەدوای خول داو تا هەتایە ئەو مرۆڤە پەیدا دەبیتەوە دیتەوە کە تۆماندوو دەکا: ئەویش ((مرۆڤی گچکەیە)).

خەفەتەکەی من ئەوەبو کە بەتاریکی دا پیچیداو تێهەڵ کشا.. خەوی لی زراندم و دیتم: زەمینەی ئەم ئادەمزادە لەبەر دەمم دا- دەگۆڕێ و دەبیتە ئەشکەوتیکی وراق و هەموو زیندەیەك دەگوشێ بە سنگ و بەرۆکیەوە.. هەموو شتیکم لەبەرچاو بوو بەدارو پەردوو.. بەسەرە نویلك و ئیسك و پلووسکی پەناپەسیوە داروخاوەکانی سەدان سالە. پرمەی هەناسەم بەنیو گۆڕەکان دا کەوتە هاتوچۆ.. فرکانی دەبەستە گۆڕیچەی ئەو مەردومگەلەو خۆی پیوە دەنووساند.. تەقازا وابوو کەبەجیمان نەهیلێ.. بەشیوەن و زاری شەو مایەوە، سکالای دەکردو شەوو رۆژ دەی گوتەوە:

((داخەکەم، دوایی ئەم مرۆڤە سەر هەڵ دەداتەوە.. بەلێ مرۆڤی گچکە سوور لەدوای سوور تاهەتایە دیتەوە))

لەوەپیش مرۆڤم دیوە.. گەورەو گچکەیانم دیون، سەیر لەوەدایە کە گەورەکانیشیان هەر لەگچکەکانیان دەچن! تیکراشیان لەبەشەریتی خۆشیانەوە گلاون..

ئای کە هەرە گەورەیان چەند گچکەیە! بەدبەختی لەوەدایە هەروەها بەگچکەیی سەر هەڵ بدەنەوە.. تۆ بلیی بەم کارو گەردانەی هەبوونەوە هیلاك نەبم؟!

زارا گوریدا بەخۆی و دەستی پیکردەوە: ((ئای کە ناخۆشە.. ئای کەناخۆشە.. ئای کەناخۆشە! بەهەناسە سواریەوە راژەنی دەردو ئازاری خۆی بیرکەوتنەوە))

ئاشقە مارو هەلۆکەی قسەیان پی بری و گوتیان: (ها کابرای چاکەوەبوو! قسەمەکەو گویمان لی بگرە: ئا لیرە برۆ تادەگەیتە ئەو شوینەی لەوێ دنیا لە باخاتی

خۆی دا چاوەنۆڕتە. بڕۆرە نيو مەلۆی گولآنی ئاوەدان بەچلاوچلی هەنگو حاقووی کۆتران، لەویێ تير بەديار پۆلە بالندەی خۆش ئاوازەوە گویێ بگرەو لەوانەوە فيری سروود چرين بە.. خاسەوە بووەکان پيويستيان بە لاوژەو ئاوازە، ئەوانەی بەنۆشەوە دەنازن قسە دەبيژن..

کەتێ هەلکەونە گۆرانيش ئەوەی چاکەوە بووەکان دەی لاويژينن ئەوان نايلينەوە، بەلکو باری لێ دەگۆرن.

زارا گوتی: گەوجينە بێ دەنگ بن! واديارە ئەو راوەنگويـنو خۆشانیيەی بەحەوت رۆژ بۆ خۆمم بەدەست هينا ئيوە پيتان زانیبێ.. لەمەولايش دەگەريمەوە سەر ئەو سروودەی بۆ ئەوشيرينی يەم بنياد نا، ئەوجا بۆخۆم پيی چاك دەبمەوە. ئەوە ديسان گەرەکتانە واز لەم کارەم بهينم؟!

جووتە جانەوەر کرديانە هەرا: قسە مەکە، ئەوەت لەبيرچووەتەوە کە چاك بوويتەوە؟ خيرا تاريکی نویێ بۆ خۆت سازبگە؛ چونکە بەتاری کۆن سروودی تازت پیێ لێ نادرێ.

زارا! تۆ گۆرانی خۆت بچرە.. با وەك گەردەلوول نرکەی بی.. خۆتی پێ چاك بکەرەوەو چارەنووسی خۆتی پێ راپەرينە. لەپيش تۆدا کەسيکی دی ئەمەی لە قەبەلْ نەنووسراوە.

زارا! جانەوەری لەمەرخۆت باشت دەناسنو دەش زانن کەچيت لێدێو چی دەبێ. تۆ پەيامبەريکیو جارت داوە کە هاتنەوەی شتەکان دووبارەيەکی ئەبەدیيە، هەر لە ئيستاوە ئەمەت لەچارە نووسراوە کە يەکەم کەس بی بۆ بلآوکردنەوەی ئەم پەيرەوە، لە بەلگەبەندو مەترسیدا کاريك تەياری خۆتە. زارا، لەگەلْ تۆمانە! دەستوورکاری يەکت بەلامانەوە شتيکی نامۆنيە. ئەوەتا دەليی : هەرچی شت هەيە تا هەتايە ديتو دەگەريتەوە.. ئيمەيش لەتەکيان دا هەر دەگەرينەوە.. ئەوەتانێ دەليی لەمەو بەرو بۆ جارەهای بێئەژمار بووينەوە، ديسان شتەکانيش لەگەلمانا هەربوونەوە.

تۆ باوەرت بەمەزنە ياسای دووبارە بوونەوە هەيە. ئەم ياسايەش دەق وەك سەعاتی لمە: هەر کەباری سەرەوەی بەتالْ بووەوە لای ژيرەوەی هەلْ دەگەريتەوەو سەر لەنوێ دادەميزيتەوە..هەروەها سەرلەبەری سالەکان چون يەکن، ئيمەش لەم مەزنەياسايەدا سەرجەممان چوون يەکی خۆمانینو دەبينەوەو دەگەرينەوە.

لەگەڵ تۆمانە! ئەگەر ئیستا بتەوێ بمری ئیمە دەزانین چۆن لەگەڵ نەفسی خۆت دا– دەکەویتە رازو نیازەوە.. بەڵام ئاشقەمار و هەلۆکەت تکات لی دەکەن لەحالی حازردا سنوریك بۆ زیندەگانی خۆت دانەنیی.

کەتۆ بۆ ماڵاوایی خۆت تیك نابێ ئەوا هەناسەی ئاسوودە بوون دەدەیتەوە.. ئەمە وایە، نەوەك بەئارەزوو بنالینی، ئەوسا تۆی جەربەزەو خۆگر کۆلی گران لەئەستۆت دادەمالی و دەبیژی: ئەوەمنم دەمرمو سەرەو نگوون دەبم ؟.. دوای کەمیکی دی دەبمە شتیکی نەبوو چونکە گیانەکانیش وەك لەشەکان نامینن.. بەڵام تۆری ئەو (علة)انەی دورەی داوم رۆژی لەرۆژان پەیدا دەبنەوەو سەر لەنوێ دروستم دەکاتەوە، منیش بەشیکم لەعیلەتگەلی گەرانەوەی ئەبەدی بۆ هەموو شتیك.

ئیدی هەر کە خۆرو زەوی گەرانەوە منیش بەخۆم وئاشقە مارو هەلۆکەمەوە لەگەلیان دەگەریمەوە ..بەلێ دەگەریمەوە بەڵام نەك بۆ ژیانیکی تازەو چاکتر یان بۆ ژیانیکی مانەندو ویچوو. بەلکو بەگەرانەوەیەکی هەمیشەیی بۆ دەق و سەر لەبەری ئەم ژیانە. دیسان باوەر دەهینم بە هەمیشە گەرانەوەی شتەکان.. دیسانەوە مژدەی رۆژی روونـاك بـۆ زەوی و مـەردوم جـار دەدەم.. مزگینـی دەرکـەوتنی مرۆڤیبـالا رادەگەیەنم.

ئەمە قسەم بوو، گوتمو تیکی شکاندم، ئەمەیە کەتاهەتایە لەچارەم نوسراوە، ئاوا بە گەف و مزگینی دانەوە لەپەردەی نەمان دا بۆ خۆم سەردەنیمەوە. ئیستا ساتی خۆی هاتووە.. ساتی پیرۆز بایی لەو کەسەی بۆ خۆی سەرەونگووم دەبێ. ئاوا زارا دەچیتە پەردەی نەمانەوە.

ئاشقەماروهەلۆ ئەمەیان گوت و بەتەمابوون زارا شتیکیان وەلام بداتەوە..بەڵام نەیزانی جووتەجانەوەرەکەی لە قسە وەستاون؛ چونکە بەتەواوی لەرازی نەفسیخۆیەوە گلابوو.. وادەردەکەوت کەنووستووە کەچی بەخەبەر بوو.

جانەوەرەکان لەم بی دەنگییەی زارا پەست بوون و ئیدی لەسەر خۆ لیی کشانەوە دواوە .

## ئاواتی مەزن

ئەی نەفسەکەی لەمەر خۆم فیرم کردووی وشەی (ئەمرۆ) بلیی، هەر وەك چۆن وشەی (دوینێ و پیرێ) دەبیژی. فیرم کردووی بەسەر هەموو پووکاوەیەکدا و لەهەر شوینیك بێ سەمابکەی.

ئەی نەفسەکەم! وردە زیندەگانیی و پەنامەکییەکانی وردە پەسندایەتیم لی داتەکاندی. قایلم کردی بە بەرچاوی خۆرەوە بەرووت و قووتی دەربازبی.

ئەی نەفسەکەم! لەهەموو بەندیکی پەنهان رزگارم کردی.. لەهەموو چلکنیك پاکم کردیەوە.. جالجالۆکەکانم لی تاراندی و هەر نووریك ئاویتەی تاریکی بووبێ لیم رەواندییەوە.

کەوتمە دەماندنی گەردەلوولی بیر بەسەر شەپرزە دەریای تۆدا و بەئاسۆی تۆوە هەورە رەشەکانم رەواندنەوەو تاوانی کوشندەم تیدا نەهیشتی.

ئەی نەفسەکەم ئەو مافەم دایتێ گەردەلوول ئاسا بلیی: ((نا)) سامالّ ئاساش بیژی ((بەلێ)) ئەوجا وەك ئەو نوورەی بەرزەخی فەرتەنەکان دەبرێ تۆش بۆ خۆت هیور دەبیتەوە.

ئەی نەفسەکەم! ئازادیم بۆ رەها کردووی، تۆش دەتوانی بەو ئازادییە دەسەلاّتت داسەپینی بەسەر بوونەوەری ئیستاو لەمەولادا.. هیچ نەفسیکیش هیندەی تۆ هەست بەزەمانی ئایندە ناکا.

ئەی نەفسەکەم! فیری سووك بینی و رق لی بوونەوەیەکم کردووی گەندەلّ نەبێ.. بەرادەیەك تی هەلکیشێ تا دەگاتە ئەو پەری خۆشویستن و ئەو سەری سووك کردن.

ئەی نەفسەکەم! فیرم کردیچۆن قایل کاریك بی..بەرادەیەك هۆیەکان و سەرەتاکانیش چۆنت بوین ئاوا مل کەچ بن. ئەوجا وەك ئەو خۆرەت لیهات کە دەریاکان بەوە قایل بکا بۆ سورگەی خۆی بلند بیتەوە.

ئەی نەفسەکەم! هەرمل کەچی و رەدووکەوتن و بەندایەتییەکم لی دارنی، تا بۆخۆت لەزەحمەت و سەختیدا سەروەربی و لەرۆژگاردا بۆخۆت فەرمانداربی، چونکە تۆ بریتیت لە بریاردراویکی تەوزیمی.

ئەی نەفسەکەم! ناوەتازەکانم پێ بەخشیوی.. بەوازی و یاریی جۆراوجۆرەوە کەیفم سازکردووی.. ئەوجا ناودیرم کردی بە بریاردراویکی تەوزیمی و ئۆقیانووسی ئۆقیانووسەکان وجەمسەری زەمانەو منارەی کەنارو ئاسۆ.

ئـەی نەفسـەکەم! بەسـەر وڵاتەکـەت دا– دانـاییم بـاراندووەو هـەموو کاسـەیەکیم بەدیرینە شەرابی ماریفەت پرکردووە.

ئەی نەفسەکەم! بەهەموو تاریك‌و ڕووناکی‌و بەهەموو ئارام‌و جونبوشە حەزیکی لەم گەردوونەدا هەن نوقمم کردووی.. دیتم کەوتوویتە گەشە بەچەشنی پۆخەمیو کەخۆی ڕادەداو دەبیتە شەقە.

ئەی نەفسەکەم ! تۆ کورەداریکی بارگرانی.. هیشووەکانت خۆیان داهیشتوون‌و بەرهاتوون.. بۆلی هیشووەکانت گۆمەمکی قنجن‌و لە ئاوداری‌دا مۆر دەچنەوە.. ئەوجا بەهۆی بەختەوەریی پەنهانتەوە شەکەت‌و ماندووی،، تۆ هیندە ئارامی کە شەرم لەئارامگرتنی خۆت دەکەیتەوە!

ئەی نەفسەکەم! لەم گەردوونەدا هیچ نەفسیك لە تۆ ڤیانترو گوشادترو بەسۆزتر نیە.. ئەگەر – رابووردوو داهاتوو لەکایەی تۆدا لیکدی نزیك نەبنەوە ئەی لەکوێ لووتیان دەبێ بەلووتی یەکەوە!؟

ئـەی نەفسـەکەم! هـەرچیم لەدەسـت دابـوو بـەتۆم بەخشـی ئیسـتاش دەت بینـم بەزەردەخەنەوە دەبیژی: ئەرێ وشەی شوکرانە بیژی دەکەویتە سەر کاممان؟.

ئەدی پیویست نیە کەبەخشندە سوپاس گوزاری ئەو کەسە بێ کەبەریزەوە دیاریەکەی لی وەردەگرێ ؟!

ئەی بەخشندایەتی پێویستی یەکی دەروونیی بەخشندەو وەرگرتنیشی بەزەیی هاتنەوەیەکی دەروونیی وەرگر نین؟!

ئـەی نەفسـەکەم! دەرك بـەکرۆکی خـەندەت‌و مانـای خەفـەتباری یەکـەت دەکـەم؛ ئیستا تۆ لەپی ئامەدی‌و پر حەزی بەخشینت دریژ دەکەیتەوە، دەروانیتە ئەو سەری دەریای کەفچرو لەدیدەکانتا زەردەخەنەی سامالەو دەبریسکیتەوە.

ئەی نەفسـەکەم! هـەر ئـەوەندە بـزەت دەرکـەوت کـێ خورەمـی فرمیسـکی خـۆی پێ‌ڕادەگیرێ؟!..

ئەو سۆزو میهرەبانی‌یەی لەخەندەی تۆدا هەن فریشتە کانیش دەخەنە پرمـەی گریان!!

سۆزی تۆ كه سنووری بەزاندووه لەشيوەن و فيغان دا خۆ داری دەكا.. لەهەمان كات دا زەردە خەنەكەت تاسەی گریان دەكاو بوونە قوربانیشت بەهەنیسكەوه رۆرۆیەتی.

تۆ بەسرپەوه دەلیی: لەهەر فرمیسكیك دا نالینیكەو لەهەر نالینیك دا سكالایەكە. بۆیە لەپەناوه زەردەخەنەكەت بەلاوه پەسندترە تاوەكو ئاشكرا كردنی ئەو خیراتەی شانت داوەتەبەری .. تا ئەو ئەلهایەی پەلت رادەوەشینێ ئەو توولە میوانە بلەرزینیتەوه كه بەعەزرەتەوەن میوه چنەكان قەپچریان بكەن.

ئەی نەفسەكەم! كه خۆت راگرتبێ و نەگریو پیلوی سوورت داخستبێ پێویستە بەسترانەوه دەنگی خۆتی لێ هەڵ بری.

ئەی نەفسەكەم! دەخەنمو سەرنجم بدەرێ، منیش باخەبەرت دەكەم: ئیدی دەتوانی هەوره گرمه ئاسا سروودەكانت پچری.. بەرەنگی دەریاكانیش گوێ قولاغی تریە ئاهەنگی هەوەس و حەزەكانت بن.. شناوەری زیرین و بەلەنجەو غەمزە بەسەریەوه مەلەبكا.. تا ئەو شوینەی كابرای بەزەبرو ئیرادەی لێ راست دەبیتەوەو بەجوانییەكەوه مقەستی ئەلماس بۆ قەپچری هیشووه تریكان دەگرێ بەدەستەوه..

نەفسەكەی لەمەر خۆم ! ئەوەیە دڵ سۆزو رزگار كەری تۆ.. ئەوەیە ئەو شكۆمەندەی كەناوی خۆی لەسروودەكانی دوا رۆژدا پەنهان داوه..

ئیستا تۆ خۆت بەخەونەكانت دەسپیری.. لەشوینی كشومات دا گرەی تینویتیت بەرووبارەكان دادەمركینی.. خەمناكی نامینێ وبەسرروودەكانی زەمانی ئایندە-دەگەیتەوه.

ئەوجا ماندویتیت دەحەسیتەوه.

ئەی نەفسەكە! هەمووشتیكم پێ بەخشیو دەست بەتاڵ مامەوه.. دواییێ بەخشینم ئەوەیە كه راستت دەكەمە بۆ تێچریكانی سروود، كەواتە ئیستا پیم بلێ: وشەی سوپاس لەسەركاممانە ؟

نەفسەكەی لەمەرخۆم ئیدی سترانی خۆت بلێ و لەبەرخاتری منیش تیرا چركینە. دەلیم گەرێ با هەموو سوپاسبەندیكم ئاراستەی تۆ بێ.

زارا ئاوای گوت...

# سروودیکە بۆ سەماو هەڵپەرکێ

## ١

ئەی ژیان! نیگای خۆم برینە ناخی چاوەخوماریەکانت، ئیدی پرتەی دلم وەستا، چونکە دیتم لەچاوەکانتا زیردەدرەوشیتەوە.. کەشتییەکی زیرینم بینی بەسەر دەریاوە دەتروسکایەوەو تیك بەستی بیشکەیەکی ئالتوونی بوو کەخەریك بوو نوقم بێ.

ئەو قاچانەم کەبە ئاشقە شیتانەی سەما پیکراون تۆ نیگایەکی مەستکەری توینەرەوەی پرسای خەندانت تی گرتن. هیشتا دەستە بچکۆلەکانت دووپلیان نەسرەواندبووە دەفەکەت قاچم کەوتە وزاق‌و پاژنە پێ یەکانم بۆ هەوای ئاوازەکانت گوییان راگرت.. گویی هەموو سەماچی‌یەکیش لە پاژنە پییدا—دەکریتەوە. ئەی ژیان! بۆ لای تۆ فرکانم کرد.. بەلام خۆت لی لادام‌و تۆرایت.. ئیدی گورزە پرچی پەریشانت لەلایەکەوە فیشکەی ماریان پێ بیستم‌و لەسەرە زمانەی کلافەشیانەوە نووکە پەیکانیان پیشان دام!

قلمبازم داو لەخۆت‌و مارەکانت کشامەدواوە .. ئیدی خۆت حەواداو بەرەو رووم هاتی.. چاوەکانیشت هەوەس‌و ئارەزوویان لی هەڵ دەقولێ‌و بەنیگای ترازاو گەرەکیانە بم خەنە سەر پیچەرێ.. ئاوا قاچەکانم بە توونـاوتوونی ریگادا فیری ئوینبازی بوون.

ئەی ژیان! لەنزیکەوە لیت دەترسم‌و لەدووریشەوە خۆشیم دەویی.. کەپشتم لی هەڵ دەکەی کیشم دەکەی‌وکە رووشم تی دەکەی دەم وەستینی. بەهۆی تۆوە ئازارمەندم، دەبێ لەپیناو تۆدا بەرگەی چ ئازاریك نەگرم؟!..

بەساردیتەوە سووتینەری.. بەفروفیلتەوە جادووگەری.. بەپشت لی هەڵ کردنتەوە کیشندەی.. بەقەشمەریتەوە پەنادەری !

دەبێ کێ رقی لیت نەبیتەوە– هەی دیل گری سەرە هەرزی جادووگەر.. ئەوەتای هیچ مەبەستیکت لەدەست دەرناچێ. کەتۆ بێ تاوان‌و گەوج بی‌و بۆ کەتن‌و گوناه بەپەلە بی دەبێ کێ تۆی خۆش نەوێ؟!.. ویرای ئەوەش لە چاوەکانتا تیلەو نیگای ساوایان بەدی بکرێ؟.ئەرێ کچۆلە پاکیزە ئاوارەکە بۆ کوێ دەم دەیتە بەرخۆت؟!.

ئەرێ بیدینە لاوەکە! چاوم لیتە لەبەردەممەوە بە چەتوونی‌و جوانیەکەوە رادەکەی؟.. ئەوا منیش بەسەرما‌و هەلپەرینەوە دوات دەکەوم.. دەربەست نیم

بشـكەومە تەنگەبــەری وەهــاوە ملــەمای لێ برابــیو ســەرودەری لێ نەكــەم. ئــەوەتۆ لەكوییی؟.. دەستت، هیچ نا پەنجەیەكتم پەنجەیەكتم بۆ دریژ بكە. ئەوەی لەبەردەمی من دایە بریتییە لەئەشكەوتو زەندۆڵ.. دەی بوەستە! گوایە ئەو كوندو شەمشەمە كویرانەت چاو لێ نین كە بەدەورمان دا بلاو بوونەتەوە؟!.

ئەی باڵداری تاریكستان! لەسەر خۆبە. گوایە تـۆ قەشمـەریت پیـم دێ؟.. دەبـێ ئیستا ئیمە لەكوێ بین؟.. ئەوە لەسەگەلەوە فیرە وەرین بووی و ددانە بچكۆلەكانتم لێ گردەكریتەوەو لەودیو پەرچەمو باڵە ئاڵۆزكاو و خنجیلانەكانتەوە نیگای داگیرساوم حەواڵە دەكەی؟!.

دەتەوێ سەمای كیوی بكەم یان سەمای دەریایی بكـەم؟.. مـن راوچیـم؛ ئـەوجا حەزدەكەی ببیتە سەگی خۆم یان ببیتە نیچری خۆم؟.

ئەی ژیان!تۆ (وەك باڵندەی شوان هەڵ خەلەتینـە) لەخشكەوە باڵە تـەپێ دەكـەیو شوقاری ! ئیستاكە بیرە لام، ئەوجا بۆی هەڵ بكیشێو بەلایەكی كەدا بۆی برۆ.

وای بـۆ خـۆم! بـازم داو كـەوتم. ئـا ســەیریكم بكـە چـۆن كـەوتوومو هانـام بـۆ هـاوردووی! ئـەرێ باشـتر نــەبوو بەریبازگــەی جوانــتردا شـوینت بكەوتمایــە.. وەك ریچكــەی خۆشەویســتی بــەنیو درەختــی رەنگــاری قەشــەنگ دا، یــان بەقـــەراغ دەریاچەیەكدا كەخیلە ماسییە زیرینەكان بەسەماوە هەلبەز و دابزیانە؟.

ئیستا هیلاكو ماندووی.. ئا لەوێو بەرەو خۆر ئاوبوون بەرغەلیك دەلەورێ.. ئەی پیت خۆش نیە ئیمـەش لیی بحەوییـنەوەو لـەولاوەش بلویـری مامـەی شـوان تـوورەی بێ؟!

مـن بـۆ ئـەو شـوینە دەت گرمـە كۆلـم.. كەواتـە هـەردوو مەچـەكی خـۆتم بـدەرێ. لەوانەشە تینووبی.. قەیدی نیە بەشـی تینویتـی شـكاندنم پێیـە.. بـەلام لیوەكـانت لەهەموو خواردنەوەیەك دەتۆرین!

بووبــە مــاریك هــەڵ گەرایـــەوە: ئەمەیــە جادووگــەر.. راخــز.. شۆخوشــەنگ.. راچــەنیو!.. نــازانم خــۆی هــەڵ خزانــدە چ كــونو كەلەبەریكــەوە، دوای ئــەوەی شەپازلەیەكی ماڵی بە رووم داو شەقلی دەستە سوورەكەی پیوە بەجێ هیشت!!

ئەی خنجیلانە جادوو بازەكە لەگەڵ تۆمە! هیندە بەدواتا رەتامو چاودیریم كردی شەكەت بووم. تائیستا سترانی خۆمم پێ دەبیستی، لەمەدواش هاواری خـۆتم پـێ

دەبیستی. دەی راستەوەبە! بەهەوای ئەو قەمچی‌یەی دات دەوەشێنێ سەما بکە. بەراستی من قەمچی خۆمم لە بیر نەچۆتەوە.

٢

ژیان گویی ئاخنی‌و لەوەڵامدا پیی گوتم:

زارا شرنگە بەقەمچی یەکەت مەگرەوە، باش دەزانی کە هەرا هەرا بیرکردنەوە ئیفلیج دەکا.. ئەوا نمایلەو خەیالیش سەریان تێ کردم، چ من‌و چ تۆ لە خیلی تەوەزەلەکانین ، لەنەدیوی چاکەو خراپەوە کەوتووین بەسەر دوورگەو میرغوزاری خۆماندا، کەسیکی دیکەش لەتەکمان دا نەی دۆزیونەوە، کەواتە گەرەکە یەکدیمان خۆش بوێ. گریمان خۆشویستنەکەمان لەباخی دلەوە نەبوو، ئایە کاریکی رەوایە بەپیچەوانەوە، لەلایەکی دیکەوە سۆزی نەفرەت دەمەبدەین‌و لەیەکدی زویرو تەوەلابین؟!

تۆ دەزانی بەزۆری تۆم خۆش دەوێ‌و لەم خۆشویستنەشدا سنوور دەبەزینم؛ ئەمەش لەبەر ئەوەیە لەداناییتەوە غیرەت دەم گرێ. وای بەدەست ئەو دانایی‌یە پیرە شیتەوە! ئەگەر هات‌و رۆژیك ئەو داناییەت بەجیی هیشتی هیندە ناخایەنێ خۆشەویستی‌یەکەی منیش بەجیت دەهیلێ)).

ژیان بەدەوروبەری خۆی‌دا روانی‌وگوتی: زارا! تۆ هیندە دلنیاو بەئەمەگ نی، خۆشویستنەکەت دوورترە لەوەی بگاتە ئەو سنوورەی بەقسەکانت وەسفی دەکەی. دەشزانم: بیر دەکەیتەوە کە دوای کەمیك بەجیم بهیلی.

لەسەر بلندانی‌یەکە کۆنە زەنگیکی قەبەی لی‌یەو ساتەکانی تاریکستان لی ئەداو ترینگەی دەگاتە بنی ئەشکەوتەکەت.. کەنیوە شەو لادەکاتەوە لەیەکەم سات دا بەخەیالتا دێ بەجیم بهیلی. زارا! باش دەزانم بریارەو داوتە کە بەجیم بهیلی.

بەدوودلی‌یەوە– وەڵامم دایەوە:

بەلێ، وەلی شتیکی دیکەش دەزانی. لیی چوومە پیشەوە کەلەنیو زلفە زیرینە پەریشانەکانی دا وشەیەکی دی بەگوێدا بچپینم، ئەویش گوتی:

((کەواتە زارا! تۆ ئەمە دەزانی.. بیجگەی تۆ کەسیکی کە نیە بیزانێ)).

دەستمان كرد بەتيل‌و نيگا ليكدى گرتن بەسەر ئەو ميرگە سەوزانەدا كە شنەى نمناكى ئيواران دەى ئەنگاوتن ئيمەش دامانە هارژنى گريان.. لەوساتەدا هەستم پيكرد كە بۆ من ژيان لەداناييم ئازيزترە.

زارا ئاواى گوت...

١-ئەى ئادەمى ! ورياى خۆت بە.

٢-دەبێ نيوەشەو لەناخى خۆىدا چى بلێ؟

٣-نوستووم‌و نوستووم.

٤-لەخەونيكى قوولەوە بەهۆش هاتم.

٥-جيهان بۆ خۆى قووله.

٦-لەوە قولترە كە شەوو رۆژ بڕواى پييەتى.

٧-ئازارەكانيش قوولن.

٨-شادمانىيەكەى لەخەمناكىيەكەى قوولترە.

٩-رابووردن‌و كۆتايى گوتەى ئازارەكانن بۆ جهان.

١٠-بەلام شادمانى ئەبەدى دەخوازێ.

١١-ئەبەدايەتى قووڵ دەخوازێ.

١٢-(( ! . ! ))

# حەوت ئالقە
## یان سروودی بەرایی و کۆتایی ، ئەلف و یێ [٣٣]

١

من پێش بینیکەم و کەیلی ئەو گیانەم پەیدۆزو ئاشکرا کارە.. ریبواریکم بەیالەو یالی نیوان دوو دەریادا سەردەکەوم.. ریبواریکم بەنیوان پیشین پاشیندا گوزەر دەکەم.. نەسرەوتیکم وەك ئەو پەلە هەورەی لەو قولاییانەوە خۆی دەدزیتەوە کەکینەوەرو دوژمنی هەرماندوییەکە نەئەوەتانی بژیو نەئەوەتانێ بمرێ!

من ئەو پەلە هەورەم.. بەرسنگی تاریکی بۆ بریقەی ئەو رووناکییە رزگارکەرانە هەڵناوە کەبەشریخەو بریسکەیەوە ژان دەی گرێ.. هیندە چەسپیو بێ گەمەی بەچەسپیو بێ.. من پەلە هەوریکم و تریشقەو چەخماخەی رووناککەرەوەم گرتووە بەکۆلمەوە.. ئەو کەسەی بەم شریخەو بریسوانەوە بەژانەوەبووە زۆر بەختیارە! بەڵام چاریش نیە چۆن هەوری قورس پیشەی خۆ مەلاس دانە دەبێ ئەو کەسەش بۆ ماوەیەکی دریژخایەن خۆی بەلووتکەوە مەڵاس بدا! چونکە لەسەریەتی رۆژێ لەرۆژان رووناکییەکانی زەمانی ئایندە هەڵ بگیرسینێ.

ئیدی چۆن بۆ ئەبەد ((هەمیشە)) سویم نەبیتەوە.. چۆن بۆ ئالقەی ژن و میردایەتی گرم تێبەرنەبێ.. بۆ بازنەی هەموو ئالقەکان شەیدا نەبم کە لەوێ کۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا وەکو ئەمرۆ ئافرەتیکم دەست نەکەوتووە بمەوێ بیکەمە دایکی رۆلەکانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ؛ چونکە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

–ئەی ئەبەدایەتی بەراستی من تۆم خۆش دەوێ–

---

[٣٣] نووسراوە (بۆ ل ٢٦١) نشید البدایه والنهایه، الالف والباء.

بەلامەوە ((ئالانی)) ئەلف و بێ– بۆ سەرجەم دەبیژرێ و رۆیشتووە. بەڵام کە (ئەلف)) هیمای (بەرایی) بێ، دەشێ دواین پیت هیمای (کۆتایی) بێ. لەبەر ئەوە بەش بەخۆم نووسیم: ((ئەلف و یێ))، واتە بە (یێ) نەك بە (ب).

## ٢

که بەرقەوە شاڵاو بۆ گۆڕستان بهێنمو ئابرووی بەرمو چی نیشانەی سنووربەندە بۆ دوور فڕێی بدەمو دەستم بگاتە لەوحەی دەستووراتەکانو بەگەرووی زەندۆڵو دۆزەقەدا وردوخاشیان بکەم..

ئەگەر بەقەشمەرییەوە گوتە بێژەداپۆلکیوەکان پەرشوبلاو بکەمو رەشەبا ئاسا تەونە جالجالۆکەکان وەبەر خۆدەمو کونە ئەشکەوتە بۆگەنیوەکانی مەرگ پاك بکەمەوە، کە بەکەیف خۆشییەوە لەو شوێنەی خواوەندەکانی زەمانی دوابراوی لێ گۆڕ کراون دابنیشمو پیرۆزبایی لەجیهان بکەم.. هەر لەنزیك بتخانەی ئەوانەی بوختان بۆ جیهان هەڵ دەبەستن منیش خۆشەویستی بەسەردا بڕێژم– ئەوە هەمووی لەپیناو ئەوەدایە کەشەیدای بینینی پەرستگاو گۆڕەخواوەندەکانم لەکاتیکدا چاوی ئاسمانی بێگەرد گومەزە شرەکانیان دەسمێ.. ئەوجا وەك سەوز گیاو گوڵاڵە سوورە بەسەر پەردووی کەلاوەکانیانەوە لیی رۆدەنیشم.

ئیدی چۆن بۆ ((ئەبەد)) سویم نەبیتەوە.. چۆن بۆ ئالقەی ژنو میردایەتی گرم تێ بەرنەبێ.. بۆ بازنەی هەموو ئالقەکان شەیدا نەبم کەلەوێ کۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟ تا ئەمرۆ ئافرەتیکم دەست نەکەوتووە بمەوێ بیکەمە دایکی رۆڵەکانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ چونکە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

–ئەی ئەبەدایەتی بەراستی من تۆم خۆش دەوێ–

## ٣

ئەگەر سروەیەك لە شنەبای داهینانی خواوەندانە لەمنی هەڵ کردبێ.. تەنانەت کەکویرە ریکەوتیش ناچار بکا بکەویتە سەماو سوورانەوە بەچەشنی هەلپەرکیی ئەستیرەکان بەچەرخی گەردوونەوە، ئەگەر هاتو بەقاقای بروسکەی داهینانەوە کردمە پیکەنینو یەك لەسەریەك چەخماخەی کاریشی بەدوادا هات، ئەگەر لەگەڵ خواوەندەکاندا مۆرە فڕێ بدەمە سەر نەردی زەوی تا بیهینیتە هەژانو شەقەتۆلەو کلپەی ئاگر فڕێ بداتە تاقی ئاسمانەوە– هەمووی لەپیناو ئەوەدایە کە زەوی نەردیکی خواوەندانەیەو بەزەبری تازە وشەی خولقینەرو بەتاوی داوەرینە سەری مۆرە خواوەندییەکان دەکەویتە لەرزەو راتەکان.

ئیدی چۆن بۆ ئەبەد سویم نەبیتەوە، چۆن بۆ ئالقەی ژنو میردایەتی گرم تێ بەرنەبێ،بۆ بازنەی هەموو ئالقەکان شەیدا نەبم کە لەوێ کۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا ئەمرۆ ئافرەتیكم دەست نەكەوتووە بمەوێ بیكەمە دایكی رۆڵەكانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ چونكە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

-ئەی ئەبەدایەتی بەراستی من تۆم خۆش دەوێ-

٤

ئەگەر لەو كاسەیە دەرمانیك بنۆشم كەگیراوەی هەموو داوودەرمانیك بێ.. كەدەستم دریژ بكەمو دوورو نزیك تیك بكەمەوە .. ئاگرو بیركردنەوە یەكبخەم.. خۆشیو ناخۆشی لیك بدەم.. قەشەنگو دزیوی شتەكان ئاویتە بكەم.

ئەگەر من گەردیلەیەكی گیان فیدابمو لەدەریای لمدا شتەكان لەكاسەی داودەرمانەكەدا ئاویتە بكەم هەمووی لەپیناو ئەوەدایە كە ((خوییەك)) لە ((هەبوون))دا هەیەو چاكەو خراپەی پێ جۆش دەخۆن.. خراپەش لەو بەهاراتانەیە كاسەكە -كەیلو كەفەسەر دەكا.

ئیدی چۆن بۆ "ئەبەد" سویم نەبیتەوە، چۆن بۆ ئالقەی ژنو میردایەتی گرم تی بەرنەبێ.. بۆ بازنەی هەموو ئالقەكان شەیدا نەبم كە لەوێ كۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا ئەمرۆ ئافرەتیكم دەست نەكەوتووە بمەوێ بیكەمە دایكی رۆڵەكانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ؛ چونكە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

-ئەی ئەبەدایەتی! بەراستی من تۆم خۆش دەوێ-

٥

ئەگەر من دەریاو هەرچی لەدەریا چووبێ خۆشم بوێ لەو حەلەشدا پتر حەزداری بم كە بەگەرداوەكانیەوە لەتەكما جەنگابێ.. كە من وەك دۆزەرەوەكان لەنەفسی خۆمدا خۆشییەك هەڵ بگرم بۆ كەناری دیارو نادیار كەشتییەكان برەتینێو دلی دەریاوانەكانیش پر لە شادی كا.. كە لەخۆشیاندا بقریوینم: ئەوا دوا قەراغ لەبەرچاو نەماو سەباەت بەوەش دوا ئەلقەی پەیوەندیەكەم پسا -ئەوسا لەنیو قەدی مەودایەكی بەرینی پرهەرادا دەبینمەوە، مەودایەك بێو دوور بێ لەبەدوایەكدا هاتنی شوینو زەمان. دەی پیرە دلەكەم با بۆپیشەوە راستەوەبین؟!

ئەی هاوار! چۆن بۆ ((ئەبەد)) سویم نەبیتەوە، چۆن بۆ ئالقە ژنو میردایەتی گرم تیبەرنەبێ، بۆ بازنەی هەموو ئالقەكان شەیدا نەبم كە لەوێ كۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا ئەمرۆ ئافرەتیکم دەست نەکەوتووە بمەوێ بیکەمە دایکی رۆڵەکانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ چونکە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

—ئەی ئەبەدایەتی! بەراستی من تۆم خۆش دەوێ—

## ٦

ئەگەر پەسندی من پەسندی سەماکەران بێ .. ئەگەر زۆرتر لەبەرئەوە کەوتبمە سەما چونکە بە درەوشانەوەی گەوهەرو زمرووت کاریگەرم.. ئەگەر خراپەی من خراپەیەکی خەندان بێ و هاورازی یاسەمین جارو پەلو لقی گوڵان بێ ئەوە لەبەر ئەوەیە هەرچی بەدبی لەگەڵ پیکەنیندا یەکگیرە.. کە ئەو یەکگیرییەش بەندە بە پاکانەو رایی کردنی خودی (( خۆش هیوایی)) لەمەرخۆیەوە.

بەلامەوە ((ئەلف و یێ)) بریتین لە گۆرانکاری و روون بوونەوەی هەموو خەستی و چرییەك: هەموو قورسیك سووك ببیتەوەو هەموو لەشیك ببیتە سەماکەریك و هەمو بیریك ببیتە بالندەیەك.

راستی یەکەی ئەوەی (بەرایی و کۆتایی) بێ ئا لەمەدایە.

ئیدی چۆن بۆ ((ئەبەد)) سویم نەبیتەوە، چۆن بۆ ئالقەی ژن و میردایەتی گرم تی بەرنەبێ، بۆ بازنەی هەموو ئالقەکان شەیدا نەبم کە لەوێ کۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا ئەمرۆ ئافرەتیکم دەست نەکەوتووە بمەوێ بیکەمە دایکی رۆڵەکانم، بیجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ؛ چونکە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

—ئەی ئەبەدایەتی بەراستی من تۆم خۆش دەوێ—

## ٧

ئەگەر بەژوور سەرمەوە هەموو ئاسمانەکان بە کشوماتییەوە برەوینمەوە .. بە کەناری ئاسمانەکانمەوە بدەمە شەقەی باڵ.. کەهات و لەناخی مەودا رووناکییەکاندا کەوتمە مەلەو لەسەرفرازیی خۆم دا— دارای پەندی بالندەکان بم— هەمووی لەبەر ئەوەیە کەدانایی بالندەکان دەلێ: ((سەروو، خواروو)) نین.. لیرە بێ و لەوێ بێ نەفسی خۆتی بۆ حەوالەکە. لەبەر ئەوەی سووکەلەی برۆ بۆ پیشەوە یان بگەریرە دواوە. ئیدی قسە مەکەو بچریکینە ؛ ئەوە نیە قسەکردن رەوشتی خیلە قورس و چرەکانە؟!

کە -گوتە-ش بلند دەبیتەوە هەر بۆ لای رۆح سووك و ناسکۆڵانە.

—ئیدی هەر بچریکینەو قسە مەکە!

ئەی هاوار! چۆن بۆ ((ئەبەد)) سویم نەبیتەوە، چۆن بۆ ئالقەی ژن و میردایەتی گرم تی بەرنەبێ، بۆ بازنەی هەموو ئالقەکان شەیدا نەبم کە لەوێ کۆتایی دەبیتەوە بەرایی؟

تا ئەمڕۆ ئافرەتێکم دەست نەکەوتووە بمەوێ بیکەمە دایکی ڕۆڵەکانم، بێجگە لەو ئافرەتەی خۆشم دەوێ؛ چونکە ئەی ((ئەبەدایەتی)) تۆم خۆش دەوێ..

-ئەی ئەبەدایەتی! بەراستی من تۆم خۆش دەوێ!

زەردەشت ئاوای گوت...

# زەردەشت ئاوای گوت
# بەشی چوارەم

(( لەکوێی ئەم زەوییەدا شێتی بەو ئەندازەیە دەردەکەوێ کە بەتوندی لەنێو میهرەبانەکان دا- دەورنگێتەوە؟!

بەڵکو دەبێ چ زیانێك (کەتووشی مەردووم بووە) توندتر بێ لەو زەرەرو زیانەی کە لەشێتایەتی میهرەبانەکانەوە پەیدا بووە؟!. وای بۆ ئەو خۆشەویستەی کەلە خۆشویستنەکەی دا تە پۆلکەیەك نیە بەزەیی پێدا هاتنەوەی میهرەبانەکانی بگاتێ؟!

((ڕۆژێکیان شەیتان پێی گوتم: پەروەردگار دۆزەخێکی هەیە ئەویش دۆزەخیمیهرەبانییەتیو بۆ خەڵکی ساز کردووە. هەر لەو شەیتانەم بیست کە لەدوابیدا گوتی: خواوەند مرد. ئەوەی مراندیشی میهرەبانییەکەی لەمەر خۆی بوو))

زارا

میهرەبانان ، بەشی دووەم. ل ١٩٦ ك

# پيشكەش كردنی هەنگوين

سالآنو مانگان بەسەر زارادا تيپەرينو هەستی پێنەكردن كەوا لاجانگو پيشەسەريان كردۆتە چۆری شير.

رۆژيكيان زارا لەسەر كەنەكی بەردەم ئەشكەوتەكەی دانيشتبوو.. بۆ دوور تەماشای دەكرد بەچاو دۆزی مارو دووی ريچكەی ئەو دۆلانەی دەپشكنی.. شتيكيش لەو پەری كەناری دەرياوە دەركەوت، هەروەها لەبيركردنەوەی خۆيەوە گلابوو ئاشقەمارو هەلۆكەی بەدەوری دا سووريان دەخواردو هاتنە بەردەمی پييان گوت:

ئەرێ زارا نيگات دەبريتە كوێ؟ واديارە ئەودالی بەختياری خۆتیو ليی دەگەريی؟

گوتی: هی هوو! منو بەختەوەری؟.. ئەوزەمانەی چاوەروانی بەختياريم تيدا دەكرد بەسەر چوو، ئيستا هۆگری كارو فرمانی خۆمم.

جانەوەرەكان گوتيان: تۆ لەو كەسە دەچی چاكەی تيرا گەرابێ.. ئەی تۆ شناوەريك نی بەسەر دەرياچەيەكی بەخيارییەوە كە رووی ئاسمان بەسەريەوە رەنگ بداتەوە؟

بەزەردەخەنەوە گوتی :بەراستی ويچواندنيكی باشتان سازدا.. بەلآم ئەوەش دەزانن كە بەختيارییەكەم قورسەو لەهيرشو كشانەوەدا لەشەپۆلو قەلبەز ناچێ.. ئەوەنيە تەنگم پێ هەلّ دەچنێو لەكۆلم نابيتەوە، وەك بنيشتە تالّ پيمە دەلكێ؟

بۆ جاری دووەم دەورەيان داو ليی هەلّ باويشكانو پييان گوت: لەرەنگی زەرد هەلّ بزركاوتو رەنگی مووەكانتەوە كە دەليی ريشالی گۆشتن، هۆيەكمان بۆ وەدەركەوتووە. ئەدی نابينی لەبنيشتە تالەوە گلاویو لەبەدبەختی خۆتا خنكاوی؟

بەخۆ هينانە پيكەنينەوە گوتی: بەراستی كەباسی زفتو بنيشتم هينايەگۆرێ لام داو ناشكوريم كرد.. ئەوەی لەمن دا روويداوە لەهەموو بەرو ميوەيەكی گەييودا رووئەدا. كەهەر تيوەبگليم باهەنگوين بێ؛ هەر ئەو خوينم خەست دەكاتەوەونەفسم لەبێ دەنگیخۆیدا نوقم دەكا.

ئاشقە مارو هەلۆ لەگەورەی خۆیان نزیك بوونەوەو گوتیان: ئەوەی تۆ لیی دەلیی وەهایە.. بەلام ئایە ئەمرۆ حەزناکەی بەچیا بەرزەکەدا سەربکەوی‌و بەهەواپاکەکەی هەست بە لەزەتی ژیان بکەی؟

گوتی: وادیارە ئیشتیام دەبزیون.. ئەمرۆ- وازم لەوەیە بۆ بەرزایی هەڵ بکشیم.. بەلام پێویستە ئیوەش هەنگوینی نایابی ساردو سپاتی کۆلەسی زیرینم بۆ ساز بکەن.. چونکە دەمەوێ ئەو بەخششە پیشکەش بە لووتکە بەرزەکان بکەم.

کە زارا گەیشتە ترۆپك‌و جانەوەرەکانی رایی کردن دیتی ئەوا بەتەنێ ماوەتەوە.. ئەوجا بزەیەکی کردو بە دەوروبەری خۆیدا روانی‌و گوتی:

بۆیە بیانووم بە هەنگوین پیشکەش کردن گرت تابتوانم بەتەنێ بم..ئەوجا بەسەرفرازی‌و بەکامی خۆم بەسەر لووتکەوە قسە بکەم‌و دووربم لەمەنزلگای پەرستگارو ئاژەلەکانیان.

کاتێ باسی خۆبەخت کردنم دەکرد ئەوەی پیم دەبەخشرا بە هەزار لە پێ والا پەرشوبلاوم دەکرد.. کەواتە چۆن زاتی ئەوە دەکەم ئەمرۆ ئەوکارە بەقوربانیدان ناوبەرم؟!

کەداوای هەنگوینم کرد بۆ چەشەتەلەم ویست گەرەکم بوو لەکۆلەسی زیرین وەری بگرم.. کە بیولە ورچ‌و پەلەوەرەکان بەعەزرەتەوەن لەزەتی لی ببینن.

داوای باشترین چەشەم کرد کەراوچیەکان لە وشکانی‌و دەریادا بەکاری دەهینن. دنیاش بریتی‌یە لەو جەنگەلەی جمەی دێ لەگیانەوەرو ئاژەڵ.. باغیکەو هەموو راوچیەکی وەحشی پیوە دەنازێ.. یان بلیین لەچرە دەریایەکی بێبن دەچێ کەجۆرەها ماسیی رەنگاو رەنگ ئاپۆرەیان تیدا بەستبێ، بەو چەشنەی ئیشتیای خواوەندەکان بوروژینێ تا دەبنە ئەو راوچیانەی تۆرەکانیان بۆ ئەم جیهانی پر لەسەیرو سەمەرەیە فرێ بدەن‌و بەگەورەو گچکەیانەوە راویان بکەن. مەبەستیشم لەدنیا جیهانی مرۆڤە جا وشکانی بێ یان دەریایی بی. منیش لەبوار و ماوەی ئەودا تۆرە زیرینەی خۆمی بۆ دەهاویژم‌و هاوار دەکەم:

(( ئەی ناخە ئادەمی‌یەکان گوشادبنەوە!))

گوشادبنەوەو ماسی‌یە بریقە دارەکانم بۆ دەربهاویژن. لەمەولاش دەتوانم بەچاکترین چەشە ماسی‌یە ئادەمی‌یەکان حەز بزیو بکەم‌و فریویان بدەم‌و ئاغرەکانیان

لی راوبکـەم، ئـەو چەشـەیەش بریتـی‌یـە لـەخودی بـەختیاریم کـە بەهەمـەلادا پەرشـی دەکەم. هەر لەنیوان خۆرهەلاٌت و باشوورەوە تا خۆرئاوا. سـەرنج بدەن کە ژمارەیـەکی زەبـەند لـەو ماسـی‌یە ئادەمی‌یانـە فیرە چەشە کردنـی بەختیاری‌یەکەم دەبن و تییـەوە دەگلیـن. هـەر کـە چەشـەکەم لـە قورگیـان راگـەرا ناچـار دەبـن بـۆ ئاسـتی مـن هـەلٌ بکشینەوە، بەو جۆرە ئەو ماسی‌یانەی فرە بەندیواری قوولاٌ پییەکانت بلند دەبنەوە بۆ نزیك داوی راوچیەك کەپیشەی راوکردنی ئادەمزادە، من لەوەتەی پەیدا بووم هەر ئەو راوچیەم کەلەناخەکانی خۆم دام، مـن: کیشـندەم، ریك هاتووم، ئاستگرم، بیٌئۆقرەم، بلند کەرەوەم، رۆشنبیرم،مامۆستام. منم ئەو کەسەی لەپیشدا گوتی:

((پیٌویستە لەسەرت ببیتە کەسیك کەخۆتی))

ئیستا با خەلکی بۆلای من سەربکەون؛ چونکە من چاوەروانی ئەو ئاماژانەم نزیك بوونـەوەی کـاتی دابـەزینم رابگەیـەنن هەرچـەندە پیویسـتیش بـوو.. بـەلاٌم هیشـتا دانەبەزیومـە نیـو خەلکـەوە.. لەبـەر ئـەوە لـیرەو لـەبان لووتکـەی کـەژەوە بـە ئـاین و ئوینیکـەوەو بـیٌ ئـەوەی هیـچ ئـارام بـرواوبم چـاوەروانم.. یـان وەك کابرایـەی‌ئارام لەبیرچوو.. ئەو ئارامەی هیچ میهرەبانی‌یەکی تیدا چنگ ناکەویٌ بەخۆمەوە خەجلیوم.

چارەنووس و بریارەکانم لەبەردەمم دا ماوەی زەمانیان گوشـاد کـردەوە.. ئـەوجا دەبیٌ منیان لەبیر کردبیٌ و لەبن سیبەری گابەردیکا کەوتبنە میش قەپاندن؟.

ئەوەی ئەبەد لە چارەی نووسیوم پشتم داوەتـە بـەری و خاراندوومی.. لەبـەر ئـەوە تەنگـە تـاوم ناکا، بەلکو ماوەیـەکی فراوانم بـۆ تـەرخان دەکا بـۆ خـۆم بکەومـە یـاری پیکـردن و خراپـەکاری.. بەتایبـەت کـە ئـەمرۆ مۆلـەتی داوم بـەکیو هــەلٌ بگـەریم و راوە ماسی لەسەر بکەم، ئەری بیستووتانە مەردوم لسەر لووتکەو ترۆپك راوەماسی بکا؟..

لەوانەشـە داخوازیەکـەم شـیتانەبیٌ.. بەهـەرحالٌ شـیتی بەسـەرم دا زال بـیٌ باشـترە لـــەوەی وەســـتان و دەســـت بەســـتەیی پـــەکم بخـــەن و زەردو ســـەوزو هـــەلٌ گـــەریم و لەناخـەکاندا بـە چاوەروانی‌یـەوە کربکـەوم. مـن نـەم گەرەکـە وەك ئـەو کەسـانە بم لـەخایاندنی چـاوەروانی دا رق دەخۆنـەوەو دەپرووکیـن.. دەلـیٌی ئـەو گەردەلولـە پیرۆزەن لەدۆلـەکاندا دلرفینـیٌ و دەبۆلینـیٌ: ((گویـم لی بگـرە دەنـا بەقـەمچیی خـوا دات دەگرم )).

نموونـەی ئـەو تاوگێرانـە نایـان ئـاوزێ فیلـم لێ بکـەن؛ چونکـە لەبەرانبەریانـەوە بەقەشمەرییەوە دەوەستم.. چەندخۆیان تووڕە بکەن لەنووکەوە هەستی پێ دەکەم.. باش دەزانم بیتو لـەمرۆدا– دەهۆلـی خۆیـان نـەکوتن تائەبەد نـاتوانن ئەو دەهۆڵـە لێ بدەن.

بەڵام بەخۆمو قەرار دادەکانمەوە قسـە[٣٤] بۆ ئیستاو بۆ ئەبەد ناکـەین، دەشتوانین لـەبی دەنگـی خۆمـان دا بسـرەوین چونکـە ماوەیـەکی دوور دریژمـان لەپیشـە. ئـەو رۆژگارە دیتە بەرەوە کە ریبوار نەتوانێ پییدا گوزەر کاو ئاوابی. دەبێ ئەو هاتووە– کێ بێ.. هەبێو نەبی ریکەوتی مەزنە، دەبێ مرۆڤ چ ملکو قەلـەمرەویك بێ کـە زارا فەرمانرەوایی هەزار سالەی تیدا بکا؟!

ئەگەر ئەو قەلەمرەوە هەروەها دووربێ بەلامـەوە گرنـگ نیـە.. دلنیـام کـەدەبێ هـەر بیتـە بەرەوە.. لـەم باوەرەوە پشت بە بنەرەتـە ئەبـەدی یـەکان دەبەسـتم. پشـت بـەو تاشو دیرینە کەژانە دەبەستم کەلەنیو گیژەنی بایەکان دا قنج بوونەتەوەو سووسـەی هەموو رابووردوویەكو داهاتوویەك دەکەن.

ئـەی شـەری لـەمن هـەڵ خزاو! بۆ خۆت پیبکەنـەو لـەبلندانی ئەو کیوانـەوە قاقـای بەتەوسو پلارت حەواله بکەو تۆرەکانت بهاویژەو داوبنینـەوە بۆ راوکردنـی باشترین ماسییە ئادەمی. برۆ خۆت بکە بەدەریاکان دا هەرچییـەکی تییـان دایـە ملکـی خۆمـە، هەمووی بچنەرەوەو بۆ منی هەڵ برە.. ئەوەی راوچیە بەدخواکانی بەتەمانی ئەمەیە.

ئەی ((چەشە))! بە پانایی دەریادا برۆ.. بەختیاری من بکـەرە نیچیرو خۆتـی بۆ دابهیلەرە بناوانەکانەوە.

ئەی دڵ! شـیرینترین دلۆپـی هـەنگویناویت بتکینـەو بیکـەرە چەشـەیەکی بـەتام لەهەناوی بەڵاو فەلاکەتی دیزو تۆقینەردا خۆی دامەزرینێ.

سـەرنجەکانم بۆ قوولترین ئاسۆگە دەکشین. ئـای لـەدەریاکان! چـۆن لەپیشـمەوە گوشـاد ئەبنـەوە؟! ئـای لـەدوا رۆژی مرۆڤایـەتی کـە بەچیشـتەنگاوی نوورانییـەوە

---

[٣٤] لەعەرەبی یەکەدا (ل ٢٧٠) نووسراوە:

((فما نوجه خطايانا لا الى اليوم ولا الى الابد)) بەلامەوە دەبێ (خطابنا) من خطب / بێو بەهەلەی چاپی دەزانم.

دەترەكیتـەوە؟!..كرومـاتیش لـەژوور سـەرمەوە بەئاسـۆی سـوور داگیرسـاودا پـەل ناهاویژێ؟!

ئـای لەسـامالی بێگـەرد!.. ئیـدی هـەورەكان لیلآیـی بەسـەردا نـاهینن‌و بـەری ناگرن؟!.

## فریا

لەبەیانی رۆژی دواییدا، جاران ئاسا زارا لەسەر گابەردی دەم ئەشكەوتەكەی دا رۆنیشت، ئاشقە مارو هـەلۆ كەشـی بـەزەویدا ئەخولانـەوە كـە خواردەمـەنی تـازەو هەنگوینی تازە ئامادەبكەن.. چونكە زارا تا دوا تنۆكی هەنگوینە كۆنەكەی بەم لاولادا بلآوكردبووەوە.

خۆی دابوو بەسەر وەكازەكەی‌داو نوقمـی بیركردنـەوەبوو. بـەوردی دەیروانی‌یـە سیبەری لەشی خۆی.. كوتوپر راچەنی! لەنزیك سیبەرەكەی خۆیەوە سیبەریكی دی شـەقلی بەسـت.. بەراوەسـتانەوە لای كـردەوە تومـەز نجومگەرەكەیـەو لەپەنایـەوە راوەساوە!

بـەلێ، خۆیـەتی: ئـەوەبوو رۆژیكیـان خواردنـی سـەر خوانەكـەی لی كـرد بـە دووبەشـەوەو دەنـەی تەمـەلی دەدا كـەدەی گوت: ((شتەكان هـەموو لەیـەكدی دەچـن، شتیك نیە شیانی كۆڵ پیوە هەلگرتن بێ، كەدانایی شتیكی قانگدەری خنكینـەر بێ‌و كوشـندە بـێ ئـەوا – هـەبوون– یـش بێمانایـە. وەلی روخسـاری ئـەم فالچیـە لـەو سەردەمەوەگۆرا بـوو، هـەر ئـەوەندە زارا لیـی وردەوەبـوو ترسـی لی نیشـت؛ چونكـە نیشانەی بەدوومی بەچروچاویەوە خویندەوە.

نجومگەرەكە زانی چی لەدلی زارا گەراوە بەلپەدەستی دەموچاوی خۆی سریەوە، وەك گـەرەكی بـێ ئـەوەی بەسـەر دەموچاویـەوە شـەقلی بەسـتووە بـی سـریتەوە، هەمدیس زاراش رووی خۆی سریەوە، ئەوجا بەجووتە هیور بوونەوە، تەوقەیان كردو زارا گوتی:

ئـای مـاندو نـەبی کـاکی خـۆش خەبـەر لــەبارەی خلیچکــی و وشـك هــەلاتن وبێ کەلکی یـەوە! لەبیرتـە کـە بوویتــە میـوانم؟ لەوانەیــە سـوودیکت وەرگرتبـێ، ئـەمرۆش بەدیار خوانەکەمەوە دابنیشە، منیش کەپیری خۆش هیوام با لەتەکتەوە دابنیشم.

نجومگـەر بەسـەربادانەوە گوتـی: خـەیالت وایــە پـیریکی ئـەوتۆی شـادیو خـۆش هیواییت لیهەڵ دەقولێ.

بەهەر حاڵ تۆ هەرچۆنیك بووبی، زەمانی شادمانیت بەسەر ئەم لووتکانەوە هینـدە ناخایەنێ؛ دوای قەدەرێ بۆران کەشتی یەکەت راپیچ دەکا.

ئیـدی زارا گوتـی: ئایـە دەتـوانم خۆمـی لی پـەنابگرم؟ نجومگـەر گوتـی لەهـەر چــوار لاوە شـەپۆلەکان گـەمارۆی کیوەکـەت دەدەن و بێ پسـانەوە وزاق دەدەن بلنـد دەبنــەوە دوای کـەمێ شـەپۆلی بەدبەختیو ئازارەکـان دەسـتەو یەخـەی ئـەم لووتکانـە دەبنــەوە ئەوجا بەخۆت وکەشتیەوە راتان دەمالن.

—بەسەر سورمانەوە زارا بێ دەنگ مایەوە! —

نجومگەر دەستی پێکردەوە: ئەوە ئیستا هیچ شتیك نابیستی.. نرکوهـوری گۆمو بناوانەکان نادەن لەگویت؟!

زارا حەپەسـاو گـوێ قـولاخ بـوو، دەنگیکــی دووراو دووری بیســت.. دەهــاتو نەدەبرایەوە، زایەلەی زەندۆڵو دۆزەقەکان دەیان قۆستەوە، لەوە دەچوو هیـچ گـەلیو دۆزەقەیەك نەی توانی بێ ئەو جۆرە هاوارە مەرگەساتە بهیلیتەوەو قووتی بداتەوە؟!

بەسەر نجومگەرەکەدا نەراندی: بـەلێ هـەی بەدووم گـەزاف! گویم لییـە مـەردومیك هـاواری فریـا دەکـا.. دەبێ لـەدەریای تاریکسـتانەوە هاتبـێ.. بـەلام من کـارم بـە فریـا کەوتنی خەلك چیە؟!.. ئا دەی بزانە دواخەتا کەلەچارەم نووسرا بێ چیە؟

نجومگەر لەوەلام دا گوتی: بەلی، ئەوە میهرەبانی یە لەخۆشیان دا دلی سـەر ریـژی کرد، دەستی حەوادانو قریواندی: بۆ ئەوە هاتووم بت خەمە ئەو گوناهەوە.

نەخیر دەنگەکە بوو بەزایەلەیەکی تۆقینەر لەوەدەچوو لەو نزیکانەوە بێ!

نجومگەرەکە هـەلی دایـە: زارا! ئـەوە گویـت لی نیـە؟ هاوارەکـە بـەرەو رووی تۆیـە. کەواتە وەرە، دەی وەرە.. لەوانەیە کاتت لەدەست بچێ و نەی گەیتێ.

بەبێ دەنگی خۆی راگرت. بەلام هەستـی بەشـەپرزەیی کـرد ویسـتو ئیرادەی لـەق بکا. بەدوودلی یەوە پرسی دەبێ کێ بێ لەودوورەوە بانگم بکا؟

دیسانەوە نجومگەر: تۆ خۆت دەی ناسی، ئیدی لەپای چی خۆتی لێ نەزان دەکەی؟.. ئەوە مرۆڤی بالایەو هاوارت لێ دەکا بەفریای بیی.

زارا بەلەرزینەوە: چی لەمن دەوێ.. ئەری مرۆڤی بالاٌ لیرە داوای چی دەکا؟

–ئیدی هەموو لەشی سەر ئارەقە گەرا!!–

کەچی نجومگەر هیچ گویی بەشلە ژانی زارا نەدا، بەلاٌم بەسەرچالەکەدا چەمی‌یەوەو گویی راهیشت کەلە قوولاٌیی‌یەوە کشوماتە، ئیدی پشتی وەرچەرخاندو زارای بینی هەروا لەجیی خۆی وەستاوەو هەلدەلەرزێ؛ بەدەنگیکی کزەلۆکینەوە پیی گوت:

وام بۆ دەرناکەوێ تۆ ئەو پیاوەی لەبەختیاری‌دا سەما بکا، ئەگەر حەز دەکەی سەمابکەو مەکەوەرە سەر زەوی، ئەگەر بەهەموو گەرموگور یەکتەوە ئیستا لەبەردەمم دا بکەویە سەما بروناکەم تۆ دوایین کەس بی لەنیو مەردوم دا بەکامەرانی خۆتەوە بنازی. بیت و یەکیك بەو لووتکانەوە هەلگەرابێ بەتەمای ئەوەی دوایین بەختیاری بەدەست بهینێ ئەوە بەخۆرایی دەکەویتە کیومالٌ.. تەنیا بەسەر ئەو مغارەو ئەشکەوتانەدا دەکەوێ کە حەشارگەی ئەوانەن حەزیان لەخۆشاردنەوەیە. بۆ سەی بەختیاریش لەو دەوروبەرانەدا نیە. ئایە لەنیو ئەو کەسانەدا خۆیان گۆرکردووەو ئەوانەشیان پۆست نشین پەرستان (عابد)ن کامەرانی چاوەروان دەکرێ؟!.. ئایە پێویست دەکا لەدوورانی نەدیوی دەریاکان داو لە دوورگە بەختیارەکان دا بۆ کامەرانی بکەوینە پەیدۆز؟.

کە لە (هەبوون)دا شتیك نەبی شیانی کۆل پیوە هەلٌ گرتن بێ کارم بەئەمەش نیە.. کە دوورگە بەختیارەکان لەم بوونەوەرەدا نەدیوبن ئیدی لێ گەرانیان کاریکی بێهوودەیە.

دوای ئەوەی نجومگەر کۆتایی بەقسەکانی‌هیناو دوا پرمەی لەسنگەوە دەرهاویشت زارا خۆش هیوا بوو بە چەشنی کەسیك لەتاریکایی‌یەوە دەربچێ و باوەش بۆ رووناکایی بکاتەوە.. ئیدی راچەنی و دەستی لەریشی وەرداوگوتی:

_هەزارو یەك جار ((نا)).. من لەتۆ باشتری لێ دەزانم؛

دوورگە بەختیارەکان هەروان لەشوینی خۆیان.. بێ دەنگ بە هەی سەردولکەی دەم بەهاوار! تۆ پەلە هەوریکی بەسەر زەردەخەنەی بەیان دا دەی بارینی، فرمیسکەکانت تەریان کردم بەلاّم لەخۆمیان دادەتەکینم و لیت بەدوور دەبم.

ئەدی نامبینی بەچاکە مامەلەت لەتەك دا دەکەم؟.. سەریشت لەم کارە سوور نەمینێ؛ چونکە تۆ لە قەلەمرەوی من دا میوانی.

ئەو لەم جەنگەلەدا بەرەو سەرچاوەی دەنگی ((فریا)) تێ هەڵ دەکەم تامرۆڤی بالاّ بدۆزمەوە، لەوانەیە لەنیو درندەکاندا تووش هاتبێ.. من لە قەلەمرەوی خۆم دا پاریزگاری دەکەم تووشی زیان نەبی.. ولاّتەکەشم پر درندەیە.

هیشتا زارا تەکانی بەخۆی نەدابوو نجومگەر دایە قاقای پیکەنین و گوتی: زارا! تۆ هەر وا ئۆینبازی.. ئەوە گەرکتە خۆتم لی بدزیتەوە.. خەریکی درندە راونانی؟ بەلاّم راکردنەکەت چ سوودیکت وەدەست ناخا؛ دەبینی کاتێ دەگەرییتەوە ئەشکەوتەکەتم لی زەوتکردووی.. دەم بینی وەك لیژنەداریکی قورس تییدا چوارمەشقی رۆنیشتووم؟!

کەزارا بەرەو جەنگەڵ دەرۆیشت پیی گوت:

چۆنت گەرەکە با وەها بێ. هەرچی لەمغارەکەم دایە بائەویش بۆ تۆ بێ؛ چونکە تۆ میوانی منی.. ورچی بۆلە بۆڵ کەر لەگەڵ تۆمە! ئەگەر لەمغارەکەم دا چکیك هەنگوینت دەست کەوت دەتوانی بیلیسیتەوە تاوەکو تالاّوی دەروونتی پێ کەم بکەیتەوە لەم ئیوارەیەدا بەبۆنەی تیپەربوونی ئەمرۆوە دەی کەینە بەزم و ئاهەنگ.. تۆش وەك ورچیکی رۆشنبیر لە گۆرانی و سەمادا بەشداریم دەکەی. دەتبینم وەك قسەکانم نەراستینی، سەرت رادەوەشینی؛ کەواتە ئەی ورچەپیر برۆ بەریگای خۆتەوە.. بەلاّم بشزانە منیش نجومگەریکم بۆ خۆم.

زارا ئاوای گوت...

## گفتوگۆ لەگەڵ دوو پاشادا

### ١

لەوکاتەدا کە زارا دایە قەد کەژەکەو خۆی کرد بەدەوەنە جاردا، سەعاتیکی نەخایاندبوو کاروانیکی سەیری هاتەرێ، کەبینی: ئەوا دوو پاشا سەرو تاجیان

ناوەتەسەرو پشتینی ئەرخەوانییان لێ بەستووەو کەریکیان بەبارەوە داوەتە بەرخۆیان . زارا لەدلی خۆیدا گوتی: دەبێ لەزەمینەی مندا ئەم دوو پاشایە بۆچی بگەرین؟ خیرا لەبن درکە چارەچەقیلەیەکدا خۆی پەنادا تا کاروانەکەی لێ نزیك بووەوە؛ ئەوجا لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بەتورەتور: بەراستی شتیکی سەیرو سەمەرەیە ! ئەوا سەرنج دەدەم کاروانەکە دوو پاشایە کەچی یەك کەر دیتە بەرچاوم؟!

بەپیکەنینەوە پاشاکان وەستانو ئاوریان بۆ شوینی ئەو دەنگە کزەدایەوە، پاشای دەستەراست گوتی: لەلای ئیمە ئەو جۆرە بیرو ئەندیشانە بەدڵدا تێ دەپەرن.. بەڵام کەسیکی ئەوتۆ نیە دەریان ببرێ.

پاشای دەستە چەپیش شانیکی هەلتەکاندو گوتی:

لەوانەیە قسەکەرەکە شوانیك بێ.. خەلوەت نشینیك بێ.. دیوانەیەك بیو لەمیژ بێ لەنیو ئەم دارو بەردەدا ژیابێ. ئەو رەوشتانەی پالفتەن بەهۆی دابران لەکۆمەلەوە خراپ دەبن.

ئەو پاشای کەیان کە نیشانەی خەمناکی پیوە دیارکەوت گوتی: باسی رەوشتە پالفتەکان دەکەی! ئەی لەتاو رەوشتە پالفتەکان گرۆهەکەی لەمەر خۆمان بەجێ نەهیشت؟.. لەنیو شوانە ویلەو خەلوەت نشینەکاندا بژین باشترە لەوەی لەنیو گرۆهەکەی خۆماندا بژین؛ ئەوان بەزیرو شتی وا خۆیان رەخشاندووەو بەرووکەش رووخسارە درۆزنەیان تاسلووس داوە. ئەرێ پشتو نەژادی رەسەن چ سوودیکی هەیە بیتو ئەوانەی فیشالی پیوەدەکەن داوەشاوینو بە تەواوی خوینەکەیان بەکۆنە نەخۆشی، خراپ بووبێو پزیشکە نەفامەکانیش دەستیان تیوەردابێ.

لەنیو ئەو خەلکەدا جووتیاری ساغ لەهەموان پەسندترە چونکە بەخۆراگریو توندو تۆلییەوە لەم زەمانەدا لەهەموو جۆرەکانی مەردوم شکۆمەندترو بەناموسترە.

جووتیاری ئەم زەمانە خاسی کۆمەلە، جیی خۆیەتی کە چینی جووتیاران فەرمانرەوابی، بەڵام کە لەگەڵ فەرمانرەوابێ–لە ئیستاش بەدوا پیی هەلناخەلەتیم– بریتییە لە ئاپوورەی هەموو چینەکانو تیکەلەیەکە لەقدیسو پەرستگارو بەدنمەكو گەداو باغلو جولەکە، کە لیی ورد دەبیتەوە وا دەزانی ئەو حەشامەتەیە کەشتییەکەی نووح کۆی کردوونەتەوە.

بە چ حالیکەوە ناوی نەریتە جوانەکانی بەرین، ئەوەی هەمانەو نیمانە بریتییە لە رووپامایی و خراپەکاری و هەموومان– مانای ریزمان فەرامۆش کردووە. ویستمان لەدەست سەرجەمی ئەمانە رابکەین ئیدی چاومان لەچاوی ئەو سەگەلە ببرێ کە ئاغری قلیدەیەو کوشتەی چاوچنۆکی و چلپەیە.

ئیستا بەتەواوی بیز دەکەمەوە؛ چونکە ئیمەش درۆزنین، وامان لی هاتووە بەداوین بەردانەوەی کەوا شەیتانبیزییەکانی باوانمان خۆمان رادەوەشینین کە زەمانە پۆلکاندوونی.. بەنیشانە ئافەرین خۆمان ئاغر دەکەین تاوەکو کۆمەلە فیلبازو نەفامەکانیان پێ سەرسام بکەین و یاریدەی ئەو دەستەیە بدەین کە بەسوودو قازانجی بێ ئەندازە لەگەڵ هەموو دەسەلاتداریکدا مامەلە دەکەن.

ئیمە یەکەم داراو سەروەر نین، پێویستە چی ئەوان لەسەری رۆیشتوون ئیمە وەها نەبین، بەراستی شەکەت بووین و بەفیلبازی و فریو دانەوە مربووین. وازمان لەگەلان هیناوە.. لەئاژاوەچیەکان لابەلووت بووین.. لەو جروجانەوەرانەش تەوەلا بووین کەدەستیان بەسەر قەلەمەکاندا گرتوون.. ئیدی لەدەست بۆچرووك و بۆساردی خان و دووکانەکان رامان کرد لەدەست ئەو هەناسەبرانە رامان کرد کە لەسنگی کۆلەوارەکانی کۆششدا غەرغەرە دەکەن.

دەك بەزیاد نەبێ زیندەگانی نیو گەلان!.

قور بەسەر ئەوانەی دەکەونە بەرایی گەلەوە!..

ئەوە پاشایان بەچی دەزانی هەقت چیە بەسەریانەوە؟!

پاشای دەستە چەپ گوتی:

وادیارە کۆنە دەردەکەت سەری لی هەلداویتەوە... برای خۆم! نۆبەتیی بیزکردنەوەت لی هاتووە، بەلام ئاگات لەوە نیە لەم ناوەدا کەسیك هەبی گویی لە قسەکانمان بووبێ.

زارا لەبۆسە هاتە دەرێ و گفتوگۆی پاشاکانیشی بیستبوو، ئەوجا لییان هاتە پیشێ و گوتی:

ئەو کەسەی گویی لەئیوە گرتبێ و قسەکانتانی بەدڵ بووبن کابرایەکە ناوی زارایە، منیش ئەو زارایەم کە دەلیم:

((ئیدی دەبێ پاشایان چ بایەخیکیان هەبێ؟!))

چیتان گوت لەوەبەر گوتوومە، کەواتە با خۆشی یەکەم بەکالانەبی و بم بەخشیّ! مایەی شادیمەو جاری دەری نابرم چونکە ئەوەی لەمەوپیش گوتم لەئیوەم بیستەوە.

ئیستا ئیوە لەولاّتی مندان و لەژیر دەسەلاّتم دان، ئەوجا منەی چیتانەو بەتەمای چین؟ دوورنیە ئەوەتان دۆزی بیتەوە کەمن بۆی ئەودالم.. من لەمرۆڤی بالاّ دەگەریم.

جووتەی پاشا دایان بەسنگی خۆیانداو گوتیان: ئەیەرۆ! تازە کارەکەمان ئاشکرا بوو. کابرا! بەم قسەیەت ناخی دلمانت سمی، بەو هۆیەشت زانی کەئیمەی بەمەرد بردووە.. دەرۆین تا بەسەر مرۆڤی بالادا دەکەوین. ئەو مرۆڤەی کەلە ئیمەی پاشا پاکزاترە.. ئەم کەرەشمان بۆ هاوردووە؛ چونکە پیّویستە مرۆڤی بەرز مامۆستای بەرز بیّ.

کەهات و دەستەی فەرمانرەوا لە هەلبژاردەو پاکزای مەردومگەل نەبوون ئەوپەری مەرگەسات زەمین لە قاقۆزە دەنیّ؛ درۆزنی و ناپەسندی پەرەدەستینن؛ کاروبار لەتەوەری خۆی دەردەچیّ و دەئالۆزکیّ..

کەهات و سەردارەکان لەقوتەو لەواری مەردومگەل پەیدابوون.. تۆ بلیّ لەزۆلەك و ئاژەلی نەتەوە پیکهاتن گەل خۆی قنج دەکاتەوە.. بەرادەیەکیش خۆی قنج دەکاتەوە دەت کاتە گویّ بیستی دەنگی خۆی کە دەلیّ:

(( هەرمنم پاکزای پەسندو پەسندایەتی))

زارا قریواندی: ئەوە چیم بیست؟.. پاشاکانیش جۆرە پەندو دانایی ئاوهایان لەلا هەیە؟! بەراستی ئەو گوتانە بەهرەی منیان ورووژاند، لەمەودوا بەئەلهای ئەم بەهرەیە پارچەیەك دەهۆنمەوە، لەوانەشە زۆرینەی مەردوم گویچکەیان پیی ئاشنا نەبیّ. بەلاّم لەدیر زەمانەوە مەرایی ئەو گوییانەم لەبیرخۆم بردۆتەوە کە دریژن!

کەرەکە- وەك نارەزایی دەربریّ - زەراندی، زاراش گوتی:

"لەو زەمانەدا، لەیەکەم سالی میژووی تازەدا،

"خواوەندی پیشینیان بەبیّ مەی هەلدان هاواری کرد،

ئیدی گوتی:

((وەی، خاکە سار.. بارودۆخ بەدو خراپ!

"چ نزمایەتییەکە! پیش ئیستا جیهان دانەرمایە

ئەم جۆرە چالگانەوە.

رۆما بوو بەسۆزانی‌یەك..

"قەیسەرەکەشی هیندە دانەوی ، گەیشتە پلەی ئاژەلی

"تەنانەت خواوەندەکەش، بووبە یەهوودییەك"

## ٢

جووتە پاشا سروودەکەی زارایان پەسەند کرد، پاشای دەستە راست گوتی، بەختی خۆمان بوو کەبەئیرەدا ملی ریگامان گرتو تووشی تۆ بووین، چونکە ناحەزەکانت لەسەر ئاوینەی نەفسی خۆیان وینەی تۆیان پیشان داوین: دەق شەیتانیك بووی بەقەشمەری‌یەوە قاقا دەحیلکایەوە.. ترسو بیمی پەچنی بووە دلمانەوە.. بەلاّم وتەو ریبیرەکانت گوییان سمین تا هەناومان راتەکینو بەسەر ترسو بیمەکەماندا زالّ بن کەسیمای دەموچاوە رمووزنەکەت ئەوسا خستبوویە دلمانەوە. ئەوجا کەوتینە ریّ تا بەدیدارت بگەین. تۆ ئەو کەسەی کە گوتووتە: پیّویستە ((ئاشتی)) مان بەو مەرجە خۆش بویّ کەدەبیتە هۆیەك بۆ هەلگیرساندنی جەنگە تازەکان.. ئاشتی کورت ماوەتان بەلاوە باشتربیّ لەشەر وەستاندنی دریژماوە))

پیش تۆ کەسیکی دی ئاوا بەنیشانبەند (ئایە)ی جەنگەوە کرکەی نەکردووە کە فەرمووتە : ((هیچ چاکەیەك ناگاتە ئازایەتی، مەبەستی باش لەجەنگدا پاکانەی گشت هۆیەك دەکا)).

ئەی زارا! کە فەرمووە جەنگی‌یەکەتمان بیست خوینی باپیران لەدەمارەکانمان دا جۆشا بەچەشنی ئەو کۆنە شەرابەی هەر ئەوەندە چپەو سروەی بەهاری بیستو ئەنگاوتی لەدنگەکاندا قولپ ئەدا، باپیرانمان ئەو کاتە لەزەتیان لە ژیان کردووە لەکۆری خەباتدا دەستەو یەخە بووبن، وەك ئەو گورزە مارانەی لە تیکئالأندا خوین دەتکینن.. بەلی خۆری ئاشتی لە چاوی باواندا نووریکی ویل کراوبووە.. جەنگ راگرتنی دریژ خایەنیش بۆ ئەوان سەرجلی ریسوایی بووە.

ئای کەباوانمان ئاخیان هەلکیشاوە کەبینیویانە رمو تیری تیژ بەقەد دیواری کۆشکەکاندا بۆ خۆیان شۆر بوونەتەوە،

"لەهەناوی خۆیانرا هەستیان بەتینویتی سەرەرمەکان دەکرد))

((کەئاسن ئارەزووی هەڵ گیرساو بۆ خوین خواردنەوە گری سەند بریق و باق پەیدا دەکا!))

هەروا پاشاکان بەگەرمی باسی بەختەوەری باوانیان دەکرد؛ سەبارەت بەوە چی مایەی گاڵتە پێ هاتن بێ لەزارادا ورووژا، کە روانییە رووخساریان بیدەنگی و ناسکییان لێ دەباری ددانی بەخۆدا گرت و گوتی: دەی باتیهەڵ بکەین بۆ سەر لووتکە، بۆ نیو ئەشکەوتەکەی زارا، لەئیوارەوە شەوارەیەکی دوورو دریژ دەست پێ دەکا، چاریش نیە دەبێ بەجیتان بهیلم؛ چونکە لەدوور دوورەوە گویم لە هاواری یەکیکە دەبێ فریای بکەوم.

پاشاینە! ئەشکەوتەکەم بەمیوانداریتان شەرەفمەند ئەبێ. چاریش نیە دەبێ زۆر باش چاوەروان بن؛ ئیوەی پاشا چاوەروانیتان بەلاوە گران نیە، چونکە لەشارنشیندا خووتان پیوەگرتووە.

ئایە پاشایان بیجگە لەئارامو چاوەروانی چ سیفەتیکی باویان بۆ ماوەتەوە؟!

زارا ئاوای گوت...

## زەروو

زارا ریگای گرتە بەرو لەبیرکردنەوەی خۆیدا نوقوم بوو. ئیدی لەبلندانیی کەژەوە داپەرییە خواریێ تا گەیشتە زەلکاوەکان. ناگەهان ئەوەندەی زانی لەکابرایەك هەلەنگوت و حەپەسا زەلامەکە راتەکاو بەئازارەوە قیژاندی و یەك لەسەریەك بەجنیوی ناشیرین دای گرتەوە، لەم بەرەنگارییەدا زارا داردەستەکەی لێ بەرزکردەوە .. بەلام دامرکایەوە گەمەشی بەخۆی دەهات گوتی: داوای بووردنت لێ دەکەم. تکاشت لێ دەکەم مۆلەم بدە لە بارەی ئەم جۆرە رووداوانەوە پەندیکت بۆ بگیرمەوە:

((ریبواریك بەچۆلەوانی دا رادەبوورد.. بیرو ئەندیشەی خۆی بۆ مەودای دوور رایی کردبوو.. ناگەهان لەسەگیك هەلەنگوت کە لەژیر تیشکی خۆردا لیی نوستبوو، ئیدی وەك دوو میملی خوینە خۆر بەترس و لەرزەوە بەرامبەر بەیەکدی وەستان.

بیتو ریکەوتەکان هیندەی سەرە پەنجەیەك گۆرانکاری یان تیدا بوایە سەگەکەو کابرای تەنیا گەمەو دەستبازییان دەکردو سلیان لیکدی نەدەکردەوە.

ئەی ئەوە نیە هەردووکیان تاکانەی چۆلەوانین ؟!

کابرای بەرەنگار بوو کە لەرقانا خۆی دەخواردەوە گوتی: کابرا! هەرکەسێ هەی کەیفی خۆتە، ئەو دەست دریژیەی بەسەر گوزەشتەکەت کردتە سەرم کاری گەرتر بوو لە دەست دریژیی خۆپیکیشانەکەت. دەی سەیرم بکە! ئاخۆ من سەگم؟!

کابرا کە قسەی دەکردو خۆی دا بوو بەسەر زەوی‌داو قۆلی بەرووتی داهیشتبووە زەلکاوەکەوە، وەك بی‌یەوێ راوی شتیکی تیدا بکا.. قۆلە رووتەکەی لەقورەلیتەکە دەر هاوردو راستەوەبوو.

کە زارا دیتی ئەوا خوینیکی زۆر لەقۆلی کابرا دەتکێ هاواری لی کرد: هەی نەگبەت! چیت لی قەوماوە، ئەوە زینەوەر گەزتووتی؟

کەپشتی وەرچەرخاند بروا بەریی خۆیەوە بەخەشمو تەوسەوە وەڵامی دایەوە:

هەرکەسێ هەیت پەیوەندیت بەمنەوە نیە، من نیشتەنیی ملکی خۆمم، پێویست ناکا وەڵامی گەوجیك بدەمەوە.

زارا ئاو قەدی بوو گرتی، بەزەییشی پیدا دەهاتەوە، پیی گوت: بەهەلەداچووی لەملکی خۆتدا نی‌و لە ملکی من دای، ناشبێ ئەو کەسەی لەقەلەمرەوی من دا بێ تووشی زیان بێ، حەز لە چ ناویك دەکەی بەو ناوەوە بانگم بکە.. من ئەوکەسەم کەدەشێ هەبم.. بەلێ هەبوویەکمو خۆم ناوناوە –زارا– . وەرە شوینم بکەوە بچینە ئەشکەوتەکەمەوە تا لەوێ برینەکانت بۆ تیمار بکەم، تۆ سەر سەختو بەدبەختی؛ جانەوەر گەزتووتی‌و مەردومیش پێ شیلی کردووی!

هەر ئەوەندە ناوی زارای بیست روخساری گۆراو رەنگیکی هیناو برد، قریواندی‌و گوتی: لەم ژیانەدا گرنگی بە چ شتیك بدەم بیجگەی ئەم مرۆڤە تاکانەیە کە ((زارا))یەو بیجگەی ئەو زیندەوەرە تاکانەیەی کەلەسەر خوین مژین دەژی کە ((زەروو))یە؟!

بۆ ئەم زیندەوەرە خۆم دابەزەویدا کەچی دەجار دەستی گەستم، ئەوەش زارا دیسان دەم گەزێ.

چـەند بەختـەوەرم كـە ئـەمڕۆ لەقەبـەلم نووسـراوە لـەم زەلكـاوەدا بم تالـەنیو زیندەوەردا پیرۆزبایی لـەچاکترین خوێن گر بکەم.. تـاوەکو پـیرۆز بـایی لـە زەرووی گەورە (زارا) بکەم کەبەدڵانەوە هەڵ زناوەو هەلیان دەملیسێ.

بەبیستنی ئـەو قسـانە زارا کـەیف خـۆش بـوو، دەسـتی دریـژ کـرد بینیتـە نیـو دەستیو پیی گوت: ((ئەرێ کابرا تۆ کیی؟)) لەنیوان منو تۆدا زۆرشت هەیە گەرەکە روونیـان بکەینـەوە. بـەش بـەخۆم ئەو یەکاڵیـەم بـەلاوە گران نیـە. ئـەوا رۆژ بـووەوەو هەموو شتیکی وەدەرخست.

کـابرا وەڵامـی دایـەوە: مـن ((نیـهادی بـیر))م هیـچ کاریگـەریك بیجگـەی زارای مامۆستام هیندەی من خۆگرو بەندیوار نیە. لییەوە فیر بووم: ((بۆ مرۆڤ ئەوە باشترە لە چاوی نەفسی خۆیدا شیت بێ نەك لەچاوی مەردوم دا- دانابێ)).

من ریبـواری ناخـەکانم، دەربەسـت نایـەم بـەروماوە تـەنگ بـێ یـان گوشـاد بـێ، بەلامەوە جیاوازی نیە بناوان زەلکاوبێ یان ئاسمان بێ، لـەم زەمینـەدا هینـدەی لپـە دەسـتیکم بەسـە کـە بەسـتبیتیو بەکـەلکی جێپێیـەك بـێ. لەئاسـت ئـەو زانسـتە سەربەنیهادە شتیك نیە بەگەورە یان بەگچکە دابنرێ.

زارا گوتـی: کەواتـە دوور نیـە بـۆ ئـەوە رەنـج بـدەی دەرك بـە کانگـاو نیـهادی زەرووبکەی، ئەوجا بەخۆتو نیهادەکەتەوە بەرەو بناوان داخزینو لیی بگەرین.

وەڵامی دایەوە: نـەخیر زارا ! چۆن دەتوانم ئەو کارە مەترسی دارە بـەجێ بهینم، زانیـاری یەکـەم لەمیشـکی زەروو بـەو لاوە بـر ناکـا.. لـەروانینی مـن دا بوونـەوەر لەمیشـکی زەروودا پـەنگ دەخواتـەوە، ئایـە ئـەم بـۆ شـاییەش -قـەبارە میشـکی زەروو- لەخۆیدا بوونەوەریك نیە؟ کەبلیم من لەم مەبەستەدا مامۆستامو ئاغریم پیوە دیارە ئەوا داوای لێبووردنت لێ دەکەم. لەبەر ئەوەش بوو کەپیم گوتی ئیرە ملکی منە. ئەوا زەمانیکی دوورودریژم بەسـەردا تـێ پـەرێو هـەموو تەقەلایـەکم بۆ لیکۆلینـەوەی ((میشـکە زەروو)) تـەرخان کـرد؛ تـاوەکو راسـتیم -بەهـەموو وردایـەتی یەکانیـەوە- لەدەست دەرنەچێ.. تـەنیا لـەم مەبەسـتەدا - دەسـەڵاتم خۆی رادەداو پشتم لەهـەموو شـتیکی دی هـەڵ کـردووە؛ لەبـەر ئـەوە (زانـین)م بەتـەریبی لەگـەڵ (نـەزانین)م دا بـە ئاوملی دەرۆن. نیهادی بیرکرنـەوەم ئەوەی لەقەبەڵ نووسراوە کـە یـەك شـت بـزانمو سەرجەمی شتەکانی دیکە نەفامم: وام بەسەر هاتووە کە رقم لـە هـەموو کردەوەیـەکی

بیری بێ بەومەرجەی لەنیو قۆناغی خۆی تێ نەپەڕێ.. وام لی هاتووە رقم لەهەموو مەردوومیك بێ لەپەرۆش‌و دوودلی خۆی‌دا بیرو هۆشی لیخن بووبێ.

کەنگێ بۆ بیرو باوەرەکەم دواچۆری دڵ سۆزیم هات ئەوە سەرەتای سەرکویریمەو بەکویر بوونیش قایلم.

کەویستبیتم شتیك بزانم بەدڵ رەقی‌و دەمار توندی لام لی کردووەتەوە، لەپیناو خۆشەویستی ئەودا بۆ لای هیچ شتیك وەرنە سووراومەتەوە. ئەرێ زارا ئەوە تۆ نی کە دەلیی: ((ژیان لەخۆی‌دا نەشتەریکە بۆ یەکالای ژیان))؟ ئەم قسەیەت وای لی کردووم پەیرەویی بیرەکانت بکەم.. بەهەمان سەبارەتەوە توانیم خوینی خۆم بدەم‌و ماریفەت‌و زانیاری بەهرە گیر بکەم.

زارا گوتی: ((واقیع‌و هەلکەوت قسەکەت دەچەسپینێ))

هیمای کرد بۆ باسکی کابرا کەخەلتانی خوین بوو.. دە زەرووی پیوە هەلەرۆسکابوون‌و هەلیان دەملیسی، دیسان هاتەوە قسە:- ئەی ئادەمی‌یەکە! ئەم بارو دۆخەت پرە لەدەرس‌و پەند.. تۆ لەخۆت دا ئامۆژگاری. ئیدی زات ناکەم هەموو پەیرەوەکانی خۆمت پی بلیم.

با - لیرە لیکدی بترازیین. حەزیش دەکەم دواتر بت بینمەوە.

ئەو ریچکەیەی هەڵ دەکشێ دەچیتە سەر ئەشکەوتەکەم، ئیدی تی هەڵکەو بۆ ئەوێ برۆ؛ ئەم ئیوارەیەش ئەندامیك دەبی لەنیو میوانەکانم دا.

لەو حەلەدا پێشیلم کردی بەخۆت دا شکایتەوە، ئیستاش ئەوەتام ئاشتت دەکەمەوە.. بەلام ناچاریشم بەجیت بهیلم؛ ئیدی ئەرۆم بۆ ئەو شوینەی لەدوورەوە دەنگیك هاوار دەکا من فریای بکەوم.

زارا ئاوای گوت...

## جادووگەر

### ١

هیشتا زارا لەپیچی ریگاکەداو لە نەدیوی کەنەکیکەوە هەڵ نەچەرخابووەوە زەلامیکی لی وەدەرکەوت ئەوا بە جموجولیکی سەمەرەوە دیتە پیشەوە.. وەك

شــیتەکان خــول دەخواتــەوەو بەراخزانــەوە بەســـەر زەویدا خۆیرەهیــڵ دەکــا، ویستەیەکی کردو لەدلی خۆیدا گوتی: دەبێ ئەوە مرۆڤی بالابێو هاواری فریاد بکا، کەواتە پێویستە فریای بکەوم. چێ ببینێ! پیریکی دی هەرچی ئەندامی لەشیەتی هەڵ دەلەرزیو چاوی زەق دەچوونەوە.

گەیشتە سەرییو هەولیدا راستی بکاتەوە، بەلام بێ هوودە بوو. پیرە وەك لەهۆش چووبی هەستی بەوە نەدەکرد کەسیکی بەدەورەوە بێ. وەك نائومیدیکی لاکەوتە لە پالەوە سەرە سوورکیی بوو، هیمای لەکیس چوونی پیشان دەدا، دوای ئەوەی تەپاو تلیکی کردو گرمۆلە بو، دەستی بەنالین کردو گوتی:

*کی گەرمم دەکاتەوە؟.. ئیدی کێ خۆشی دەویم!

*دەستی گەرمو نیانم وێ دەن.. دلی گرگرتووم وێ دەن.

*لەگیانەلادام، بۆ ئەو لپەدەستانە داماوم قاچە ساردەکانم بگلۆفن.

*راچەنیوم.. نەرمەتا دەمی تێژەنیوم..

*هەڵ چۆقیوم.. گرە، دەم پروکینێ.

*ئەی بیری بێ ناو! نیچیری تۆم.

*ئەی ترسناکی خۆپۆشیو، لەهەوران پیچراو،

*بەچاوانەوە لەتویی تاریکیدا لیم بزدەبنەوە،

*ئەوا من رەهیلم بەسزای ئەبەد، لەژیر زەبری تۆدا گینگلە ئەدەم..

*ئەی راوچی دڵ بەرد- تۆ- ئەی خواوەندی نادیار.

***

*بەتوند ترین زەبرەوە هەڵ کوتە سەرم، دیسان دام پەلۆسە.

*ئەم دلە ونجرکە.. شارەگی بن برکە.

*ئەوە چیتە بۆ ئەوەندە ئازاردانم دەخایەنێ؟.

*بەسەر پەیکانی کول، دەمریز تیرەندازم دەکەی ..

*چاوەروانی چی دەکەی، لەچاوە توورەکانتا بریسکەی خوایەتی‌یە؟

*ئەرێ لەئازاردانی بنیادەم بێزار نەبووی؟

*ئەوەتای لەکوشتن خۆداری دەکەی..

*تەنیا مەبەستت ئازاردانە..

*ئەی خواوەندی تۆسن‌و نادیار!

لەپای چی ئەشکەنجەم ئەدەی؟!

***

*ئاخ چاوم لیتە لەشەودا خۆت بۆ لای من کیش دەکەی.

*چیت گەرەکە؟.. دەبیژە ، بیژە.

*چاوم لیتە تەکم پی ئەدەی، تەنگم پێ هەلدەچنی.. ئائەوەتە خۆتم پیوە دەنووسینی.

*تۆ لە گیانەڵادا هەست بۆ هەناسەم.. بۆ ترپەی دلەکەم دەگری.

*ئای چۆن زرگنیکی !زرگنی چیم پێ دەبەی؟

*دەی! لیم بتەکیرەوە.. لیم بتەکیرەوە..

*ئەو پەیژە چیە بۆم دەنیی بەشانتەوە؟.. دەتەوێ پییدا سەرکەوی.

*تا خۆت بخەیتە دلمەوە؟!

*ئەوە گەرەکتە بەناخی بیرەکانم دا برۆیتە خوارێ!

*هەی خۆ بەزل پیشاندەری نادیار.. هەی دز،

*دەتەوێ چی بفرینی؟.. دەتەوێ چی ببیستی؟

*ئەرێ منەی چیتە.. درەی چیتە؟! تۆ، ئەی ئازارخوا!

*تۆ ئەی خواوەندی دەست وەشینی بکوژ؟!

*ئەوە گەرەکتە وەك سەگ خۆم فرێ بدەمە بەرپێت؟

*ئەوە گەرەکتە مەستانەو بەهیری بیمە پیشەوە،

لۆژە لۆژ خۆشەویستیت بۆ بگرم بەکۆلمەوە؟

***

*بەخۆرایی تێ دەسرەوینی.. دەی دڵ رەقی بێ رەزا تی سرەوینە!

*ئەی میرشکار! نەسەگی تۆمو نەنیچیری تۆم..

*ئەی دزی لەهەوران پیچراو من دیلی تۆ نیم.

*ئەی چاو شارکێ بازی نەدیوی هەوران.. قسەبکەم، ئەی نادیارەکە قسەبکە!

*دە بلێ! چیت لەمن دەوێ.. ئەی خۆ لە بۆسە دەر: بۆ سەرجەمی ریبواران؟

***

*ئای کە سەیری! داوای تەمیانە دەکەی؟

چ تەمیانەیەکە– داوای دەکەی؟!

*نەفس بەرزیم تیت دەگەیەنێ بەکەم دانەکەوی، فرەخوازیە.

*لەولاشەوە نەفس بەرزی دووەمم هیمات بۆ دەکا:

ئیدی زۆر مەریسەو بەکورتی بدوێ.

*ئاخ.. ئەوەی تۆ داوای دەکەی– هەمووی منە–!

***

*ئای کەشیتی ! ئازارم ئەدەی ماندوم دەکەی،

ئەوەتای جوامیریم ئەشکەنجە ئەدەی؟!

*خۆشەویستیم بدەرێ.. کێ گەرمم دەکاتەوە..

ئیدی کێ خۆشی دەویم..

*دەستی گەرمم وێ دەن.. دلی گرگرتووم وێ دەن.

*پیم ببەخشە؛ حەزۆکی تاکم.. بەتەنێ لەشەختەدا تامەزرۆم تەنانەت بۆ لای دوژمنانم.

*داوات لی دەکەم تەسلیمی خۆی بێ، هەرچەند دوژمنیکی لەهەموو کەس پتر ستەم ریژی.

*بەڵام خۆی نەدیو کرد! هەڤالی تاکانەم ئاوابوو.

گەورەترین دوژمنم بوو:

بوونەوەری نادیار.. خواوەندی بکوژ و ببر.

***

*نا..نا، مەرۆ..

بگەریوە.. ئاوەرە سزام بدە.

*وەرەوە بۆ لای دواین تەنیا خواز،

بەتاسەی تۆوە فرمیسکم هاژە دەکەن،

*دواین تیشکی دلەکەم،بۆ لای تۆ خۆی دەهاویژێ

*ئاخ.. وەرە بۆلام:

ئەی خوا نادیارەکەم،

ئەی ئازارەکەم،

ئەی ئەو پەری کامەرانیم!.[٣٥]

---

[٣٥] کە ئاخت بۆ گەرانەوەی خوای نادیار بێو ئەویش ئەوپەری مایەی ژانو بەختەوەریت بێ ئەدی ئەمە باوەر هینانو ئیمان نیە بەخواکەی هەموو جیهانو گەردوون؟!

٢

شۆرشی زارا هەڵ گیرساو گەیشتە رادەی خۆی. داردەستەکەی لی هەڵ بریو پەلۆست. دایە گریەو پارانەوە، ئەویش بەپیکەنینیکی پر لەرقەوە پیی گوت: هەی جادووگەر! بێ دەنگ بە، هەی رووکەش .. هەی درۆزن!.. زانیومە تۆ کیی.

هەر ئیستا لوولاکانت فەلاقە دەکەم.. بۆ خۆم دەزانم لەگەڵ ئیوەماناندا چی دەکەم. پیرە راستەوەبوو، هاواری کرد: زارا! جاریٚ بوەستەو لیم مەدە؛ ئەوەی لەمنەوە بینیت تەنیا بەزموگەمەبوو، گەمەش بەشیکە لەهونەرەکانم. ئیدی مەرەنجیٚ ویستم بۆ تاقیکردنەوە پیشانتی بدەم.

راستیەکەی بەناخی نیهادم دا رۆچووی؛ ئەوجا چی لەتۆدا هەیە منیش بۆ خۆمم گل داوەتەوە. زارا! تۆ کابرایەکی دڵ رقی و گالۆکەکەت دەم هینیتە زمان کە بلیم:

((زارا کابرایەکە بەتەنگە بەستەکەی خۆی خەلکی قەمچی وەشین دەکا!))

بەپیش خواردنیکەوە پیی گوت: ئەی چاوبەستکەری هەرچی گیان و رەوانە! مەرایی مەکە، تۆ ئەو رووکەشەی هیچ راستی‌یەکی تیدا نیە.. بۆشت نیە دەمت لەراستی‌یەکانەوە بژەنی!

ئەریٚ سەرتۆپی تاوسان.. هۆ –دەریای پر لەهیچ و پوچ، هەی جادووگەری دەم رەش! لەبەردەممدا چ دەوریکت پیشان دا؟.. وات دەزانی بەنالین و کوروزانەوەکەت باوەردەکەم؟!

پیرە گوتی: من دەوری (پاکانە بژیری و ئیزای هۆش)م نواندووە. ئەی هەر تۆ نەبووی کە ئەم دەستەواژەیەت داهینا؟. بەزمانی ئەو شاعیرە جادووگەرە قسەم کردووە کە هۆشی دەگۆریٚ و لیی هەڵ دەگەریتەوە تا بەکارخراپی و دل خراپی خۆی بزانیٚ.

---

کەواتە هیچ خۆت تیك مەدەو بە ((بیٚخوایەتی)) شەوە چی دی لاف لی مەدە.
ئالانی

زارا! ئەوە بە نمایشەکەی من فریوت خواردووە؟.. ئایە پیش ئەوەی خاکەساریم لی بسەلمینیٚ و دەست بنییتە ژیر سەرم ئەم فریودانەی منت بۆدەرکەوتووە.. لیم بیستووی بە ئاخوداخەوە دەت گوت: ((خۆشەویستی بەرادەیەکی زۆر کەم نەبیٚ خیری بەخۆیەوە نەدیوە)) ئیدی لەدەروونمدا خراپەی لەمەر خۆم دەستی کرد بەسەما.

زارا گوتی: پیشتر زۆر کەسی لەمن زیرەکترت فریوداون.من ئەو کەسە نیم بەرانبەر فیلبازەکان خۆپاریز بم؛ چونکە وەهام پیٚبراوە سل لەکەس نەکەمەوە.

بەشت هەر ئەوەیە مەردوم فریوبدەی، ئیشی ئیوەمانان لە من پەنهان نیە، باش دەت ناسم.. ئەوەش دەزانم کە (ووشە)کانت دووماناو سیٚ مانان تا دەگاتە چوار مانا .. ئەوەی ئیستاش پیت لینا نە ئەوەیە هەمووی راست بیٚ و نە ئەوەشە هەمووی درۆ بیٚ.

ئەریٚ درۆزنی رووکەشی بەدکار ! ئایە دەتوانی لەم بارەوە بچیتە سەر بارودۆخیکی دی؟.. ئەگەر رۆژیٚ لەرۆژان بەرووتی لەبەردەم پزیشکەکەتدا راوەستای ئەوا کاریٚ دەکەی دەردەکەت خۆی لەو پزیشکە بگۆریٚ. ئاواش لەبەردەم مندا درۆکەت لی گۆریم کە گوتت:

((ئەوەی لەمنەوە دیتت وازیو گەمە بوو)). وەلی نەختیك راستیت دایە پاڵ درۆکەت. لەهەندیٚ لاوە لەو کەسە دەچی کە پاکانە بژیری گوناهەکانی هۆشە.

سروستی تۆم لی ئاشکرا بوو، لە (جادوو) دا بەو پلەیە گەیشتووی خەلکی پیٚ چاوبگیر بکەی.. بەلاّم لە ریابازیو درۆدا ئەوەنی خۆتی پیٚ فریوبدەی، چونکە شکستە خەیاڵو هیوا ترازاوی، بیجگەی رق لیبوونەوە هیچ راستییەکت چنگ نەکەوتووە، وات لی هاتووە گوتەی راستت بەلاوە نەبیٚ، هەموو شتیکت رووکەش و قەلبە تەنیا لچو لیوەکەت نەبی یان بەولاترەوە ئەو قیزو بیزەی پییاندا لکاون

جادووگەر بەقرمنی‌یەوە نەراندی:

ئەریٚ کابرا! تۆ کیی تا مافی ئەوەت هەبی ئەم جۆرە قسانەم تی گریٚ کەلەم زەمانەدا من لەهەموو گیان لەبەریك مەزنترم؟

خيسەيەكی وای لەزارا كرد تیشكی سەوزی فڕێ دا.. وەلی كوتوپڕ دۆژ داماو بەدەنگیكی كزەوە گوتی:

ئەی زارا ! لیرەدا بەدەست هەموو شتیكەوە ماندووبووی، رقت لەسەرجەمی هونەرەكانم بووەوە؛ كەواتە مەزن نیم. خۆدەرخستنەكەشم بێ كەلكە.. بەلام وەك دەزانی داوای گەورەیەتیشم كرد، مەبەستم ئەوەبوو دەوری پیاوی گەورە بنوینمو باوەر پێ بوونی لایەنی زۆر بەدەست بهینم.. كەچی درۆكانم لەوزەی مندا نەبوون.. لەبەردەممدا بوونە لەمپەریك تیی هەلەنگوتمو ئەستۆم ورد بوو!

ئەی زارا... هەرچییەكی تیمدایە درۆی نیو ئاخنی درۆیە؛ بیجگە تیك رووخانم هیچ راستی‌یەكی دیكەم بەلاوە نیە.

كەزارا بەچاوەسوركێ زەوی دەبری وەلامی دایەوە:

ئەو حەلەی داوای گەورایەتیت كرد بۆ تۆ كاریكی شەرەفمەندانە بوو. بەلام نەگەیشتیتە مەبەستت، كەواتە تۆ گەورە نی.

ئەوەی لەتۆدا پەسندی بكەمو بەسفەتیكی چاكی بزانم، ئەوەیە كە بەخۆتەوە ماندووی، دیسان كە هاوارت كرد: ((من گەورە نیم)) كە پاكانەی گوناهی هۆش دەبژیریتەوە مانای وایە بەشی خۆت بەریزی. وابزانم ئەم بیركردنەوەیەشت لەترووكەیەك تێنەپەری، بەهەر حالْ لەم ساتە نیگایەتا راست گۆ بووی.

بەلام پیم بیژە: لەنیو لیرەوارو تاشەبەردەكانی مندا دەوروخولی چیتە.. كەخۆت لەسەر چەقی ریگاكەم دریژكردووە یەكانگیربین مەبەستت وەدی هینانی چ بورهانیكە لەمنەوە؟ ئەی سەبارەت بەچی ویستووتە داوی ئەزموونی خۆت بۆ من بنییتەوە؟

–كە چاوەكانی زارا ئاگریان لی دەبووەوە ئاوای گوت

–پیرەی جادووگەریش بۆخۆی دۆش داما. پاشان گوتی: ویستت خۆت تاقی بكەیتەوە، بەش بەخۆم تەنیا ئەودالی مرۆڤی راستو رەوانم.. مرۆڤیكم گەرەكە چی لەدلدابێ ئەوە دەربڕێ، خواستی منیش بریتی‌یە لەپردانی راستو مەزنە پیاو.

–ئەدی زارا! تۆ نازانی كەمن ئەودالی زارام!–

دوو قسەکەرەکە مات بوون، زاراش چاوی نانە سەریەك و نوقمی بیرکردنەوە بوو، ئەوجا دەستی جادووگەرەکەی گرت و بەهەموو ئەدەبیکەوە پیی گوت:

ئا لەوێ، لەسەر ئەو بەرزاییە ریگایەك دەچێ بۆ ئەشکەوتەکەم، لەویدا کیت بوێ دەستت دەکەوێ، هەر بەگەیشتنەجێ لە ئاشقە مارو هەلۆکەم بپرسە تا یاریدەت بدەن بەدریژایی و پانایی‌دا ئەشکەوتەکە بپشکنی.

لیت ناشارمەوە تا ئیستا من پیاوی مەزنم نەدیوە.

چونکە هەرچی زەبرە چاو هەیە ناتوانێ بکەویتە پەیدۆزو بەدوای مەزنایەتی‌دا ویلْ بێ، ئیمە لەحالی حازردا لەسەردەمی ((گەلان سەروەری))دا دەژین. ((فیزوگەورایەتی))[٣٦] زۆرم بینیوە خۆی لی راداوەو هەلاوساوەو گەلیش بەدەوریدا قوولاندوویەتی: ئائەوە پیاوە گەورەکەیە. بەلام مووشەدەمەی ئاسنگەر کە هەر برەویتەوەو هەوای تیدا نەمینیتەوە چ سوودیکی هەیە؟!

دیسان هەر بەو چەشنە هەوای بۆق دەردەچێ کەخۆی هەلْ دەئاوسینێ تا شەق دەبا. هیچ یارییەکیش هیندەی ئەوە خۆش نیە کە دریۆشەیەك بچەقینێ بەچەرمیکی فوودراودا. کەواتە رۆلەکانم گویتان لەم پەندە بێ.

حالی حازرمان رۆژی گەلانە.. ئەوجا بیجگە لە شیتەکان کێ دەتوانێ گەورەو گچکەی گەل هەلاویرێ.. بیجگەی شیتەکان کێ دەتوانێ داوای گەورایەتی و سەروەری بکا.. ئایە کەسیك هۆشو گۆشی لەکیس نەچووبێ توانیویەتی زال و زەفەرمەند بێ؟!

ئەی شیتە ئاوەکییەکە! دەت بینم بەدوای پیاوی ((گەورە))دا ویلی.. ئەرێ کێ ئەمەی بەتۆ راگەیاندووە؟

ئەری هۆ ئۆینبازەکە! لەم زەمانەدا ((مەزن)) دەست دەکەوێ؟.. بۆچی گەرەکتە داو لەبەردەمی مندا بنییتەوە ؟

---

[٣٦] بەپیی کتیبەکە ((العاقم)) نووسراوە لەوانەیشە ((المتعاقم) بێ بەلام دەست کاریم نەرکردو بەچاوك هیشتمەوە

زارا ئاواى گوت/ ئيدى خەمەكانى دان بەباداو پيكەنينيكى بۆ كردو ريگاى خۆى گرتە بەر.

## بەركەنار

زارا هيشتا وچانيكى ريگاى نەبرى بوو زەلاميكى كەتەى لى وەدەركەوت، لەقەراغى ريگاكەدا ليى دانيشتبوو. دەموچاوى لاوازو هەلّ بزركاو بوو. بەم تارمايىيەوە فرە وەرس بوو. لە دلى خۆىدا گوتى:

واى بۆ خۆم! ئەوەى من دەى بينم سەرتاپا خەم پۆشە، واديارە ئەم زەلامە لەتاقمى كاهينەكانە. نازانم ئەم خەلك و خوايە لەزەمينەى مندا چيان گەرەكە؟.

بەلىّ، لەدەست جادووگەريك قوتارم بوو كەچى كەوتم بەسەر چەمەرچييەكدا.. بەسەر جادوگەريكى ديكەى زەبەلاحدا، دەليى گردى مردوانە، ئەمانە لەو بابەتانەن كە منەتبارمان دەكەن گوايە شتى سەمەرەو نازو نيعمەتى خوامان پيرادەگەيەنن.. كەچى لەوسەرەوە ژيانمان لە بەرچاو ناشيرين دەكەن !! خۆ شەيتانيش نايە ئەم رەموزنە بفرينىّ.. كە ئيشيكمان بەشەيتان بىّ هەميشە خۆى بزردەكا.. ئەم نەفرينە ئەگەر بەدەنگيشەوە بى درەنگ دەگاتە جىّ!

زارا لەبەرخۆيەوەو پرتەو بۆلەى بوو، بيرى لەئۆينيك دەكردەوە لەبەردەمى رەشپۆشەكەوە تىّپەرىّو چاوى نەكا. بەلاّم كابرا هەر لەدوورەوە سووسەى كردبوو، وەك كەسيكى بە مراز گەيشتوو راستەوەبوو، خۆى كوتاكە يەكانگيرى بىّ؛ ئيدى پيى گوت:

–ئەى ريبوارى گەرۆك! جا هەركەسيك هەى. فرياى ئەم پيرە سەر لى شيواوە بكەوە كە لەم ناوەدا كەوتۆتە مەترسىيەوە.. لەهەمەلاوە گويم لەنركەو لرفەى درندانە. ليرە پياويك هەبوو دەمتوانى پەناى بۆ بەرم.. بەلاّم ئيستا ديارنيە. چەند گەرام جيگاكەى بدۆزمەوە بىّ سوود بوو.. خەلوەت نشينيكى هيندە سالحە ئەو

قسەو باسانەی لەم رۆژانەدا بەنیو خەلکدا بوونەتە قاو، هیشتا بە جووتە گویی ئەو ئاشنا نەبوون.

زارا گوتی: ئەریٚ پیم نالیی چ قسەو باسیکە؟.. لەوانەیە هەر ئەوەبیٚ کەدەلین : ((ئەو کۆنە خواوەندەی کە لەوەپیش باوەریان پیی هەبوو مردووە)).

کابرا بەکەسەریکەوە گوتی: من ویرای ئەوەش ئەو قسانەم کردوون خزمەتی ئەو خواوەندەم کردوە تا دوایین ساتی ژیانی.

ئیستاش چونکە بیٚ سەروەر ماومەتەوە بەرکەنار دەبم.. بەلام ئازادیشم بەخۆمەوە نەدیوە؛ لەبەر ئەوە بوومەتە بەدبەختیکی هیوا براو.. تازە چنگم ناگاتە بەختیاری مەگەر بگەریمەوە بۆ رۆژگاری رابووردووم. ئەوا هاتمە ئەم کیوانە تا دابورەسمی دین بەجیٚ بهینم، ئاهەنگی جەژن سازبکەم کە شایستەی سەرۆکی بالاو دیرینە بابەکانی کەنیسە بیٚ؛ ئەوەش من کە ((پاشینەی پاپاکان))م.

بەلام ئەو پەرستگارەی لیرە بوو.. ئەو جەنابەی بەسرووودی نویژەوە ستایشی خوای دەکرد مردووە؛ لەکۆخەکەیدا لیی گەرام نەبوو. تەنیا دوو گورگ لەبەردەم دەرگاکەی دا بەشیوەنەوە دەیان لووراند. تا لەژیان دابوو هەموو گیانەوەرەکان بەزەییان پیدا دەهاتەوە، ئیدی بەسەرگەردانی کەوتمە ریٚ، بریاریشم داوە زەرەرمایە نەگەریمەوە؛ ئیستا بەلایەکی کەدا لە پیاویکی دیکە دەگەریم، بەمەزەندەی من لەهەموو بیٚدینو خوانەناسەکان سالح ترە– ئیدی کەوتمە گەران بەشوین زارادا.

پیرە ئەمەی گوتو بەتیژی چاوی برینە بەرانبەرەکەی . زاراش دەستی دریژکردو لەپی کابرای ئەم دیواو دیو کردو جوان لیی وردبووەوە، ئەوجا پیی گوت:

جەنابی بەریز! دەستت چەند جوانە؟! بەراستی بەوە خایەنراوە بەمووفەرك ماچ بکریٚ، ئیستاش ئەوا لەنیو خودی دەستی زارادایە.

من زارای بی دینو نکوولم، گووتووشمە: لەکویی ئەم زەمینەدا لەخۆم بیٚ دینترم دەست بکەویٚ، بە ئامۆژگارییەکانی شادمانم..

وەك تير بچەقينيتە چاوەكانی پيرەوە تيی روانیو بە بيرەوەرييەكانیدا و بەنەديوی بيرەوەرييەكانیدا رۆچوو تاهاتەوە قسە:

كەس هيندە خوای لەكيس نەچووە- وەك ئەو كەسەی لەو پەری خۆشەويستی خواوە گلابێو بەهۆيەوە سەرووی هەموو شتيك كەوتبێ.

زارا! ئادەی سەرنجم بدەرێ، ئەی نامبينی زۆر لەتۆ خوانەناسترم؟.. بەڵام دەبێ كاممان بەم نكوولیيە لە ئەوی ديكە كەيف سازتربێ؟

زارا تاويك بيری كردەوە، ئەوجا لە سەرەخۆ گوتی:

تۆ پيم بلێ ئايە تا دوا هەناسەی ژيانی خزمەتت كردووە؟.. پيم ناليی چۆن چۆنی مرد؟.. ئەی ئەو قسەيە راستە كەدەلين: ((ميهرەبانی دەستی ناوتە بينیو خنكاندوويەتی؟.. ئەمەش لەبەر ئەوە بووە كە ديويەتی ئەوا مرۆڤ بە قەنارە= خاچەوە هەلواسراوە بەلايەوەگران بووە خۆشويستنەكەی ئەو - دەرهەق بەمەردووم- ببيتە ئەو دۆزەخەی مەلبەندی نەمانە)).

پيرەكە بەدەوری خۆيدا ئاوری دەدايەوە بێدەنگ بوو بەرادەيەك دەموچاوە مۆنەكەی ئازاريان لی دەباری.

زارا لەسەر قسەكانی رۆيشت:

-وازی لی بيرە.. ليی گەرێ بابروا. چار نيەو هەر دەبێ بەهيلاك چێ. تۆش ئەمە دەزانی، راستە كەدەبێ ناوی مردوان بەچاك ببرێ.. بەڵام رەوتو رەفتاريكی سەيری رەچاو دەكرد!!

پيرە گوتی: كەواتە با قسەكانمان لەبەينی سێ چاو دەرنەچن (پيرە يەكەڵ چاوبوو) لەبارەی خواو كاروبارەكانيەوە بەندە لەبارترە؛ چونكە سالەهای سالە خزمەتم كردووەو مل كەچی خواستی ئەو بووم. زارا هيندەی من شارەزای ئيشوكاری ئەو نيە؛ نۆكەران پەی بەزۆر شتی نهينی سەروەرەكانيان دەبەن. تەنانەت بری شت كەلەخۆياندايە و پيی نازانن ئەو نۆكەرە ملۆزمانە دەركی پێ دەكەن!

بێ گومان، خوایەکی پەنهانی تیوە گلاوی رازونهێنییەکان بوو.. لەراستیشدا کورەکەی لەپێچەریوە نەهاتەلای؛ بۆیە زینا یەکەم قۆناغیك بوو لەقۆناغەکانی باوەرپێهێنانی[٣٧]

کەسێك ستایشی خوا بکا بەو سیفەتەی پەروەردگاری خۆشەویستی و میهرە- ئەوە لەگەیشتنە پلەی بالای خۆشەویستیدا کورتی هیناوە. ئەی ئەوە نییە خوا بریاری داوە خۆی بکاتە دادوەر؟..لەولایشەوە خۆشەویست هەرچی سنووری پاداش و سزایە دەی بەزینێ.

ئەو خواوەندە رۆژهەڵاتی یە لەزەمانی لاویدا- دڵ رەق بوو گیانی تۆڵەستینی تیدا گینگلەی داوە.. ئەوجا بۆ تەسەلاو خەمرەوینی ئاوەلەکانی دۆزەخیکی فەراهەم هیناوە. کە رۆژگاریش پیری کرد خاوبووەوە.. بوو بە میهرەبان.. ئەوجا هەڵ گەرایەوە بوو بە باپیر دوای ئەوەی کە باوك بوو نەخیر بوو بەداپیریکی پیرەلۆکی پەریشان.

رۆژێکیان بەدیار کوانووە دانیشت خۆی گەرم بکاتەوە.. چروچاوی ئالۆزکابوون، نیو چاوانی دابوو بەیەکدا.. هەستی بەبێ هیزی قاچەکانی دەکرد.. هەستی دەکرد ئەوا بەدەست ئیرادەو خواستی خۆیەوە.. بەدەست جیهانەوە تەواو شەکەت بووە، تا لە فرە میهری خۆیدا تەنگە نەفەس بوو؛ ئیدی خنکاندی و برایەوە.

زارا وەستاندی و گوتی: ئەوەت بەچاوی خۆت دی؟.. لەوانەیە بەوتەرزە گیانی دابێ، دەشگونجێ بەشیوەیەکی کە بووبی، کەپەروەردگارەکان بمرن بەهۆی جۆراو جۆر دەمرن و نەدیو دەبن.

---

[٣٧] لاهوتی رۆژئاواو فەلسەفە دینیەکەی دەربارەی پەیامی عیسا (د.خ) بۆ ئەم جۆرە ئەنجامانە پالیان بەژمارەیەك خاوەنبیری کەلەی گەلەکانیەوە ناوە.

بەڵام بەزاتی خوا بێدینی نیتشە لەوەدا کە لەم قۆناغی ئیمانەوە دەدوێ- ئەوە بێدینی یە بەو - وینە شیواوەی پیشانی دراوە.. نەك بەو مەسیحیەی کەنموونەی نیتشە ریزو گرنگییان بەم وتەیەی داوە. کە فەرموویەتی: ((ئەی پەروەردگار. لییان خۆش بە؛ ئەوانە خۆشیان نازانن کە چیدەکەن.

-هۆیەکە هەرچیەك بوو بێ ئیدی ئەو نەما-.

خراپترین شت کەیادی ئەوی پێبکەمەوە، باسی ئەوی پێبکەم- ئەوەبوو کە روانین‌و بیستنەکانم یان بلیم: چاوو گوێی لێ دەشیواندم.

کەسیکیش نیگای روون بووبێ‌و بیژەی بیگەرد بووبێ ریکو رەوان ئەوە خۆشەویستمە. هەروەك خۆت دەزانی ئەی پیرەکاهین ویرای ئەوەی چ دەقە ئاکاریکی خۆتان ئاسای بدەنە پاڵ ((ئەو)) نادیاریکی داخراوبوو!!

ئەی بیرکردنەوەکانی بەزۆری دژوار نەبوون؟! زۆرجاریش رقی لێ هەڵگرتووین چونکە دەرکمان بە قسە داخراوەکانی نەکردووە، باشتر وابوو دەربرین‌و بەیانی ریکورەوان بوونایەو پێویستیان بەهەلگیراو داگیرو راڤە نەبوایە.

ئەگەر لەبیستنی قسەکانی‌دا خەتای گوێیەکانمان بێ بۆچی گوێی وای بۆ دروست نەرکردووین بیستن تیك نەدەن؟.. کەگویچکەمان بەقور سواخ درابێ پیم نالیی کی ئەو قورەی تیدا رۆناوە..؟

ئای کە چەندەها دەفرو هەور لەژیر دەستی ئەو سوالەتکارەدا شکاون!... چونکە وەستای سوالەت هیشتا لەپیشەکەیدا باش قاڵ نەبوو بوو.. ئیدی بۆ خەشم بەو ئافەریدانە دەریژێ کەخۆی دروستی کردوون‌و بەگیرو ویری‌و شیواوی لەژیر دەستی دەرچوون؟!..

تەنانەت ئەوەی شایستەو پەسندی میهرەبانی‌یە هاواری لێ هەستاو گوتی: لەچنگ ئەم خواوەندە رزگارم بکەن.. باشتر وایە بێخوابم‌و بریاری چارەنووسی خۆم بدەم.. باشتر وایە شیت بم‌و نەفسی خۆم بکەمە خواوەندیك...

ئەوجا کۆنە پاپا هاواری لێ هەلساو گوتی:

-زارا، ئەوە دەلیی چی؟ بەراستی لەپاریزگاری‌و تەقوادا گەیشتوویتە ئەوپەری؛ هەبێ‌و نەبی بەدیداری خواوەندیك شاد بووی‌و رێنمایی کردووی تا ئەم بێدینەت لێ دەرچووە.. هەر ئەو ئیمانداری‌یەی هەتە ریگەی لێ تەنیوی بروات بەخوا بێ..

لەمەولاش ئەم دڵ سۆزی‌یەی هەتە جلەوکیشت دەکا تا دەتگەیەنیتە ئەودیوی خیرو شەر.

ئەوەت لەقەبەلە: بەچاو، بەدەست، بەدەمت خیرو فەروەبەشی. واش مەزانە دەست بەتەنێ ئامیری فەرە.

دەتەوێ لەپیش چاوی مندا وەها خۆت پیشان بدەی کەلەهەموو کەس بێ دینتری، بەش بەخۆم بۆنی پیرۆزیت لی هەڵ دەمژم. لەم بۆن پیرۆزی‌یەوە هەست بەخۆشایەتی‌یەك دەکەم ئاویتەی ژان‌و ئازارە بفەرموو! با بۆ شەویکیش بێ میوانت بم.. لەسەر ئەم زەمینە شوینیك شك نابەم ئۆقرەی تیدا بگرم؛ هەر لەنزیك تۆوە دەحەویمەوە.

زارا بەتەواوی حەپەسابوو، ئەوجا گوتی:

–چۆنت گەرەکە با وەهابێ. لەسەر ئەو لووتکەوە ریگایەك دەچێ بۆ ئەشکەوتەکەی زارا. بەریزەکە! حەزم دەکرد لەتەکتا بهاتمایە، بەش بەخۆم سەرجەمی تەقوا خوازانم خۆش دەوین. بەجیت دەهیلم چونکە ناچارم دەبێ خیرا بەرەو ئەو دەنگە برۆم کە هاوار دەکا فریای بکەوم. تۆ بچۆرە ئەشکەوتەکەی من لەوێ کەس زیانی پێ ناگا .. ئەشکەوتەکەی من بۆ هەموو راگوزاریك بەندەری ئاشتی‌یە.. پیم خۆشە داماوان لەسەر زەوی‌یە رەقەکەی من بحەوینەوە.

بەلاَم بەش بەخۆم دەسەلاَتی ئەوەم نیە خەمەکانی گیانت بەباکەم . زەمانیکی دوورودریژ بەسەر دەچێ و کەسیش سەر هەڵ نادا بتوانێ خواوەندەکەت لەمردن راست بکاتەوە. کۆنە خواوەند مردو برایەوە، ئیدی تۆش ناژی.

زارا ئاوای گوت..

## دزیو ترینی جیهانییان

زارا بەکیو پارەیی دای بەنیو دەوەنەجاردا، بە چوارلای خۆیدا ئاوری دەدایەوە، بەشکو بەسەر فریابەرەکەدا بکەوێ.. کەچی تیی هەڵ نەنگوت، ویرای ئەوەش

بەکەیفـەوە بـازی دەهاویشـتو دەرۆیشـت، لەبەرخۆیـەوە دەی گـوت: ئـەم نیوەرۆیـە پاکانـەی خراپەکانی بـەیانی بژاردەوە. ئەوانـەی هاتنـە ریگـامو قسـەم لەگـەڵ کـردن سـەیرو سـەمەرە بوون!.. لەمـەدواش هـەموو وشـەکانیان دەماشـمەوەو دەیـان جـوومو لرفیان دەدەمو دەیان کەمە خۆراکی نەفسی خۆم.

کاتێ زارا گەیشتە پیچەرییەك لووتە شانیکی هاتەبەر، هـەڵ ویستاو دیمـەنیکی تـازەی لێ وەدەرکـەوت.. کەبـەخۆی زانـی ئـەوا کەوتووەتـە مەرگسـتانیکەوە![38] چـی ببینێ؟.. دەرووی زەندۆڵو تەنگە سوور دەچوونەوە.. رەش دەچوونەوە.. زورگیکی رووتـەنی بـێ درەخـتو گیـا.. نەچرپکـەی پەلـەوەرو نـەجریوەی چۆلەکـەی تیـدا دەبیسـتران! بـەدۆلیك دا دەی روانـی هیـچ زیندەوەریکـی پـێ قـایل نـەبوو، تەنانـەت درندەشی تیدا نەدەژیا، جار جارێ نەبێ کە سەوزە ماری قەبەخۆیان پیدا دەکرد، ئەویش لەو حەلەدا دەبووکە پیر دەبوونەو دەیان ویست لەناو بچن؛ هەر لەبەر ئەوە شوانەکان ئەو دۆلەیان ناو نابوو ((گۆرستانی ماران)).

زارا– راماو بیرەوەری دیرین سەریان تێ کرد، هاتەوە بیری کە لە رابووردوودا بەم دۆلەدا گوزەری کردووە. میشکی خۆی قورس کرد.. وردە وردە هیزی ئەژنۆی براو هەنگاوی بۆ هەڵ نەدەهاتەوە. هەر ئەوەندە چاوی کردەنە کوتوپر لە قەراغ ریگاکەدا زەلامیکی بینی.. تومەز بەدەموچاو مرۆڤە کەچی هیچ شیوەیەکی لەئادەمی ناچێ.. بوونەوەریکی چاو پێکەوت لەنیو بوونەوەرەکان دا ناوی نیە؟!

زارا سەرسـام بـوو،بەودیمەنــە چاوەکــانی خــەجلین، دەموچــاوی تــابن لاجانگـە سپییەکانی سوور هەڵ گەرا.. رووی لێ وەرگیرا کە ئەو شوینە بەجێبهیلێ. کەچی دەنگیکی بیست.. دەنگیکی قرخن.. لەقۆرەی قووناوی ئاوەرۆی بەندکراو دەچوو!.. ئەوەندەی نەخایاند دەنگەکە گۆراو بوو بەجۆرە کرکە دەنگیك لەقسە دەچوو، کە دەی گوت:

[38] ئیمە دەتوانین بە پاشگری ((ستان)) چ بۆ کاتو چ بۆ شوین گریی ئیزافی وەسفی پێ بکەینە وشەی لیکدراو هەر بە زرە ریژی هیندستانو کوردستان گریی ((مملکە الموت))م کردە مەرگستان.

–ئەی زارا.. ئەی زارا! ئەگەر دەتوانی هیمای من هەڵ بهینەو شی بکەرەوە؛ ئەوجا لەبارەی ((تۆڵە سەندن لە شاهید))[٣٩]ەو تۆ راستی جاربدە.

لەجیی خۆت بوەستی و بگەریرە دواوە، لەپیشتەوە زەوی بەستوویەتی.. تۆ خۆت بەئاغردەزانی، کەواتە وریابە باخل بوونەکەت لەسەر ئەو شەختەیە هەل تەتریزێ و چوار پەلی ورد نەبێ.

زارا! تۆ خۆت بەدانا دەزانی کەواتە ئەو هیماو پەردەکەی لیت داهینرا، ئازات دەکەم هەلی بهینە. ئەگەر ئەوەیی تویکلی رەق بشکینێ تا ناوك وەدەر بخەی– دەی پیم نالیی ((من)) کیم؟.

هەر ئەوەندە زارا ئەم قسانەی بیست؛ میهرو پەرۆش هینایە هەژان. وەدرەختیك قەدەکەی لەژیر زەبری تەوردا بێ ئاوا دانەوی. بەڵام هیشتا تەواو دانەچەمی بوو هەستایەوەو نیشانەی دڵ رەقی بەرووییەوە شەقلی بەست، ئەوجا گوتی:

–کابرا! تۆم ناسیوە: تۆ خواوەند کوژی. وازم لی بهینەو لیت بەرگەشتم. بەلاشتەوە بارگرانییە یەکیك لەئارادابێ و سەرنجت بداتێ و لەبەد فەسالیت هەڵ روانێ.. دزیو تری جیهانییانی و پرکیشت کردو تۆڵە لەم ((شاهید))ە بستینی.

زارا ئەو – وشانەی گوتن و تەکانیدا بروا.. بەڵام بوونەوەری بێ ناونیشان توند قاچی گرت و بەتورە تورەوە هاواری کردێ: مەرۆ.. لیرەبە.. زانیشم بە چ زەبریکەوە گلاوی؛ خۆشی لەخۆت کەتوانیت راستەوەبی.

خواوەندکوژ هەستی بەچی کردبی تۆش دەرکی پێ دەکەی. وەرە لە کن خۆمەوە دابنیشە؛ وردە کاتی خۆت لەگەڵ مندا بەفیرۆ نادەی. ئەوجا ئەگەر من روو لە ئەو نەکەم ئەدی روو لەکیی بکەم؟.. دابنیشەو تەماشام مەکە. کەچاوت لەبەد فەسالیم بنووقینی– مانای وایە ریز لە ناشیرینیم دەگری.

---

[٣٩] نووسراوە : (الانتقام من الشاهید))

وشەی (شاهد) فرە واتەیە، ئەوجا مەبەست (عیان) بێ یان (گەواه) یان (بینا).. هتد بێ / ئەوا وەك خۆی هیشتمەوە.

ئـــەوان دەم چەوســـيننەوە؛ تـــۆش دوا پـــەناگامی. کـــە دەشـــم چەوســـيننەوە نەبەکينەواری‌يـــەو نەبـــەهيزی لەشـــکرە. دەربەســـت نيـــم؛ حـــەزيش دەکـــەم لەگـــەڵ هيزەکـەيان دەسـتەو يەخـە ببمـەوە. دەبـێ لەجيـهانداو لـەرووی شـکۆمەندی يـەوە سەرکەوتنيك هەبێ خۆی لە شانی سەرکەوتنی چەوساوەکان بدا؟ ((راونەر بەشوين کەوتن‌و ردوونان کۆتايی دێ کەهەميشە راکەريکە بەدوای شوينيکەوتووەکەی دا))

ئازاری چەوساندنەوەيان دەرهەق بەمن تەنيا پەرۆش‌و بەزەيی پيدا هاتنەوەيانە.. تەنيا لەبەر زەبری ئەو بەزەيی پيدا هاتنەوە رادەکەم‌و پەنام بۆ هاوردووی. کەواتە بم گرە لای خۆت، بۆيـەش بەتاکـە پـەناگام دانـای چونکـە بەنـهينگاو سروشـتی مـن دا رۆچووی؛ ئەوەی خواوەند کوژ هەستی پيدەکا تۆ زانيوتە. ئەی ريبواری بی باك‌و بێ رەزا! ليرە بمينـەرەوە. ئەگـەر دەشتەوێ ئۆغر بکـەی ئـەو ريگايـەی مـن گرتمـە بـەر تابگەمە ئيرە تۆش بەری مەدە.. هەرچەندە- بەد ريگايەکە بۆ خۆی!

تکام وايە لەبەر ئەوەی ئەم وتانەم ئاراستە کردی وئامۆژگاريم بەگوێدا چپاندی ليم خەشم گير نـەبی‌و تـانووتم لی نـەدەی. من هـەر ئـەوەم کە دزيوترينـی جيـهانيانم. قاچەکانم لەهەمووقاچيك قورس‌و قەبەترن؛ بۆيـە بەهـەر ريگايـەك دا رەت بـووبم کـاولم کردووە.

ديتـــم بـــەرەو رووم ديـــی.. دەشتويســـت بەدزەيەکـــەوە بـــەلام دا رابـــووری، هـــەر کەدەموچاوت سوور هەڵ گەران زانيم کەتۆ زارای. ئەگـەر بيجگـەی تـۆ بـەلام دا تێپـەر بايە، سروەيەکی دۆستايەتی پی رادەگەياندم. يان پـەرۆش‌و بـەزەيی بەنيگايـەك يـان بە وشەيەك پـێ دەبەخشيم.. بەڵام وەك شارەزای لەسـەر سـولکەریدا نەگەيشـتومەتە ئەو پلەيەی بەخير پێ کردنی خيرەومەندان رازی بم.

مـــن ســـامانيکی فـــرەم پيکـــەوەناوە لەشـــتی فەلاکـــەت‌و گـــەورە- بەســـاماناك‌و دزيويانەوە-، زارا! لەبەرئەوە يە کە بەتەريقی‌و خەجلينت شەرەفمەند بووم.

بۆ خۆ رزگار کردن لەبۆژۆی ميهرەبانەکان رەنجيکی زۆرم داوە تابگەمە ئەو مرۆڤە تاکانەيەی لەم زەمانەدا باوەری وايە- بەزەيی پيدا هاتنەوە- تۆلەيە‌و نيعمەت نيە.

ئەرێ زارا! بيجگە تۆ کەسيکی دی ئەمەی گوتووە؟!

بەزەیی پیدا هاتنە سووکایەتی‌یەکە بۆ شەرەفمەندی.. ئەوجا خوای دەکرد لەئادەمی‌یەوە دەبو یان لەخوای ئادەمی‌یەوە دەبوو. ئەو مەردایەتی‌یەی لە یارمەتی گرتنەوەدا هەیە لە رەپیش کردنی یارمەتی‌دا نیە. بەلاّم گچکە مەردوم وا دەزانن: دەست پیشکەری لەبەزەیی پیدا هاتنەوەدا سەر تۆپی ئاکارە پەسندەکانە. ئەوانە لە گچکەیی خۆیانەوە تی دەنۆرن؛ نابینی ریزی بەدبەختی ناگرن کەگەورە دەبێ.. ریزی بیچم سزی ناگرن کەدەگاتە ئەو پەری.. هەروەها ریزی شیواندن ناگرن کە هیچ ناهیلیتەوە.

چۆن تەماشای گەمالّ بەسەر میگەلی مۆلّ خواردودا دەکشێ تیلو نیگای منیش ئاوا بەسەر میهرەبانگەل دا سەردەکا. لەروانینی من دا میهرەبانەکان گەدای ویلّو سەختیان لەبەرنو سەرجەنجالی بیری پاتالن.

چۆن سەقاقۆش بەکینەواریو سووکەوە چاو دەبریتە زەلکاوەکان منیش بەیەکادانی وردە شەپۆلەکانو هەموو نەفسیکی نزمو ویستیکی بێتین.

زەمانەی باوەر بوون بەو مرۆڤە بچووکانە زۆری خایاند، خەلکیش هەرچی راستو بەجێبێ دایانە دەست ئەوان.. تۆ بلێی: کردەی ئەوان. بەم رەنگە خۆیان بەهیز کردو لافیان لی دا: هەرچی خۆیان بەچاکی نەزانن چاك نیە، واتە چاکە هەرچاکەی ئەمانەو بەس.

ئەوەی لەم زەمانەدا پیی دەگوترێ راستی هەر ئەوەیە کە ئەو مزگینی دەرەی لەنیو ئەو گەدایانەدا پێگەیشتووە زانیویەتی.. ئەو قەدیسە رەفتار سەیرە زانیویەتی کە بۆ داکۆکی لەمیللەتەکەی هەستاوەو گەواهی بۆ خۆی داوە، گوتوویەتی: ((من راستیمو راستیش منە)).

ئەو داواکارە لەمیژە ریێ بەو گەدایانە داوە، ئەوانیش خۆیانیان هەلّ ناوەو لەسەر ((سم)) قیت بوونەتەوە. ئەو دوینەرەی گوتی : ((من راستیم)) بەتەواوەتی فیری گومراییی کردوون.

ئاوا قسەی خۆی کرد. کەسیش هیندەی تۆ / زارا! ئاوا بەناسکی تەکی پێنەداوەتەوە؛ کەبەلای‌دا رابووردیو بانگت کردێ:- نا.. نا..و هەزار جار - نا-...

ئەو خەلكەت لە گومرايى-ئەو- وريا كردەوە تۆ يەكەم وريا كەرەوە بـووى لـە تووش هاتنى ((بەزەيى پيدا هاتنەوە)) دا. وەنەبێ گوتارەكەت بەرەورووى كۆمەڵو تاك بووبێ بەلكو خۆت دواندووەو ئەو كەسانەت دواندوون كەلە ئاستى خۆتـدا بـوون، لەتەريقى ئازارە گەورەكان شەرمنى خۆت وەدەردەخەى، كەدەلیى: ((خەلكينە ئاگاتان لە خۆتان بێ! پەلەهەورى بەرين لەكانگاى بـەزەيى پيـدا هاتنـەوەو ميـهرەوە خـۆى دەكشينێ)).

پاشـان دەليـى: ((خولقينـەرەكان دڵ رەقـن، ڤيـانى مـەزن بەسـەر بـەزەيى پيـدا هاتنەوەكەى لەمەرخۆيەوە بلند دەبيتەوە))

ئەى زارا! ئەو حەلەى بەم قسەيەت هاتيتەگفت دەركت بەگەفو تەريرى زەمانى خۆت كربوو.

ديسان دەبێ خۆشت بپاريزى لەو هيندە بەزەيى پيدا هاتنەوەيەى تيتدا هەيە؛ چونكە زۆرى وا هەن كەمەند كيشى تۆنو بەريوەن.. ئـاى كـەزۆريان لى دەخنكيـنو زۆريشيان وەيشمە دەى بەستێ!

ديسان پيت دەليم كە لەمنيش سڵ بكەيتەوە، تۆ مەتەلەكەى منت بەبارى جوانىو ناشيرينىدا هەڵ هيناو زانيت من كيمو چيم كرووە، لەوەشـەوە تـى گەيشـتى چـى بتوانێ بەرەنگارت بێو بت گەوزينێ.

بەهەر حاڵ لەسەر خواوەند پێويست بوو بمرێ: چاوبزيك بوو هيچ شتيك خۆى بۆ لەبەر نەدەشيردرايەوە.. خۆى دەكرد بەقووڵايى مرۆڤ داو لـەبنى بنـەوەىدا چى خەوشو درزيوى هەيە وەدەرى دەخست.

تۆ لىگەرێ! بەزەيى پيدا هاتنەوەكەشى بێ شـەرمانە بـوو؛ دەچـوو پـەردەى لەسـەر نەنگىيەكانى من هەڵ دەمالى؛ ئەدى جيـى خـۆى نـەبوو ملۆزميكى ئاوا ميهرەبان بۆ خۆى بمرێ؟ ئەدى بۆم نـەبوو تۆلـە لـەو كەسـە بكەمـەوە كـە - گـەمارۆى نهينىيـەكانى دابووم.. يان مەرگ بۆ خۆم دابنيمولەدەستى رزگارم بێ؟!

خواوەنديك چـاوى لەهـەموو شـتيك بـێ.. بەتايبـەتيش مـرۆڤ واباشـە نـەمينێ، مرۆڤيش ونبينى ئاوا نەگرێ بەكۆليەوە.

دزیوترینی جیهانییان ئاوای گوت. زاراش وەك سەهۆلی لەهناو گەرابێ راچەنیو گوتی:

–ئەی بێناونیشان! منت لەپەیرەویی خۆت تەکاندەوە.. لەپاداشی ئەوەرا من تۆ بانگ دەکەم ببیتە پەیرەوم.. سەرنجی ئەو لووتکەیە بدە ئەشکەوتی زارا لەوێیە.

ئەشکەوتەکەم وراقو دالأن دالأنە.. فرە سەردابە، بۆ ئەوانەی حەزیان لەخۆشارکێیە پەنا پەسیوی چاکی هەیە دەورو بەرەکەشی زورگو گەلیو زەندۆلە.. دەوەنە جارو زەبەنگە.. جمەی دێ لە پەلەوەرو زیندەوەری خشۆكو گەزندەو درندە. تۆی لەژیان تۆراوی نیو مەردوومو بەرکەنارو شەکەتی دەستی بەزەیی هاتنەوەی خەلکو خوا– باشتر ئەوەیە کەرییو شوینی من رەچاو بکەی، چۆن من فیربووم تۆش فیربە، کارگەری ئەزموونکاریش نەبێ بەکەلکی فیربوون نایە.

لەپیشەوە لەگەڵ ئاشقە مارو هەلۆکەم خۆت فیرە قسە بکە، ئەمیان نموونەی جانەوەرە گەورەکانەو بەهەلمەتە،ئەویشیان خشۆکیکی مەکرۆیە. بائەو دوانە چاکتر نموونەی راویژ پێ کراومان بن.

زارا ئاوی گوتو سەر رێ کەوتو بیرو ئەندیشەی کەوتنە فرکان. ریگای دەئەنجنیو دەربارەی زۆر شت پرسیاری لەخۆ دەکرد، سەرەنجام بەبێ وەلأم دەمایەوە.

لەدلی خۆیدا دەی گوت: مەردوم چەند بەدبەختو دزیوە.. چەند کینە لەدڵو نەنگی پەنهانە!!

پیم گوترا: مرۆڤ خۆشەویستە.. ئاشقەخۆیە، ئەوجا دەبێ خۆ پەسندی بگاتە چ پلەیەك تابەسەر ئەو سووك وسۆلییەی لەزات دایە زاڵ بێ؟

ئیستا بەلای بونەوەریك دا رابووردم زاتیخۆی خۆش دەویست، لەهەمان کاتیش دا رقی لی دەبووەوە، بەلای منەوە گەیشتووەتە ئەوپەری چ لە ئەشقی خۆیداو چ بەسووك زانینی خۆیدا. تائیستا نەم دیوە هیچ بوونەوەریك هیندە رقی لەزاتی خۆی ببیتەوە، لەم جۆرە داشکاندنەو لەم سوکردنەدا بلند بوونەوەو مەزنایەتی هەیە. دووریش نیە ئەو بوونەوەرە ((مرۆڤی بالا)) بی کەهاواری فریا کەوتنی دەبیسترا.

من ئەوانەم خۆش دەویـن کە پیاوی رق لی بوونەوەی مەزنو بەسووك زانینی گەورەن؛ چونکە پیویستە مرۆڤ لە خۆی دەرچێو بەسەریەوە بالأبی.

## سوال پەسند

لەوكاتەدا زارا لەدرێوترینی جیهانییان ترازا هەستی بەتەنیایی کردو لەبەر ئەوەی بیروڕای سەیر بوونە گرەیەك‌و دایانە کەللەی شەختە لەهەموو ئەندامی لەشی ڕاگەرا. دەستی لەخۆی نەشت بەلکو زاتی هینایەوە بەبەرخۆی‌داو ماوەیەك بەنیو لەوەرگای گەش دا ڕابوورد کە بەسەر دەریادا- دەی ڕوانی.. ماوەیەکیش بەپشت کیودا بوو بەهەردە گیڵ‌و کەوتە نیو بەردەڵان‌و خیزمالکی وشکەچەمەوە، هیندە بیروون بوو سامی لی دەباری، ئەوەندەی کە زاتی وەبەرخۆی هیناو لەشی گەرم داهات‌و لەدلی خۆی‌دا- دەی گوت:

دەبی لەنزیکانی برا گەلیکەوەبم نەزانم بەم سەرانسەرەدا دین‌و دەچن. دوور نیە ئەو میرەوانی ((أنس))یەی دوای تەنیایی هەستی پێ‌دەکەم .. ئەو گەرمی‌یەی دوای شەختە بەگیانم دا- دەگەرێ هەمووی لەهەناسەی ئەوانەوە هەلی کردبێ‌و گیانی نەرم‌و شل کردبمەوە.

ویستەیەکی کردو بەدەوری خۆی‌دا ملەقوتیی کردو بەسەر تەپۆلکەیەکەوە گارانیکی بەدی کرد! دەست بەجێ زانی تومەز پرمەو هەڵاوی گاوگۆلەکەیەو ڕەهابووە.. ئەوجا وەك نەرمە بایەك دلی بووژاندووەتەوە.

گاگەل هیچ هەستی بەهاتنە پیشەوەی زارا نەکرد، چونکە هەموو هۆشیکی پاتالەکە بەلای ئەو گوتارەوە بوو بەسەریان دا- دەخوینرایەوە. زارا چەند شەقاویك هاتە پیشەوە کەچی دەنگی مەردومیکی بیست لەنیویانەوە دەردەچوو ، گاگەلیش بەدەوری‌یەوە ئالقەی دابووەوە، بۆ شوینی دەنگەکە سەرە سورکییان بوو.. کەزارا ڕیگای دردا دیتی: ئەوا کابرایەك لەنزمانییەوە دانیشتووەو لەخۆی دەنووسێ‌و گاگەل دەدوینێ تاقایلیان بکا لیی نەسلەمینەوە.

قسە کەرەکەشمان یەکیك بوو لەبەرەی ئاشتی خوازان‌و ئامۆژگاری نیو شاخان کە بەناسکی‌و نیانی دیاردە- دەکرین، چاوەکانیشی سۆزو میهریان لی دەباری‌و دەورینگانەوە.

زارای لێ هاتەپێشـەوە، بەحەپەسـانیکەوە لێـی پرسـی: ئـەرێ خـەریکی چـی..
زەلامەکە وەڵامی دایەوە: ئەوەی من لێرە داوای دەکەم هەر ئەوەیە کە تۆ گەرەکتە؛ من لە بەختیاریی ژیان دەگەریم، ویستم گاگەلەکە دەرسی دانایی خۆیانم دادەن.. ئەوا چیشتەنگاو لای کردەوەو خەریکم بیـان هینمـە زمـانو قسـە. ئەوەندەشـی نـەمابوو بکەونە گفتو قسە تۆهاتی لیمان تیك بدەی!!

ئەگەر ئیمـە نەگەرێینـەوەو بەچەشنی ئـەو گاوگۆلـەمان لێ نەیـە، هـەرگیز ناچینـە مەلەکووتی ئاسمانەوە. چار نیەو دەبێ لەگاگەلەوە فیرە کاویژ بین.

لەراستیش دا ئەگەر مرۆڤ هـەموو جیـهانی لێ بـەقازانج گـەرا بـەڵام فـیری ئـەوە نەبوو- وەك گاوگۆل بجوێو بجویتەوە ئەویش بەچاکی بیربکاتەوە- دەبێ زیندەگانی چ سوودیکی بۆ هەبێ،. چونکە بیتو بیری خۆی کاویژ نەکاتەوە لەخراپترین دەردی خـۆی هـەڵ ناسـتیتەوە.. ئەمرۆکـەش دەردی بـێ دەرمـانی مـرۆڤ دەردی ((بیزکردنەوە)یە. کام رۆلەی ئەم زەمانە دەروونی، چاوی، دەمی.. بیز ناکەنەوە؟!

ئەرێ زەلام ! تۆش هەر وەك ئەم هەمکە خەلکە نیت؟.. ئیدی بۆخـۆت سـەرنجی گاگەلەکە بدە.

ئامۆژگاری نیو شاخان ئەم قسانەی کردن، ئەوجا سـەرنجی دایـە زارا، ئەمـەش دوای ئەوەی کەچاوی لەگاگەلەکە نەدەگواستەوە. رووخساری گۆرا، دەنگی هەڵ بری و گوتی:

((ئەوە کییەو.. کێ ئەدوینم؟؟))

خیرا لەسەر زەوییەکە راستەوەبوو، گوتی:

-ئەوە لەژوور هەموو قیزو بیزیکەوەیە.. ئەوە زارا خۆیەتی، ئەوە چاویەتی، ئەوە دەمیەتی، ئەوەش دلیەتی.

وەك دەسـتی بەخەزنەیـەکی ئاسمـانی گەیشـتبێ، بـەچاوی فرمیسـکاوییەوە پەلاماری دەستی زارای دا ماچی بکـا.. لەولایشـەوە گـاوگۆل سـەریان لەرووداوەکـە ماسا؛ چاویان برینە ئەم دووکابرایە!

زارا خۆی لێ راپسکاوت‌و گوتی: تۆ بۆچی باسی من دەکەی.. هەستە باسی خۆت بکە؟.. تۆ ئەوە نەبووی سوالت پەسندکردووەو لەسامانە گەورەکەت تەکیویتەوە.. تۆ ئەوە نەبووی لەچاوی دەولەمەندان‌و دەولەمەندی‌دا بێ‌شەمیت دەبینی‌و چویتە نیو هەژارانەوەو خیرو بیرت پیدا هەڵ رژاندن‌ودلت بۆ کردنەوە، کەچی ئەو هەژارانە بەنائومیدی وەلامیان دایتەوە..؟

سوالکەرەکە قسەکەی سەندەوە: بەلێ بە نائومیدی گەرامەوە.. ئیدی پەنام بردە بەر گاگۆلەکە؛ تۆش ئەوەباش دەزانی.

زارا گوتی: ئەوجا لیرە فیربووی کە وەستایەتی بەخشین گرانترە لەوەستایەتی وەرگرتن؛ بەخشین هونەریکە لیزانینەکەی بەندە بە سۆز بەریوەبردنەوە لەگەل زاڵ بوون بەسەر مەترسی‌یەکانی میهردا.

سوالکەرەکە دیسان بۆی سەندەوە: بەتایبەت لەم سەروبەندەدا کە سپلەو قوتەو چەپەلەکان شۆرشیکیان بەرپاکردووە.. لووت هەڵ دەبرن‌و بەچینە چەقاوەسووە چەنەبازەکەیانەوە دەنازن، لیت پەنهان نیە کە ساتی شۆرشی چینە کۆیلە ژیر دەستەکان نزیك بووەتەوە.. شۆرش‌و ئاشووبە مەوداو ماوەی دریژەدەکیشن.

چینی گچکە ئەوەی پیی دەبیژری خیرو سەدەقە لیی یاخی دەبن، ئەوجا با ساماندارەکان وریای خۆیان بن

وای بۆ ئەو دەفرە ئاخنراوانەی چکە چکە نەبێ لەملە تەسکەکانیانەوە نای دەلینن، ئەو دەفرانە زووبەزوو ملیان دەشکێ. منیش بەرەنگاری زرگنی ناپاکی‌و هەوەسی غەزەبناك‌و هەلمەتی تینووی تۆلە ستین‌و هەموو ئاپوورەیەکی باغڵ– بوومەتەوە. ئەو کەسەی گوتوویەتی: بەختیاری لەنیو هەژاران دایە درۆی کردووە. کەواتە بیجگەی گاو گۆل خۆشی لەمەلەکوتی ئاسمان نابینێ‌و پییەوە نانازێ!

ئەوجا زارا پرسی: ئەی بۆچی دەولەمەندەکان چیژو خۆشی لە – مەلەکوت– وەرناگرن؟

سوالکەرەکە لەسەری رۆیشت: فلانی! کەتۆ لەمن باشتری لێ بزانی بۆچی تاقیم دەکەیتەوە؟.. ئەی هەر لەبەرئەوە نەبوو کەرقم لەدەولەمەندەکان بوو پەنام بردە بەر

هــەژاران؟.. ئەوانــە بــەندەی ســامانەکانیانن، چاویــان ســاردو ســرن.. هەوەســی پیکەوەنانی سامان دلی زەوت کردوون‌وخستوونیە باریکەوە لەپیناو بەسودهینانی هەر سەرەنویلکیك گشت هۆیەك بخەنەکار.. ئەوەنیە لەدەست گەجەرو گوجەریك رام کردووە، خویریتیتان بەرووی ئاسماندا دەقیژینێ. لەدەست ئەو چینەش رام کردووە کە پۆشــتەی زیــرن‌و ســاختەن‌و بــەو تــەرزە پشــتاو پشــت لــەو باپیرانــەوە دابــەزیون پەنجەکانیان چرنووکی ئاسن بوون.. هەروەها لەدەست چینی کەولەکۆن‌و شرە خۆر دەرباز بووم کە دەماری پیاوەتی‌وپەرۆشی مەردایەتییان تیدا مردووە، ژنەکانیشیان بــێ ویلانــە بەرادەیــەك بــەرەللا بــوون لەگــەڵ ســۆزانی یــەکانی ســەلیتەخانەدا جیــا ناکرینەوە.

ئاپۆرەو تێ چرانم لەچینی بالاّو نزم دا وەك یەك هاتنە بەرچاو. لـەم رۆژگـارەدا جیاوازی لەنیوان دەولەمەندو هەژاردا نیە؛ بیرم کردەوەو بریارمدا رابکەم. تالە دوا قۆناغ دا خۆم لەنیو گاگەلەکەدا دۆزی‌یەوە.

پەیامبەری ئاشتی ئاوای گوت‌و لەبەر ئەوەی بەتەوژمی گوتارەکەیەوە تەکانی دا هەمووگیانی سەر ئارەقە گەرا.. ئیدی بەجارێ گاوگۆل شلەژاو کەوتە مۆرە. بەلاّم زارا یەکبینە چاوی بری بوونە سوالکەرەکەو دەخەنی، تا ئەو لەقسە وەستاو ئەم دەستی پێ کردەوە:

سەبارەت بەتوندی دوانەکەت خۆت ماندوو کرد، نەدەبوو بەم وتە وشکانەوە دەم هەڵ بهینیتەوە، نەدەبوو گویشیان بۆ هەڵ بخەیتەوە، باوەرناکەم گەدەشت بتوانــێ هەرسیان بکاو دەرەقەتی ئەو رقە هەڵ چووەت بێ؛ کەواتە گەدەت پێویســتی بەخۆراکی سوکترە. تۆش -بێچاوینی بێ- ئەوەندە بەهەلپە نیت، پتر لەوە دەچی تۆ لە گژوگیا خۆرەکان بی کە حەزیان لەدانەویلە جون‌و هەنگوین لستنەوەیە.

سوالکەرەکە دای مەزراندەوە: بەراستی پیکـات. مـن حـەزم لەهەنگوینـە.. حـەزم لەگیاجوونەودانەویلە کرماندنـە.. ملومووشـی هــەموو تـام خـۆش‌و بەرامـە خۆشـیك دەکەم وازم لەشتیکە هەمیشە لەجوون دا لەگەڵ باری تەوەزەلی دا بلوێ. لەهونـەری کاویژدا هیچ گیانداریك هیندەی گاوگۆل کارامەنیە کە کاویژی داهیناوەو پاڵ کەوتنە

بەرخۆری داهیناوە.. بەو تەرزە خۆی لەبیرکردنەوەی قوول رزگار کردووە؛ چونکە تیژ بیرکردنەوە دەبیتە هۆی دڵ هەلئاوسان.

زارا پیی گوت: کەواتە سەیری ئاشقەمارو هەلۆکەم بکە. لەسەر رووی زەمین دا بێوینەن. ئەو ریگایە بۆ ئەشکەوتەکەم دەچێ، فەرموو ئەم ئیوارەیە لەوێ دەبیتە میوانم.. ئەوجا پیکەوە لەگەڵ دوو جانەوەرەکەمدا باسی بەختەوەری گیانداران دەکەین.. تۆ برۆ لەوێ چاوەروانم بە تا دەگەریمەوە؛ چونکە دەنگیك لەدوورەوە هاواری فریام لی دەکا، منیش بەپەیسەریەوە دەچم تۆش لەئەشکەوتەکەم دا بەسەر هەنگوینی تازەدا دەکەوی کەلە کۆلەسی زیرین دەرهاتووە لەساردیدا دەلیی بەفرە. ئیدی بۆ خۆت لیی بخۆ.

هۆ کابرای نەناس!

بەر لەوەی برۆی مۆلەت لە پاتالەکەت بخوازە چونکە دوا سەریان لە هەموو کەس بۆ تۆ دلسۆزتر بوون‌و لەهەموو کەس باشترو راستر فیری فەلسەفەو دانایی ژیانیان کردووی.

ئەوجا سوالکەر گوتی:

جەنابی زارا! گاوگۆلەکەم لەتۆ دلسۆزترو راستتر نیە چونکە تۆ بەودلپاکیەتەوە لەباتاڵ باشتری.

ئیدی زارا گوتی:

دەك دوات برێ– هەی خۆ تێ هەڵ سووی خۆریك خەر! ئەوە دەتەوێ بەستایش‌و قسەی هەنگویناوی خراپم بکەی؟.. دەی لیم دوور کەوەرەوە!

((بەخەشمەوە زارا دار دەستەکەی لی هەلبری.. سوالکەری تاینیش خیرا بۆی دەرچوو.

## سیبەر

هیشتا سوالکەرەکە نەدیو نەبووبوو، زاراش هەستی بەتەنیایی نەکردبوو–بیستی ئەوا دەنگیکی دیکە لەدوایەوە هاواری دەکاتێو پیی دەبیژێ: زارا! بوەستەو سەرنجم بدەری؛ من سیبەرەکەتم.

بەڵام زارا هیچ گویی نەدایە، پیی ناخۆش بوو چیاو بەندەکانی بەوجۆرە ژمارە ئادەمی‌یە ئاوەدان ببیتەوە. لەبەر خۆیەوە دەی پرسی: ئەی باری گۆشەگیری‌یەکەم چی بەسەرهات؟ ئەوجا گوتی: مەملەکەتی من بەشیك نیە لەم جیهانە.. دەبێ برۆمو بەدوای کیویکی تازەدا بگەریم.

ئا ئەوەتا سیبەرەکەم بانگم دەکاتێ.. بەڵام ئەندیشەی ئاوام بەلاوە گرنگ نیە، هەر دەبێ ئەو رەدووم بکەوێ، بەچاو خۆشمەوە لیی رادەکەم.

زارا دەرۆیشتو لەناکاو دیتی ئەوا سوالکەرەکە لە پیشیەوە رادەکاو سیبەرەکەشی بەگوستاخی بەدوایدا دێ.. ئیدی زارا بۆی دەرکەوت خەریکە شیت بی. کتوپر وەستاو کەوتە خۆتەکاندن لەو فروفیڵو سووکایەتی‌یەی تییانەوە گلاوە.. دەشی گوت: ئایە پیرە قدیسەکانی وەکو من دەبێ رووداوی لەمە سەیرو سەمەرەتریان بیتە بەر؟!

بەراستی لەم کیوانەدا شیتایەتی‌یەکەم زیادی کردووە. ئەوەتا بەحوکمی شیتی گویم لەزرمە زرمی شەش قاچە.

ئەوەش راست نیە کە زارا سل لە ئەندیشە بکاتەوەو تووشی دردۆنگی بێ، تاوای بیتە بەرچاو جووتە قاچی خەیاڵ لەقاچەکانی خۆی دریژ تر بن.

لەناکاو هەڵ ویستاو بۆ دواوەی ئاوریکی دایەوە، تومەز سیبەرکەیەتی‌و خۆی پیدا ئەکیشێو هاکا بکەویتە سەر زەوی. کە لەم ئەندیشەیەی نۆری بەجارێ ئەتەرەشی چوو، هەروەك لەسیلەی گۆرستانەوە تارمایی بیتە بەرچاو، ئەویش سەبارەت بەوەی پیرو ریوەلە بوو.. ئیدی قیژاندی‌و گوتی:

–تۆ كيی، بۆچی لافی ئەوە لێ دەدەی گوایە سێبەری منی لەكاتێك دا چارەی ئەو فەسالەتم نەگەرەكە؟!

سێبەر وەڵامی دایەوە: بم بەخشە كە دەم گوت سێبەرتم! پیرۆز بایشت لێ دەكەم؛ چونكە بارو فەسالی منت بەدڵ نیەو چێژ سازی. من ڕێبوارێكی نەسرەوتی ئەم دنیایەم.لەمێژەو بەدوای هەنگاوەكانتەوەم ، ئەو ڕێگایەی گرتوومەتە بەر بێ سنوورە، وەك جوولەكەی سەر لێشێواو ڕەهەندەم، بێجێگەو ڕێگەم، هەرچەندە نەجوولەكەمو نەدامەزراوم.. نەهەمیشەمو نەئۆقرە گرتووم.

بۆچی لەچارەم نووسراوە ڕەهەندیەكی بێ ئۆقرە بم.. گێژەلوكەی گشت بایەك بم فرینێ.. هێندە گۆی ئەم زەوی‌یە بێ جەمسەرە بپیوم هیلاكو ماندووبم؟!

خۆم دا بەدارو بەردا، بەوێنەی ئەو گەردو تۆزەی دەپژێتە سەر ئاوێنە بەندوو جامخانەكانو پێیان دادێتە خوارێ.. دەست بۆ هەرشتێك ببەم خێرا فرتەدەكاو هیچم بۆ لێ وەرناگیرێ، ئەوەتام لاژگێكمو خەریكم ببمە تۆزو بچم بەهەوادا !

زارا! من پاشكۆی تۆمو لەدواتەوە ڕۆیشتوومو نەت بینیوم. چەندە خۆم لێ پەنهان كردبی ڕاسترین سێبەری تۆ بووم، لەكوێ قۆناغت خستبێ لەنزیك قۆناغی منەوە بووە. ئەوجا وەك ئەو تارمایی‌یانەی حەزیان لەوەیە خۆیان بدەن بەسەر ئەو بانانەدا كە قورسە باری بەفرن، منیش لەتەك تۆدا هەلم كردە گەشتو ڕەو بۆ ئەوسەری ئەم دنیایەو كام شوێنی سەهۆلبەندانە ! بەدوات داو بەتاسەوە بۆلای هەموو قەدەغەكراوێكی دوور ڕۆیشتم، بەرەو هەموو خراپەیەك هەلەداوان بووم.

ئەگەر لەم دوورە گەشتەم دا شتێكی پەسندم بەدەست هێنابێ هەر ئەوەیە كە درم بەهەموو بەربەستێك داوە. هەر بەشوێنتەوە بوومو چی دلم پەرستبێتی تێكم شكاندووە. نیشانكردەكانی سنوورم بەجارێ هەڵ گێرانەوە.. وێنەكانم سەرجەم سڕینەوە.. دابەزیومەتە بان هەموو هەوەسو ئارەزوویەكی ئەنگیزو مەترس. لەڕاستی‌دا من ئەم هەمووتاوانانەم كردوون، هەر بەدواتەوە نە باوەرم بەمانای وشەكانو نە بەدابو دەستووری پیرۆزو نەبەناوە موفەركەكان ماوە. ئەرێ دەبێ شەیتانەكە لەگەڵهەموو كەوڵ گۆرینێك دا ناوەكەشی بگۆری.. یا دەبێ ناوەكان هەر

کەولی رووت بن؟.. دوورنیە ئەو شەیتانە لەخۆیدا بریتیبێ لەکەولیکی رووتو هیچی دی!

بۆ رۆیشتن نەفسی خۆم گاڵ دەدا و دەم گوت:

((چی پیی بگوترێ راستی لە (هەبوون)دا نیەو هەموو شتیکیش دروستە)). ئەوجا گورم بەستەوە کە بەسەرو بەدلم رووکارە سەهۆلەکان بەسەر گۆمەکانەوە- وردو خاش بکەم. ئای کەبەرووتی دەردەچوومو شەختەش ئاگری بۆ پرووکانی پیستم رادەگرت؟!

وای بۆ خۆم! بەسۆزو شەرەفم چیم بەدەست هینا؟.. بەئیمان بەسالحان چیم پیکەوەنا؟.. ئەو پاکیتییە درۆزنەی لەوە بەرخۆم پیوە بائەدا لەکوێ خۆی شاردەوە؟.. پاکیتی پیاوچاکان لەدرۆ بەشەرەفەکانیان دا چیبەچی کردو چی بەسەرهات؟!..

ئای چەند شوین پیم هەڵ گرتیو ئەودالی راستی بووم کەچی (راستی) لیم هەڵ گەرایەوەو دامیە بەر شەپازلە، هەر دەستم دەکوتا بۆ راستی.. بەڵام تابۆم دەرنەکەوت کەدرۆزنم دەستم وەبەر راستی نەکەوت!

زۆر شت لەپیشمەوە ئاشکرا بوو، لەبەر ئەوە هیچ شتیکم بۆ نەمایەوە، هەرچی خۆشم ویست مردو برایەوە.. ئیدی چۆن دەتوانم نەفسی خۆم خۆش بوێ؟!

من گەرەکمە چۆنم پێ خۆشە ئاوا بژیم، دەنا باشتر وایە هەر نەژیم .. ئەمەش خواستی پیرۆزترین ئادەمیزادە.. بەڵام تازە، خۆشی وەرگرتنی من بەسەر چوو چونکە مەبەست و ئامانجەکانم پوکانەوە، لەپیشمەوە هیچ بەندەریك شك نابەم تا کەشتییەکەمی بۆ برانینم؟!

بەلامەوە بای لەبار گرنگ نیە، کەسیك رووگەی خۆی نەزانێ لەپای چی بۆ بەریانی بابەکان هەستو چاو بگیربێ؟

هەمەو نیمە : دلیکی ماندووی بی شەرمەو ویستیکی نەسرەوتەو بالی شکستەو پشتی بربرە ترازاوە .

چەندە بۆ جیگاو ماوای خۆم تەقەلامدا بەلام بەد بەختیم بۆ مایەوە.. زارا! تۆش دەزانی لە پیناوی دا بەچ تاسەیەکەوە رەنجم بۆداوە؟!

ئەو ئارامگەیە دەبێ لەکوێ بی؟.. زۆری بۆ گەرامو نەشم دۆزیەوە کە هەمیشە بێ شوینەو لەهەموو شوینیکیشە .. بەلکو بێهوودەیەکی ئەبەدییە!

سیبەر ئاوای گوتو دەموچاوی زاراش داماوییان لی دەباری، ئەوجا گوتی:

تۆ سیبەری منی. ئەی گیانی رەبەقو گەرۆك! ئەوەنیت خۆت دەهاویژیتە کام مەترسی ئاسانەوە.. رۆژەکەت لەشان گران بوو، وریابە ئیوارەکەت زیاتر بەهیلاکت نەبا؟!

ئەوانەی وەك تۆ ویلن لەدواییدا بەسەر بەختەوەریی خۆیان دا دەکەون. جا-کەیفی خۆیانە لەهەر بەندیخانەیەکدا بن! ئەدی نەت دیوە کەبەندییەکان هیور دەبنەوە چۆن لەبان تاوانەکانیان سەمادەکەن؟!

کارێ نەکەی باوەری تازە بەسەرتا زاڵ بێو بەئەندیشەی ستمەوە بتخاتە گیژو گاز؛ چونکە هەر لەئیستاوە مەترسیت لی دەکرێ هەموو تەنگانەیەکی تازە جلەو گیرت بکات.

ئامانجی خۆت لی بزربووە، کەتۆ ریت لی تیك چووبی چۆن دەت ئاوزی بەنیو خەمو کەسەردا برۆی.. یان چۆن پیت دەکرێ دڵ نەوازیی خۆت بکەی؟

-ئای کە چ خەیالیکی ویڵ و چ بیریکی ئاوارەی ئەی پەپلوولەی ماندوو! ئەگەر دەتەوێ لەپەناگای ئەم ئیوارەدا بحەسییتەوە بۆ لای ئەشکەوتەکەی من سەربکەوە.

ئا ئەوە ریگاکەیەتی. بەش بەخۆم لیت دووردەکەومەوە چونکە واهەست دەکەم شتیکی سیبەر ئاسا گیانم قورس دەکا.

ئیدی بەتەنێ بۆ خۆم رادەکەم تا لەدەوری خۆم نوورم بۆ دەردەکەوێ. ئەوجا ئەم ئیوارەیە بفەرموو بۆ ئەشکەوتەکەم. ئەم شەو لەوێ دەی کەینە شەوارە تابەیانی بەسەماو هەڵ پەرکێ شەوگار دەبووژینینەوە

زارا ئاوای گوت..

# لەنیوەرۆدا

زارا بەراکردن ریگای گرتە بەرو تووشی کەس نەبوو، لەبەر ئەوەی بەتەنی بوو ئەم کەشەی پێ خۆش بوو، چەند ساتیکی خایاندو لەبیرکردنەوەی ئەوەدا بوو کەبەچی شادمان بی.. ئەوا خۆر بەتاقی ئاسمانەوە ریك تیشك دەهاویژیتە بان سەری زارا، لەپیشەوە پیرە درەختیکی دی لقوپۆپی تیك با هەڵ درابوون، لەهەموو لایەکەوە شەقە میوی تێ ئالأبوو، تەنانەت قەدەکەشی داپۆشی بوو. هەر لەدوورەوە هیشوەکانی زەرد دەچوونەوەو لەبەرزی‌یەوە گەیوگەیو– شۆر بوو بووەوە. ریبواری تینوو بەپەرۆشەوە ویستی دەست بەرێو هیشویك لی بکاتەوەو گرەی دەروونی پێ دابمرکیتەوە، دیسان هەستی کرد ئەوا شتیکی دی هانی ئەدا لەژیر سیبەری دالیتەکەدا خۆی لی دریژبکاو ماندویتی بحەسیتەوەو بنوێ لەسەر گژوگیاکە لیی راکشا، ئەوەندەی پێ نەچوو تینویتی لەبیرچووەوە، وەنەوز دای گرت بەلأم چاوەکانی زەق زەق لەکورە دارەکەیان هەڵ دەروانی.. ئەو کورەدارەی کە ئاشقینی لەگەڵ راگوزاری تینوودا دەکرد؛ ئەوجا لەدلی خۆیدا بەبێ دەنگی گوتی :

ئا– بێ دەنگو بێ سرپە!.. لەوانەیە ئیستا جیهان کامڵ بووبێ، هەست بەشتیك دەکەم لەوەبەر شتی ئاوام بەخۆمەوە نەدیوە، چۆن شنەی شەماڵ لەگەڵ وردە شەپۆلی بریقەداردا– دەی کاتە وازیو راوراوین وەنەوزیش بەو تەزرە دام دەگریتەوە، سەیرە ئەم وەنەوزە پیلوی چاوەکانم نانوقینێ.. هاتووە گیانم گورجوگۆڵ دەکاتەوە.. ئەو گیانەی بەدەست مانویتی‌یەوە ریك هاتبوو، ئیستا بۆ تیرا گەرانی وەنەوز بەرگوشاد دەبێ.. تۆ بلیی ئیوارەی حەوتەم رۆژی گیانە ماندووەکە لەقرچەی نیوەرۆدا بێ؟

ئیستا گیانە ئاوارەکەم ئەوەندیکی حەز بکا خۆی لەگەز ئەدا.لەوەدەچێ پاش ئەوەی بەتام ترین شتی چەشت وازی لەداماوی نەبیو خۆی لی بخواتەوە.

ئەوە گیانەکەمەو بەرسنگی لەگڵ توند دەکا دەلیی ئەو بەلەمەیە لەگەشتی دووری دەریاوە بەشەکەتی گەرابیتەوە، ئەوجا لەویستگەی خۆیدا، سنگی دابیتە بەر تەنکاو. ئەری وشکانی لەدەریای تەرنباز راستتر نیە؟!گیانی رەوانم پیویستی بەوە

نيە كەبە گوريس لە لەنگەرگادا شەتەك بدرێ.. داوی جالجالۆكەيەكی بەسە بی نووسينێ بەگلەوە..

ئەوەتام دەليی بەلەميكمو لەتەنكاوی خۆیدا بەبێ وەی حەوابيتەوە.. بەباريكە تاليكی خاوخاو بەسترابيتەوە..

ئای كەبەختەوەرم! ئەرێ نەفسەكەی لەمەر خۆم! كەتۆ لەسەر سەوزە گيا راكشابیو لەم ساتەش دا شوانە بەشمشاڵ دا نەتوورينێ ئەی بۆ تی هەڵ ناكەيتە ديلانەی خۆت؟!

نا..نا..مەی لاوژينە! نيوەرۆ بەسەر ميرگزارەوە دەحەسيتەوە.. نەفسەكەی خۆم! هيچ چيەت لی نەيە.. جيهانەو تەواو رەخسيوە.

نا.. نا.. مەی لاوژينە! چۆلەكەی ميرگزاريش كشومات ناجريوينن،

سەيركە! پيرە نيوەرۆ ليی راكشاوەو ليوان دەبزيوێ.. ئەی نای بينی دلۆپيك بەختياری بنۆشی؟..

دلۆپيك كۆنە شەرابی ئالتوونی كە بەختياری بۆ ئەم نيوەرۆيە دەگرێ بەكۆليەوە.. بزە دەی گرێ!..

ئا- بێ دەنگ! ئەوە زەردەخەنەی خواوەندەكانە. هەرچەندە خۆم بەدانا دەزانم؛ لەوەبەر باوەرم وابوو كەبەختەوەری لەكەمتر هۆوە پەيدا دەبێ.. بەلاّم زەمانە تيی گەياندم هەلەشە بووم دانا شيتەكان ئەو جۆرە هەلەيە ناكەن.

ئيستا زانيومە كەباشترين هەست كردن بەكامەرانی بە كەمۆكيكەوە بەند دەبێ.. خۆی هەڵ دەنێ بەسەر ناسكو مەندترين ماتی دا.. بەسەر شنەبادا.. بەسەر نيگايەك بێ دەنگیو چاو تروكانيك دا...

چيم لی بەسەر هات؟.. نەفسەكەم! گوێ بگرە ئايە زەمانە بۆی دەرچووە؟.. ئەی نام بينی بۆ نيو چالی ئەبەد رەهيڵ دەبم ؟.

هەست بەزامی ناخی دلم دەکەم؛ ئەی دلەکەم! بۆ خۆت تەرتو- تونابە. پاش ئەوەی هەستت بەم کامەرانی‌یە کرد، دوای ئەوەی شەبەقە برینت تی بوو باشتر وایە ئیدی لەلیدان بوەستی.

ئای کە سەیرە! ئەوە هیمان جیهانەکە نەرەخسیوە؟ ئەی سوورانەوەی خۆی تەواو نەکردووە.. ئەی ماتەی نەداوە.. نەگەییوە؟.. ئەو توپە زیرینانە بۆ کوێ باڵ دەگرنەوە؟. ئەی دەبێ منیش بەگەردیان دابرۆم؟.

((ئای بێ دەنگ!))

کە باویشکی داو هەستی بەکرژی ماسولکەکانی کرد زانی لەوەبەر خەوتووبووە، لەدلی خۆی‌دا گوتی: ئەی تەمەلی خەوخۆش! راستەوەبە. ئەی دواتان بڕێ پیرە قاچ!گوایە نازانن کە لەکاتەوە گلاون‌و هیشتا ماوەیەکی دریژمان لەبەردەم دایە؟!

فلانی ئەو ماوەیەی تییدا نووستی نیوەی ئەبەد بوو. ئەی پیرە دلەکەی لەمەر خۆم! راپەرە! دوای ئەوەی نوقمی خەوبووی پێ ویستت بەزەمانیکی دوورو دریژە تابیدار ببیتەوە.

بۆ جاری دووەم وەنەوز -زرای داگرتەوە..، گیانی ر ەوانی زارا بێ باکانە لی راکیشایەوە؛ چونکە گەرەکی بوو بەتەواوی بحەسیتەوە، ئەوجا گوتی: دە—بیدەنگ بەو لیم گەرێ.. ئەی گوایە جیهانەکە پێ نەگەیشتووە؟..

((ئای لەو گۆ زیرینە چەندە قەشەنگ‌و جوانە!))

زارا لەگیانی خۆی راخوری: هەی تەوەزەلی ئۆینباز! ئا دەی راستەوەبە. ئەوە چیتە.. باویشك ئەدەی.. دەپرخینی.. بۆ بن چالگەکان خۆت شۆردەکەیتەوە؟!

((ئەی گیان! پیم نالیی کە تۆ کیی؟))

لەوحەلەدا تیشکی خۆر چەقی‌یە دەموچاوی زارا بەشپەرزەیی راچەنی‌و هاوری کرد:

-ئەی ئاسمانی پانو پۆر بەژوور سەرمەوە! تۆ بەسەرمن دا- دەروانی بۆ گیانە ئاوارەکەشم گوێ دەگری؟!..

کەنگێ ئەو دلۆپە شەونمەی کەوتە سەر هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا هەلی دەمژی؟..

کەنگێ ئەم گیانە نامۆیە دەخۆیتەوەو هەلی دەمژی؟. ئەی ناخە نەمرەکان .. ئەی بناوانی پر لەشادی.. ئەی ئەو نیوەرۆیەی هەموو شتێك لەئاقاردا- دەکەویتە لەرزە- ئەرێ کاتی ئەوەت نەهاتووە گیانی من تادوا چۆر هەڵ مژی.. ئەوجا لەتۆدا نوقم بێ؟!.

زارا ئاوای گوت و لەخەوی ژێر کورەدارەکە راپەری.. وەك لەبێ هۆشی دا بوبێ و چاك بووبێتەوە دیتی هیشتا خۆر بەتاقی ئاسمانەوەیە. ئەوجا زانی کە بۆ ماوەیەکی کورت نەبێ خەوی لێ نەکەوتووە.

## سەلام

دوای ئەوەی زارا بەپیادەیی ماوەیەکی زۆری بری و بەدوای فریاد بەردا هەردە گێڵ بوو هەموو ئەو ماندووبوونەی بەفیرۆ چوو. ئەوجا گەرایەوە بۆ ئەشکەوتەکەی.. دوا نیوەرۆش بەرەو شیوان شەقاوی زل زلی هەڵ دەهێنانەوە.

هیشتا بیست هەنگاویکی مابوو بگاتە ئەشکەوتەکەی بەشەپریوی هەڵ سلەمی‌یەوە.. تومەز هاوارو فریادەو لەگوییدا- دەزرنگیتەوە.. نەخێر تەواو شلەژاو چونکە دلنیابوو ئەو دەنگە دەنگە لەئەشکەوتەکەیەوە دەردەچێ.. بەڵام لەوەدەچێ ئەو کەپۆرەیە لەیەك زارەوە دەربچێ؟!

هەلنگی داو خۆی گەیاندە ئەشکەوت، دیتی ئەوا لەبەردەمی ئەوانەی لەریگادا پییان گەیشت راوەستاوە.. بەرودا ئاپۆرەیان بەستووە: پاشای دەستە راستە، پاشای دەستە چەپە، پیرەی جادووگەرە، میرقەشەیە، سوالکەرە، سیبەرە، نیهادی هۆشە، نجوومگەرە، داماوە، کەرە....!!

دزیوترین جیهانیانیش تاجیکی لەبان سەر رۆنابوو، دووپەلاسی قرمزی لەخۆیەوە ئالاندبوون، چونکە ئەو کابرایە کەیفی بەخۆ لێ گۆرین چ دەبوو، وەك هەموو دزیوەکان حەزی لەخۆجوان کردن بوو.

هەلۆی زاراش لەنیو ئەوکۆمەلە دا خۆی گیڤ دابوو، سەغلەتی پیوە دیار بوو، چونکە دەی زانی کەناچار دەبێ وەلامی هەندێ مەسەلە بداتەوە کە بۆ باری باغلیو لووت بەرزییەکەی باش نەبێ. ئاشقە ماریش خۆی لەگەردنی ئالاندبوو.

ئەم دیمەنە زارای حەپەساند، بەچاوە سووركێ دەمووچاوی میوانەكانی دەقۆزتەوەو لاپەرەی دەروونی هەڵ دەدانەوە، میوانەكانیش بەرزە پێ راست بوونەوە.. بەسەركزییەوە چاوەروانی گفتی زارا بوون، ئەویش دوای كەمیك بێ دەنگی، گوتی:

-((كەواتە هاواری فریاو پەنا تومەز دەنگی ئیوە بوو.. ئیستا دەزانم كە دەبی لەكوێ بەدوای مرۆڤی بالادا بگەریم.

ئەو مرۆڤە لەئەشكەوتەكەم دا رۆنیشتووە، بەلاشمەوە سەیر نیە؛ خۆم بانگم كردۆتە ئیرەو بەلینی زیافەتی هەنگوینو كامەرانیم پێ داوە. وام بۆ دەردەكەوێ لە نیو خۆتان دا ناكلۆك بن، لەم كۆرەدا یەكدی دڵ گران بكەنو پەرت بن. لەهەمان كاتا كە بەیەك دەنگ هاواری فریادەكەن دەبنەوە بەیەك. كەواتە پیویستتان بەیەكیكە بتان گیریتەوە بۆ دۆخی پیكەنین. كەسیكی ئەوتۆبێ ماتەی شیتی لیی دابیو بەكەیفو سەما بێ.

لەبەر ئەوەی شیوە دوانەكەی من بەرانبەر بەمیوانی وەك ئیوە شایستە نەبوو داوای لی بووردنتان لی دەكەم.. بەتایبەت كەهەمووتان مل كەچی نائومیدین.. بەلام ئیوە نازانن بەچی ورەی دلی من بەتین دەبێ. دیمەنو فەسالی نائومیدەكان پاڵ بەهەموو مرۆڤیكەوە دەنێ بكەویتە پرسەو دل نەوازییان، ئیستا ئەمە هەستی منە هەر بەم هەستەشمەوە قەرزدارتانم. ئەوجا چیم لەدەست دابێ پیشكەشتانی دەكەم؛ كەواتە ئەم ئیوارەیە دابەزنە مغارەكەمەوە. با ئاشقە مارو هەلۆكەشم خزمەتتان بكەن.

لەبەرئەوەی لەمەنزلی من دانو بێوەیە دەبێ ئیوەش چی نائومیدییە لەخۆتانی دابرنن، پیشەكی دلنیاتان دەكەم پاشانیش پەنجەتووتەمتان بۆ رادەكیشم، هەر ئەوەندە توانیتان پربدەنە ئەو پەنجەیەم ئەوا پر ئەدەنە باسكیشم، دوودڵ نیم كە دلەكەی خۆمتان بدەمێ؛ كەواتە ماندوو نەبنو خۆش هاتن.

زارا ئـاوای گـوت‌و پیکـەنینی شـەرو خۆشەویسـتی رای دەژەنـی. میوانـەکان دانـەوین‌و بـەریزەوە سـلاوەکەیان سـەندەوە، ئـەوجا پاشـای دەسـتە راسـت بـەناوی هەموانەوە کەوتە قسە:

لەشیوەی دەست رەپیش کردن‌و سلاوەکەتەوە زانیمان کە تۆ زارای، بەرادەیـەك لەبەردەممان دا نەوازشت نواند خەریك بوو– ریز لـەتۆ گرتنەکەمانی– پـێ شـەرمەزار بکـەی. بیجگـەی تـۆ کـێ دەتوانـێ نەوازشیك بنوینـێ پارسـەنگی بـەلای سـەنگینی دا سـلاوبداتەوە، بەراسـتی پیشـەوایەتیی‌یەکت بـۆ هـاوردین بـاری رەوشـتمان راسـت بکاتەوەو روانینمان ئاراستە بکاودلمان توندو تۆل بکا.

ئیمە دوو دلین کەبەهەر کیویك دا هەل بگەریین لەم کیوە بلند تربی، بلندانی یەك بێ دیمەنەکانی بەر دەممان بەجۆرێ گوشاد بکا پەردەی چاوان لابدەن‌و روانینمان تیژ بکەنەوە.

ئیستاش لـەپیناوفریا کـەوتن دا نـەدەقیژیینین‌و نـە هـاوار دەکـەین چونکـە دلمـان کرایەوەو لەخۆشیانا کەیل بوو، خەریکە هیزو ئازایـەتیمان دیتـەوە بە بەرداو گورج دەبینەوە.

ئەی زارا! هیچ شتیك لەسـەر ئـەم زەمینـە هینـدەی ویسـتی بـەرزو بـەهیز مایـەی شادی نیـە، روەکـە پیرۆزیکـە هـەرچی خاك رواندبیتـی ناگاتـە شـکۆمەندی ئـەو، هـەر ئەوەندە درەختیکی گەورەی لی هەل کەوت، هیزو تواناکەی رەگـاژۆ دەکاو بۆ هـەموو باخ ومیرگی دەوروبەری دەتەنیتەوە.

زارا! هەرکەسیك وەك تۆ بلند بیتەوە لەداری سەروو دەچـێ کـە بـە کشوماتی‌یەکی ناوازەوە بەرز دەبیتەوە، قەد سەخت‌و پەل توندو هەمیشـە سـەوزە، دەیـەوێ تـی هـەل بکـاو بگاتـە ئـەو شـوینەی سـەروەریی لی رەهادەبـێ هـەروەك بی‌یـەوێ گـەردەلوول‌و ترۆپکـەکان بهینیتـە زمـان . کـە وەلام بداتـەوە کرکـە ئاهـەنگیکی بلنـدی فـەرماندەی زەفەرمەند رەوانە دەکا.

لەپێ هەلگەرانی لووتکەو بۆ پیدا روانینی ئەو دارە مەزنە دەبێ کێ بێ سێ‌و دوی لی بکا؟.. هەرکەسێ تووشی چارە رەشی بووبێ هـەر ئـەوەندە بـەبالای پیرە دارەکـەتی دەروانی چی‌خەم‌و خەفەتە لەخۆی دەتەکینێ.. ئەوەتا نەسرەوتەکان بەتەماشاکردنت دلارام دەبن‌و دلە سەرگەردانەکانیش خاس دەبنەوە.

بەراستی زۆر چاو دەروانننە کیوەکەت و دارە گەورەکەت. حەزەکانیش هەر بۆ لای تۆ خرۆشاون، زۆر کەسیش دەربارەی راستی زارا دەیان پرسی و دەیان پرسی‌یەوە.

سەرجەمی ئەوانەی سرووده شیرینەکانی تۆیان وەبەر گوێ کەوتن و هەموو تەنیا خوازەکانیش دەلین:

—نابینی ئەوەتا زارا لە ژیاندایە؟ کەئیمەش لەتەکیا نەژین زیندەگانیمان بێ کەلك و بێ‌خیرە. بۆچی نایەتەلامان داوای ئەوەی جاری دا تەشریف دەهینێ؟.. ئەی دەبێ ببیتە نیچیری گۆشەگیری یان دەبێ ئیمە بە دوای دا ویڵ بین؟!

لەم زەمانەدا گۆشەگیری داهینراوو لیك هەڵ وەشاوە.. بەچەشنی گۆری لیك هەڵ تەکاوە، لەهەموو شوینیکەوە زیندوو بوونەوەیە، بووژانەوەیە.. جمین و بلاوەیە!

ئەوا شەپۆلەکان بەدەوری کیوەکەدا هەڵ دەکشین. هەرچەندە لووتکەی تۆ گەردن کەشە، جیی خۆیەتی زۆرینەی خەلکو خوا بۆ لای تۆ پیدا هەڵ گەرین. کاتی ئەوە هاتووە کەشتییەکەت لەئارامگای خۆیەوە دەربچێ و تی بتەقینێ.

ئیستا کەئیمە لەبەردەمی خۆت دا—دەبینی و نائومیدی دای گرتووین و خۆشمان – لەحالی حازردا— نەداوە بەدەستەوە دەی راستینی ئەوانەی لەئیمە باشترن بەریوەن و بۆ لات دین.. بریکی کەش لەوانەی بەدۆستانی خوا بەناو بانگن دیسان بۆ لای تۆ دەکەونە رێ. ئەمانە لە حەزو گەدە هەلهینجان و بیز لەدنیا—دا گەیشتوونەتە ئەو پەری. ئەمانە ژیانیان نەگەرەکە ، مەگەر بەخشندەیەك بیت و لەسەر ((هیواو ئاوات)) مەشقیان پێ بکا و بیان خارینێ.. یان لەتۆی زاراوە فیرە ئاواتی مەزن بن.

پاشای دەستە راست ئاوای گوت و لەپی زارای گرت و خەریك بوو ماچی بکا.. بەلام خۆی راپسکاوت و کشایەوە دواوە و بەبێ دەنگی مایەوە، پاشان گەرایەوە نیویان و لییان کەوتە چاوەسورکێ، هەرچەندە نیگای تێ دەگرتن نهینگای دەروونیانی دەسمی، ئەوجا گوتی:

—ئەی پیاوە بالاکان... میوانەکانم! ئادەی گویم بۆ رادیرن. ئەوا ریك بەئەلمانی قسەتان بۆ دەکەم، راستەو رووپیتان دەلیم : ئەوانەی من بەتەمایانم بینە ئەو کیوە ئیوە نین.

پاشای دەستە چەپ گوتی : ئەمە راستە کەبەئەلمانی رەپاو روو دەمان دوینی.. ئەی دەرناکەوێ کە ئەو دانا رۆژهەلاتیە هەر نازانێ ئەلمانەکان کین؟.. باشتر وابوو بیگوتایە بەئەلمانییەکی زبرودر دەتان دوینم.. ئەوەش لەم زەمانەدا هیندە بلح نیە.

زارا لەسەری رۆیشت: لەوانەیە سەرجەمتان پیاوی بالاَبن بەش بەخۆم ناتان بینم گەیشتبنە مەزنایەتیو هیزیکی ئەوتۆ کەمەرجو خواستی بالابوونە. بەمەزندەی من ئیوە ئەمەن کەهەن.. یان بەولاترەوە بە مەزندەی ویستی بەبرشتو شاراوەی دەروونی من ئیوە هەر ئەم بیچمو قەلاَفەتەن. هەرچەندە ئەو ئیرادەیەم ئیستا کپە بەلاَم تائەبەد هەر بێدەنگ نابێ، بەدووریشی نازانم ئیوە لەیارانی خۆم بن.. بەلاَم جیگری قۆلی راستم نین.

کەسیك– وەك ئیوە– بەقاچی نەخۆش بروا پێویستی بە چاودیری هەیە.. ئەوجا کەیفی خۆیەتی نەفسی خۆی بناسێ یان نەی ناسێ. من نەچاودیری باسکم دەکەمو نەچاودیری قاچم دەکەم. نە مدارای ئەوانەش دەکەم کە بەفەرمانی من دەخەبتین. ئیدی چۆن چۆنی خۆتان دەخەنە کلی[٤٠] نەبەردی داخەوە؟

ئەگەر پشت بەئیوە ببەستم مانای وایە کارێ دەکەم سەرکەوتنەکەم مسۆگەر نەبێ؛ چونکە زۆرینەتان هەر بە ئەوەندە زرنبە لەتەپلەکانم هەلسێ دەبەزنو دەگلین.

وەك من بەتەمام ئەو بەهادارە نین، لەو نەژادەش نین کەمن دەمەوێ، من ئەودالی ئەو ئاوینانەم روونو بێ گەرد بنو ئامۆژگاریەکانی خۆمیان لەسەر بورونگینمەوە. بیتو وینەکەم لە ئاوینەکانی ئیوەدا رەنگ بداتەوە ئەوا بەشیواوی ژاکاوی پیشانی بینەرانی دەدەن.

بارکیشی و ئەندیشە ئارایی زەمانی بەسەر چوو شانتانیان داتەپاندوون، نیهادتان لەخراپەدا ئیق دەکاتەوە، چونکە بەکەلە هیرەو زەنا زەناوە حەملاونو ئاکاری پەنامەکی بەمیرات خستوون. ئیستاش چەند سالح بووبنو بنەچەتان چاك

[٤٠] کل : أ–گلپەی ئاگر.

ب– دیزەو گۆزەی کەلەکەکراوی گر تێبەردراو بۆ سووربوونەوەیان/ وشەکەم بەخوازە بەکارهیناوە.

بووبێ نەنگی و ناتەواوی زۆرتان تیدا ماوە. هیندە لاسەنگ و چەوت بوون کام ئاسنگەری کارامەیە چەندەتان برەقینیتەوە ناتوانێ راستتان بکاتەوە!

ئیوە شایستەی ئەوەن ببنە پردو لەخۆتان باشتری بەسەردا رابووریّ، ببنە پەیژەو کەسیك پییدا هەڵ زنێ گەرەکی بێ سەرووی زاتی خۆی کەویتەوە. پێویستە بۆ ئەو ئامانج بەرزە بەنەرمی پشتی بۆ رابگرن. رۆژیك دێ ئەو سۆرەو تورەیەی ئیوە دەی خەنەوە ببنە میرات گری من.. بەڵام لەبواری زەماندا رۆژیکی دوورە. ئیوەش بۆتان نیە ناویمن هەڵ بگرن، بۆ تان نیە لەم زیندەگانیەدا خیرو بیری من بەمیراتی خۆتان بخەن.

ئیوە کەسانیك نین کەمن لەم کەژەدا بەتەمایانم.. ئەو کەسانەش نین کە بۆ دواجار دادەبەزمە نیو خەلك بیان کەمە یارو یاوەری خۆم.. لەوە پترنین کەپیشە تایەکن بۆ ئەوانەی کەبەریوەن و فرە لەئیوە مەزنترن؛ ئەوان لەو گرۆیە نین کەلەحەزو گەدە ترشان و بیز لەدنیادا گەیشتوونەتە ئەو پەری. لەو دەستەیەش نین پییان دەلین: ((پاشماوەی یارانی خوا لەسەر زەوی)).

نا.. وهەزار جار – نا.. من لەسەر چیابەرزەکانم چاوەروانی بیجگەی ئیوەم.. تا نەگەنە ئیرە هەرگیز دانەپەریمە خوارێ بۆ نیو خەلك و خوا. ئەوان لەئیوە بەقەڵافەتترو بەهیزترن. لەتەوقی سەریانەوە تا پاژنە پییان کەیف خۆشی و لەش ساغییان لی دەبارێ..

((دەبێ شیرانی دەم بەخەندە هەر بگەنە لام و بگەنە لام!))

ئەرێ میوانەکان گوایە هەوالی رۆلەکانی منتان پێ نەگەیشتووە کەبەرەو ئارامگەی من کەوتوونەتەری؟!

باسی باخات و دوورگە بەختیارەکانی لەمەر خۆم بۆ بکەن،
باسی جۆری تازەی خودی خۆمم بۆ بکەن!
ئەوە بۆچی باسی هیچ کامیك لەمانەم بۆ ناکەن؟..
تۆ بەشقی ئەم میوانداری‌یەم بۆ ئیوە رۆلەکانی لەمەر خۆمم پێ بلین!
هەموو گردو کۆیەکم بۆ ئەوانە..
هەموو هەژاریم لەبەر خاتری ئەوانە..
هەر لەبەر ئەوان خۆداریم کرد لەبەخشین دا.

من هەموو شتیك دەكەمە سەرگەردی ئەو رۆلانەم..

كەزیندە روەكی بەراستی هەبن رۆلەكانی منن..

بۆ ئازیز ترین ئاواتی من- ئەوان گەورە درەختی ژیانی بەرچاون.

كتوپر زارا لەقسە وەستا؛ تاهیندەی دیكە تاسەو شەوقی بیتە جۆش. ئەوجا هیدی هیدی چاوەكانی ویك نان و دەمی داخست و گوێ قولاخی لیدانی دلە كەی بوو. سەرجەمی ئەوانەی لە ئەشكەوتەكەدا بوون چوونە خامۆشی.

هەر پیرەی نجومگەرمایەوە كە بەهیماوە لەهەوادا شتی سەیرو سەمەرەی پیشاندەدا.

## شیوی نهینی

نجومگەر خۆی پینەگیراو هاتە پیش و دەستی زارای گرت و گوتی: ئەدی هەرتۆ نەت گوتووە هەندێ شت لەپیش هەندێ شتەوەیەو دەبیتە بەرایی؟.. مەگەر بانگی منت نەهیشت بۆ نان خواردن لیرەو لەگەڵ ئەوانەدا كە لەدوورەوە خۆیان كوتاوە بۆ لات.. وا پێ دەچێ گەرەكتە هەر بەقسە تیرمان بكەێ؟!

سەبارەتەكانی مەرگت زۆر هینانەوە بەنموونە: سەرماو خنكان و شتی وا.. بەڵام یەكیك باسی لی قەومانی منی نەكرد كە بەڵای ((لەبرسان مردن)) بەجارێ زەندەقی بردووم.

ئاشقە مارو هەلۆ هەر ئەوەندە ئەم قسە یان بیست ترسان و رایان كرد؛ چونكە باش دەیان زانی ئەوەی لەبەیانی یەوە تا ئیوارە كۆیان كردۆتەوە بەتەنێ بەشی نجومگەرەكە ناكا.

نجومگەر هەر وا ریسەی دایە: یەكیكتان نەهات باسی ترسان لە ((تینوان مردن)) بكا؟ بەچاو خۆمەوە هەرچەندە وەك رووباریك گویم لەهەلقولینی قسەرەوانی بوو تینویتیم پێ ناشكێ.. بەلكو داوای كەمیك مەی دەكەم، هەر بەمەی تەندروستی رادەگیرێ و زوو بەزوو شیفا دەبەخشێ.

نجومگەر بەدەم قسەوە داوای مەی دەكرد، پاشای دەستە چەپیش دەی گوت: مشوورم خواردووە كۆلیكم لی خستووە بەلام بی نانین. زارا پیكەنی و گوتی: تەنیاكان

بێنانن مرۆڤیش هەر بەنان ناژی.. بەگۆشت بەرخیش دەژی، دوو بەرخم هەن باسەربردرینو چاك بكرینو بەرامە بكرین. خۆم حەزم لەگۆشت بەرخی بەرامەدارە. دیسان گیاو میوەو بەرەدرەختم لەلاهەن، بەشی ئەوانە دەكەن كە بەهەلپەن یان بەچەژن.. گویزوشتی تویكلینم هەن بەشكاندنیان خۆمان خەریك دەكەینو ناوكەی پەنهانو شاراوەش وەدەردەخەین.

دوای كەمیكی دی باشترین ژەم دەخۆین، بەلام دەبێ هەموومان دەست بدەینە كار.. جووتە پاشا وەك ئەوانی دیكە خەریك بن، زاراش كە بۆ خۆی پاشایەكە دەتوانێ ببیتە چیشت لینەریك.

هاتووان ئەم پیشنیازەیان بەلاوە خۆش بوو، تەنیا ئەو سوالكەرە خۆ تەرخانە نەبێ كەلەگۆشتو شەرابو بەهارات لووتی هەڵ دەكرد، گوتی:- زارا بەهەلپەوە چی دەلێ گویی لی بگرن! ئایا كە مرۆڤ بەچیادا هەڵ دەگەرێ بۆ ئەوەیە بچیتە سەر داوەت؟.. ئیستا تێ گەیشتم كەلەم پەیرەوەیدا مەبەستی چی بووە: ((باهەژاری پیرۆز موفەرك بێ)) بەئەوەش دەزانم كە بۆچی دەیەوێ سوالكەرەكان لەناو ببرین.

زارا گوتی: فلانی تۆش وەك من خۆشكیلە بە، بەچیەوە راهاتووی دەست بەرداری مەبە. ئەوجا دەنكو دانووی خۆت بجوو، ئاوی خۆتی لی بخۆرەوە.. ئەگەر ئاوا كەیفت ساز دەبێ هەر بەچیشتی خۆتا هەلدابلی، من كە نوینەری ریبازو یاسام تەنیا بۆ خۆمو یارانی خۆمم، وەنەبێ ریبازیك بم بۆ هەموو مەردووم، بەلام كەسیك گەرەكی بێ شوینم بكەوێ پێویستە ئیسقان رەقی قاچ سووكەلە بی.. لەزەماوەندا دڵ خۆش بێ خەفەت نەخوا، بەساغیو توندییەكەوە گورج خۆی فریبداتە هەمو شتیكی سەختو فەلاكەتەوە.

چی لەزەویدا باشە بۆ خۆم و مریدەكانمە ئەگەر ئەو نازو نیعمەتەمان لی قەدەغەكرا ئەوا جەربەزانە وەری دەگرینەوە.

بنازم! بەلەزەتترین خۆراك دەنۆشینو ئاسمانی بێ گەردمان هەیە.. بەهیزترین بیرو باوەر و نەشمیلەترین ئافرەتمان هەن .

زارا ئاوای گوت، بەلام پاشای دەستە راست لەوەلامیدا گوتی :

–ئەری شتیکی سەیر نیە کابرایەکی دانا– بڕوای بەقسەی ئاوا ڕاست هەبێ و ددانی پیدابنێ؟! لەراستی دا زۆر سەیرە ئەو دانایە هەستێ و لەیەك شوین دا دووشت،[٤١] دوو دژ یەك گیر بکاو "کەر" نەبێ!

پاشای دەستە ڕاست بەحەپاسانەوە ئاوای گوت. کەرەکەش بەزەرینەوە دلنیایی دەربڕی.

ئەو داوەتە دوورو دریژە بەو چەشنە دەستی پێ کرد کەلەکتیبی میژوودا بە ((شوینی نهینی )) ناودیر بوو. لە جەرگەی ئەو شیو کردنەش دا سەراروان و بناوان قسە دەهاتەوە سەر ((مرۆڤی بالا)).

## مرۆڤی بالا

### ١

یەکەم جار کەهاتمە نیو ئەم خەلکەوە– ئەو شیتایەتییە مەزنەم بۆ هاوردن کە گۆشەگیرەکان دەی قەومینن. لەمەیدانی گشتی دا لیی راوەستاموکەوتمە دواندن، هەر وەك لەگەڵ کەس قسەم نەکردبێ. کەشەو داهات خۆم و هاوریکانم: تەناف و لاشە مردووەکان– لەوێ ماینەوە.. بگرە خۆیشم لاشەیەکی ساردوو سر بووم.

بەڵام کەبەیانی تازەم گزنگی دا راستییەکی تازەشم بۆ ئاشکرا بوو، فیری کردم کەبلیم:

چم داوە لەمەیدانی گشتی و مەردومگەل.. چیم داوە لە زەنازەنایان و گویچکە دریژەکانیان)).

پیاوە باڵاکان! لەگەڵ ئیوەمە. لەمنەوە فیری ئەم قسەیە بن ((لەمەیدانی گشتیدا کەس بەمرۆڤی باڵا باوەر ناهینێ)) ئەگەر ویستتان – وەخۆتان حەزدەکەن هەرگیز قسە نەکەن ئەوا جەماوەرەکە بەچاوداگرتنەوە دەکەونە مقۆ مقۆو دەلین: ((گشتمان یەکسانین)).

پیاوانی بالا! تویژی گەل نکوولی مرۆڤی بالا دەکا لەبەردەمی خواوە چونیەك دەروانیتە چینەکان و تاکەزەلامیك.

---

[٤١] بۆ (ص ٣١٤) کە نووسراوە: ((.....ان یجمع الحکیم بین الامرین ولا یکون حیمارا)). لیرەدا لە وشەی (الامرین) بەگومانم– کە : –دووشت یان دوودژ– بێ؟

کە خواوەندەکان نەمابی ئیدی چ کاریکمان بەیەکسانی‌یە لەبەر دەمی خوادا.. ئەوا جەماوەر هەیە ئیمەش لەبەردەمی ئەودا نکوولی لەیەکسانی دەکەین. کەواتە ئەی بالآینە! لە مەیدانی گشتی‌و جەماوەر پشت هەڵ بکەن‌و بتەکنەوە.

## ٢

بالآینە! دەلیین لەپیشگای خوادا؟.. ئالەم زەمانەدا خواوەند مردو بەسەرتانەوە بەلآیەکی زل بوو بیت‌و خۆی نەنایە گۆریچەوە ئیوەش نەدەژیانەوە.

لەم زەمانەدا نیوەرۆی رووناك دیت‌و نووری خۆی دەپژینێ، مرۆڤی بالاش دەبیتە سەروەر. ئەرێ براینە! لەم قسەیەم تی گەیشتن؟

دەتان بینم هەڵ دەلەرزن.. ئەوە دلە سووركیتان تووش بووە؟.. یان لەبەرابەرتانەوە دۆزەخ دەمی لی داقەلآشتوون؟.. تۆ بلیی سەگی دۆزەخیش بە شوینتانا بقوورینی؟!

ئەی بالآزادەکان! بۆ پیشەوە. ئەوا دایکەیەك بەژانەوەیە کیوە گەردن کەشەکەی دوارۆژی مرۆڤایەتی دەخاتەوە. خواوەندەکە مرد. ئیستا ئیمە گەرەکمانە مرۆڤی بالآ بژی.

## ٣

ئەوانەی لەنیو مەردوم دا زۆر کۆڵ پیوە هەلگرن‌و گرنگی پێ دەرن لەنیو خۆیاندا لەشتیك دەپرسنەوە کە ژیانی مرۆڤ بپاریزێ.. بەلآم زارا خەم خۆری ئەوەیە بزانێ چۆن مرۆڤ بەسەر مرۆڤایەتی خۆی‌دا سەردەکەوێ.

مرۆڤی بالا قیبلەگای نیگاو سۆزمە.. لەو بەولاوە نەدەربایستی ئەم مرۆڤەی ئیستام‌و نەدەربایستی خزمان‌و هەژارانم.. نەخەم خۆری پاشەکەوت‌و هەلبژاردەی خەلکم.

براینە! ئەم مرۆڤەم بۆیە خۆش دەوێ چونکە دەبیتە بنەو قۆناغیك، دیسان گوژمە سفەتیکتان تیدا بەدی دەکەم ئیوەم لەلاخۆشەویست دەکەن‌و ئومیدم لەدل دا- دەبووژیننەوە.

بالآزادەکان! بەراستی لە -بەسووك زانيين -دا شارەزا بوون؛ سەبارەت بەهيندە ئوميدم پيتان قايمە، ئەوانەی لەسووك كردن دا گەورەن ديسان لەريزو سەنگينی دا گەورەن.

لەنائوميدیيەوە گلاونو تاقيتان كردەوە؛ ئەم كارەتانم پی بەريزە، چونكە لەسەر خۆبەدەستەوەدان رام نەبوونو بەخۆ پاريزيش ريسوا نەبوون.

لەم زەمانەدا كلكە و زۆلەكی نەتەوە سەروەرن، بانگی هەموو ناچيزە سفەتيكی پەسەند ئارا- رادەهيلنو لەئارامو نەوازشو سلی و نەجمانەوە تێ دەكەنەوە.

ئەوانە نيمچە پياونو سفەت ژنانیو خزمەتچينو سەركردايەتی كەلە هيرەو حەشامەت دەكەنو بەتەمان بەسەرچارەنووسی دنيادا زاڵ بن، ئای چەند شتيكی بەد فەرە! دەك نەتەوەی نيمچە پياوەكان دواتان بڕێ ئەوانە كول نابن هەر لەوە دەپرسنەوە: ئەو چ شتيك بەنازو خۆشايەتیيەوە ژيانی مرۆڤ دريژ دەكا؟

ئا بەم چەشنە لەم زەمانەدا زاڵ دەبن.

ئادەی براكانم! بەسەر ئەو كۆمەلە ئادەميەدا بەرەوژوور سەربكەون، چونكە دوژمنو خوينە خۆری مرۆڤی بالآن.

هەڤالەكانم! بەسەر پەسەند ئارايی بێ نموودو خۆپاريزیو سڵ كردنەوەو چاوديريی گەرديلە خۆڵو شارەميروولەو خۆشايەتی زاتو كامەران خوازی بۆ زووربەی مەردووم- دا، هەڵ بكشينو بالآبنو بەرەو ژووربنەوە.

بالآ زادەكان! بەنائوميدیيەو خۆتان راگرن باشترە لەوەی خۆتان بدەن بەدەستەوە. بۆيە ئيوەم خۆش دەوێ چونكە دەزانن لەم زەمانەدا بژين.

ئا بەو چەشنە لە ژيان چی پەسەند تر بێ پييەوە دەنازنو خيری لێ دەبينن

## ٤

ئەرێ براينە، ئيوە ئازان؟!.. ئەو ئازايەتیيەم ناوێ كەبەسەنگ دەرپەراندنو بەرچاو فەراهەم دی..

ئازايەتی تەنيا خوازيكم گەرەكە كەس نەی بينێ.

نەبەزی ئەو هەلۆيانەم گەرەكە لەخوای شەهيدەوە بێ.

گیانە وشکەوەبووەکان بەئیسترەکانەوە.. کویرەکان بەسەر خۆشەکانەوە هیچیان نازانن هیزی دڵ بەری بەری بەکویوەیە.

دڵ مات بوون بە یاسای ترس لی نیشتنە.. بە شۆر بوونەوەی چالی دۆزەخە.. ئیدی ئەودڵانە تا بەشیان ترسو لەرز بێ سەراویلکەنو بەشیان بەناخەوە نیە!

ئازا- کەسیکە بەچاوی هەلۆ تیل بگریتە قووڵایی بێ بنو بەچنگی خۆی بر بداتە ژیراوەکان، ئا ئەوەیە ئازاو نەبەرد!.

## ٥

دانایان گووتویانە: ئەو کەسەی ئەودالی پرسەی من بی مرۆیەکی بەدخوایە.. خۆزگە ئەو راستییە بەسەر بارو دۆخی ئەم زەمانەش دا دەبرا، خراپەو شەر لەمرۆڤدا بووەتە چاکترین هیز، کەواتە پیویستە تا دێ مرۆڤ لەچاکەو خراپەدا وەك یەك بەرز ببیتەوە. ئەمە پەیرەوی لەمەرخۆمە: گەورەترین شەر بۆ مرۆڤی بالا لەهەمان کاتدا خیرە بۆی.

بانگی سزا هەل گرتنو بەکۆڵادانی هەلەو گوناهی جیهانییان شایستەی مزگینی بەخشی چینی خویریلەکان بوو لەنیو مەردومگەل دا. منیش بەچاو خۆمەوە- وەك گەورەترین پرسە -بەگوناهی گەورە کەیفم دێ.

لەگەڵ ئەوەشرا ئەم جۆرە قسانە بابەتی ئەو کەسانە نین کەگوییان دریژبووە.. هەموو وشەیەکیش بۆ هەموو زاریك ناشێ، بری راستی والابیژی دەرك پێکرنە ئاسایییەکانن، دینە گۆرێو بەهەمەلادا نەدیودەبن، قاچە بەرخۆلەکانیش شایانی ئەوەنین بەدوای ئەو راستییانەدا رابکەنو بیان گەنێ.

## ٦

بالاینە! ئایا لەو باوەرەدان: بۆ ئەوە هاتبم بەهەلەکانتان چیتان شیواندبێ چاکی بکەمەوە.. یان خەوگای نەرمونۆڵ بۆ ئازار مەندەکانتان ساز بکەم، یان ریگای ئەشکەوت پیشانی ئەوانە بدەم کە سەر لیشیواوی نیوتەنگەی چیاوچۆلن؟!

نەخێر..با لەجۆری ئێوە كامتان هەڵبژاردەیە نەمێنێ، وا دەخوازێ ڕۆژ بەڕۆژ پتر لەگێرو گازدابن.. تەنیا بەم تەنگ پێ هەڵچنینە مرۆڤ بەرەو لووتكە دەبێتەوە.. تا دەگاتە ئەو شوێنانەی هەورە تریشقە بەچەخماخەی كوشندەوە دەی پرووكێنێ.

لە بواری ڕۆژگاردا بیركرنەوەو حەزەكانم ئاراستەی ژمارەیكی كەم دەكەم.. بەرەو ڕووی ئەو ڕووداوانەیان دەكەمەوە كەدووراو دوور هەمیشەن. دەربایستی بەدبەختیو ئازارە ناچیزەكانتان نایەم.

لەبواری بەدبەختیدا كورتی دەهێنن ئازارەكانتان نەگەیشتوونەتە ڕادەی خۆیان؛ چونكە ئێوە هەر لەبەر خۆتان ئازار دەچێژن نەوەك لەبەر مرۆڤ.

ئەگەر لافی بەرگە گرتنی ئەو ئەشكەنجەیە لی بدەن بێ گومان درۆزنن، ئەوەندەی من بەرگەی لاوازیو سوێ بوونەوەم گرتووە كەسیكی واتان تیدا بەدی ناكەم بەرگەیان بگرێ.

## ٧

بەوە قایل نابم هەورە برووسكە لەئازارگەیاندنی خۆی بوەستێ، تەنانەت لەپەك كەوتنیشی دا نابێ لەرێبازی خۆی لابدا. من دەمەوێ ڕوو لەنیشان سەمتی خۆی بگرێو خزمەتی مەبەستەكانم بكا.

لەمێژە دانایی لەمەر من پەنگی خواردووەو چڕ بوونەتەوەوهەوریكی فەراهەم هێناوە، هەردیتو بەكشوماتی تاڵو پەیوەست دەبی.. داناییەكەو لەقەبەڵی نووسراوە: ڕۆژێ لەڕۆژان هەورە برووسكە بهاوێژێو چەخماخە لێبدا.

من نامەوێ ببمەنوریك بۆ ڕۆڵەی ئەم زەمانە، نەشم گەرەكە بەسفەتی نوور لەنێویان دا ناودێربم. لەباتی ئەوە مەبەستمە كوێربوونیان بەمیرات بخەم.. دەی هەورە تریشقەكەی دانایی خۆم! بشریخێنەو ئاوی چاوەكانیان بەرە!!

## ٨

دوای شتێ مەكەون لە وزەی ئێوە بەدەر بێو پەی پێ نەبەن. ئەو كەسەی داوای شتی لەتوانا بەدەری كردبێ لەگەڵ خۆیدا درۆزن بووە؛ چونكە لەو حەلەدا كەداوای

شتی بەروالەت گەورەو لاسایی‌کراوە دەکا هەمووشتیکی گەورەی لی تەوەلا دەبێ، بەئەندازەیەك خۆی دیتە پیش چاکە :

کول بینە، مردە لۆخەیە، وشەی زلی بەدەم دا هەڵ سواون، چەندە قرپەو شەقە لەپەنجەکانی و دەست بەیەکدانی‌دا هەڵ بستینێ کارەکەی بێسوودە!

مرۆ بالاًکان! خۆتان لەگەورە خوازان بپاریزن، قنیات کردن و دواکەوتن باشترین گەنجینەیە[٤٢]

–ئەی ئەوە نیە لەم زەمانەدا گەلەی مەردووم"العامة" باوی سەندووە؟.. کە گوترا رەشۆکی و گەلە هیچ جوداوازی‌یەك لەنیوان گەورەو بێ نموونە ددا نیە، ریگای راست و چەوت لیکدی جیا ناکریتەوە.. کەواتە گەلە مەردووم بی باری درۆزنەو هەست بەتاوانی درۆکەی‌ناکا.

## ٩

ویژدان ئازادو بالاًدلیرەکان! گورجو گۆڵانە خۆتان دابین بکەن. ئەم زەمانە، زەمانی گەلە مەردوومە. هەر ئەوەندە گەلە فیری شتیك بوو. بەبێ بەلگە پیی قایل بوو ئەوا بەهیچ بورهانیکەوە ناتوانن بیرو باوەرەکەیان بگۆرن یان ئەوشتە لییان بۆتە خوو لییان دەرهاویژن.

لەمەیدانی گشتی‌دا پێسەلماندن و قایل کردن بەشتی ژیرانە کاری نەکردەیە.. بەلکو بەهۆی جوولەو دەنگوسەدای بەرزونزمەوە لەگەڵ جۆری دەم و لەوس دا کاری پێ سەلماندن خۆی دەسەپینێ. لەبیمی گەلەو جەماوەردا هیچ شتیك هیندەی شابەلگەی تووشی قیزو نەفرەت نابێ!

---

[٤٢] کەلیرەدا (قنیات)ی بەباشترین گەنجینە داناوە، لەگەڵ گیانی فەلسەفەکەی دا (بەلای منەوە–ئالانی) ناگونجێ و گفتیکی دژوارە. بەتیروانینی هەموو بەندیکی ئەم کتیبە بۆمان دەردەکەوێ کەبنەمای ((سەرکەوتنی ئادەمیزاد بەسەر زاتی خۆی‌داو قەومانی شەری گەورە بۆ رامالینی باوەری دەرویشانەو راهیبانە هەرگیز لەگەڵ مەسەلەی ((قەناعەت)) ناگونجێ؛ ئەو بەئاشکرا قنیات و بەکەم دا کەوتن مندار دەکاتەوە. کەواتە ئەم قسەیەی ئیرەی تیل نیشانەو باری نیگەرانیش بۆ ئەو سەرەنجامیکی مشەیە!.

ئەگەر هات و جاریك لەنیو گەلەمەردوم دا ((راستی)) سەركەوت ئەوا دەكەونە مقۆو لیكدی دەپرسن: دەبی چ گۆرایی و سەر لی شیوانیك داكۆكی لی كردبیّ و سەركەوتنی لەقەبەل كردبیّ؟!

لەبەرئەوەی زاناكان وەك نەزۆك دەردمەندن و پاریزیان لی بكەن رقتان پیّ نەریژن.. هیندە چاو ساردو چاوپیسن سەیری بالندەیەك بكەن ئاوەرووت دەبیّ. فیشاڵ دەكەن گوایە درۆزن نین، لەم خۆهەلكیشانەشیان دا وریای خۆتان بن، كەسیك لەدرۆزنی دا كۆلەواربیّ و كەسیك راستی پەرست بیّ بەینیان دوورە .

نا گەرمی شتیكەو قورسەدانایی شتیكی دیكەیە. بەش بەخۆم باوەرم بەهۆشە ساردەكان نیە؛ كەواتە كەسیك نەزانیّ درۆ بكا ناشزانیّ ((راستی)) چیەو چۆنە.

## ١٠

كەویستتان بگەنە سەر لووتكەكان بەقاچی خۆتان پییان دا هەڵ بگەرین.. خەریكی ئەوەمەبن بەقەڵاندۆشكانی بیانی بگەنە سەر كیوان.

بەو سوارە بلیّ كە فركەدەكاتە سەر زینی ئەسپ و بەپرتاو بەرەو نیشانكرد دەروا: سوارە! لەبیرت نەچیّ قاچە شەلەكەت لەگەلتا سوار بووەو لەدواكایەش دا پیادە دەبی و لەبەرزیتەوە بۆ نزمانی شۆر دەبیتەوە.

## ١١

بالاپیاوەكان ئیوە خولقینەرن، ئافرەتیش تەنیا رۆلەی خۆی بەسك هەلدەگریّ. قەرەی شتی بیّئەندازە مەكەون. خۆتان فریّ مەدەنە بەلەمیكیش كەلەتەنكاودا چەقی بیّ. بزانن كیّ نزیكتانەو كەستانە، گومانیش مەبەن كەلەبەر خاتری ئەو دەتوانن شتیك بەشتیك بكەن.. هەر وەك ناتوانن لەباتی ئەو شتیك دابهینن.

داهینەرینە! واز لەوتەی ((لەبەرخاتران)) بهینن و لەبیری خۆتانی بەرنەوە، كارپەسندیتان بەوەبەندە كەشتیك دەكەن لەبەرخاتری ئەم و سەبارەت بەئەو و لەبەر فلانە هۆ نەبیّ. لەئاقار ئەو ئامیرو كەرەسە درۆزنانەوە خۆتان كەرو كاس بكەن.

كار لەپیناو كەسی نزیك دا باشەیەكەو بەبالای بۆرە پیاوان براوە..ئالو گۆری لەنیویاندا قاوە.. ئەم گوتەیەش– دەستیك دەستەكەی دی دەشوا باوە.. ئەو بۆرە قەومە هەقیان بەسەر خۆپەسندیی ئیوەوە نیە، بیّ هیزن و بەفریانایەن.

خولقینەرەکان! لەخۆ پەسندیتان دا ئەو خۆراگرتنو خۆ پاریزی‌یە بەدی دەکریّ کەسك پرەکان هەیانە. ڤیانتان دەوران دەوری بەرمیوەیەکە هیشتا هیچ چاوگیك نەی دیوە.. ئاگاداریەتی و خۆراکی پیّ‌دەدا. ئەوجا بیت و سەرپاکی خۆشویستنتان بەسەر رۆلەکانتان دا برژیّ– لەمەدا هەموو ئاکار پەسندیەکتان روون دەبیتەوە ئیدی ئەمەیە ئەرکی ئیوەو ئەوەیە ویستی ئیوە.. بەم رەنگە یاساو دەستووراتە درۆزنەکان ناتوانن گومراتان بکەن.

## ١٢

بالاّ داهینەرەکان! بزانن ئەوەی لەدایك دەبیّ نەخۆشەوئەوەی لەدایکیش بووە پیس بووە.

لەئافرەتەکانتان بپرسن تابزانن لەمندال بوون دا لەزەت نیە؛ ئەوەتانیّ مریشك بەگارەوە هیلکە دەکاو شاعیریش بەژانەوە دادەهینیو دەشیعرینیّ!

داهینەرینە! پیسی دایکەکانتان تیکەوتووە. هەموو مەلۆتکەیەکی تازە پیسی یەك دەهینیتە جیهانەوە

کەواتە پیّویستە هەموو داهینەریك نەفسی خۆی پاکژ بکا..!

## ١٣

پەسند ئارایی لەشتیکدا مەکەن کە دەسەلاتتان بەسەردا نەشکیّ. حوکمی نەکردەش مەگرنە ئەستۆی خۆتان.

باوانتان چ جیماویکی پەسندیان بەجیّ هیشتبی ئیوە دەست بەرداری مەبن.. چۆن دەتوانن بالاّببنەوە ئەگەر ویستی باوانتان لەتەك دا هەلّ نەکشیّ؟.. بەلاّم ئەوەی بەتەمایە بگاتە پیشەنگایەتی دەبیّ وریا بیّ و نەبیتە دوا ریبوار، لەوەش ئاگادارین! نابیّ بیویلیەکانی باوانتان پیرۆز مەندبکەن.. ئەمە کاریکی بی هوودەیە: کەسانیك

باوانيان لەژنانەوە گلابن‌و مەیان هەڵ دابێ‌و گۆشت بەرازیان[٤٣]ماشیبیتەوە- هەستن داوای رووسووری‌و داوین پاکی بکەن.

ئەگەر بەپێویستی دەزانن‌و بەتەمای داوین پاکیی ئەو جۆرە پیاوە ((باوان شیواو))ەن کەژنیك دوو یاسیتان بۆ دیاری کردووە-ئەوا زۆری دەم دەدەن پیی لی هەڵ دەبرن. بەش بەخۆم نای سەلمینم ئەو کابرایە واز لەنەفامی خۆی بهینێ.. بادیریکیشی بنیاد نابێ‌و لەسەر دەرانەکەی نوسیبیتی ((ئەمە ریبازی پاکیتی‌یە)) وا نیە، بەلکو ئەو دیرە پەناگایەکە بۆ ((کۆششی شیتانە)). لە گۆشەگیری‌دا مرۆڤ چ گوژمە هاندەریکی لەتەك خۆی‌دا هینابێ ئەوانە گەشەدەکەن. هەر لەو گۆشەگیری‌یەی‌دا ئاژەڵ‌و گیانداری شاراوە نەشونما دەکەن.

(واباشە زۆر کەس لەتەنیا خوازی بسلەمینینەوە)

ئایە لەم زەمانەداو لەسەر رووی زەوی کەس هەیە لەقدیسە خەلوەت نشینەکانی بیاباناچەپەلتربێ کە لەلایەکەوە شەیتان‌و لەلایەکی دیکەوە بەراز دەورو خولی دەدەن؟.

## ١٤

**ئەی بالاینە! کە بۆجاریك لەخەلکی لاوەکی بوون‌و نیشانەی نائومیدیتان لی دەرکەوتبێ‌و دۆش دامابن وەك پلنگی نیچیر لەدەست چوو یان وەك یاریکەریکی تاولەی مۆرە بۆ نەهاتوو-هەستتان پینەکردووەو خۆتان نەدیتووە؟.**

بەلام ئیوە بێ‌پەرواو بێ دەربەستن، بەباشی فیری یاری‌و سەرچلی نەبوون.. ئەی ئیمە لەژیان دا هەر ئەوەنین لەپیناو گالتەجاری‌و قوماردا دەورەی میزیکی گەورەمان داوە؟.

---

[٤٣] ئەم برگەیە پەیوەندی بەمیراتی‌و ماکزاوەیە کەخۆشمان کوردانە دەلیین: ((نانی چاك لەئاردی چاك / یان ئەوەی لەمشك بێ جەواڵ ئەدرێ)) ئەمانە بەهەرحاڵ.

بەلام بیت‌و نیتشە شارەزای ئایەتەکانی قورئان بوایە کە فەرموویەتی : ((قەرەی زینا مەکەون‌و بادە هەڵ مەدەن‌و گۆشت بەرازو مندارەوەبوو مەخۆن..هتد)) ئەوا لە بێ خوایەتیەکەی دا کورتی دەهینا!! ئەو مایە رووسووری‌یەی لیرەدا دەری بریوە فەلسەفە زادەی ئەوینە./ ئالانی.

ئەوەنیە لەبەرئەوەی بەهەلەداچوون و مەبەستی مەزنتان لەدەست داوە دەتانەوێ خۆشتان لەدەست بدەن. هەر لەبەرئەوەی خۆتان ژێر کەوتووبوون گەرەکتانە مرۆڤیش سەرنەکەوێ؟

نموونەکان چەندە هەڵ بکشین هینانەدییان گرانتر دەوەستی. ئەرێ پیاوە بالاکان! ئیوە- بۆ نموونایەتی بالا- نموونەی ژێر کەوتوونین؟

بەڵام لەمەدا گویتا بخەفینن، وەرنەپیشەوەو بۆ خۆتان پێ بکەنن، ئەوەش سەیر نیە کەئیوە نموونەی سەرکەوتن یان نیوە نموونەبن؛ چونکە نیوە ویرانن.

دوا رۆژی مرۆڤیش سستەرۆ خۆی کیش دەکاو لەئیوەدا- دەرەخسێ.

ئەرێ قوولاوی دوورە نهینگای مرۆڤ لە مەنجەلەکانتان دا ناجۆشێ؟..

هەر لەنیهادی ئیوەدا بالابوونی قوولترین شتی ئادەمیانەی بەرەو ئەستیرەی حەوتەوانە- خۆی مت نەداوە؟

گوایە شتیکی سەیرە بیت و چەند مەنجەلە ئادەمی یەك تیك بسرەوینن، بدەن بەیەك دا؟!

بالازادەکان! ئەوجا بۆ خۆتان پیبکەنن.. ئای کە بابەتە شیاوەکان ((ممکنات))ی دوا رۆژی مەردوم زۆردەبن! ئەوەنیە لە رابووردوودا چەندان هەوڵ و زەحمەت سەریان نەگرتووە؟.. ئای کەزۆرشتی سەر ئەم زەمینە- هەرچەندە گچکەش بووبن- گەیشتوونەتە پلەی کامل بوون!

بەو شتە گچکە پێ گەیشتووانە ئالقەی خۆتان بدەنەوە هەر شتێ تانەگاتە رادەی رەخسین[٤٤] ناتوانێ فیری هیوامان بکا.. ئەوشتانە کەپێ گەیشتن ((گەیین)) دلە کانتان ساریژ دەکەن.

## ١٦

---

[٤٤] رادەی کەماڵ- وەك لەئایندا باوە- بۆ ئادەمزادی سەر ئەم دنیایە نەشیاوە، خەیالە.

زاراش کە بە ((هەبوون خوازی))یەوە دەنازێ چۆن لەگەڵ ئەم بابەتە نموونەیی یە ئەندیشە ئارایەدا خۆی دەگونجینێ؟!

-ئالانی-

گەورە ترين هەلە کەلەم جيهانەدا کرابێ ئەم گوتەيەيە:

((ئای قور بەسەر ئەوانەی لەم دنيايەدا پێ دەکەنن!))

ئەو کەسەی ئەم هەرەشەيەی کردووە لەپێشکنين دا کورتی هيناوە، لەسەر زەوی شتی وای بەدەست نەکەوتووە شايانی پيکەنين بيت.. لەهەمان کات دا منداڵەکان شتی وادەبيننەوە کەبيان هينيتە پيکەنين

خۆشەويستی ئەو گەڤبازە مەودا کورتە، ئيمە کە قاقا پيدەکەنين شتيکی ئەومان پێنەگەيشتووە. هەر ئەوەيە کەرقی لی هەلگرتووين و بەرنەفرين و جنيوی داوين و بەگريان و ددان لی کرۆژتنەوە هەرەشەی لی کردووين.

ئايە ئەمە بەد چيژی نيە مرۆڤ هەستی خۆشەويستی نەبووبێ و بشکەويتە جنيودان و نەفرين؟ ئەو گەڤبازە بۆيە ئەمەی کردووە چونکە لەگەڵەی مەردومە توورەکانە.. بيت و ئەو رەشۆکيە بەخۆشەويستی زانيبايە ئاگری غەزەبی نەدەگرت هەر لەبەر ئەوەی بێ ئەڤين بووە. ئەوجا هەموو خۆشويستنيك کە بگاتە ئەوپەری بەجارە خۆشويستنيك داناکەوێ و بەزيادەوەی دەوێ..!!

لەو توورەو تۆسنانە دوور بکەونەوە؛ چونکە لەمرۆڤايەتی دا جۆريکی نەخۆش و هەژارن. ئەمانە لەو گەلەرەشۆکييانەن کە لە ئاقار ژيان دا-ديدەکوڵن و ژەهری چاوەکانيان زەوی گرفتار دەکەن.

ئەوانەی لەکارئاسانی‌دا نەزانن لييان بەدوورين. بەسەر خاك دا قورسە پين، دليشيان لەسنگيان دا بارگرانە. ئەوانە کەنەزانن سەما بکەن ئيدی چۆن قورسەباری گل نابن؟!.

## ١٧

هەموو شتە جوانەکان بەپلەو پيچەرێدا بەرەو ئامانجەکانيان دەرۆن.. وەك خيلە پشيلە بەمرەوە پشتی بۆ بەرزەوە دەکەن؛ چونکە بەتەمای بەختەوەريی زوو بەدەستەوە هاتوون. کەواتە شتە جوانەکانيش هەميشە خەندەن.

کاتيك مەردوم لەراستە ريی خۆيانەوە زەفەرمەند بوون تۆش بۆت هەيە لەهەنگاوەکانيان شارەزا بی. سەرنجی هەنگاوەکانم بدە ئەوسا بەحالی منيش دەزانی هەر کەبينيتم سەمادەکەم ئەوە بزانە کە لەئامانجی خۆم نزيك بوومەتەوە.

لەراستیدا من نەبوومەتە پەیکەریكو ستوونیکی بێ هەستو گیانیش نیم، حەزدەکەم بەهەموو کەنارو شوینە دوورەکان دا بسووریمەوە؛ چونکە لەزەویدا کۆسپو زەلکاوی زەبەند هەن قاچیك سەماکەرو خزیلك نەبێ پییان دا رانابووریێ.

براینە! دلەکانتان بۆ سەرەوە بەرزبکەنەوە.. بەلام قاچەکانیشتان لەبیر نەچن؛ چونکە پێویستە ئەوانیش هەڵ پەرن.. کەویستتان بەچاکی سەمابکەن پیتان ناخۆش نەبێ بەسەردا هەڵ بگەرینەوە.

## ١٨

خۆم کردە پاشای خەندە لیوەکانو بەدەستی خۆم
تاجی گولبەندم چنیو نامە بان سەرم..
بیجگەی من کێ دەتوانێ ئاوا پیکەنین
لەکوورەدا بجۆشینێو.. جۆشاندم
منم زارای سەماکەرو سووك هەنگاو..
بال لیك ئەدەمو بۆ بلندانی وزاق دەبەم..
بالندەکانیش تێ دەگەیەنم بالْ بگرنەوە..
من ئەو کەسەم بەژن جوانیی خوایانەم پێ براوە.
من: زارای پیش بینی دەم بەخەندەم..
بەسرەوتی لی بووردووم،
راپەرین خوازی سنوربەزینم..
بەنەفسی خۆمو بۆ خۆم تاج دەنیمە سەرم.

## ١٩

براینە دلتان بەرەو ژوور بکەنەوە، لەبیرتان نەچێ قاچەکانیشتان بەرزبکەنەوە..

سەما چیە کارامەکان ! نەك هەر بەدڵو قاچ بەلکو لەسەر تەوقی سەریشتان قنجەوەبن.

لەنیو بەختیارخوازەکان دا جانەوەری زەبەلاح هەنو قورسە جوولەن. هەشیانە لەدایك بوونیانەوە گەدەکیشن، ئەم جۆرە گیاندارانەدژ ویستی بەژن ریکین، وەك فیل

کەخۆی تاقی دەکاتەوە لەسەر تەوقی سەر قنجەوەبێ. هەر چۆنیك بێ ئەوانەی شیتی بەختیارین چاکترن لەوانەی شیتی بەدبەختین، ئەو کەسەی قورسە –سەمایە باشترە لەو کەسەیکە شەلە رۆیە.

لەمنەوە فیری دانایی بن، دزیوترین شت دوو رووی هەیە هەریەکەشیان جوانیی خۆی هەیە، شەری مەردومیش دوو قاچی سەمای هەیە. کەواتە بالا پیاوینە ریك لەسەر پی بوەستن.

کۆڵ بەمەرگەساتی جەماوەرەوە هەڵ مەگرن؛ لەم زەمانەدا لیبووك و قۆشمەکانیشیان سیمای خەفەتبارەکانیان لی نیشتووە، هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەم زەمانە– زەمانی گەلەی ئادەمییەکانە.

## ٢٠

ئیوە با ئاسای ئەشکەوت و رەهۆلی چیابن کەدەردەچی و بەکەیفی خۆی هەڵ دەکاتە سەما، دەریاش بەختووکەی ئەو شنەیە دەکەویتە لەرەو هەلپەرکێ و زنجیرە بەند!

ئافەرین لەو کەسەی باڵ لە کەرگەل دەروینێ..ئافەرین لەوکەسەی پەنجە بۆ گوانی دەلەشیر دەبا ودەی دۆشێ.

ئەوە گیانی پاك و ئیسك سووك!

وەك گەردەلوول دەیکاتە گەردش، لەپیناودیرین و داهاتوودا..

دوژمنی سەر ئالۆزو سەرزەدەیە، دوژمنی هەموو هەرزاڵ و دالیتیکی سیسەوەبوویە، دوژمنی هەموو شتیکی خراپ بوویە.

ئافەرین لەگیانی گەردەلوول: گیانی کیوی و پاکزاو سەرفرازو رەبەق کەبەسەر زەلکاوی خەمبارانەوە دەی کاتە سەماو رۆینە.((هەر دەلیی بەسەر میرغوزاری پاراودا لەنجەولاردەکا))!!

ئافەرین لەو گیانەی نەفرەت لەو حەشاماتە دەکا کە بە گەلۆری کردوو یانەتەسەگوەر..

ئەم جارەش ئافەرینی لی بێ کەنەفرەت لەو نەکاملانە دەکا بەمۆنییەوە خۆیان رادەوەشینن (ئەو گەلۆرانە وادەزانن بەمۆنیتی مەزنایەتی وەدەست دەهینن!)

ئافەرین لە هەژانیك كە بەپیكەنینەوە ((لم)) بەسەر ئەوچاوە بیمارانەدا- دەپرژینێ لەم بوونەوەرەدا بیجگەی تۆزیكی بۆرەقنە هیچ شتیكی دی نابینن.

بالاینە خراپیتان ئەوەیە كەفیری هەلپەركێ نەبوون بەهەوای خۆی؛ تا هەنگاوەكانتان هەلبرنە ژوور سەری خۆتان. بیتو نەوەستنو زەحمەت بكیشن چ ژیانیكی تیدا نیە-.

بلندینە! بابەتە شیاوەكانی بوونەوەر زۆرن.. كەواتە خۆتان بەپیكەنین رابهینن، باپیكەنینەكەتان بۆ ژوور سەرتان بلند ببیتەوە. سەماچیەلیزانەكان! لەبیرتان نەچێ بەجوانی بخەنو دلەكانتان بەرزبكەنەوە. تاجی خەندە لیوەكان گولبەندیكە وەدەی نیمە سەرتان. لەكوورەی خۆم دا پیكەنینم جۆشاندووە؛ دە ئەو جا ئیوەش فیری بن.

# سروودی دڵ تەنگی[٤٥]

## ١

لەکاتیك دا زارا سەرگەرمی دوانەکەی خۆی بوو، لەوحەلەدا کەدوا قسەی خۆی کرد–دیتی ئەوا لەزاری ئەشکەوتەکەی وەستاوە. میوانی بەجێ هیشتو دەرپەڕییە دەری هەوای پاك هەڵبمژێ، قریواندی:

–ئای لەم هەوا خۆشە.. لەم سروە نمناكو فینکە.. لەم هیوریو بەختەوەرییە..؟!

ئاشقە مارو هەلۆکەم! ئاوەرنە پیشەوە، پیم بیژن بۆن دانەوەی کۆری ئەو باڵاپیاوانەتان پێ خۆش بوو؟

–ئای دوو جانەوەرەکەی لەمەرخۆم چەندەم خۆش دەوین؟!

ئەوجا بەجووتە بەدەوری زارادا خولەکەیان کردو تیر قەدەریك تییان هەڵ روانیو سێ قۆلی کەوتنە شەماڵ هەلمژین کە لە ئەنجومەنی باڵاپیاوان دا شتی ئاوایان بەخۆیانەوە نەدی بوو.

هەر ئەوەندە زارا لەئەشکەوتەکە هاتەدەر پیری جادوگەر راوەستاو بەسووسەوە نیگای دایە ئەم لاو لای خۆیو گوتی: دیارەی شوینەکە چۆڵ بووە. لەرووی قەدرزانییەوە زارا ئاسا منیش بەسفەتی باڵاپیاوان دەتان دوینم:

((لەدەم ئەشکەوتەکە دەر نەچووبوو دەستی بەسەر گیانە مەکر بازەجادووگەرەکەمدا گرت.. کەشەیتانی خەفەتباریمە، دوژمنی خوینە خۆری زارایە، ئەم گیانە شەیتانەی من هەر ئەوەندە فیی هاتێ لەوانەیە لەبەر دەمتان دا جۆرەها ئەفسانە بنوینێ. بەڵام تکاتان لێ دەکەم لۆمەی ئەو شەیتانەم مەکەن؛ بەش بەخۆم زۆرم بەرهەلستی کردووە کەچی دەرەقەتی نەهاتووم.

گیانە بەد فەرەکەم ناحەزی زارایەو دۆستی هەموانتانە، ئەوجا ئیوەی بیر حەرام بەپیاوە رەوا پەرستەکان یان بە تەمیانە بژیرەکانی هۆش یان بەشۆرش گیرەکان یان

---

[٤٥] ص٣٢٦ ع، نووسراوە:

أ–لەچاپی بیروت دا ((نشید الاشجان))

ب–لەچاپی بابل دا ٩٨٦/ ((نشید الاشجار)) بەلامەوە یەکەم راستە.

بە حەزۆکە مەزنەکان ناودیربن–هەر ئەوەن وەك مـن تووشـی رق لی بوونـەوەی گـەورە بـوون. ئیوە باوەرتـان هـاوردووە کـە خواوەندەکـە مـردووە بـەبێ ئـەوەی لەسـەر یـەکیك لەخەگاکان خواوەندیکی دیکە بەقوماتەی ساوایەتی‌دا بەسترابێ

بالاینـە! باشـتان دەناسـمو دەش زانم زارا کـی‌یـە.. تـالیم بـێ و خۆشـیم بـێ دەشـێ خۆشـم بـوێ چونکـە هەسـتی پیدەکـەم قەشـەیەکی لی پـەیدا دەبـێ.. جـار جـارەش وەك پەیکـەریك دیتـە بـەرچاوم کەشـەیتانی خەمـەکان خـۆی تـێ هـەڵ خزانـدبـێ.. دیسـان خۆشم دەوێ چونکە گیانـە بەدفەرەکـەم لەسروشـتی ئـەودا شـی بووەتـەوە. ئـەو گیانـە خەریك بوو داگیرم بکا، ئا ئەوەتا ئامبازمـەو ییخـم ئـەدا، ئـای چـۆن شـەیتانیکە خـۆی دادەرنیتە خەمەکانی شەوە زەنگەوە.

–ئەوا تاریکی داهاتو چاکترین شت لـەخۆی‌دا نوقم دەکا گـوێ قـولاغ بـن.. چاو بگیربن! ئەو گیانە کەگیانی ئیوارە خەمەکانە ئایە پیاوە یان ئافرەتە؟

پیری جادووگەر ئاوای گوت. ئەوجا دەستی دایە تارەکەی‌و نیگای برینە ئەوانـەی لەدەورەی بوون.

2

کەشەماڵ بەفینکی هەڵ دەکاو شەونمی دلنەوازی دەبـارێ هیچ چـاویك نـای بینـێ ئاوەنگیش وەك هەموو تەسەلایەك بەبێ چرپە هەڵ دەنیشێ.

ئەی دلـە سـووتاوەکەم! بـەبیرت نایـە چـەند تینـووی فرمیسـکی ئاسمـان بـووی.. سیرۆشی تنۆکی ئاونگ بووی؟

بەلێ برسیتی هیلاکی کردبووی، خۆریش پووشـی زەرد هەلگـەراوی تیشـکە بـاران دەکـردو لـەنیو پیرەدارە رەش داگیرساوەکان دا بەدەورتـەوە راکەراکـەی بـوو.. هینـدە بـەنازو قەشـەنگ بـوو هۆشـی لەبـەر بـری بـوو.. وای خسـتە هۆشـتەوە گوایـە بـۆ – راستی–بەپەرۆشی. بشزانە فریودەرەو قەشمەریت پێ دەکا.

نەخیر بیجگەی شاعیریك هیچ شتیکی دیکە نیت

ئەوەش نی بەتاسەوە ئاگاداری راستی بی.

تـۆ بریتـی لەجانـەوەریکی خشـۆکی کیـوی، دەبـێ هـەر درۆ هـەڵ بریـژی.. جانـەوەریکی غەنیمـەت لـەکیس چـووی دڵ شکسـتی.. ئەوەنیـە رووبـەندی کلاودیـو

بەدەموچاوتــەوە دەگـری.. نـەخیر رووبـەندی تویـی رووبەندەکـەتی و هــەر بـۆ خـۆت غەنیمەتی فەلاکەتی خۆتی.

ئەری کابرا! راستە کەتۆ راستی خوازی؟

نا..نا. تۆ شیتی و بەس .. شاعیری و بەس!

تۆ رەوان بیژی بەخوازەوە.. قسەکەری بەقیرەوە..

بەرووخساری پەتەریانەوە.. بە گوزەرگای بەیانە

درۆزنەکانا باز بازین دەکەی،

لەژیر ئاسۆی خەیال ئارادا..

بەسەر پەلکەزیرینەی رووکەش دا،

ویڵ و سەرگەردانی

تۆ ئەو سەر لیشیواوەی بەهەمەلادا، رادەکەی

نا..نا. تۆ شیتی و بەس شاعیری و بەس!

***

ئەریَ کابرا! راستە کەتۆ راستی خوازی؟

ئەریَ کابرا! راستە کەتۆ راستی خوازی؟

تـۆ رموزنـی پەیکـەری ئـەو خواوەنـدەی کەلـە شـەختەی خـۆیدا ببریســکیتەوە، وەنەبیَ شکۆی ئەو پەیکـەرەت هـەبی کەبـەهیمنی بەسـەر دەروازەی مـالی خـواوە هـەڵ نرابی.

هەر پەیکەریك بۆ پەسەندایەتی و پاکینی هـەل نرابیَ تـۆ دوژمنـی ئـەو پەیکـەرەی. شایستەی ئەوەی لە چۆلە وانیدا بەرەڵابی و بەکەیفی خۆت هەراش بی. ئۆقرەت نیـە، کەترنجابیتــە تەنگــە بەریکــەوە لــەکون و کەلەبەرەکانیــەوە بــازت داوەتــەوە دەریَ و دەربەسـتی هیچ قـەومانیك نـەبووی. لـەنیو نـزاری پـر لەجانـەوەری خنجیلـەو بەلـەك دا حەزو هەوەسی خۆت بەتاڵ کردوەتـەوە لەحـەلیك دا لەلغاوەیانـەوە حـەزۆکی ئالۆش و خوین دەتکا.. ئـەوجا تیر ئاسا خزایتـە نیویـان و خـۆت کـردە جانـەوریکی خشـۆکە درۆزنە.

تۆ بەچەشنی ئەو دالآنەی بەتیژی دەروانن‌ە چالگەکان‌و هەر ئەوەندە بەرخیکیان بەدی کرد پری دەدەنێ. سیسارك‌و دالآشەکان دوژمنی بەرخەلن، دالەکان دوژمنی هەموو گیانداریکن کە بەنیگاو خوری‌دارو لارەمل‌و بەستەزمان بێ.

***

حەزو هەوەسی شاعیریش هەر حەزو هەوەسی دالٚ‌و پلنگە!

هەی شیتەکە، هەی شاعیرەکە! ئائەمەیە حەزە سوورکیی تۆ کەبەهەزار دەم‌و چاو خۆی رووبەند کردووە؟!

وەك مەریك لەمرۆڤت هەلٚ روانیوە؛ چۆن بە قاقای پیکەنینەوە مەرەکەت کووت و لەت کرد ئاوا خواوەندیشت لەمرۆڤ دا ونجرکردووە!

ئەمەیە خۆشایەتی شاعیرو خۆشایەتی دالٚ‌و پلنگ.. خۆشایەتی شیت‌و شاعیر.

کەرۆژیکیان خۆت دایە بەرشەمالٚ لەو مانگە یەکشەوە زرگنە دەچووی کەپەنا دەباتە بەرکەناری سوورهەلٚ گەراوی ئیواران‌و لەدەست نیوەرۆی دوژمنی رادەکاو لەو دارگولآنە ئاودیو دەبێ کەتاریکایی دایان دەپۆشێ. بەلێ لەرابووردوودا وەك مانگی یەك شەوە پەنام گرت. لەدەست شیتگیری - راستی- و لەدەست حەزو هەوەسی رووناکی رام کرد.. بەدەست قرچەی نیوەرۆوە ماندوو بووم.. بەرەو مۆلگەی تاریکانی‌و خۆر ئاوابوون بەداماوی شۆربوومەوە.

((راستی))ش بەگەرمەتینی خۆی هەلی پرووکاندم.

-ئەی دلی بێ ئۆقرە! فەلاکەتی سیرۆشیی ئەوکاتەت نایەتەوە یاد؟

-چیم بەسەر راستیگەلەوەیە دەك دوای برێ.

من شیتیکم‌و بەس، شاعیریکم و بەس.

## لیی زانین‌و زانست

جادووگەر ئاوای لاوژاندو سەرجەمی ئەوانەی لەدەوری بوون لەداوی ئاوازە غەمگینە تەرەنکارەکەیەوە گلاندن، تەنیا زەرووبازەکە نەبێ کەبەنیهادی هۆشەوە بەسترابووەوە، ئەو تیوەی نەگلا.. بەلکو راپەری تارەکەی دەستی جادووگەرەکەی رافراندو قیراندی: ((فلآنی! هەوای ئەشکەوتم بیست. دەی هەواکە تازە بکەنەوەو زارا بخەنەوە نیومان)).

((هـــەی ئۆينبازەكـــە! ئەفســـانەكەت پالمـــان پيـــوە دەنـــێ بـــەرەو شـــەهوەت و(حەزەسووركێ)و چۆلگە هەلنگ بدەين.

وای بۆ خۆمان! كەوينەی تۆ هەستیو دەم لە راستیيەوە بژەنێو كۆلی پيوە هەڵ بگـرێ وای بـۆ ئـەو بـيرە ئازادانـەی لەجادووگـەران سـڵ ناكەنـەوەو لەئـەنجامی كەمتەرخەمیيەوە ئازادی لەدەست دەدەن!!

ئـەی شـەيتانی دڵ تـەنگ! بـە لەوسـە لـەوس گەرەكتـە بمانگيريتـەوە نيـو بەنديخانـەكانو خـەلكی كەمـەندكيش بكـەی؟ لـەناڵينی تـۆوە بانگـەوازی شـاراوە دەردەچێ، هەر لەو كەسانە دەچێ كەبەداوينپاكیدا هەڵ بلينو لەو سەريشەوە پيدا هەڵدانەكەيان بېيتەوە بانگ هيشتن بۆ رابواردنو لەزەت وەرگرتن.

خاوەنی نيهادی هۆش ئاوای گوت. جادووگەرەكەش چاوی دەگيرا بەوانەدا كە لەدەوری بوون. سەبارەت بە زەفەرمەندی خۆی دەستی كردبوو بە ويرەوير ، باری خۆشـايەتیيەكەی هيـوری كردبـۆوە.. دەرهـەق بەميملەكـەی رقـی نيشـتەوە، دواتـر نيگای دايەو بەنەرميكەوە پيی گوت؛ سترانی خۆش باشترين دۆست دەئاورووژينی؛ كەواتە پيويستە بۆ ماوەيەكی باش كرو مات بين.. ئەوە نيە ئەو بالا پياوانە كرو مات گوێ قولاغن؟ وام بۆ دەردەكەوێ لەسرووودو ئاوازەكانم هيچ تی نەگەيشتبی؛ چونكە تێ فكرين لەجغزی ئەفسانەدا قەتيس ماوە.

خاوەن نيهاد وەلامی دايەوە: چونكە پيت لينا كەمن و تۆ جوداوازين واهەست دەكەم ستايشم دەكەیو چاكيشت كرد. ئەرێ بالاپياوەكان چيتانە؟ دەبينم ئيـوەی دەروون ئازاد متەق ناكەن! بەچەشنی ئەو كەسەن بۆ ماوەيەكی زۆر دابيتە سەمای ئافرەتيكی شەنگی رووتی بێپەروا كەچی لەئەندەروونی خۆیدا گيانی هەلپەرێ!

باڵاپياوينە! خاوەنی هيزيكن كە گاڵتە جاری يەكەی جادووگەريش بەشيكە لەو!

بـەلام مـنو ئيـوە دووراو دووريـن، بەرلـەوەی زارا بگەريتـەوە ئەشـكەوتەكەی بـۆم رەخسا زۆرتـان لەگـەڵدا بدويم.. هەرچەندە لەگەلتان دا ناكۆكو بۆ ژۆم، ئـەوەی مـن بـەباوەری قايمـەوە ئـەو دالمـی ئيـوە ليـی نـەبانن. بۆيـەش هاتمـە لای زارا چونكـە مەلبەندی چاكە لەبەريوەبردنی چەسپيودا، بەتايبەت لـەم زەمانـەدا كەهەمووشتيكی تيدا دادەوەشێ بەلام كارئەنجامەكەی زارا شلووق نابێ.

لەنیگاو روانینتانەوە دەردەکەوێ کە ئەودالی گومانن.. ئاشقی دوو دلین.. حەزتان لەوەیە بومەلەرزە سەرتاپای زەوی بگریتەوە تائەوەندەی کە ژیانتان شەپرزەبێ، ئەوەی من لیی دەترسم ئیوە حەزی لی دەکەن.. نیو کە گەورك‌و نزار ژیانی ئاژەلی لەلاشیرین کردوون.

هەرکەسیك چاوساختان بێ نەکەونە مەترسیی‌یەوە حەزتان لەچارەی نیە.. بەپیچەوانەوە حەزتان لەئاودەنگیی جادووگەرە رێ ونەکانە!

بەلام بشزانن ئاواتە پەناپەسیوەکانی دەروونتان وەدی نایەن؛ چونکە لەمرۆڤ دا ترس هەستیکی غەریزەیی سەرەتایەو هەمووشتیك راڤەدەکاو راستی گوناهە بنەرەتی‌و پەسندە بنەرەتی‌یەکانی وەدەردەخا، ((پەسند))ی منیش هەرزادەی ترس‌و بیمە کە پیی دەگوترێ ((زانیاری))

لەمیژە مرۆڤ لەزیندەگانی‌دا بووەو ترسی جانەوەری درەندەی لی نیشتووە، بەتایبەت ئەو جانەوەرەی خۆی‌تیدا متداوە کەزارا پیی دەلێ:

((جانەوەری دیوی ناوەوە)) ئەو ترسە لەگەڵ چەرخی رۆژگاردا بووەتە–ئەترەش چوونی گیان کەپیی دەگوترێ ((زانیاری)).

خاوەن نیهادی زانیاری ئاوای گوت، زاراش گەرایەوە ئەشکەوتەکەی‌و پاشینەی گوتارەکەی بیست، ئەوجا کابرای گەلاوگوڵ باران کردو بەگالتە پێکردنەوە پیی گوت:

ئەوە چ دەبیستم؟.. بەراستی تۆ کابرایەکی شیتی دەنا من شیتم؛ لەبەر ئەوە دەست پیشکەری دەکەم: بەیەك نۆرە –راستی– دابەزیمە بان سەرت. بشزانە((ترس)) نا ئاسایی‌و لادانیکە لەمرۆڤ داو لەبنەرەتەوە لە ئازایەتی‌یەوە راساوە.. تەماداری بەیەکادانی رووداوەکانی رۆژگارە.. گیرۆدەی خۆشایەتی گومانە.. خۆتیفریدەری شتی نادیارە.

هەر لەو سەردەمەوە کە جەربەزەیی‌و سفەتە پەسندەکانی گیاندارە درندەکان مرۆڤیان سەرگەرم کردووە–ئازایەتی لی بووەتە سەرتۆپی سۆزو پەرۆش؛ ئیدی کۆلی نەداوەو لەئاکار پەسندی‌و دلیریی درندەکان فرسەتی خۆی بینیوە،ئا بەو چەشنە بووەتە مرۆڤ.

وام بۆ دەردەكەوێ ئەو ئازايەتی‌یە راچەنیوە بالاّیە مرۆڤایەتی‌یەكە بالی هەلۆو مەكرو پیچی ماری هەن، ئەمرۆش پیی دەگوترێ ...

دانیشتوان دایانە قاقای پیكەنین‌و بەیەك دەنگ گوتیان:

-پیی دەگوترێ زارا.

لەنیو ئاپوورەكەدا شتیك وەك پەلە هەوری رەش بەرزەوەبوو. دواتر لەبەر چاو گوم بوو، جادووگەرەكە بەپیكەنینەوە گوتی:

ئەوە گیانی بەد فەرم بوو-دەرچوو. لەوەبەریش پیم راگەیاندن: گیانیكی مەكرۆی درۆزنەو خۆتانی لی بپاریزن. هەر ئەو بەد فەرە كاتێ بەرووتی وەدەركەوت فیلەكەشی كۆتایی دێ، بەش بەخۆم لەبەرهەلستی جادووی ئەودا كۆلەوارم چونكە ئافەریدەی ئیمە مانان نیە.

با ئیستا بەرەو باشی‌و شادیی خۆمان بابدەینەوە...

تەماشایەكی زارا بكەن كە چۆن چاوەكانی لەتۆزدا بۆر دەچنەوە! وابزانم لیم بەقینە.. بەلاّم تا تاریكایی دانەیە ناتوانێ ئاوا خەشم گیربێ.

لیی گەرین! ئیدی بەرەو میهری خۆی دەبیتەوەو منیشی بەدلّ دەبێ؛ چونكە تا ئەوجۆرە كارە شیتانە فەراهەم نەهینێ ناتوانێ بەوحالە خۆی پێ زەوت بكرێ!

زارا كابرایەكە خۆشەویستی دوژمنەكانیتی لەژیانم دا كەسیكی كەی ئاوا بەتوانام نەدیوە لەو هونەرەدا؛ لەپیناو خۆشویستنی دوژمنەكانی‌دا خەشمی خۆی بەدۆستەكانی دەریژێ!

پیرەی جادووگەر ئاوای گوت‌و هاتووانیش چەپلەیان بۆ لیدا، زاراش بەنیویان دا دەهات‌و دەچوو، دەستی ئەدان بەیەك دا. بەسۆزیكی ئاویتە لەشەرو خۆشەویستی دەربارەی هاوریكانی بیزاری دەنواند، وەك داوەرانی ئەوەبێ لەیەك سات دا خەلكەكە بەهانەخوازبن‌و ئەویش پاكانەیان بۆ بكا. لەدەم ئەشكەوتەكەی‌دا هەوای پاك چاخی كردو ئاشقە مارو هەلۆكەی هاتنەوە یاد. ئیدی تەكانی داو لەخۆی نووسا بۆی دەرباز بێ.

## لەنیوان دوو ناسکە لەبیابان دا

ئیدی ئەو ریبوارەی خۆی ناونابوو ((ئەدنیشەی زارا)) هاواری کردو گوتی:

لیرە بمینەرەوە چونکە خەم رەوینمانی؛ بیتو بڕۆی دیسان دەبین بەژیر باری خەمەوە. جادووگەر دواچۆری بیفەری خۆی بەسەردا قلپ کردینەوە.. تەنانەت میر قەشەی لەخواترسیشی خستە فرمیسك رشتن‌و لەدەریای خەمەکان دا سەرگەردان ما؛ بیجگەی جووتە پاشا ورەمان بەردا؛ چونکە ئەوان بەسەرو سیمای پاشایانەوە بەخۆفەرمانی راهاتوون‌و دەسەلات پیشان دەدەن. خۆ ئەگەر بەتەنێ بووانایە دەکەوتنە بەر گەمەی هەورو بای پاییزەو کەرەبا بەسەریانەوە دەگریاو گویمان لەهاتوو هاواردەبوو. زارا بەجیمان مەهیلە؛ بەلاو فەلاکەتی شاراوە لەگۆرین‌و گەرەکیانە بینە قسە.. تاریکستان‌و هەورو هەلای چر لەگۆرین‌و بەرۆکمان دەگرن، ئەوا لە تەنگە نەفەسیدا گیر دەخۆین.

خۆراکی مرۆڤایەتیت پێدا‌ین، ئایەتبەندەکان هیزو ئاواتیان بۆ هەڵ قولاندین.. بەئەندازەیەك لەپاش ئەم داوەتە بواری ئەوەنادەن گیانی تەوەزەلی بمان خاتە سیپالەوە.

تەنیا تۆ شایستەی ئەوەی بەدەورمانەوە هەوای هیزو پاکژی دەمە دەی. لەم جیهانەدا وینەی ئەو شەمالە بۆن خۆشەی کونە ئەشکەوتەکەی تۆم هەلنەمژیوە.

هەریم بەهەریم‌و قوژبناو قوژبن گەرام‌و لووتم تیوە ژەنی تەنیا لەمەلبەندەکەی تۆدا بەرامەی فینك چاخی کردم.

راست دەبیژم.. جاریکی دیکەش بەرامەیەکی ئاوا خۆش بووژاندمیەوە- کاتیك تیم راچریکاندە ئەو سرووشەی لەبەینی دووناسکە ((نەشمیلە))ی بیابان دا بۆم هات.. ئەوکاتەی لەپیرە ئەوروپای نمناك‌و خەفەتاوی دوورکەوتمەوەو سنگم بەسروەی خۆش بۆی بێ گەردی خۆرهەلات پربوو. ئەوەش زەمانیك بوو تییدا ئاشقی جووتە ناسکەی بیابانی خۆرهەلات بووم، ئاسمانی ئەوێ وەك ئاسمانەکەی ئەورووپا

نيە كەچرە هەور بەری بگریٚو بیروراش بەسەریەوە تەماوی بێ. نەخیر ئاسمانی خۆرهەلاٚت بێ گەردەو بیرورای چاكو پاك بەسەریەوە دەورنگیتەوە.

ئیوە كوٚلەوارن وناتوانن لەجادووی ئەو دوو ناسكە بنۆرن.. وازیان لەسەما هیناوەو بۆ خۆیان رۆنیشتوون.. جوانترین جمینی هونەری لەماتی ئەواندایە، بەجۆریك بیر كردنەوە لەسینەیان دا پەنهانە هەر دەلێی بۆ خۆیان گوژمەیەكن لەنهینیو پەردەكو بەرەنگو وینەی سامالەوە شەپۆل دەدەنەوە. ئاوایە پەردەكو هیمای خۆبەدەستەوەدەر بۆ ئەو كەسەی پەی بەنهینییەكان دەبا. لەپیناو شۆخینیو ئاشقینی دووناسكەی بیابان دا سرووشی ئەم سروودەم بۆ هات.

ئەو ریبوارەی بەئەندیشەی زارا ناودیر بوو ئاوای گوتو بوارەی كەسی نەدا وەلاٚمی بداتەوە، ئیدی پری دایە تاری جادووگەروو لاقی وەبەرلاقی ناو چاوی برینە دەورو بەرەكەیوبەو نیوەندەدا شكۆو داناییان دەپژاند. بەچەشنی پەریوەیەكی دوورە ولاٚت كەبەسەروەی ئاسمانی ئەوێ خۆی ببوژینیتەوە- پەرەلووتی رەوی بوونەوە و پراوپر هەوایان هەڵ دەمژی..

ئەوجا بەنركەوە لەسروودی راچریكاند:

بیابان بەرینو فراوان دەبێ، وای بۆ ئەوكەسەی بەتەمایە دەست بەسەر بیاباندا بگرێ!

چەند بەسامە!

چۆن سەرەتایەكەو شایستەی (سام)ی ئەفەریقایە شایستەی شیریكە یان هەرەشە كاریكە بەرەو رەوشتە پەسندەكان مەردوم راپەرینێ.

جوتە نەشمیلەكانم! كاتێ منی كورە ئەورووپایی بۆم ریكەوت لای قاچەكانتەوەو لەژیر سیبەری دارخورماكان دا رۆنیشتم، هیشتا ئەو سامەتان لی نەنیشتبوو.

-بانگی نویژ بەئاشكرا!-

***

چەند سەیرە! وادەزانم بەرانبەر بیابانم كەچی هیچگار دوورم لییەوە. وەنەبێ میرگولەكان قووتیان دابم، بەلكو وەك بۆن خۆشترین زار خۆیان بۆ كروومەتەوە، ئیدی خۆم تێ فری دان. جووتە دۆستی ئازیزم! ئەوەتام لەبەرپیتان دام.

-بانگی نویژ بەئاشكرا!-

***

ئەگەر ئەو میرگە پیشوازی لەمیوان بکا ئەوا بەش بەخۆم ستایشی دەکەم..

ئیوە هەردووکتان پەی بەهیما کاری من دەبەن لەداناییدا ئەویش بیتو بەچەشنی ئەو میرگە بێ ئەوا پیرۆزی لە هەناو راگەرێ.. بەلاّم چونکە من لە ئەوروپاوە هاتووم ئەویش لەهەموو بووکە رازاوەکان نکوولترە لەو مەسەلەیەدا کەوتوومەتە گومانەوە.

—خوا ئەویش چاك بکا، هەر ئەو دەبیستێو ئەو بەهانادێ—

***

ئەوا لەسیبەری میرگۆلەیەك دا . لیی دانیشتووم.. زۆر تر لە خورمایەکی تاریکە رەنگی ئالتوونی دەچم کەبەتاسەوە بێ خۆی بهاویژیتە زاری مەمك قیتیکەوە لەدوورەوە ددانە سەهۆلییەکانی سپی بچنەوە، دەبێ دلە گر تیبەربووەکانی هیشووە خورماکان خەون بەو زارانەوە نەبینن؟!

—بانگی نویژ بەئاشکرا!—

***

لەقرچەی نیوەرۆدا دەلیی ئەو خورمایانەم کە پەپوولەو میرووی بالداریان تیوەرووکاون..

حەزو هەوەسی لەو جروجانەوەرانە وردتر دەورەیان داوم، بەلکو لەو میروانە هاروهاجترن. لەراستو چەپمەوە وەك -باوەترسە- ((دۆ دۆ و زولەیخا)) بەجارێ ماتو بێ دەنگن.

سروەی فیردەوسو باخان هەلّ دەمژم، هەوایەك دەم ئەنگیوێ زیوکفتی مانگەشەوە، تا ئیستا مانگ تریفەی ئاوای لەئاسۆوە بەری نەکردووە. تۆ بلیی ئەم کارەی بەریکەوت بێ یان بەئەنقەست بێ، هەروەك کۆنە شاعیران گوتوویانە؟

بەش بەخۆم دەربارەی ئەوەی گوترا لەگوماندام؛ چونکە لەئەوروپا زەمینەوە هاتوومو ئەورووپاش لەهەموو بووکە رازاوەکان نکوولترەوسەهند ترە.

—خوا ئەویش چاك بکا، هەر ئەوە دەبیستێو ئەو بەهانادێ—

پراو پری کەپووم هەوا هەڵ دەمژم.. دوینێ و سبەینێ بۆ من نین، دادەنیشمو چاودەبرمە دارخورما کە چۆن لارو لەنجەیەتیو سمتی بۆ دەبزوینێ، هەر دەلیی سەما کەریکەو لەسەر یەك قاچ بینی گرتووە..

دەی کاتە کاری ئەوەی تەماشای بکا دەمو دەست لاسای بکاتەوە. لەوانەیە دارخورماکەمان ئەوەی لەبیر چووبیتەوە کە قاچی دووەمیشی هەیە.

بەخۆرایی لۆی ئاوریشمی شەکاوەم هەڵ پشکنیو ئەودالی قاچە بچکۆلە جادووبازەکە بووم..

جووتە ئازیزەکەم! بروام پیبکەن ئەو قاچەکەی دی تازە بەریی خۆیەوە رۆیشتووە.

ئەی هاوار! دەبێ ئەو قاچە ویلە لەکوێ گیرسابیتەوەو لەکوێ قۆناغی گرتبێ؟.. لەوانەیە بەتاقی تەنیا مابیتەوەو لەترسی پەلاماری درندەو زەردەشیری یاڵ لوول هەڵ بلەرزێ، لەوانەیشە ئیستا کوتولەت بووبێ.

—بانگی نویژ بەئاشکرا!—

***

جووتە ئازیزەکەم! هەرچەندە دڵ ناسكو سینە کەیلی پەرۆشو میهرن.. بەڵام مەگرین.

ئەی زولەیخا! تۆش وەك پیاوان خۆت گورجەوەکە..

نازەنینەکەم دۆدۆ—ی هەڵ بزرکاو!

لەگەڵ تۆشمە: چی دی فرمیسك هەڵ مەریژە.

.. بەڵام دەبی لەم گۆشە زەمینەدا (لەم بیابانەدا) هیزیك هەڵ قولیبێو دڵان بەندیوار بکا.. دەبێ رشتەیەك ئایەتو فەرموودەی تیدا هەبنو بۆنی گوڵاو بدەنەوەو بالآبنو سامیان لی بباریێ.

***

ئەی دیمەنی گەورەو بەسام! بەرزەوەبەو باجاریکی دیکەش سروەی پاکیتیو پەسندی هەڵ کات، بئەنگیوێ.

خۆزگە شیری رەوشتە پەسندەکان دیسانەوە لەبەردەم نازەنینەکانی بیابان دا دەهاتو دەی نرکاند!

کیژگەلی بیابان! ئیستا تێ دەگەن کەنرکەی ویڵو پەسندایەتی بەهیزترین شتە بۆ وریا کردنەوەو راپەرینو هەژاندنی ئەورووپا.

ئەوەتام منـی کـورە ئـەورووپایی بـەدەس خـۆم نیـە دەبـێ لـەئاقار نرکـەو دەنـگ دانەوەی ئایەتە رەوانو ئاشکراکان داچلەکیمو باش باش هەستم رابگرم،

—ئیدی پشتم بەخوا بەستووە—

((بیابان بەرینو فراوان دەبێ، وای بۆ ئەو کەسـەی بەتەمایـە دەسـت بەسـەر بیابـان دا بگرێ!)).

## بەئاگاهاتن

### ١

دوای ئـەوەی ریبـوارو ئەندیشـە هەریـەکەیان سـروودی خـۆی چـری ئەشـکەوتەکە جمەی هاتو کردیانە حیلەی پیکەنین، لەیەك ساتا هەموویان کەوتنە قسـە.. تەنانـەت کەرێپاشـاش بـۆی دەسـاندنەوە. زارا بەرقــەوە راوەســتاو گالتــەی بــەو میوانانــەی دەهات.. هەرچەندە کەمیك لەو کەیف خۆشیەیان پەری بووە دلی ئەمیشـەوە؛ چونکـە ئــەو دیاردەیــەی بەیەکــەم نیشــانەی بەدبــەختی[٤٦] ئــەوان لی دەدایــەوە. لــەزاری ئەشکەوتەکەی هاتە دەرێو لەگەڵ ئاشقە مارو هەلۆکەی دا کەوتە قسە:

نا ئومیدیەکەیان چی لێهات، وادیارە نائومیدی لەمـەرمنیان لـەبیر چووەتـەوە.. کەچی هیشتا قیژە قیژیان لەبیر ماوە؟!

هەر ئەوەندە کەرە بۆز لەگەڵ غەلبەغـەلبی پیاوەبالاکان دا تیزەی دایـە زەریـن زارا گویی خۆی ئاخنیو گوتی:

—ئەمانە بەکەیفنو دەشێ لەمنەوە فیری بووبن. ... بەلام پیکەنینەکەیان پیکەنینی من نیە.

---

[٤٦] لەدوو نووسخەی جیادا هەرنوسراوە : ((في هذا الحبـور اول اعـراض الشـقاء)) واتـە بـە (ق) نووسـراوە، دوای چـەند دیریکـی کـە نووسـراوە : ((یمثلـون الی الشـفاء)) واتــە بــە ((ف)) هەرچەندە لەوشەی ((شقأ)) بەدبەختی /بەگومانم، بەلام هەر هیشتمەوە.

قەی ناكا، ئەمانە پیر گەلیكن سەبارەت بەوەی كە ریگایەكیان بۆ خۆیان پەسندكردووە بی گرنەبەر هاتوون خۆشبوونەوەی خۆیان دەنوینن..

قەی ناكا گویچكەم بەرگەی هەراو هۆریای لەوە تیژتری گرتووەو رەقاوەتەوە!

ئەمرۆ سەرەی رۆژیكی سەركەوتووە؛ چونكە قورسەگیان كە بۆ رووناكی دوژمنیكی بی رەزایە- بەرەودوا دەبیتەوە هەرچەندە سەرەتای ئەمرۆ بەدووم بوو دەشێ كۆتایی بەخیر بگەرێ.

ئەوا ئیوارە سوارە بەسەر زینی ئەرخەوانیيەوە دەریاكانی برینو ئاغر ئاغرهاتە بەرەوە.

ئیوارە تیلی شادمانی دەگریتە رۆژی سەرفرازی، زەویش بەسەر نهینیەكانی خۆیدا خاو دەبیتەوە.

كە ئیوە بەمیوانی مەنزلتان لەلام گرت، دەبێ لەپەنامەوە ژیانیش شایستەی گرنگی پیدان بێ.

لەهیور بوونەوەیەكی كونە ئەشكەوتەكەی دا زارا لەسەر قسەكانی رۆیشت:

ئەمانە بۆ خودی خۆیان فیرە پیكەنین بوونو رووحە قوورسەكەش لەكۆلیان بووەتەوە، وادیارە خۆراكو ئایەتەكانی من كاریان تی كردوون.. بەو ژەمە خۆراكەی من هیچ گەدەیان هەلّ نەئاوسا.. چونكە ئەوژەمەی من پیم نۆش كردن شایستەی خەباتكەرانەو حەزە تازەكانیان وریادەكاتەوە.

دلیان بەجارێ رەویوەتەوە، لەبیركردنەوەی خۆیان دا بەیانی تازەگییان بەدەست هیناوە كەمایەی كەیفو شادیيە، بۆیە دەبینین چوار پەلیان پر لەئاواتی تازەیە.

وەنەبێ نەزانم كە ئەو جۆرە خۆراكە نادریتە مندالآنو ئافرەتە شلومەكان چ پیریژن بن یان قەیرەو نەورەس بن. بۆ قایل كردنی هەناوی ژنو منـدالّ چارەیەكی دیكە هەیە، خۆمنیش نە پزیشكی ئەوانمو نەدەرەقەتیشیان دیم.

ئەو كۆمەلە بالایە وازیان لەبیز هاتنەوە هاوردووە، لەمەش دا سەركەوتنیكی منی تیدا هەیە. كەهەستیان پێ كرد لەكن من ئاسوودەن هەموو شەرمیكی هیچووپوچیان لەخۆیان دارنی.. ئا ئەوەتان بەدلّ سۆزی یەوە هەست بەهەرشتێ بكەن سووكو باریك دەری دەبرن.

ئەو بالایانە بەدڵ گوشادییەوە بەرەو - وردەکاتی خۆشیان بادەدەنەوەو منەت باری کاویژ دەکەنەوە، منەتبارکردنیش بۆ بادانەوە بەلای چاك دا باشترین بەلگەیە. زەمانەش هیندە ناخایەنێ بۆ بیرەوەریی کۆنە خۆشییەکانیان بەرزەك و نیشانە داچەقینن.

ئیستاگشتیان لەنەخۆشی چاك بوونەتەوە! لەگەرمەی خۆشیدا زارا ئاوای گوت. ئاشقە مارو هەڵۆکەشی ریزی ئەم هیوری و بەختەوەرییەیان بەچەرخەیەك پیشان دا.

## ٢

دوای قەدەریك کە غەلبەغەلب لەنیو غارەکە برا گویی زارا شەپرزە بوون. تەنانەت کەبیدەنگیی مەرگ بالی بەسەر ئەوناوەدا کیشا.. بەڵام بەو چەشنەی سەرە سنەوبەر بژەنیتە مەقەلی پشکۆوە ئاوا بەرامەیەکی خۆش لەغارەکەوە دەرچوو!

لەبەر خۆیەوە دەی پرسی دەبێ ئەو گرۆیەی لەئەشکەوتەکەم دا بەجیم هیشتن خەریکی چی بن؟.. هەر ئەوەندە گەیشتە بەردەرگاکەی واقی ورما.. هەرگیز چاوەرانی شتی ئاوا سەیر نەبوو؛ بۆیە بەسەریان دا هاواری کرد: ئای کەسەیرە! خۆ بایان داوەتەوە بۆ خۆپاریزگاری و خوا پەرستن.. ئەوەتان داب و نەریتی نویژ بەجێ دەهینن.. بەراستی ئەمانە لەوەدەچن شیت بووبن!؟

سەرجەمی ئەوانەی لەئەشکەوتەکەی خزابوون وەك منداڵان و پیریژنان بەچۆك دا هاتبوون و کرنووشیان بۆ کەرەکە دەبرد. دزیوترینی جیهانییان بەنەرەوە خۆی رەپیش کردو هەڵ چەرخایەوە.. دواتر بەلاوژەوە دەنگی لێ هەڵ بری و دەستی کرد بە پیدا خویندن:-

"گەورەیی و دانایی، منەت و ستایش ، تواناو دەسەلات- هەموویان شایستەی خوای ئیمەن.. تا ئەبەد"

کەرەش بەزەرەیەکی دوورو دریژەوە بۆی سەندنەوە.

-بارقورسی ئیمەیەو خزمەتمان دەکا، بردە باریکی هیندە خۆراگرە هیچ داخوازییەك بەپاشدا ناباتەوە، ئەو کەسەی خواوەندی خۆی خۆش بوێ ئەویش خۆی ئاسا بە قایمی دەی حەملینێ.

کەرەکە بەزەرینەوە بۆی سەندەوە.

-بێدەنگە، تەنیا بە ئافەریدەی جیهانی خۆیدا هەلدادەلێ مەگەر بەکەیفی خۆی وازبهینێو لی بوەستیتەوە.. دەنا ئامانج گری هەلە نیە.

کەرە-بەزەرینەوە بۆی سەندەوە.

-بۆخۆی رادەبووریو کەسیش لە ژیان دا گویی ناداتێ. پیست خۆلەمیشی‌یەو رەوشت پەسندیی خۆی پێ حەشار دەدا. ئەگەر هۆشی هەبێ بەوپیستە کەوە رەنگە پەروای دەکا.. لەبەر ئەو سفەتانەی، تیکرا باوەر بەجووتە گوێ دریژەکانی دەهینن.

کەرەکە بەزەرینەوە بۆی سەندنەوە.

-ئای چ حیکمەتیکی پەنهانە! چۆن گوێ دریژیکە بەئەرێ نەبێ وەلام ناداتەوە.. داواش رەت ناکاتەوە؟! تۆ بلیی جیهانی‌یەکانیشی لەسەر بیچمو وینەی خۆی ئافەریدە کردبن؟.. بۆیە جیهانیو جیهانیکی هیندە گەوجو هیچوو پووچن.

کەرەکە بەزەرینەوە بۆی سەندنەوە.

تۆ ریگەی راستو چەوت دەگریتە بەر، ئەوەی مەردووم بەراست یان بەچەوت ناوی دەبا تۆ گرنگی پێ نادەی. چونکە پایەبلندیو مەلەکووتی جەنابت نەدیوی خیرو شەرە، پاکیتیو بێ تاوانیی تۆ لەوەدایە کە نافامینی بێ تاوانی چیە.

کە رەکە بەزەرەوە بۆی سەندەوە.

ئەوەتایت کەس لەخۆت ناتارینی.. پاشاو گەدا وەك یەك وەردەگرێو بەیەك چاو تەماشایان دەکەی. ئەگەر خەتابارەکان بینە لات ئەوا بەخۆش زەرینیکەوە پیشوازییان دەکەی.

کەرەکە بەزەرینەوە بۆی سەندەوە.

تۆ حەزت لەمییەو حەزیشت لە هەنجیری گەیووە. لەخواردن دا توورەنابی، هەرکە برسیت بوو هیندە قایلی درك دەماشیتەوە. ئالەمەدا حیکمەتی خواوەندانەی لەمەرخۆت پەنهان داوە.

((کەرەکە بەزەرینەوە بۆی سەلماند..!))

# جەژنی کەر

## ١

کە زارا ئەم پارچە پیدا هەلدانەی بیست بەجارێ سرەوتی لەبەربرا.. خۆی پێنەگیرا ئەویش دەستی کرد بەزەرینو تەکانی داو لەنیومیوانەکانی دا گیرسایەوە ئەوانیش سەرجەم شیتو هیربوون. ئیدی بەسەریاندا قیژاندی:

ئادەمزادەکان! ئەوە خەریکی چین؟. لییان هاتە پیشەوەو یەکە یەکە راستی کردنەوەو گوتی:

ئەی خاکە سار خۆتان! بیتو بیجگەی من ئاوا چاوی پیتان بکەوتایە.. تەوەزەلی کاسی کردوون، لەم دینە تازەیەتان دا کەوتوونەتە پەلە قاژێ.. یان بەلیدانەوە یەکی دی لەپیرو پیریژنو خەلەفاوەکان دەچن کە بەشیتو ویتی ورینەدەکەن!؟

تۆش ئەی میر قەشە، بەبێ هیچ نکوولییەك چۆن ریگەت بەخۆت دا کە خواوەند ئاسا کەریك بپەرستی؟

قەشەی مەزن وەلامی دایەوە:

زارا! بم بەخشە؛ لەکارو باری خوایدا من لەتۆ شارەزا ترم، جیی خۆشیەتی کەدەبێ من هەر وەهابم. لەچاوی کەریك را-خوا بپەرستین باشترە لەوەی کە بێ خوابینو هەر نەی پەرستین. دۆستە مەزنەکەم! لەم قسەیەم رابمینە ئەوجا دانایی فرەت بۆ دەردەکەوێ.

ئەو کەسەی گوتوویەتی ((خوا گیانە)) ئەوا بەرەو نکوولیو بێ خوایەتیهەنگاویکی زلی هەلهیناوەتەوە، ئەو جۆرە گوتەیە خراپەیەکی ئەوتۆ لەدنیادا دەنیتەوە کە بەئاسانی چارەسەر ناکرێ.

هیشتا لەسەر ئەم زەوییە شتیك ماوەتەوە کەئەتوانین بیپەرستین؛ لەبەرئەوە دلم لەخۆشیان دا سەما دەکا.

زارا! بەسیەتی. میر قەشەی لەخواترس هەستی چۆنەو باوەری بەچیە تۆ لە ئاست خۆتەوە بێ بەخشە.

زارا بەلای ریبوارو ئەندیشەدا ئاوری دایەوەو گوتی:-

((تـۆش کـەپیت دەگوتـرێ ((بـیری ئـازاد)) یـان کـە بـاوەرت وایـە ((بـیریکی سەربەستی)) چۆن نمایشی ئەم دەورە سەیرە دەکەی و ((بت)) یش دەپەرستی؟!

ئەی ئەو کەسەی بۆخۆت بـاوەریکی تـازەت بریـار داوە ئـەوەتای کـاریکی وەهـا فەراهەم دەهینی کە لەنیو ئافرەتە شۆخەکانی شەوارەدا نەت کردووە.

–ئەندیشەو ریبوار وەڵامیان دایەوە: کاریکەو مایەی خەمناکی‌یە، تۆش راسـت دەکەی.. بەڵام بەش بەخۆم ناتوانم هیچ بکەم؛ چونکە کۆنە خواوەند ژیاوەتەوە، ئیدی زارا چ دەلیی بی لێ.

هـۆی ئەمـە هـەمووی دەگەریتـەوە بـۆ درێوترینـی جیـهانییان کـە خواوەندەکـە دبوژینیتەوە، دەی ژینیتەوە.. ئەوناشیرینە گوتووشیتی، خواوەند کوژ [٤٧] خۆیـەتی.. دواتر مەرگی خواوەند بریتی‌یە لەباوەریکی لەقی بی پشتیوان.

زاراش گوتی: ئـەرێ کۆنـە جادووگـەری فیلبـاز! تـۆ چیـت کـردووە؟ ئـا لـەم کـاتی سەربەستیەدا کێ باوەرت پێ دەکا کە تۆ ئیمانت بەو شتە کەرەکی‌یانـە......هینـاوە... ئەرێ تۆ پیم نالیی کەی باوەرت بەو شتە خواوەندییانە هیناوە؟

بـەلای خۆتـەوە لـیزانو مـەکربازی، ئـەی کەواتـە چۆن پرکیشیت کردو ئاوا خـۆت گەوج کرد؟!

جادووگـەر وەڵامـی دایـەوە: زارا! تـۆ پیکـات. ئـەوەی کـردم گەوجایــەتی بـوو زۆرم رەنج بۆ داو پییەوە خەجلیمو هیلاك بووم.

زارا بە ((نیهادی هۆش))ی راگەیاند، لەگەڵ تۆمە! بیر بکەرەوەو پەنجەت بنیرە بان پـەرەی لوتـت، گوایـە ویژدانـت لەسـەر کـردەوەی رابـووردووت بـەگیری نـەهیناوی؟.. ئەرێ بیری تۆ لەم گەرمەی پەرستنو چەرەدووکەلی بخورەدا پیس و بۆژۆ نەبووە؟.

---

[٤٧] لەم برگەیەدا ئەوپەری پرکیشی پیوەدیارە. لەهەمان لاپەرە–٣٤٠–دا نووسراوە: ((ولو قال انه قائله)) بەهەمزە لەچاپ دراوە، سەرنجی نوسخەیەکی دیکەشم دا هـەروەها بـوو. من ((ئالانی)) وای بۆ دەچم هەلەی چاپ بی‌و((.....قاتله)) بێ واتە بکوژی ئەو.

بەهەر حاڵ کەلەدواییینەی ئەم برگەیەدا– دەلێ: ((عقیده لا ترتکز علی شیء)) کۆلـەواری ئەم فەیلەسووفە لەبێ خوایەتی‌دا بەتەواوی ئاشکرا دەبێ.

ئالانی

نیهادی هۆش پەنجەی نایە بان لووتی و گوتی: لەو دیمەنەدا شتێك هەیەو دلمی پێ ئاسوودە ئەبێ. لەوانەشە مافی خوا پەرستیم نەبێ.. بەڵام هەر چەندە سەرنج دەدەم: خوایەك بێ و بەو شیوەیە بی ئەلبەتە شایستەی باوەر پێ هینانە.

بەگویرەی ون بینی و شایەدیی لەخواترسەکان پێویستە پەروەردگار زاتیکی نەمربێ. کەسیکیش خاوەنی زەمانیکی ئاوا مەودا دریژ بێ دەتوانێ باشترین کات و زەمان لەقەبەڵ خۆی بکا، پیی خۆشە بەفرمانی گەلۆرانەوە بەکاوەخۆ بژی و بگاتە ئەو ئامانجەی گەرەکیەتی، کەسیکیش بیری[٤٨] لەرادە بەدەر بێ حەزی لەشیتی و کاری گەلۆرانەیە.

((ئەدی نابینی زارا! چونکە پیت داگرتووە لە دانابیدا خەریکی ببیتە کەریك؟))

بۆچی دانا ریگای پیچاو پیچ ناگریتە بەر؟.. تۆش لە دەروونی خۆت دا شتیك بەدی ناکەی ئەم راستی‌یە بسەلمینێ؟

ئەوجا زارا بەدزیوی جیهانییان دا هەلی روانی؛ دیتی لەسەر زەوی خۆی دریژ کردووەو خەریکە شەراب بکا بەدەمی کەرەکەدا. ئەوجا پیی گوت: ئەرێ تۆ چیت کردووە؟ فلانی! بەتەواوەتی گۆراوی و لەچاوانتەوە تیشکی نوور دەردەچێ، رووکارە دزیووەکەشت بە کەوای مەزنایەتی‌یەوە خۆی دەشەکینیتەوە. ئەرێ ئەو قسەیەی بەدەم هاوریکانتەوەیە راستە؟.. ناشێ لەپاش مردن زیندووت کردبیتەوە؟.. ئەوەچی هانی دای زیندووی بکەیتەوە؟.. ئەو حەلەی بەمەرگت سپاردو رەگەڵ زەمانی بەسەر چووت خست ئایە کەتنباربووی یان نا؟!.

ئەوەتای دەت بینم دوای هیروگیلی زیت بوویتەوە، ئەوە چیت کردووە؟.. چما چاو ساغیی خۆت دەکەی؟.. هەی داخراوی شاراوە! قسە بکە، قسە.

ناشیرینتری جیهانییان گوتی:

-زارا! هەبێ و نەبێ تۆ زەلامیکی بەدی. ئەوا لیت دەپرسم ووەڵاممم بدەرەوە: ئایە کە خواوەندەکە زیندە بێ یان بەراستی مردە بێ کاممان باشتری لێ دەزانین؟

---

[٤٨] بۆ. ل-٣٤١ = ((المتجاور حده)) بەلامەوە هەلەیەو دەبێ ((المتجاوز)) بەزای بێ.

بەڵێ من دەزانم- هەر وەك و لەوەبەر فێرت کردووم- کەسێك گەرەکی بێ کوشتنی بێ ژیانەوە بەئەنجام بگەیەنێ چەکی پێکەنین دەخاتە کار، تووڕە بوونیش کوشندە نیە.

ئەدی زارا! هەر تۆ نەبووی کەئەمەت گوت؟..

تۆ پەنهانی.. تۆ رووخێنەری هیوری.. تۆ قدیسی خەتەرناکی! هەر تۆ بەدیو هەرتۆ بەدخوای.

٢

کەزارا ئەو وەڵامانەی بیست حەپەسا ئەوجا بۆ زاری ئەشکەوتەکەی راخزیو هەڵ ویستا، دواتر نەراندی:

ئەی پرکیشینە! بۆچی نهێنییەکانتان لەبەرچاوی من دەشارنەوە؟.. هەر لەبەر ئەوەی کە بوونتە لەخوا ترس چوونەتە قاوغی منداڵانەوەو دڵتان داناچڵەکێ.. کردەوەکانتان ساوایانەن. ئەوە نیە لەپی شیرەخۆریتان بەخۆوە گوشیوەو دەبیژن: ((پەنا بەتۆ.. ئەی خوای باش و ئازیز!))

دەی هەر ئیستا لەهۆدەی منداڵان دەربچن.. ئەشکەوتی لەمەر من ئەمرۆ گەمەی منداڵانی بەخۆیەوە دی.. برۆنە دەرێ واز لە هارو هاجی منداڵان بهێنن.. بەدڵ سرەوتنەوە بیر بکەنەوە تیرابمینن.

بێ گومان ئەگەر ئێوە نەبنەوە بەمنداڵ ناکەونە مەلەکووتی ئاسمانەوە (ئەمەی گوت و پەنجەی بەرەو تاقی ئاسمان هەلبری). ئەوجا سەرجەم گوتیان: نا.. نامانەوێ بچینە مەلەکوتی ئاسمانەوە، ئیستا بووینە پیاو تەنیا داوای پیرۆزی مەلەکوتی زەوی دەکەین.

٣

زارا لەسەر گوتارەکەی رۆیشت:

دۆستە تازەکانم.. پیاوە رەفتار سەیرەکان.. باڵاپیاوینە! ئیستا بەش بەخۆم حەزم لەچارەتان نیە. دیارە دڵ خۆش بوونەتەوە، بۆیە دەمووچاوتان پەمەیی هەڵ گەراوە.. مافی خۆتانە وەك گوڵی نەورەس بیکەنە شایلۆغان.. هەرلەبەر ئەوەی گەرەکتان بوو

شادمان بن و زارای رووح سووکیش بەسۆزی پیریتی یەوە لەنیوتاندا بێ و گیانتان نوورانی بکا کردتانە کەیفە کەرانێ و ئاهەنگتان بۆ ((کەر)) سازکرد.

بەرزە پیاوان! ئەم جۆرە جەژن و شەوگارەتان لەبیر نەچنەوە، کارەکەتان بلیمەتانە فەراهەم هینا، ئەمە جەژنی ئەو کەسانەیە کەلەنەخۆشی خەلستوون، ئەم جۆرە جەژنانە گەف لەنۆش و خاسەوەبوون دەکەن.

کە بەبۆنەی ئەم جەژنەوە، جەژنی کەر– ئاهەنگتان سازکرد با کاریك بێ و لەپیناو خۆشەویستی خۆتان و خۆشەویستی من و یادی مندابێ..

زارا ئاوای گوت...

## سروودی مەست

### ١

بەدەم قسەکردنی زاراوە میوانی ئەشکەوت دوابەدوا هاتنە دەرێ و خۆیان دایە بەرهەوای رەوان، زارا قۆلی دزیوترینی جیهانییانی گرت و بردی تا دیمەنی شەوگار و تاڤگە زیوینەکانی بەرتریفەی مانگە شەوی لەنزیك ئەشکەوتەکەیەوە پیشان بدا. ئەو پیرانە بەگەلە لەبەردەم ئەوتاڤگانەدا بەدلنەوازی یەوە راوەستان و بەخودی خۆیان دەنازی، ئەوجا زارا لەدلی خۆیدا، دەی گوت: ئیستا بەهۆی بینینی ئەو بەرزە پیاوانەوە زۆر بەکەیفم!

ئەوەی بەدریژایی ئەو رۆژە روویدا کاریکی هیجگار سەمەرە بوو: کە دتیان ئەوا دزیوترینی جیهانییان کەوتووەتە وشەچەنی و بۆلە بۆل بەشکو گفتی خۆی پێ دەربڕێ. دەمی ژەنی یە بابەتیکی هیندە خەتەرناکەوە هەناوی گویگرەکانی پێ هەژاند. گوتی:

برادەرینە ئەمە بۆ یەکەم جارمە کە لەیەك رۆژدا هەموو ژیانمی تیدا بەرمەسەر، ئەوەندەم بەسە کە جەژنیکی ئاوا لەتەك زارادا– فیری زەوی خۆشویستنم بکا، ئیستا دەتوانم بەمەرگ بلیم: ئائەمەیە ژیان و زیندەگانی ؟.. کەواتە جاریکی دیکەش بم گیرەوە بۆ جەرگەی ژیان.

گەلی برادەرینە! ئەوە بۆچی وەك من بەروی مەرگدا هەڵ ناشاخین: (ئا ئەمەیە ژیان؟ کەواتە لەپیناو خۆشویستنی زارادا جاریکی کەش بمان ژینەرەوە). ئەوا نیوە شەو لای کردەوەو دزیوترینی جیهانییانیش ئاوای گوت.

پیاوە بەرزەکان لەم حەلەدا هەستیان پێکرد لەسەر دۆخی جارانیان نەماون و گۆراون و خەریکن چاکەوەبن، زانیشیان زارا کاری تیکردوون و گۆریونی؛ ئیدی بەخۆشەویستی و ریزەوە کەوتنە لەپەدەست ماچ کردنی زارا.. هەندیکیان پیدەکەنین و بریکیان دەگریان، کۆنە جادووگەریش بەکەیفەوە هەلی دەخستەوە؛ لەوەدەچوو باش مەست بووبێ، چۆنی ڵی بلیین دوای تەوەزەلی -مەستی ژیانی تازە بووە، هەندیکیش وادەگیرنەوە ((کەرەکە)) بەشەرابی دزیوترینی جیهانییان سەرخۆش بووەو کەوتووتە هەڵ تیزان و سەما دەش بێ لەبەرئەوەبێ کارەکە گرنگ نەبێ و رووداوە گەورەکانی ئەو سەردەمە بەسەر کاروباری کەرەکەدا تێ پەری بووبن.

ئەم گوتەیەش یەکیکە لەدەق نیشان و ئایەتی زارا:

((دەبێ ئەمە چ بایەخیکی هەبێ!))

٢

کاتێ دزیوترینی جیهانییان ئەو گفتانەی درکاند زارا شلەژابوو؛ چونکە زمانی لە کلیلە چووبوو، ئەژنۆی دەلەرزین و چاوەکانی نیشتبوون، کێ بزانێ چی بەدلدا هاتووە، لەهەڵ کشان و داکشانی بیرکردنەوەدا گوری دەبەستەوە بداتە شەقەی بال و بۆ دوور هەل بروانێ و لەترۆپکەوە بەسەر جووتە دەریادا بروانیتە خوارێ. تۆ بیژە: هەوریکی چروگرژبوو بەنیوان زەمانی رابووردوو داهاتوودا تێ دەپەری.

بەرزە پیاوەکان لەدەوری زارا کۆبوونەوەو قۆلیان بۆ کردە پالپشتی تابەخۆی ئاوزاو ئاهیکی پیدا هات ئەوجا بەمقۆ مقۆوە کەوتنە پیدا هەلدانی، بەلام ئەم کرکەی لیوە نەهات، وەك کەسیك هەست بۆ دەنگیك رابگرێ تیراماو قامکیکی نایە بان لچی و هاواری کردنێ: ئا-وەرن!..

کەبیدەنگی بالی بەسەردا کیشابوون لەدوورەوە زایەلەیەك دەنگی دایەوە.. زاراو کۆمەلەکەی گوێ قولاغ بوون.. دیسان پەنجەی نایە بان لچی و بۆ دووەم جار گوتی:

-وەرن و .. وەرنەوە.. ئەوا نیوەشەو داهات. ئاهەنگی قسەی گۆرا.. بەلام لەهەڵویستی خۆی دامایەوە، خامۆشی بەقورسی دایگرتن.. بەکەرودالەوە تۆ بلێ بە

ئاشقە مارەوە سەرجەمیان کپ بوون.. دنیا خامۆش بەئەشکەوت و مانگی رەنگ زەردەوە.. شەوگاریش بەبێ چرپە هەروا بەماتی مایەوە.

بۆ جاری سێیەمی قامکی نایەوە بان لچی و گوتی:

وەرن و.. وەرنەوە، ساتی خۆی نزیك بووەتەوە.. دەی وەرنەوە لەشەودا خۆمان نوقم بکەینەوە.

## ٣

ئەی بالا پیاوینە! ئەوا نیوەشەو داهات. چۆن کۆنە زەنگ زایەلەی خۆی بەگوێدا چپاندم منیش ئاوا لەتەکتاندا- دەچپێنم.

بەدلسۆزی و سامیکەوە لەگەلتاندا راز دەگرم کەکۆنە زەنگی نیوەشەو چپاندی بەگوێمدا. کۆنە زەنگێکەو هیچ مرۆڤێك هێندەی ئەو تەمەن درێژ نەبووە.

نیوەرووکی پیرەزەنگ لەدلی باوانتانەوە دەکەوێتە لێدان و ساتی نیوەشەو دەخاتە پرمەوە هەنکە، پێکەنینیش بۆ جەرگەی تاریکستان رەوانە دەکا.

گوێ بگرن! بڕێ شت بەرووناکی نیوەرۆ ئاشکرا نابن.. بەلام لەم (سات)ەدا کەهەوا فێنکەو هەراو هوریای دلان دامرکاوەتەوە شتەکان بۆخۆیان رازدەگرن و لێکدی دەگەن و رادەخزێنە ئەو گیانە رەهایانەی درێژە بەرابواردن و شەوارەی ئەدەن.. ئەوجا گوێ بگرن بۆ هەنکەی ساتی نیوەشەو کەچەندە دێرین و قوولە!

((ئەی مرۆڤ! ئاگات لەخۆت بێ؟!))

## ٤

وای بۆ خۆم! دەبێ زەمانە بەکوێدا تەشەنەی کردبێ؟ لەوانەیە خۆی دزیبێتەوە بۆ ناخی بیرە بێبنەکان؟! ئەمە دنیایەو خەوی لێکەوتووە.

خاکەسار خۆم! گوێم لەسەگ وەرەو چاوم لەتریفەی مانگەشەوە. بمرم باشترە نەوەك ئەوەی لەنیوەشەودا لە دلم چەسپیوە بۆتانی دەربڕم.

-ئیدی بۆ خۆم مردم و برامەوە!

ئەی جالجالۆکە بۆچی دەوری من دەتەنی؟ وادیارە داوای خوێنم لێ دەکەی؟

خاکەسار خۆم! شەونم دلۆپ دلۆپ دەبارێو (سات) نزیك دەبیتەوە، ئەوساتەی تییدا هەلدەلەرزمو دەمکاتە شەختە. ئەوساتەی یەکبینە دەپرسێ: ((کێ بەسەر ئەمەدا زات دەکاو بویرە؟.. کێ دەبیتە سەروەری هەموو جیهان؟.. کێ لەخۆرازی‌یەو دەتوانێ لەسەرجەمی رووبارەکان رابخورێو بلێ: ((رووبارەکان! ئادەی بەکەیفی من ئۆغر بکەنو لە نەخشەکەم لامەدەن؟))

ئەی مرۆڤی بالاٚ! ئەوا سات نزیك بووەتەوە؛ تۆش وشیاری خۆت بە، ئەم گوتەیەم بەرەورووی گوێ سووكو تۆیە.

–دەبێ نیوەشەو لەناخی خۆیدا چی بلێ؟!–

٥

من بردەی ئەویمو گیانیشم هەموو رۆژێ سەما دەکا! ئەرێ پیم نالیی کێ دەبیتە سەروەری جیهان؟

ئای داخەکەم ! ئەوا مانگ نوورانی بوو.. هەواش کپ و هیمن، ئایە دەتوانن بۆ بلندانی بدەنە شەقەی باڵ؟ هەرچەندە کەوتنە سەما .. بەلاٚم لاق نابیتە باڵ.

ئەی هەلپەرکێ زانەکان! تافی کەیف خۆشی رابووردو شەرابەکەش ترشا.. لەم لاوە کاسەی شەراب بەتالو لەولایشەوە چیەو رازی گۆرستانە!

ئەوە چیتانە! بۆچی لەفریندا نەگەیشتنە بلندانی؟.. ئا لەبەر ئەوەیە کە گۆرستان هاوار دەکا: ((مردووەکان رزگار بکەن، بۆچی شەوگارمان نابریتەوە.. تۆ بلیی بەتریفەی مانگەشەو مەست بووبین؟!

ئەی بالاٚکان! وەرن گۆرەکان قوتار بکەن..

ئەوە چیتانە! بۆچی مردووەکان راناپەرینن؟.. مردووخۆرکەکان مربوون، ئیدی بەسیانە! ئەوا سات هاتە بەرەوە، نزیك بووەتەوە. بەردەوام زەنگەو دەزرنگیتەوە.. دلیش بەسوکایەتی‌یەوە هەراس فرێ ئەداتە دەرەوە، مۆرانەی دلیش پەردەی دادەوەشینێ.

–ئەی هاوار! ئەم جیهانە چەندە بێ بنە.

٦

ئەی ((تار)) لەگەڵ تۆمە! فرە حەزم لەژێ ئاوازەکانتە.. هەر دەلیی لەدوورەوە بلند دەبنەوە.. زایەلەی زەمانی رابووردوون و لەرۆخ رووباری دلدارییەوە بەرز دەبنەوە!

ئەی زەنگ! تۆ بریتی لە -تار-ی دلتەزین، خەمەکانی باوان و پیشینان هەموو دلیان کوتایتەوە، زەمانەش بانگەوازی تۆی پێ گەیاندو حەملاندی تا بوویتە پاییزە زیرینەیەك وەك دلە تەنیاکەی من، دەنگت بوو بەگفت و قسە، خودی جیهانیش گەیی بەچەشنی ئەو هیشووانەی ماتەیان داوەو رەش دەچنەوە.

جیهان دەیەوێ کفنی شادی بەبالای خۆی ببڕێ و بمرێ.

ئەرێ بالا پیاوەکان! بۆچی ئەو بۆنە خۆشەی لە پەنهانی‌یەوە دێ هەلی نامژن؟.. ئەگەر نازانن ئەوە بەرامەی ئەبەدە.. بۆنی کۆنەشەرابی بەختەوەری یە .. بەلێ بەختەوەری کەیل کە بەتاسەی مەرگەوەیە، لەنیوەشەودا بەدیلانیوە تێ هەڵ دەکا:

((جیهانەکە قوولە.. جیهانەکە لەوەش قولترە کە رۆژگار گومانی پێ دەبرد)).

٧

دەلیم گەرێ.. لیم گەرێ! ئیستا جیهانەکەم رەخساوە ئەی رۆژ-نهار- و گەوج و مۆن وازم لێ بیرە.. لەوە پاکیزەترم دەستی تۆم وێ کەوێ.. ئەی رۆژی برالەی شەو ئەوە نییە ساتی نیوەشەو لە تۆ بەشەوقترە!

پیویستە پاکیزەکان سەروەری جیهان بن؛ چونکە بەهیزو نەناسراویکن گیانگەلی نیوەشەو- کەتیشکی نوور دەپژینن- خۆیان تیدا مت داون و لەرووناکییەکانی چیشتەنگاو قوولترو پرشنگدارترن.

ئەی چیشتەنگاو.. نیوەرۆ تۆ بەلاولۆمدا دییت و دەورەی بەختیاریم دەدەی؛ چونکە لەمنی تەنیادا کانی ئەو گەنج و خەزنانەت دەست دەکەوێ کەلەبن نایەن.

ئەی جیهان! ئەوە داوای من دەکەی؟.. لەگەڵ ئەوەشرا نەجیهانیم و نەئایینیم و نەخوا پەروەرم؟

بەکو چ رۆژیکی قورسەو چ جیهانیکی گرانە!

بابەریبەریی من دەستەکانت بەرێ کەون.. برۆن پەلاماری بەختیاری قولتر بدەن، پەلاماری بەدبەختی قولتر بدەن، برۆن دەست بەسەر خواوەندەیکدا بگرن.. ئیدی وازم لێ بیرن بابرۆم بەفەرمانی خۆمەوە.

ئەی ڕۆژ! بەختەوەریم قوولەو بەدبەختیشم هەر قوولە.. بەڵام نەخواوەندیکمو نە دۆزەخی خواوەندیکم.

ئای کە ژانی ئەم جیهانە قوولە!!

## ٨

ئەی جیهانی سەیرو سەمەرە! ئازارەکانی خواوەند لەئازارەکانی تۆ قووڵترن، تۆ پەردەرە ئازارەکانی خواوەندو لاقەی من مەکە. مـن کـەمانیکمو لەدەنگـە ژیکانمـەوە جادووکاریو شیرینبارانە.

من تاری نیوەشەوم.. زەنگیکمو کەس لەبەیانو دەربرینم تێ ناگا.. زەنگیکمو لەبەردەمی کەردا وەزمان دیم.. ئەوا من دەی بیژم کەچی ئیوەی باڵا تیناگەن.

ئیدی کار لەکار ترازا، لاویتی لەتەك عەسرو نیوەرۆدا خۆیان پیچایەوە، کاتی ئیوارەیەو شەو و نیوەشەو هاتنەبەرەوە.. لەلایەکەوە سەگەو لەلایەکەوە بایە هەردووکیان حەپوولوورەیانە!

با دێ.. لەمن بادێ..[٤٩]
وەك سەگ دەنووسکینێو دەحەپەینی..
.. با دێ دەنگی کەرەبادێ..
ئای چۆن دەلەرفینێو دەحیلکینێ..
بەگیانەوە لەنیوەشەودا دەنیخینێ

***

تۆ بلیی شاعیریکەو بەد مەست بووە.. سنووری نەشەی بەزاندووەو بیخەوی دای گرتووە.. ئەو کۆنە سەعاتە لەنیوەشەودا وازیی بەئازارەکانی دەکا.. دیسان دەستبازی لەتەك خۆشییەکانی دەکا، خۆشی لەکاتی تاوساندنی ئازاردا گەلی لە ئازارەکە بەتینترو قووڵترە.

ئەی دارمیو دلرەقانە شەقەبرم کردیو دلۆپ دلۆپ خوینت تکا، کەچی هیشتا سەنا خوانمی؟

---

[٤٩] دارشتنی ئەم کۆپلەیەم خستە سەر شیوە هۆنینەوەی –لاوکی دەرویشی عەبدی، کە ئیستاش لەبیرمە لەسالی ١٩٤٩ داهیشتا خەتم نەدابوو خوالیخۆشبوو مەلا حوسەینی جەلکی لاوکەکەی بەم سەربەندە دەست پێ دەکرد (بادێ.. لەمن بادێ.. دەنگی مەترەلۆسان دێ.. هتد)) بەهەمان کاریگەری منیش دەم لاوژاند.

دڵ رەقیی من کەیلو مەستە، ئەی چۆن ئاوا ستایشت بەرەو رووی باوەش دەکاتەوە؟!

گویم لیتە کەدەلیی: هەر شتیك رەخساو گەیی داوای مەرگ دەکا. کەواتە سەد ئافەرین لەداسی رەزەوان! ئەو شتەی چنگ لەزیندەگانی گیر دەکا هیشتا نەکاملە.

ئەوەش ئازار کەبەنەفسی خۆی دەلیّ:

رابوورەو مەمینە. بەلاّم ئازار زەدە داوای ژیان دەکا.. بەتەمایە بگاو کەیفی ساز بیو پر هەوەسو ئارەزوو بیّ.. بەتاسەی شتی روونترو دوورترو بالاترەوە بیّ، بردە باری ژانو ئازارەکان هاواردەکا: ((بەتەمای میراتگرمو وەجاخم روون بیّ.. ئامانجیشم رۆلەکانمەو خۆم نیە.)) کەچی (خۆشی) نە داوای جیگیر دەکاو نە داوای زارۆ دەکا. ئامانجی خۆشی/ تەنیا زاتی خۆیەتی، تاسەی نەمرایەتی دەکا. ئارەزوومەندی ئەوەیە شتە رۆیشتووەکان سەر لەنویّ بگەرینەوە. چارەی ئەو شتەی دەویّ کە لەزاتی خۆی بچیّو تا ئەبەد ئارام گرتووبیّ.

هەر ئازارەو دەلیی:

ئەی دل! تیك بشکیّو خوین بتکینە،

ئەی لاق! برۆ بقاچینە..

ئەی بال! بەرەو بلندانی رەهابە.. بەرەشو بلاّوبە.

تۆش لەخۆتدا هەر ژانیو هەر ئازاری،

پیرە دلەکەم! ئازارەکانت پیت دەلین: تیّ پەرەو کۆتابە !

کەواتە –بۆ هەمان کار– راپەرەو خۆت گورجەوەکە.

١٠

ئەریّ بالا پیاوینە! دەبیّ بەچیم بزانن؟

ئایە پیغەمبەرم یان دردۆنگم یان مەستم یان خەونگیرەوەم یان هیچیان نیمو زایەلەی زەنگی نیوەشەوم؟

ئایە شەونمم؟

نەخیر بخوریکم لە ئەبەدایەتییەوە سەردەکەم!

گوایە نەتان بیستووە، یان هەستتان پیّ نەکردووە کە جیهانی من رەسیوە؟

نیوە شەویش ئەوا هەر نیوەرۆیە .ئازار لەزەتەو نەفرین بەرەکەتەو شەو خۆری درەخشانە!

دوورکەونەوە ! با نەلین ئیوە گوتووتانە: کابرای دانا پەتیارەیە.

ئەگەر هەستتان بەکەیف خۆشی کردبێ دیارە هەستیشتان بەپەژارە کردووە، تیکرای شتەکان زنجیرەن.. بەیەکدا چوون.. سەرجەم دلخوازی یەکدین.

ئایە تامەزرۆی ئەوە نەبوون کە -یەك جارە- بە دووجارە بگەریتەوەو قریوەی ئاسوودەتان بۆ لەزەتیك کردبێ ئەویش بۆ سەردەمیکی رۆژگار و چاوترووکانیك بووبێ؟!

بەو ئاواتەوە حەزتان لەوە بووە تیکرای شتەکان بگەرینەوەو زنجیرەبن، پیکداچووبن، دلخوازی یەکدی بن. ئەی نەمرینە! ئاوا جیهانەکەتان خۆشویستووە، خۆشویستنەکەشتان ئەبەدی بووە. ئیوە بە ئازارەکانتان گوت: کۆتایی بەخۆیان بهینن کەچی هاوارتان کردنێ بگەرینەوە؛ چونکە هەموو خۆشایەتی‌یەك نەمرایەتی دەخوازێ.

## ١١

لەزەت و خۆشی‌یەکان نەمرایەتی بۆ هەموو شتیك دەخوازن: ئەوەتان پیکەوە هەنگوین و ترشاویان دەوێ.. ساتی مەستانەی نیوەشەویان دەوێ.. گۆرستان و فرمیسك بارانی پرسەی سەر گۆریان دەوێ.. نووری زیرینی خۆری دەمەو ئاوابوونیان دەوێ.

هەرشتیك لەزەت بە بەعەزرەتیەوە نەبێ گەلی لەئازار برسی و تینووترە، ئەو نهینی و نایابی‌یەی لە لەزەت و خۆشایەتیدا هەیە لە ئازاردا نیە.. خۆشایەتی هیندە خۆپەروەرە ددان لەخۆی بەرنادا، ویستیکەو لە ئەلقەیەکی بێ جەمسەردا رەنج دەدا، خۆشویستن و خۆش نەویستنی ویکرا دەوین.. بەگوشادیی خۆیەوە دەنازێ: شتێ دەبەخشێ و شتێ فری دەدا کە لەوسەرەوە بەرقەبەری بەرابەر دەبیتەوە.

ئەو لەزەتەی بەخۆنازە تاسەی ئازارو هەڵ پرووکانی نیو دۆزەخ دەکا.. مەیلی ریسوایی و هەموو شتیکی شیواو دەکا: بەتینویتی ژیانەوە گردەگرێ. لەم جیهانەشدا ژیانتان لی پەنهان نیە.

بالاينه! لهزهتی بهختـهوهرو هـهڵ چـوو تاسـهتان دهکـا.. ئـهی سـهرنهکهوتووان! لـهزهت بهپهرۆشـی ئازارهکانتانهوهیـه؛ لـهزهتی ئهبـهدیش ههمیشـه حـهزی لـه هـهموو تهقهلایهکی سهرنهکهوتووانهیه. که داوای ئازار دهکا داوای زاتی لهمهر خۆی دهکا.

ئهی دڵ ! تیك بشكێ؛ تۆی لهزهت تۆی ئازار.

بالاینه! فیربن: لهزهت نهمری خوازه.

لهزهت بۆ سهرجهمی شت نهمری دهخوازێ.. نهمری!

ئا ئیستا فیری سروودهکهم بوون؟.. ئهرێ لهکاکلهی تێ گهیشتن؟

کهواتـه ئـهی بالاپیاوینـه! راخزیـنو ئـهم سـرووده بلاویژنـن.. ئـهوه سـروودی منـهو ناونیشانهکهی بریتی‌یه له ((جاریکی دیکه)) ماناکهشی : ((تا ههتایه)).

ههمووتان سروودی زارا بچرن

ئهی مرۆڤ! وریابه.

"ئهوه نیوهشهو چی دهلێ؟

"لهمیژه وهنهوزهکوتهمهو خهوالووم

"ئا ئیستاش لهنوینی خۆمدا بهئاگادیم

"جیهان بهتهواوی قوله

"لهوهش قوولتره که رۆژ باوهری پییهتی

ئازارهکانیش قوولن

لهزهت لهئازارهکان قوولتره

ئازار دهبیژێ: فلانی رابوورهو کۆتابه

بهلام هیچ لهزهتیك نیه داوای نهمرایهتی نهکا

ئهو نهمرایهتی‌یهی دوایی نایه .. دوایی نایه!!!

## ههرهشهکهر

لهبـهیانی رۆژی دوایـی‌دا زارا لهسـهر جیگاکـهی راسـتهوهبوو. پشـتینی لهسـهر کلۆتـان بهسـتو بهگهرموگوریهکـهوه لهئهشـکهوتهکهی دهرپـهری. هـهر دهتگـوت ئاسکیکی سرکهو لهودیو ههورانهوه سهری پیوه ناوه.

جاران ئاسا، راسا و لەتەك خۆردا کەوتە رازان:

ئەی گلینە چاوی درەوشاوە بەنووری کامەرانی! دەبێ خۆش هیوا بوویی؟.. ئەوەتای ((ئەگەر چی بۆ خۆشت نەبێ)) رووناکی دەبەخشی؟!

ئەرێ ستارە گەورەکە ! ئەوە نابیتە زەحمەتی شکۆمەندی کە دەربکەویو ئەوانەی ئارام گرتووی شوینی خۆیانن رووناکیان بکەیتەوە.. ئیدی نووری خۆت بەسەر هەموو جیهاندا پەرواز بکەی؟!

من لەخەو راپەریم.. بەڵام ئەو باڵاپیاوانە هەروەها لە پرخەی خەودان، تۆ بلیی بەراست هاوریم بن؟.. نەخیر ئەو مرۆڤە باڵایانە نین کە لەم کیوانە بەتەمایانم!

گەرەکمە سەرلەبەیانیان دەست بدەمە کار کەچی ئەوانە لە بانگەبانگی سبەینانم بیئاگانو زرمەی پێیەکانیشم لە گزنگ کەوتنا وریایان ناکاتەوە!

لەغارەکەی مندا پاڵ کەوتوون، خەونەکانیان بەسروودی نیوە شەوانەی من ئاواشتە دەبن کەچی گوێیەکانیان بۆ بیستنی وتەکانم هیندە سووکەلە نین!

زارا هەلەوگیری رازی خۆی بوو، خۆریش بەئاسۆوە پێ هەڵ دەزنا. لەناکاو قیژەی هەلۆکەی لەبەرزایییەکانەوە بیست، ئەوجا گوتی: دیارە هەر لەتەك خۆمدا ئاشقە مارو هەلۆکەم بیداربوونەتەوە کە لەدەمەو گزنگدا ستایشی خۆر بکەن، هەلۆکەشم بەچنگی خۆی بکەویتە راوکردنی نووری تازە. من گیانداری راستم خۆش دەوێ، بەڵام دەبێ پیاوە راستەکانم لەکوێ بن؟

لەوکاتەدا زارا وای هەست پێکرد پۆلە بالندەکان بەگرشەوە و بەدەوریەوە بالیان گرتووەتەوە.. وای هەست پیدەکرد لە ژیکەوانی دوژمنەوە تیرە باران دەکرێ.. لیکی دەدایەوە: هەبێ و نەبێ ئەو ئاژنینو چووزاندنەوەیە بریتییە لەگەمەو دەستبازیو دولبەران لەگەڵ خۆشەویستی تازەدا.

بەسەرسامییەوە لەدلی خۆیدا ئەی گوت:

فلانی! دەبێ چی بەئازاری هینابم؟

بە پاریزیکەوە لەسەر تاشی دەم ئەشکەوتەکەی رۆنیشت،ئیدی کەوتە دەست راوەشاندن لەو مەلانەی ورووژمی پر بەزەییان بۆ دەهاورد، هەستیشی بەوە کرد ئەوا لەپی دەچن بەکولکی یالییەکدا.. هەر ئەوەندە دەستی وێ کەوت نرکەی شیریکی بیست.. نرکەیەکی پرسۆزو میهرەبان.

زارا هاواری کرد: زایەلەی هەرەشەو وریابوونەوە بەرزوەبوو! هەستی بەهێزیك کردو دلی خستە ئەوباری دی، کەچاوی کردنەوە دیتی جانەوریکی کەتەی رەنگ زەرد لەبەردەمی پالکەوتووەو سەری ناوە بەئەژنۆکانیەوە، لەسەگیك دەچوو کۆنە خاوەنەکەی دۆزیبێتەوەو بەدیاریەوە کلکەسۆتێ بکا.

پۆلە کۆترەکان بەدەوری زارادا چەرخەیان دەکرد، هەر ئەوەندە سەر بالی کۆتریك بیدایە لە لووتی شێرەکە بەواق ورمانەوە سەریکی بۆ رادەوەشاندو لەپێکەنین دا بینی دەگرت

لەئاقار ئەم دیمەنەدا زارا تەنیا ئەم وتەیەی لەدەم هاتە دەرێ: ((ئەوا رۆلەکانم نزیك بوونەوە)) ئیدی لەبێ دەنگیدا نوقم بوو، هەستیشی پێ کرد باریکی قورسی لەسەر دڵ لاچووە.. فرمیسکەکانی رشتن‌و لەسەر لەپەدەستەکانی جۆرراو گەیان بەست، سەری لەوە سوورمابوو هەرچی لەدەورەی بوو جوولەیتێ نەکەوت!

کۆترەکانیش بەسەر شانوملیەوە دەنیشتنەوەو وازییان بەموو سپییەکانی دەکردو سۆز بارانیان دەکرد، شێرەکەش پەیتا پەیتا فرمیسکی داچۆراوی سەر لەپەدەستەکانی دەلستەوەو لەسەرخۆ بەنەوازشەوە دەی نرکاند.

ئەم هەڵ ویستە درێژەی خایاند.. لەوانەیشە نەی خایاندبێ چونکە ئەو جۆرە هەلویستە لەسەر زەوی کات‌و زەمانی بۆ نیە .

لەم کاتەدا بالاپیاوەکان لەخەو گاراپەرین‌و خۆیان کۆکردەوە بۆ لای زارا دەرکەون بەیانییە سلاوی لی بکەن.. بەلام هەر ئەوەندە سەریان لەزاری ئەشکەوتەکە وەدەرنا، شێرەکە بەنرکەوە هێرشی بردنێ، بەهاتوو هاوارەوە ئەترەشیان چوو، ئیدی بەدوا کشانەوەو لەبەرچاو گوم بوون.

شپرزانە زارا لەشوین خۆی راپەری، قەدەریك بە چوار لای خۆیدا روانی‌و دەی گوت‌و دەی گوتەوە: یاران! چی روویدا.. چیم بیست‌و چیم بینی؟ کەهاتەوە سەرخۆی‌و رووداوەکانی ئەو رۆژەی لی روون بوونەوە، ریشی پەنجە شانە کردو گوتی:

دوینی بەیانی لەسەر ئەم گابەردە رۆنیشتبووم‌و نجومگەرەکەم لی هاتە پیش‌و بۆ یەکەم جار هاواری فریام لی بیست. بالاپیاوینە! ئەو هەوالەی دوینیکە نجومگەرەکە پیی راگەیاندم تەنیا هەوالی سەرنەکەوتنی ئیوەبوو، لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەزموونم

خەریك بوو بم هینیتە لاتان كە پیی گوتم: ئەی زارا! بۆ ئەوە هاتووم بت خەمە دووایین هەلەی خۆتەوە.

سەبارەت بەگوتەی (دووایینەی هەلەكانت......) بەرقەوە دایە قاقای پیكەنین، لەبەر خۆشیەوە دەی پرسی::دەبێ چ شتیك بی ئەم هەلەیەی بۆ هیشتبمەوە؟!

دیسانەوە لەسەر گابەردەكە ریك هات نوقمی بیركردنەوە بوو، خیرا راپەری و قریواندی:

((ئەوە بەزەیی و میهرەبانییە.. بەزەیی و میهر بۆ پیاوە بالاكانە). پۆلا ئاسا سەختی بەرووخساریەوە دیار بوو، گوتی:

((میهرەبانیش زەمانی خۆی هەبوو))

دەبێ بەزەیی و حەزو هەوەسی من چ بەهایەكیان هەبێ؟.. خۆمن بەختیاری خوازنیم، ئەوەی بۆی دەرەتیم فەرمانیكەو خستوومەتە بەر ویستی خۆم.

ئیستاش كە شیر هاتووتە پیشەوە بەلگەی نزیك بوونەوەی رۆلەكانمە.. بەچاو خۆشمەوە گەییوم و كاتی خەزانمە.

ئا ئەوە شەفەقەو لەكازیوەی منەوە دەردەكەوێ.. ئەی نیوە رۆی مەزن! سەرانسەر نووری خۆت برژینەو بپرژینە.

ئا لەوسەردەمەدا كە بەویستی توند تۆلەوە ئەشكەوتەكەی بەجێ هیشت.. وەك خۆری بەیان كەلەودیو هەورانەوە دەربكەوێ:

((زارا ئاوای گوت))

كۆتایی [٥٠]

---

[٥٠] لە چاپی بیروتداو لە ل-٣٥-وە پاشكۆیەكی هەیە لەسەرەبرشتی یاداشتەكانی فریدریك نیتشە، بەشە بەخۆم بەپیویستم نەزانی رەگەڵ ئیرەی بخەم.هەر وەك لەهەندێ چاپی دواییندا (چاپی بابل) ئەو پاشكۆیەیان پەراندووە.

ئالانی

١٩٩٠/٨/١٥